# هۆزی شێخ بزێنی

نووسینی

م.سەعد فاروق یوسف شێخ بزێنی

٢٠١٥- ١٤٣٦

★ ناوی کتێب: هۆزی شێخ بزێنی

★ ناوی نووسەر: سەعد فاروق یوسف شێخ بزێنی

★ تیراژ: 500 دانــە

★ساڵی دەرچوون: ٢٠١٥

★ چاپ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر

★ دیزاینی بەرگ: ئاسۆ حسن احمد

★ نەخشەسازی: کۆسرەت جەمیل

★ تایپ: عبدالله عبدالله

★ ژمارەی سپاردن: ژمارە ( ٨٥٥)ی ساڵی ٢٠١٤ی لەلایەن وەزارەتی رۆشـنبیری پێ دراوە.

چاپ: چاپی یەکەم – چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین/هەولێر

بسم الله الرحمن الرحيم

((يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ))[1].

صدق الله العظيم

وفي الحديث الشريف:

قال الرسول صلى الله عليه وسلم: (( تعلموا من النسب ما تعرفون به أحسابكم وتصلون به أرحامكم )) [2].

صدق رسول الله

---

[1] - سورەتی (الحجرات)، ئایەتی: ١٣ .

[2] - رواه الترمذي.

وقال عمر بن الخطاب رضي الله عنه ( الفاروق ) ثاني الخلفاء الراشدين: (تعلموا النسب ولا تكونوا كنبيط السواد، إذا سئل احدهم عن أصله قال من قرية كذا وكذا )[3].

من اقوال الإمام علي بن ابي طالب (رضى الله عنه): (أكرم عشيرتك، فإنهم جناحك الذي به تطير، وأصلك الذي إليه تصير، ويدك التي بها تصول).

(يموت الرجال وتبقى مآثرهم) واته: پیاوان دەمرن کرداری چاکیان هەر زیندووە.

---

[3]- مقدمة ابن خلدون، الفصل التاسع من النسب.

# ناوەڕۆک


| لاپەڕەکان | بابەتەکان |
| --- | --- |
| 9 | پێشەکی ...... |
| 12 | دەروازە.... |
| 22 | کوردستان...... |
| 32 | پێناسەیەکی خێڵ....... |
| 38 | ئەو ڕاو سەرنجانەی کە باس لە ناوی شێخ بزێنی دەکەن......... |
| 44 | ڕیشەی ناوی جوگرافی و مێژوویی گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی... |
| 48 | هۆزی شێخ بزێنی بەزۆری لە دەوری زێی گەورەو بچووک لە عێراق نیشتەجێ بوونە.. |
| 48 | زێی بچووک ... |
| 53 | زێی گەورە... |
| 54 | ئەستان (لیوا-پارێزگا).... |
| 55 | قەزا ... |
| 55 | ناحیە ... |
| 55 | گوند..... |
| 60 | کۆچکردن... |
| 61 | ئەو ڕاوسەرنجانەی لە بەڵگەنامە فەرمییەکان لەسەر هۆزی شێخ بزێنی نووسراوە... |
| 99 | تیرەکانی هۆزی شێخ بزێنی ... |
| 101 | دەوری هۆزی شێخ بزێنی لە شۆڕشی شێخ مەحموودی حەفیدا... |
| 109 | دەوری هۆزی شێخ بزێنی لە شۆڕشی کوردا... |

| | |
|---|---|
| شێخ بزێنی و هەمەوەندو کۆیی یەکان... | 111 |
| حاجی قادر گۆڕقەرەجیەو لە تیرەی دەربەندییە کە یەکێکە لە تیرەکانی هۆزی شێخ بزێنی | 119 |
| هۆزی شێخ بزێنی لە وولاتی عێراق.... | 128 |
| هەولێر ... | 128 |
| دهۆك... | 201 |
| موصل... | 218 |
| سلێمانی... | 226 |
| کەرکوك... | 229 |
| هۆزی شێخ بزێنی لە تورکیا... | 280 |
| هۆزی شێخ بزێنی لە ئێران ... | 321 |
| هۆزی شێخ بزێنی لە سوریا... | 323 |
| ڕاگواستنی کورد دوای یەکەمین جەنگی جیهانی... | 326 |
| ڕاگواستنی هۆزی شێخ بزێنی... | 329 |
| ئەنفالکردنی ڕۆڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی ... | 342 |
| زیندانی سیاسی ڕۆلەکانی هۆزی شێخ بزێنی ... | 440 |
| سەرچاوەکان ... | 442 |
| نامەیەك لە مامۆستا سەعد شێخ بزێنیەوە بۆ هەموو ڕۆڵە نەبەردو قارەمانەکانی نەتەوەی کورد بەگشتی و هۆزی شێخ بزێنی بە تایبەتی... | 461 |

## پێشەکی

پێش هەموو باسێك سوپاسی خوای بەخشندە و میهرەبان دەکەم لەسەر ئەو هەستەی پێی بەخشیم تاکو بتوانم پەرتووکێك لەسەر هۆزی شێخ بزێنی و نەوەکانی و بنەماڵەکانی و ڕیشەو زادگاکانیان بنووسم کە بە پشتیوانی خوای گەورە کتێبەکەم بە ئەنجام گەیشت، ئەوەی لە هەمووان ڕوونە مرۆڤایەتی بەگشتی لە حەزرەتی ئادەمەوە (سەلامی خوای لێ بێت) سەرچاوە دەگرێ و هەموو دانیشتوانی گۆی زەوی و هەموو جیهان کە بە درێژایی تەمەنی ڕۆژگارەوە کە چەندین ساڵە ئەم زەوی یە ئاوەدان بۆتەوە و کیشوەرەکانی دروست بوون و زمان و نەتەوەی جیاواز جیاواز لەسەر ئەم زەوییەدا ژیاون ئەمە کارێکی وای کردووە کە میللەتێکی زۆر بەناویەکدا بێن و بچن و شەپۆل بدەن، وە هەر بەشێك لە پارچەیەك زەوی و وولاتێکدا جێگیر بێت و ببێتە خاوەنی کەلتوورو داب و نەریتی تایبەت بەو نەتەوەیە، هەروەها باری چینایەتی و توێژی جیاجیای گەلان لەئارادابووە،وە هەر بەشێك لە بەشیکی تر جیابووە، بۆیە هۆزی شێخ بزێنیش وەکو هەر هۆزێك لە هۆزە کوردییەکانی نەتەوەی کورد بەدەر نیە لە نەتەوەکانی تر کە بەدرێژایی ڕۆژگار تاکو دەگاتە ئەمڕۆ چەندین وەچە و نەوەی نوێ ی لێ دروست بووە و لە چەندین شوێنی جیاجیا نیشتەجێ بوون کە بە تێپەربوونی کات ئەم هۆزە گەورەیەی لێ دروست بووە، هەروەها مەلا ئەحمەدی باپیرە گەورەی بنەماڵەکانی هۆزی شێخ بزینی چوار کوڕی هەبووە، هەریەك لەوانە کەسایەتی بەهێز بوون و خاوەنی زوهد و تەقوا بوون، هەروەها سوارچاك و داناو عەگید و لێهاتووی سەردەمی خۆشیان بوون و لەڕووی دین و دونیاوە زۆر ناوداربوون و بەناوبانگ بوون و خاوەن قۆناغ و دیوەخان بوون نەوەکانیشیان لەچەند ناوچەیەکی کوردستان بلاۆبوونەتەوە، خزمەتێکی زۆریان بە کوردەواری گەیاندووە و بەشداری هەموو ئەو شۆڕشە هەڵگیرساوە دوابەدوای یەکترانەیان کردووە بەتایبەتی شۆڕشی شیخ مەحمودی حەفید و مەلا مستەفای بارزانی، بەسەدان قوربانیان داوەو ناوچەکانیشیان چەندین جار خاپوور کراوە لەلایەن دوژمنانی کوردەوە لە ساڵەکانی ١٩٦٣ و ١٩٨٧ و ١٩٨٨ زۆربەی ئەو گوندانەی ناوچەی شێخ بزێنی خاپوور کرا و زۆربەی خەڵکەکەشی ئەنفال کرا .

کارێك کە ئەم قۆناغەی مێژوونووسی کوردی لەلایەکەوە پێویستیەتی، کۆکردنەوەی زۆرترین زانیاری هەمە جۆری مێژوویی یە سەبارەت بە مێژووی نوێ ی کورد. بیرەوەری و زانیاری ناوچەیی پشکێکی بەرچاوی ئەم لایەنە پێك دەهێنن. خۆشبەختانە کەسانێکی خەم خۆر لێرەو لەوێ پەیدابوون، بەو پەڕی پەرۆشیەوە سەرقالی کۆکردنەوەی هەموو زانیارییەکی

مێژوویی تایبەت بە ناوچەکانی خۆیانن، کە بەگشتی لە کەسانی تر ئاسانترو زووتر بۆیان فەراهەم دەبێت، ئەم پەرتووکەی بەر دەستتان دەچێتە هەمان خانەی باسکراو.

ئەم پەرتووکە لێکۆلینەوەیەکە لەبارەی هۆزی شێخ بزێنی، لە ڕووی مێژووی کۆمەلایەتی لە سەرەتای دەرکەوتنیان، تاوەکو سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەك، توێژینەوەکە ماوەیەکی مێژوویی فراوان بەخۆیەوە دەگرێت، لەو ماوە مێژووییەدا گەلێك گۆڕانکاریی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری و جوگرافی بەسەر هۆزی شێخ بزێنیدا هاتوون.

ئاشکرایە هەلبژاردنی هەر باس و بابەتێك لە کۆمەلێك هۆکارەوە سەرچاوە دەگرێت، هەلبژاردنی بابەتی (هۆزی شێخ بزێنی)یش، لە کۆمەلێك شتەوە سەرچاوەی گرتووە، یەکەمیان ئەوەیە کە تا ئێستا هیچ توێژینەوەیەکی تایبەت دەربارەی هۆزی شێخ بزێنی ئەنجام نەدراوە، لە هیچ سەرچاوەیەکدا بەشێوەیەکی وردو بابەتیانە لایەنە نادیارو شاراوەکانی هۆزەکە باس نەکراون، لەکاتێکدا لە چەندین سەرچاوەی مێژوویی جۆربەجۆردا بەشێوەی جیاجیا باسی لایەنی (سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابووری....هتد) شیخ بزێنیەکان کراوە، ئەمە جگە لە چەندان نووسین و وتار لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان لەسەر ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی، بەلاّم بەشی زۆری ئەمانە نیوەچلن و کەم و کورتی زۆریان تێدایە، هۆکاری دووەمیان ئەوەیە بەردەوام ئەوانەی دەیانویست لە ڕووی مێژووییەوە توێژینەوە لەسەر هۆزە کوردییەکان ئەنجام بدەن، لەسەر هۆزی شێخ بزێنی داوای زانیاریان لێ دەکردم، ئەمە جگە لەوەی هەمیشە خزم و کەس و دۆستان پێ یان دەگووتم : کتێبێکی تایبەت لەسەر هۆزی شێخ بزێنی بنووسە، ئەمانە هۆکاری سەرەکی نووسینی ئەم پەرتووکەمن.

ئامانجی ئێمە لەم توێژینەوەیە خستنەڕووی چەند ڕاستیەکی زانستیە لەبارەی هۆزی شێخ بزێنی، لەسەر بنچینەو بنەمایەکی مێژوویی، بەدەر لە هەموو لایەنگری و پێداهەلدانێکی دەمارگیری عەشیرەتگەرایی، هەروەها خۆ بەدوورگرتن لە ئامانج و مەرام و بەرژەوەندیی تایبەت، پێشکەشکردنی توێژینەوەکە بە مەبەستی ناساندنێکی وردی هۆزی شێخ بزێنی بە هەموو ئەوانەی دەیانەوێت زانیاری لەبارەی ئەم هۆزەوە، وەکو یەکێك لە هۆزە بەهێزو گەورەکانی کوردستان بزانن.

لەم توێژینەوەیەدا پشت بەلایەنی(تیۆری و مەیدانی) بەستراوە، واتە لە لایەك پەنام بۆ سەرچاوە جۆربەجۆرەکان بردووە، لە لایەکی دیکەشەوە پشتم بە (دەم و دوو دیدار،

چاوپێکەوتن، بەڵگەنامەکان و.... هتد) بەستووە، بەتایبەتی بەشی زۆری گەشتەکانم بۆ هەموو ئەو گوندو ناوچانەی شێخ بزێنی کە مەیدانی سەردانم کردوون.

هەمیشە توێژەرەوە لەکاتی توێژینەوە ڕووبەڕووی چەندان ئاستەنگ و کێشە دەبێتەوە، بەتایبەتی لە بارەی لایەنی مێژوویی کۆمەلایەتی هۆزێك، کە تا ئێستا هیچ توێژینەوەیەکی لەسەر نەنووسراوە، ئەوەی لەسەریشی نووسراوە زۆر کەمە، بەشێك لەو نووسینانەش هەڵەو کەم و کورتیان تێدایە، ئەمانەش دووبارە پێویستیان بە سەرنج و تێبینی و ڕاستکردنەوەو لێکدانەوە هەیە، ئەمە جگە لەوەی کتێبخانەی کوردی لەبارەی مێژووی ئەو سەردەمە زۆر هەژارە، هەروەها نەبوون و کەمتەرخەمی کەسانی هۆشیارو ڕۆشبیری هۆزەکە، کە لە سەردەمی خۆیدا گرنگیان بە نووسینەوەی مێژووی هۆزەکە نەداوە، بەجۆرێك بە هیچ شێوەیەك گرنگیان بە تۆمارکردنی یاداشتی کەسانی بەتەمەن نەداوە ئەوانەی زانیارییان لەسەر هۆزی شێخ بزێنی هەبووە، هەر بۆیە بە پێویستم زانی دڵسۆزانە هەم کاتێکی زۆری بۆ تەرخان بکەم، هەم ماندووبوون و ئەرکێکی زۆریشی بۆ بکێشم بۆ کۆکردنەوەو لێ وردبونەوەو ساخکردنەوەو ریکخستنی کۆکراوەی زانیارییەکان، کە لە پاڵ کۆمەڵێك پەرتووکی مێژوویی و سەرچاوەی دیکەدا ژمارەیەکی بەرچاوی بیرەوەری چەندین کەسیشم بۆ بەکارهێناون، ئەمە جگە لەوەی ئەم ناوچانەی کە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتەجێ بوون لە ڕووی مێژووییەوە تا ئێستاش کاری بەم شێوەیە مەیدانی و فراوانیان بۆ نەکراوە. هەر بۆیە بە پێویستم زانی بۆ هەموو ڕۆڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی ڕوون بکەمەوە کەوا ئەم پەرتووکە کە بەو سادەیی و ساناییەوە لەبەر دەستتدایە ڕەنجی حەوت ساڵەی منە کە کارم لەسەر کردووە تاکو بە ئەنجام گەیشتووە، کە پاش شەوخوونی و کۆشش و بەخشینێکی بەرفراوان لە ڕووی تەندروستی و جەستەیی و ئابووری و کۆمەلایەتی ....هتد ، کەناکرێ ئاماژەی پێ نەکەم.

**سەعد شێخ بزێنی**

**بچوکترین بەندەی خوا لەسەر زەوی**

**مامۆستای زانکۆ**

**٢٠١٤/٩/١٥**

**دەروازە:**

مێژوو زانستێکی زیندووە مەرجێکی پێویستە بۆ قەوارەی نەتەوایەتی. بەبێ مێژوو ناتوانرێ لە ڕەسەنایەتی هیچ نەتەوەیەك بکۆڵرێتەوە، ڕەش کردنەوەو فەوتاندنی مێژووی هەر نەتەوەیەك دەبێتە هۆی لەنێوچوونی ئەو نەتەوەیە. هەرچەندە جیهان لەوپەڕی گەشەکردن دایە لەم چەرخەدا تەکنۆلۆژیا لەوپەڕی پەرەسەندن دایە بەڵام مێژوو لە نرخی خۆی کەم نەکردووتەوەو چاوگەیەکی هەرە پێویستە بۆ هەزار بابەتی تر .

ئاشکرایە نووسینەوەی مێژوو مەرج و بنچینەی هەیە بۆیە دەبێت مێژوونووس بەتەنگ ڕاستی یەوە بێت لە ڕەگەزپەرستی و سۆزو دەست تێوەردانی سەربەخۆ دوور بێت هەر لەبەر ئەم هۆیانەیە کە بە هیرۆدۆت دەوترێ باوکی مێژوو یان مێژوونووسان، کەواتە وا پەسندترە کە ڕووداوانی ڕابردوو بنووسرێتەوە نەك وەکو پاشا و سەرکردەکان کە نووسەری تایبەتی خۆیان لەگەڵ بوو لەشەڕ گەشتدا و ئەوەی بۆ سوودی خۆیان بوو وایان بە نووسەرەکان دەنووسی شتی نارەواو بێ سەمەرەیان دەخستە پاڵ ناحەزانی خۆیان و ئاگایان لەوەنەبوو کە هەموو نەتەوەکان چاکە و خراپەی خۆیان نووسیوەتەوە تاکو باسی دزو جەردەو شێت و دەولەمەندو هەژارەکانیان نووسیوەتەوە، ئەوجا مێژوویەکی پوختەیان لێ پێك هێناوە.

لەناو کوردانیش دا گەلێ مرۆی کەلەمێردوو سوارچاك و بەڕاوێژ هەڵکەوتووە ڕاڤەی دەوروبەری خۆیان کردووە جا چ بەدەست و بازوو چ بە کردەوەو مشور زانین چ بە سەرپەرشتی کردن کە هەمووشیان بەشێك بوون لە کۆمەلەکەمان، بەڵام بەداخەوە ئەمرۆ کەوتوونە مێژووی لەبیر چوونەوەو کەس نیە لێ یان بپێچێتەوە، ئێمەی کوردیش ئەگەرچی وەك نەتەوەیەك لەسەر ئەم زەوی یە دەژین و خاکێکی فراوانمان هەیە کە لە سەردەمێکی هەرە کۆنەوە بۆ خۆمان ئاوەدانمان کردووتەوە سەرباری ئەوەی کە هەزارەها کێشمەکێشمان بەسەرهاتووە خۆشمان بەکەمتر نازانین لە کەس بەڵام تا ئێستاش مێژوویەکی تەواومان نیە، ڕەگەزمان پەرت و بلاوکراوە، وەك خەرمانی بێ خاوەن هەر کەس هاتووە خراری خۆی لێ پڕکردووە.

لێرەدا مافم هەیە گازاندە و گلەیی لە چینی ڕۆشنبیر بکەم چونکە دڵنیام ئەگەر بەراوردێك بکرێت ئەوا لەسەدا چەند کەسێك هەیە کە کەم و زۆرێك ئاگاداری هەبێ لە مێژووی نەتەوەکەی، دەنا ئەویتر فری بەسەرەوەنیە بێجگە لەمەش ڕۆشنبیرانی کورد کردوویانەتە پیشە لە مەیدانی دیراسەت و لێ کۆڵینەوە نووسینەکانیان تەرخان کردووە هەر بۆ شاعیرەکان و ئەوانەی هەندێ کەشکۆلی نووسینیان لەدوای خۆیان بەجێ هێشتووە وە

لایەنەکانی تریان فەرامۆش کردووە کە یەکێ لەمانە ساغکردنەوەو نووسینە لەسەر هۆزە کوردییەکانی میللەتەکەمان بە دەگمەن نەبێ دەنا بەلایدا نەچوونە، جا ڕەنگە خوێندەواری کورد ئەگەر لە چاپەمەنییەکانی کوردی چاوی بە ناوی هۆزێك لە هۆزە کوردییەکان بکەوێ کە هۆزەکەی خۆی نەبێ یان لێ ی نزیك نەبێ هەر بەلاشیا ناڕوات بێ ئەوەی بزانێ پەرتووکەکە چی تێدایە . جا بۆ ئەوەی نووسەرانی کورد لەمەولا ڕوو بدەنە ئەم لایانە هەر یەکێ لە شوێنی خۆی لێ ی ڕاپەڕێ بۆ ئەوەی کەرەستەیەکی مێژوویی کۆبکەینەوە، ئەوا من لێی ڕاپەڕیم و تەلە سمەکەم شکاند لە هەڵبژاردنی یەکێك لە هۆزە کوردییەکان ئەویش هۆزی شێخ بزێنی یە، بۆیە ئەم کتێبەی کە لەبەر دەستتدایە، تۆمارێکی جوگرافیایی و مێژوویی و مەیدانی و یاداشتی ڕۆلەیێکی ناوچەی شێخ بزێنی یە، کە لە نزیکەوە لەباری سروشتی و ئابووری و کۆمەلآیەتی ئەم ناوچەیە دەدوێ کە هۆزی شێخ بزێنی تێیدا نیشتەجێ بووە، زانیارییەکی تاڕادەیەك وردو سەرنج ڕاکێش و بەکەلکی پێشکەش بە خوێندەواران دەکات.

وەنەبێ نووسەر لەبەر خۆی و بنەماڵەکەی و پێداهەڵدانی ناوچەکەی خۆی ئەم کتێبەی دانابێ، بەڵکو ئەم کارەی لە پێناوی شارەزاکردنی خەلکەکەیە لەبارەی ئەم ناوچە گرنگەوە کە بەشێکی دیارو ناودارە لە کوردستانی عێراق و تورکیا و ئێران و سوریا دا، لێدوان و نووسین لەسەر بەشێکی وولآت و نەتەوە، خزمەتکردنی هەموو وولآت و نەتەوەیە.

لەبواری تۆمارکردنی زانیاریی جوگرافیایی و مێژوویی و لێکۆلینەوەی مەیدانی لەبارەیانەوە، بەزۆری ئەو کەسانە سەردەکەون کە خەلکی ناوچەکە بن یاخود لە نزیکەوە ئاگاداریی و شارەزاییکی زۆریان لە هەموو ڕوویێکی ئەو ناوچەیەدا ببێ.

خوێنەری بەرێز: لێدوان و لێکۆلینەوە لە شێخ بزێنی و ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی و باس کردنی سنووری ئەو هۆزە، لەپێناوی بیری تەسکی ناوچەگەریی و عەشیرەتگەری دا نی یە، بەڵکو وەکو واقیعێکی جوگرافیایی و مێژوویی خۆیان دەنوێنن و دەکەونە بەر زەین و لێکۆلینەوەی نووسەرو ئەمیش تۆماریان دەکات و دەوری خۆیان پێ دەدات.

ئەو کەسانەی لە رابردوودا دەورێکی ڕاستەوخۆیان لە بارەی ژیانی کۆمەلآیەتی و ئابووری و ڕامیاری ناوچەکەدا بووە، مێژوو پشتگوێیان ناخات و ئاوڕیان هەر لێ دەداتەوە، کەم و زۆریش ئاوڕدانەوەو حیسابێکیش بۆ کەسایەتی و پیاو ماقول و دەسەلاتدارانی عەشیرەت و ناوچەکانی دیکە دەکات. لێرەدا وەنەبێ نووسەری ئەم پەرتووکە یەکەم کەس بێ ئەم جۆرە کارە ڕۆشنبیرییەی گرتبێتە ئەستۆ لەسەر باری جوگرافیایی و مێژوویی و ڕۆشنبیری

ناوچەیەکی وولآت یان عەشیرەتێك یاخود شارێك نووسی بێتی بەڵکو گەلێ نووسەری دیکە لە مەیدانی ئاوادا ئەسپی زانیاری مێژوویی و ئەدەبی خۆیان تاوداوەو گەلێ بەرهەمی پڕ سوودیان پێشکەش بە خوێندەواران کردووە و هەریەکە لە باری جوگرافیایی یا مێژوویی یاخود ئەدەبیاتی شارێك یا ناوچەیەکەوە دوان و بەچاکیش لێی سەرکەوتوون و جێگەی ڕەزامەندی جەماوەری ڕۆشنبیرانی کورد بوون. جا بۆیە ئەم بەرهەمەم کە تایبەتە بە سنوورو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی لە هەر چوار پارچەی کوردستان و هەموو ئەو وردەکاریانەی کە پەیوەستن بەو هۆزەوە کارێکی بەنرخ و بەهادارە لە کاروانی ڕۆشنبیری نەتەوەکەمان جێی خۆی و نرخی تایبەتی خۆی هەیە.

لەو سەروبەندە مێژووییەی بابەتی لێکۆڵینەوەکەماندا، پەیوەندی باوك سالاری خێڵەکی لەناو کورداندا باوبووە. سەرچاوە عەرەبیەکان ناوی هۆزە کوردەکان بە هۆز یان خێڵ یان تیرە....و هی تریش دەبەن. لە سەدەکانی ناوەندا (هۆز) واتای یەکێتی هۆزایەتی دەگەیاند، کە چەند دەستەو کۆمەلێکی لێك جودای بە هاوبەندی خوێن پێکەوە گرێ دراون[1]. بەلآم (خێڵ) لە کۆمەلە خزمێك پێك دێت[2]. کەچی (تیرە-تایفە) پاژ یان لکێکە لە هۆزێك یانیش یەکێتی هۆزەکان. (ابن منظور) (سەدەی سێزدەیەم)ی زانای زمانەوانی دەڵێت: دەکرێ (تیرە) کۆمەلێکی پتر لە هەزار کەسی بگرێتە خۆ[3].

ئەو ناوانەی وەك (هۆزو خێل و تیرەو کۆمەل و گەل و نەوە)، کە نووسەرە عەرەبەکان بەسەر هۆزە عەرەبییەکانیان دابڕیوە، دابڕینیان بەسەر کوردەکاندا هەموو دەم ڕێك نایەت و بەزۆریش شەقلێکی زاراودیی هەیە. بۆ نموونە هەندێ جارو لە هەندێ سەرچاوەدا بەو یەکگرتنە هۆزایەتییە مەزنەی کوردی (هەزبانی)، زاراوەی (هۆز) و جاری واش هەیە (خێل) و لەو چەشنانەیان پێ دەڵێن.

سروشت هەوارگەی سەرەتای گەلانی کوردستان بووە، مرۆڤ لە زستانان هەوارگەیان دۆلەکان و ئەشکەوتەکان بووە و خۆیان تێدا پاراستووە لە سەرماو سۆڵەی زستان و کاتێ بەفرو بارانیش نامینێ و شومی زستانیش خۆی دەپێچێتەوە کۆچ و کۆچباریان تێك دەنێن بۆ

---

[1] - ابن منظور. لسان العرب، ج١٤. القاهرة، ١٩٠٢، ص٧٥ .

[2] - ابن منظور. لسان العرب، ج٦. القاهرة، ١٣٠٠، ص٢٥٠ .

[3] - ابن منظور. لسان العرب، ج١١. القاهرة، ١٣٠١، ص١٣٠ .

دەشتە پان و بەرینەکان و دەو ڕووبارەکان، جا دوای ئەوەی لە دەشتەکان فێرە کشتوکاڵ کردن دەبن، لەپاڵ ئاژەڵ بەخێوکردنەوە، دەست دەکەن بە دروستکردنی ئاوایی و جێنشین دەبن، واتە هەوارگەی دیاریکراو و جێگیریان دەبێت بەڵام کاتێ بیرو باوەڕی ئاینی بڵاو دەبێتەوە لە هەر ئاواییەك پەرستگایەك دروست دەکرێت خەلکەکەش لە جاران زیاتر کۆدەبنەوە و دەورە لە یەکتری دەدەن و پەیوەندی کۆمەلایەتیان بەهێز تر دەبێت. بەم جۆرە زۆربەی هۆزەکان هەوارگەیەکی زستانەیان هەبووە بۆ پشوودان و کشتوکاڵ کردنیان، دوای ئەوەی هاوینان لە زۆزان دەگەڕانەوە بەم جۆرە گەلی کورد لە خاکێکی فراوانی نێوان دەریای ڕەش و گەرووی هورمز و چیای زاگرۆس و دەریای سپی ناوەڕاست نیشتەجێ بوونە. بەلاّم دوای ئەوەی جەنگ بەرپا دەبێت لە نێوان سەفەوییەکان و عوسمانییەکان لەسەر خاکی کوردستانی باکوور، لە سالآنی نێوان (١٥١٤ – ١٥١٨ز)، ئاگری جەنگ زۆربەی هۆزەکانی کوردستانی باکووری گرتەوە. تیرەو بنەماڵەیەکی زۆر ئاوارە بوون و لە ناوچە دەشتاییەکان گیرسانەوە و نیشتەجێ بوون، واتە کۆچ کردنی زۆربەی بنەماڵە و تیرە شاخاوییەکان، ڕامیاری هۆی سەرەکی بوو، جا لەبەر شەڕو شۆڕی سەفەوی و عوسمانییەکان ڕایان دەکرد، هۆی دووەمی کۆچ کردنیشیان، هۆی ئابوری بوو، تا وای لێهات دەشتەکان لە ناوچە شاخاوییەکان زیاتر ئاوەدان بوونەوەو خەلکەکەشی زیاتر پێشکەوتن و تێکەڵی یەکتری بوون، بەجۆری هەر دەشتێك بەدەیان بنەماڵەو تیرەیان لێ گیرسایەوەو تێکەڵی هۆزە نیشتەجێ بووەکان بوون و بوونە خزمیان، واتە خزمایەتی هۆزانی دەشتەکان لە خوێن بوو بە زەوی، چونکە دەشتەکە چارەنووس و مان و نەمانی ئەوانی بەیەکەوە بەستەوە، نموونەشمان دەشتی هەولێرو ناوچەی گۆرانی چیای کوختی (مەقلوب) و ناوچەی گەرمیان و شەبەکستان و .... هتد.

با ئەوەش لە یاد نەکەین زۆر تیرەو بنەماڵەش کەوتنە ناوچەکانی دەوروبەری کوردستان و توانەوە لە بۆتەی گەلانی بیانی. بەخۆکردنە ژێر ڕەشماڵی هۆزێ لە هۆزانی عەرەب، تورك، فارس...هتد. دوای تێپەڕبوونی ڕۆژگارێکی دوورو درێژ، بەسەر دامەزراندنی ئەم هۆزانە، خۆیان بە ناوی (خالد کوڕی وەلید- عومەری کوڕی خەتاب- ئیمامی حوسێن ....هتد) دەزانن. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لەم هۆزانە بە کوردی قسە دەکەن و لە کوردستانیش نیشتەجێن، جا بەم جۆرە زۆر لە هۆزانی کورد ناوە ڕەسەنەکانیان وون کردووە و ناوی تریان وەرگرتووە، یان ناوی هۆزەکەیان نابەن بەڵکو ناوی تیرەکەیان دەبەن کە ئەویش بەشێکە لە هۆزەکەیان وەکو بەشێك لە تیرەی چۆغەڕەشی لە هۆزی شێخ بزێنی کە خۆیان بە ناوی

تیرەکەیان ناو دەبەن نەوەکو بە ناوی هۆزەکەیان کە شێخ بزێنییە، وە یان هەندێك لەو هۆزانە بەجارێ لە کوردایەتی شوراونەتەوە و بوون بە گەلێکی بیانی.

مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە، شارنشینی یان، گوندنشینی نەبووە، بەڵکو جێگۆڕکێی کردووە، بەدوای ژیان و گوزەران و پێویستی ژیانی و پاشان وردە وردە ، نیشتەجێ بووە، گوندو شاری دروست کردووە، هەندێ مرۆڤیش تاکو ئێستا هەر کۆچەرن (رەوەندن)، کوردەواری خۆشمان بە هەمان شێوە، بەڵکە لەنێوان خۆشماندا رەوکردنمان هەیە، لە ناوچەیەکی کوردستان بۆ ناوچەیەکی دیکە، لە هەرێمێك بۆ هەرێمێکی دیکە، هۆکارەکان زۆرن، بەلاّم سەرەکی ترین هۆکار(سیاسی)یە، کە لەم سالاّنەی دوایی ڕەو بەرەو ئەوروپا گەیشتە پۆپەی، کە هەرچەندە، لە سەدەکانی رابردووش (نۆزدەو بیستەم) ڕەو بۆ ئەوروپا هەبووە، بەلاّم زیاتر تاك و تەرا بووە، شوێنی سەرەکی هەر عەشیرەتێك دیارە، بەلاّم هەندێك (بەشێك) لەم عەشیرەتە، شوێنی سەرەکی خۆیان جێهێشتووە، بەرەو شوێنێکی دیکە رەویان کردووە، جا سیاسی بێت کۆمەلاّیەتی، ئابووری، دوژمنایەتی...هتد، هەمیشە لایەنی بێ هێز، شوێنەکەی چۆڵ کردووەو کۆچی کردووە.

هەر هەوڵێك بۆ نووسینەوەی مێژووی هەر پێکهاتەیەکی کۆمەڵگەی کوردستان، ئەو پێکهاتەیە عەشایەری بێت یاخود ئاینی، یاخود هەل و مەرجێکی سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەلایەتی و چینایەتی قۆناغێکی دیاریکراو لە قۆناغەکانی کۆمەڵگەی کوردستان جێگای دەست خۆشییە بۆ ئەوەی نەوەکانی داهاتوو ئاگاداری ڕابردووی کۆمەڵگە و میللەتەکەیان بن، بە تایبەتی بۆ گەلی کوردستان، چونکە زۆرجار مێژووی کورد و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکەی شێوێنراوە، هۆزی شێخ بزێنیش یەکێکە لەو پێکهاتە گەورانەی کە سەنگ و قورسایی سیاسی و کۆمەلاّیەتی و ئەدەبی و شۆڕشگێری لە کۆمەڵگەی کوردستاندا هەبووە و هەیە، بۆیە نووسینەوەی مێژووی هۆزی شێخ بزێنی بە وردەکارییەوە لە ڕووی سیاسی و مێژوویی و کۆمەلاّیەتییەوە گرنگی خۆی هەیە بۆ کۆمەڵگەی کوردستان.

زادگاو شوێنی دانیشتن و بنەرەت و بنچینەی هەر تاکێك لە تاکەکانی ئەم هۆزە لە کۆمەڵگەی کوردەواری بۆ گوند دەگەڕێتەوە، بۆیە گوندەکانی تایبەت بەم هۆزە مەڵبەندی سەرەکین بۆ لەخۆگرتنی هەر تاکێك لە تاکەکانی نێو هۆزی شێخ بزێنی لە کۆمەڵگەی کوردەواری هاوشێوەی هۆزەکانی تر.

لە ولأتانی گەشەسەندوو و خاوەن شارستانیەتدا، ڕێز لە هەموو کەل و پەل و بەرد و دارو درەختەکانیش دەگیرێ، تا وردەوالەی خۆلی بن بەردێکیش لەبیر ناکرێ و پشتگوێ ناخرێ، بۆیە پێشبڕکێ زادەی خۆ دەرخستنە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، بنچینەکەیش لە دێرینی فەلسەفەکان و چێژو ڕۆمانسیەتی شیعرو ڕەسەنایەتیی هونەرو پەرەپێدانی بوارە جیاوازەکانی و سەردەمی دروستبوونی مرۆڤایەتی دەست پێ دەکات، لە قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و سەردوولکە و حیکایەتدا، شیعر لە ناسکی هەست و خۆشەویستی و دەروون پاکیدا هەلدەقولێ، ئاخافتنیش لە ڕێگای گوێگرتن و ڕا گۆڕینەوە و فێربوون لە ئەزموونداکاریگەری دەبێت، هونەریش سامانێکە لە جوانییەکانی هەمەڕەنگی ئاوازو وێنە و ستران و لاوك و حەیران و نەخش و نیگاری داستان و ڕۆمانسیبوون و بەردەوامی و گەشبینی دوا ڕۆژی لێ دەخوێنینەوە و ئەمە هەر هەمووی من لە گوندا دەیبینم.

گوند لانکەی حەوانەوەی ساوایە، باوەشی دایك و شیر مژین و لایلایەی سەرهەلدانی ژیانە، ساویلکەیی و ساوابوونە، متمانە و یاری و خۆشی و جموجۆلی ئاوەدانی پڕ مۆسیقای ناو خێزانە، لانکەکەیش جۆلانەی گەشەکردن و پەرەسەندنە، پەروەردەکردنیش میهرەبانییە، من هەموو ئەو شتانە لە گوندیکدا دەبینم، بۆیە بایەخدان بە گوند واتە گرەو کردن لەسەر پێشکەوتن و فەرامۆشکردنیش واتە فەرامۆشکردنی شارستانیەت.

لە هەموو کاتێکداو لە هەموو شوێنێك عەشیرەت و عەشیرەت گەری هەبووە، و ڕۆلی باش و کاریگەریان گێراوە لە نێو کۆمەلگادا. وە هەر عەشیرەتێکیش خەلکێکی زۆری هەبووەکە بە هەموو توانایانەوە کاری بۆ پێشخستنی عەشیرەتەکەی خۆی کردووە، عەشیرەتەکان ئەگەر چی لە زۆربەی داب و نەریت و لایەنەکانی تری ژیان هاوشێوە بوونە بەلآم لەگەلَ ئەوەشدا هەریەکە خاوەنی چەندەها داب و نەریتی تایبەتن کە بەدرێژایی ژیانیان پارێزگاریان لێی کردووە. هەریەکە لەو عەشیرەتانەش سەرۆکێکی هەیە کە یان بە هەلبژاردن یان بە بۆماوەیی بووە بە سەرۆك. ئەم سەرۆکەش بە یارمەتی و پشتیوانی خەلکی خۆی هاوکاری خەلکی دەکات لەڕووی کێشە کۆمەلآیەتیەکانی وەك کوشتن و ژن هەلگرتن و کۆمەکی کردنی نەخۆش . عەشیرەتی شێخ بزێنیش وەکو هەریەك لە عەشیرەتەکانی تر داب و نەریتی خۆی هەبووە و سیستەمی تایبەتی هەبووە بۆ بەڕێوە بردنی عەشیرەتەکەی خۆی .

لەلای هەموو کەس ئاشکرایە کە ژیانی کۆچەری و گەڕان بە دوای لەوەڕگا و بەرژەوەندییەکانی ژیان زالَ بووە بەسەر ژیانی زۆربەی هۆزو خێلەکان وە لە نێو کورد دا تاوەکو

نیوەی دووەمی هەزارەی دووەم ژیانی کۆچەری هەرمابوو، وە کۆچکردن لە نێو کوردەکان ببو بە نەریتێکی بەردەوام کە پێی دەگوترا کۆچی گەرمیان و کوێستان، عەشیرەتی شێخ بزێنی بە پێی بەدوا داچوونێکی زۆرو لێکۆلینەوەو پرسیارکردن لەو کەسانەی کە لەبارەی شێخ بزێنی شت دەزانن و بە پێی بەلگەی بە هێزو ئاشکرا، عەشیرەتی شێخ بزێنی چەند خێزانێك بوونە کە بە تەقدیر پێش نزیکەی (٤٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا لە ڕۆژهەلاتی کوردستان (کوردستانی ئێران) بوونە لە دەوروبەری ناوچەی (قصر شیرین) ئەم کۆمەلە خێزانە کۆچیان دەست پێ کردووە بەرەو باشووری کوردستانی گەورە واتە بەرەو کوردستانی عێراق هاتون، لە پاش شەری چالدێران بەهۆی ناکۆکی نێوان سولتان سەلیمی یەکەمی عوسمانی و شا عەباسی سەفەوی لە پاش سالانی (١٦٠٠)ەوە، دەستیان بە کۆچکردن کردووە وە ئەمانە کاتێك کە هاتوون لە ماوەی گەشتەکەیاندا لە هەر شوێنێك نیشتەجێ بوبن لە دوایدا هەندێکیان لێ بەجێ ماوە، بەلگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە کە لە ماوەی نێوان سنووری عەشیرەتی شێخ بزێنی و ئەو شوێنەی لێوەی هاتوون کە کوردستانی ئێرانە چەندەها کۆمەلە خەلك دەبینین کە بە خۆیان دەلێن شێخ بزێنی لەو ناوچەیەی کە لێوەی هاتوون بۆ نموونە لە (تلعفر) وە لە (موسلْ) بەلام ئەوانە ئێستا بە عەرەبی قسە دەکەن وە هەروەها لە ناو (عشائر السبعە)ش شێخ بزێنی هەیە، وە کاتێ کە لە بادینان پەریونەتەوە بۆ زێی گەورە واتە لە ناحیەی کەلەك تاوەکو کەورگۆسك لەو بەینە بۆ ماوەیەکی زۆر نیشتەجێ بووە، ئەم کۆمەلە خێزانە، کە دەکرێ بلێین هەموویان دەگەرێنەوە سەر (مەلا ئەحمەدی گەورە) کە باپیرە گەورەی هۆزی شێخ بزێنی یە، مەلا ئەحمەد چوار کوری هەبوو وە هەموو ئاغاکانی عەشیرەتی شێخ بزێنی کوردستانی عێراق دەگەرێنەوە سەر ئەم چوار کورە. دوو کوریان لە شێخ بزێنی (محمود ئاغا و حسن ئاغا) لە دەم زێی گەورە ماونەتەوە، وە ئێستا ناوچەکانیان لە گوندی ( کەورگۆسك و گاینج و شیوەرەش — خرابە دراو — کەلەك — موسلْ — تلعفر)

وەك وتمان کورەکانی مەلا ئەحمەد دوانیان لەسەر زێی بادینان نیشتەجێ بوونە، هەرچی دوو کورەکەی ترە ئەوانە کەناویان (حاجی هەمزەو مەلا عباس)ە، ئەمانە هاتوون لە گوندەکانی کەرکوك و دەورووبەری نیشتەجێ بوون ، پاش ماوەیەکی زۆر، بوونە بەخاوەن چەندەها خێزانی بە هێزو زیرەك وە خزمایەتیان پەیداکردووە لەگەلْ خەلکی ناوچەکە کە ئێستاش لە کەرکوك و دەورووبەری و ناوچەی شوان و ئاغجەلەرو تەق تەق و سێگردکان و گوندو ناوچەکانی کەرکوك دادەنیشن .

شێخ بزێنییەکان دوای ئەوەی دەرفەتی فراوان خوازیان بۆ ڕەخسا لە زێی بچووك پەڕینەوە بۆ بەری کەرکوك، لەبەر ئەوەی شێخ بزێنی یەکانی کوردستانی باکوریش لەسەر زێ بوونە بۆیە هەردەم سەر زێیان پێ خۆش بووە، بۆیە ئەم شوێنەیان هەڵبژاردووە.

لەو سنووورەدا چەندەها گوندی تر هەن خۆیان بە شێخ بزێنی دادەنێن سنوری عەشیرەتی شێخ بزێنی لە ناحیەی پردێ وە دەست پێدەکات بەرەو ڕۆژهەلاّت دەم زێ و دەم زێی بچووك تاوەکو ناحیەی ئاغجەلەر لە بەری کەرکوك، وە چەند گوندێك هەیە دەپەڕێتەوە بەری هەولێر وەکو گوندی سارتك و شەیتان و کانی لەلە وەبە سەدان خێزانی شێخ بزێنی هەن لە هەر یەك لەشارەکانی دهۆك و هەولێر و کەرکوك و سلێمانی نیشتەجێ بوونە بۆ مەبەستی پەیداکردنی بژێوی ژیانیان، یان بە حوکمی وەزیفە لە ناوشار نیشتەجێ بوون. عەشیرەتی شێخ بزێنی سیفەتی تایبەتی خۆیان هەبووە بە گشتی سەخی تەبیعەت بوونە، ڕێزیان لە میوان ناوەو زۆر ئازاو قارەمان بوونە ، خاوەن مزگەوت و حوجرەی فەقێ بوونە، لە هەر گوندێك دیوەخانێکی هەبووە بۆ میوان، خزمەتی پیاوانی ئاینیان زۆر کردووە، لە نێو گوندەکاندا منافەسەیان دەکرد بۆ مەلا باشی، وە هەردەم خەریکی کاسبی بوونە و یەکێ لە کارەکانیان ئەمە بووە کە توانیویانە تفەنگ دروست بکەن کە ناوی تفەنگەکە مارتینی هنری بووە.

**عەشیرەتی شێخ بزێنی لە زۆر شۆڕش بەشداری کردووە لە وانە:**

١-جەنگی جیهانی یەکەم کە چەندەها کەس چوون بۆ بەسرەو شوعێبەو لە دژی ئینگلیز شەڕیان کردووە .

٢-لە شۆڕشی شێخ محمود

٣-لە شۆڕشی ئەیلول

٤-لە شۆڕشی ئازادی خوازی کوردستان

٥-لە ڕاپەرینی بەهاری ساڵی (١٩٩١)

٦-لە ئازادکردنی عێراق بەژداری کردووە . وە هەردەم لانکە بووە بۆ پێشمەرگەی کوردستان.

لە سنوری شێخ بزێنی دا چەند چینێك دادەنیشن وە زۆربەیان خاوەن زەوین وەکو ئاغاکان هەروەها هەندێ گوند هەیە کوێخای هەیە، وە خەڵکێکی زۆری وەك جوتیارو خاوەن پیشە و خاوەن مەڕو ماڵاتن، هەموویان خۆیان بە شێخ بزێنی دادەنێن، هەروەها چەندەها مامۆستاو فەرمانبەری هەیە کە لە دەزگا حکومیەکاندا کار دەکەن، شێخ بزێنی وەکو عەشیرەتەکانی تر خاوەن خەبات و قوربانی بووەو بگرە زیاتریش، بۆ نموونە لە ساڵی (١٩٦٣) وە تاوەکو ئێستا

سێ جار بە گشتی گوندەکانیان تێکدراوە و تالآن کراوە ، لە ساڵی (١٩٨٨) و نزیکەی (٥٠٠٠) مرۆڤی لێ ئەنفال کراوە و زیاتر لە سەدان شەهیدو بزربوی ئەم و ئەولای داوە، بۆیە ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی هیچ بایەخی پێ نەدراوەو قوتابخانەی تێدا دروست نەکراوەو بۆیە ڕێژەی نەخوێندەواری زۆرە، وە شێخ بزێنی لەگەڵ عەشیرەتی (شوان و ساڵەیی و هەمەوەندو گەردی و خۆشناو وزراری و گۆران و بیبانی و میران بەگ و غەفوری و کۆیی و تاڵەبانی و مزوری و جاف....هتد) خزمایەتی و دۆستایەتیان هەیەو هاتوچۆی یەکتر دەکەن لە خۆشی و ناخۆشی و لە لێقەوماندا بە بانگی یەکتریەوە دەچن، سنووری شێخ بزێنی لە ڕۆژهەڵآت لە قەڵا سێوکە دەگەڕێتەوە لە باشوورەوە لە شوان دەگەڕێتەوە باکوری زێی بچووك و ڕۆژئاوای ساڵەیی یە، لە سنووری شێخ بزێنی دا خاکێکی بە پیت و بەرەکەت هەیە، بۆیە زۆربەی خەڵکەکەی پشتیان بە کشتوکاڵ و مەڕو ماڵآت بە خێوکردن بەستووە .

## کوردستان

*ناوی ڕەسمی: کوردستان.

*ژمارەی دانیشتوانی: (٤٤,٩٥٠,٠٠٠) ملیۆن کەسەو دابەشی سەر چوار دەوڵەت نیوو کراوە.

*ڕووبەری: (٣١٢,٦١٦) میل چوارگۆشە و (٥١٧,٠٠٠) هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.کە (٢١٢٠٠٠) هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە بە تورکیا لکێندراوە، (١٩٥٠٠٠) هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، بە ئێران لکێندراوە، (٨٤٠٠٠) هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە بە ئێراق لکێندراوە، (١٧٠٠٠) هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە بە سوریا لکێندراوە، (١٧٠٠٠) هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە بە کۆماری ئەرمینیا لکێندراوە.

*چڕی دانیشتوانی: ١٣٦ کەس لە یەك میل چوارگۆشەدا .

*بەندەرە گرنگەکانی: ئەسکەندەرۆنە یەکەم دەرگای دەریایی یە لە کوردستانی گەورەو کەوتۆتە ڕۆژئاوای کوردستان.

*گەشەی دانیشتوانی : ٢,٤٪

*زمانەکانی: کوردی ٩٠٪ تورکی و ئاشوری و ئەرمەنی١٠٪

*نژادەکانی: کوردی ئاری، ئەرمەن و تورك و ئاشوری ، بونی تورك و عەرەب لە کوردستان بە هۆی داگیرکردن و فتوحاتی ئیسلامی بووە لە هەموو بوارەکاندا.

ئاینەکانی: ئیسلام، مەسیحی، ئێزیدی، زەردەشتی.




**شارە سەرەکییەکان/ پایەی شارنشینیەتی لە پارێزگایەکاندا ١٩٨٥:**

| پارێزگا | دانیشتوان هەزار | شارنشین | | گوندنشین | | پارێزگا | دانیشتوان هەزار | شارنشین | | گوندنشین | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | هەزار | ٪ | هەزار | ٪ | | | هەزار | ٪ | هەزار | ٪ |
| ئادیەمان | ٤٣١ | ١٥١ | ٣٥,١ | ٢٨٠ | ٦٤,٩ | دەرسیم | ١٥٢ | ٤٣ | ٢٨,٤ | ١٠٩ | ٧١,٦ |
| ئاگری | ٤٢١ | ١٤٢ | ٣٣,٧ | ٢٧٩ | ٦٦,٣ | ئورفە | ٧٩٥ | ٤٠١ | ٥٠,٥ | ٣٩٤ | ٤٩,٥ |
| بینگۆل | ٢٤٢ | ٦٢ | ٢٥,٣ | ١٨٠ | ٧٤,٧ | وان | ٥٤٧ | ١٨٩ | ٣٤,٦ | ٣٥٨ | ٦٥,٤ |
| بەدلیس | ٣٠١ | ١٢٠ | ٣٩,٨ | ١٨١ | ٦٠,٢ | ئازربایجانی | ١٩٧٢ | ٩٠٣ | ٤٥,٨ | ١٠٦٩ | ٥٤,٢ |
| دیاربەکر | ٩٣٥ | ٤٧٢ | ٥٠,٥ | ٤٦٢ | ٤٩,٥ | کرماشان | ١٤٦٣ | ٨٢٢ | ٥٦,٢ | ٦٤١ | ٤٣,٨ |
| ئەلازیغ | ٤٨٤ | ٢٣٤ | ٤٨,٣ | ٢٥٠ | ٥١,٧ | کوردستان | ١٠٧٨ | ٤٢٨ | ٣٩,٧ | ٦٥٠ | ٦٠,٣ |

| | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەرزنجان | ٣٠٠ | ١١٢ | ٣٧,٤ | ١٨٨ | ٦٢,٦ | بەختیاری | ٦٣١ | ٣٢٩ | ٣٦,٣ | ٤٠٢ | ٦٣,٤ |
| ئەرزڕۆم | ٦٣٤ | ٣١١ | ٤٩,٠ | ٣٢٣ | ٥١,٠ | لورستان | ١٣٦٧ | ٦٣٩ | ٤٦,٧ | ٧٢٨ | ٥٢,٢ |
| گازی ئانتەپ | ٩٦٦ | ٦٤٣ | ٦٦,٥ | ٣٢٣ | ٣٣,٥ | ئیلام | ٣٨٢ | ١٥٧ | ٤١,١ | ٢٢٥ | ٥٩,٠ |
| هەکاری | ١٨٣ | ٥٦ | ٣٠,٤ | ١٢٧ | ٦٩,٦ | کوهگیلویە | ٤١٢ | ١١١ | ٢٦,٩ | ٢٠١ | ٧٣,١ |
| مەلاتیە | ٦٦٦ | ٣٠٨ | ٤٦,٢ | ٣٥٨ | ٥٣,٨ | نەینەوا | ١٢٣٠ | ٩٤٨ | ٧١,٣ | ٣٨٢ | ٢٨,٧ |
| مەرعەش | ٦٣٩ | ٢٩٤ | ٤٦,٠ | ٣٤٥ | ٥٤,٠ | کەرکوک | ٦٠١ | ٤٥٣ | ٧٥,٤ | ١٤٨ | ٢٤,٦ |
| ماردین | ٦٥٢ | ٢٤٤ | ٣٧,٤ | ٤٠٨ | ٦٢,٦ | دهۆک | ٢٩٣ | ٢١٩ | ٧٤,٦ | ٧٤ | ٢٥,٤ |
| موش | ٣٣٩ | ٧٨ | ٢٣,١ | ٢٦١ | ٧٦,٩ | هەولێر | ٧٧٠ | ٥٩٦ | ٧٧,٤ | ١٧٤ | ٢٢,٦ |
| سێرت | ٥٢٥ | ٢٣٧ | ٤٥,٢ | ٢٨٨ | ٥٤,٨ | سلێمانی | ٩٥٢ | ٦٨١ | ٧١,٥ | ٢٧١ | ٢٨,٥ |

*زانین و خوێندن و نووسین:٧٥٪

*دابەشی کارگێڕی: ٣٣پارێزگایە+ ١٩٥قەزا+ ٥٨٦ ناحیە.

*زەوی کشتوکاڵی: ٣٠,٥٪ لە خاکی کوردستان.

*بەرهەمی کشتوکاڵی: گەنم، جۆ، نیسك ونۆك، توتن، برنج، گیز، هەنگوین، گوێز، گولەبەرۆژە، "گەنمەشامی" تەڕە بەهەموو جۆرەکانی، میوەجات بەهەموو جۆرەکانی، چەندین جۆری دیکەی بەرهەمی خۆرسکی و بەرهەمی کشتوکاڵی هەیە لەشاخەکان.

*سامانی ئاژەڵی: مەڕ١٨,٥٠٠ ملیۆن سەر، بزن١٢,٧٠٠ ملیۆن سەر، چێڵ وگامێش ٥,٦٥٠ ملیۆن سەر، پەلەوەر٢٩,٨٥٠ ملیۆن سەر.

*سامانی سروشتی: نەوت، غازی سروشتی، فۆسفات، کبریت، ئاسن، مەڕمەڕ، بەردی چەوی، یۆرانیۆم، چاوگەکانی ئاوی کبریتی، چەندین جۆری سامانی دیکەی تیایە لە ژێر خاك و هەمووی زەوت کراوە یاخود ناتوانرێ دەربهێنرێت بە هۆی بارو دۆخی کوردستان وولاتانی دروستکراو لە سەر خاکی کوردستان.

*پیشەسازی: پالاوتنی نەوت، پالاوتنی غاز، چیمەنتۆ، مەڕمەڕ، ڕستن و چنین، جل و بەرگی خۆمالی و کارگەیی،"خۆمالی واتە ڕانك و چۆخە" پێلاوی خۆمالی" کلاشی پەڕۆین"، فۆسفات وکبریت، دۆشاو، گەشت وگوزار.

*بەرهەمی کارەبا: ٣٥,٦٠٠ملیار کیلۆ وات کاتژمێر.

*ئالوگۆڕی دراو: کوردستان بەهۆی دابەش بوونی بەسەر چوار ولاتی دژ بە یەکتری لەهەموو لایەنەکەوە تەنیا لەسەر کێشەی کورد کۆکن لەبەر ئەو هۆیە دراوی ئەو ولاتانەی کە پێی لکێنراون بەکاری دێنن وەك" دیناری ئێراقی و، توومەنی ئێرانی و، لیرەی تورکی وسووری و دۆلارو یۆرۆ".

-ڕژێمی دەسەلات: کوردو نیشتمانی خاوەنی دەسەلاتی تایبەت بەخۆیان نەبوونە بە هۆی دابەشکراوی بە سەر چوار دەولەتی شۆفێنی ڕەگەزپەرستی و بەکارهێنانی هەمووجۆرە کارێکی نامرۆڤایەتی و هەرکارێکی کە لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بێت... سەرەڕای ئەوە کورد هەولی داوە بە دامەزراندنی دەسەلاتی تایبەت بە خۆی لەوانە دەسەلاتی شێخ مەحمود... کۆماری کوردستان لە شاری مەهابادو دوایی... دەسەلاتی کوردی لە باشوری کوردستان لەدوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ١٩٩١ تاکو ئێستاش خاوەنی دەسەلاتی خۆیەتی بە بوونی پەرلەمانی کوردستان بە "١١١" ئەندام و ئەنجومەنی وەزیران بوونی پەیوەندی بە جۆرێکی نیمچە ڕەسمی لەگەل وولاتانی جیهانی لە بواردکانی ڕامیاریو ئابووریو ڕۆشنبیری. ئەو خالەش لەناوەڕۆکی مێژوی کوردستان ڕوون کراوەتەوە لەهەموو لایەنە جۆراوجۆرەکان.

جوگرافیای کوردستان: (( شوێنگەی ولات بەگوێرەی تۆڕی هێلەکانی درێژی و پانی، کوردستان لە نێوان پانی ٣٩,٤٠ی باکوورو٣٠,٦١ی باکوور(واتا ٩,٧٨هێل)و لە نێوان هێلی ٥٢,٦١ی ڕۆژهەلات و ٣٦,٠٠ ڕۆژهەلاتدا(١٦,٦١ هێل) ڕاکشاوە، درێژایی خاکی کوردستان لە باکوورەوە تاکو باشوور نزیکەی ١٣٠٠ کیلۆمەترە.. پانایییەکەشی لە ڕۆژهەلاتەوە بۆ ڕۆژئاوا خۆی لە ٥٠ کیلۆمەتر دەدات، ئەو پانییە لەهەموو لایەکەوە وەکو یەك نییە، لەلای

باکورەوە پانایەکەی دەگاتە ٥٧٨ کیلۆمەترو لە ناوەراستدا کەم دەبێتەوە تا دەگاتە ٢٣٢کم، هەتا بەرەو باشووریش برۆین ئەو پانایە تەسکتر دەبێتەوە لە بەشی کۆتایی باشووردا کەلە (١١٢کم) زیاتر نابێ[١].

کورد گەلێکە لە گەلەکانی باشووری رۆژئاوای ئاسیا.[٢] ئەم گەلە لە دەوروبەری هەزارەی سێیەمی (پ.ز) لە جوگرافیای کوردستان بە ناوی (گوتی) یان (گوتو)یان (گوتی) بە دەرکەوت. کە ئەمیش لەگەڵ بوونی میرنشینی گوتیام لە سەرەتای سەدەی (٢٤)ی پ.ز دەرکەوت، کە ئەمرۆکە کوردستانەو، بە یەکەمین دەوڵەتی کوردی لە مێژوودا دادەنرێت، ئەو کاتەش سۆمەریەکان وا وەسفیان کردووە، کە میرنشینێکی سەربەخۆیە هەر وەکو هەردوو میرنشینەکانی (سۆبارتۆ) و (عیلام).[٣]

گوتییەکان=شەرکەرەکان (warriors)[٤] باپیرە گەورەی کوردەکانی ئیستان،[٥](گوتی)ش ناوێکە سۆمەریەکان ناویان ناون ،لە کاتێکدا ئاشووریەکان بە (کاردۆ)ناویان بردووە [٦]. دەربارەی سنووری میرنشینەکەش، ئەوا لە زێی سەروو لە باکوور درێژ دەبۆوە تاوەکو رووباری سیروان (دیالە) لە باشوورو، لە رووباری (دیجلە) لە رۆژئاوا تاکو چیای سلێمانی لە رۆژهەلات، پایتەختەکەشیان شاری کەرکووك بوو، کە ئەو کات بە ناوی (عەرفە)(Arrapha) ناسراو بوو ، هەر وەکو (سندنی سمیپ)ئاماژەی بۆ کردووە،[٧] یاخۆد بە

---

[١] - د. عەبدوڵلا غەفور، جوگرافیای کوردستان، دەزگای چاپ و بلاۆکردنەوەی موکریانی، کوردستان، ٢٠٠٠.

[٢] - كونتر دشنر ، أحفاد صلاح الدين ، ترجمة عبدالسلام مصطفى صيدق ، اربيل بدون سنة طبع ، ص ٥٦.

[٣] - Arshak Safrastion kuras and Kurdistan The har will press London ١٩٤٨

[٤] - London HJHJHForeign office, Armenia and Kurdistan,١٩٢٠, P.٤ .

[٥] - لەمرۆوە هیچ گفتوگۆیەك لە بارەی ئەم مەسەلەوە ناكرێت ،چونكە دەیەها سەرچاوە و كتێب ئەمەیان دوویات كردۆتەوە.

[٦] - Major H.M.Burton.The kuds R.C.A.S . Vol . xxxl. part , January ,١٩٩٤,p.١٨.

[٧] Sydny smith , Early History of Assyri to١٠٠٠ B.C.,Chatto & windus London , ١٩٢٦. Pp .٨٨ ,١٩١ -٢٣٠ .

ناوی (ئەرەبخا Arrapkha) ناوی هاتووە، هەر وەکو لە مێژووی کامبرج هاتووە.[١] کە ئەمیش یەکەمین پایتەختی کوردستانە لە مێژووی کۆندا لە سەرەتاکانی هەزارەی دووەمی (پ.ز)کۆچکردنەکانی هیندۆ — ئەوروپییەکان ڕوویدا ، میدییەکان (Medes) لە چیاکانی زاگرۆس (کوردستان) جێگربوون و دواتر بە درێژایی کات لەگەڵ گوتییەکان بە تەواوەتی تێکەل بوون، بەم جۆرە گوتییەکان خوێن و زمانیان لە میدییەکان وەرگرت وبە یەکەوە ئیمپراتۆریەتی میدییان پێکهێنا[٢] ڕەنگە هێرشی ئاشوورییەکان بۆ سەر زاگرۆس بۆ چەند جارێك ، پەیوەندی بە هۆکاری گواستنەوەی پایتەختەکەوە بێت ، بە جۆرێك (عەرەفە) خۆی لە ماوەی چەند سەردەمێکدا تووشی داگیرکاری ئاشوورییەکان بۆتەوە . ئەمەش وای لە (کەی خسرۆ)ی پاشای میدییەکان کرد ، هاوپەیمانیەتی لەگەڵ (نبوبلاسر)ی پاشای بابلیەکان ببەستێت بۆ هەلگیرساندنی جەنگێکی یەکلایکەرەوە بۆ لە ناوبردنی ئاشوورییەکان (٦١٧-٦١٢ پ.ز) یەکەمین جار بیریان لە هێرش کردنە سەر ڕزگار کردنی ناوەراستی عەرەفە (کەرکوك) کردەوە دژ بە داگیر کەری ئاشوورییەکان و دووبارە گەرانەوەی زەوییەکانە بۆ سەر ئیمپراتۆریەتی میدی — کوردی [٣] ، پاش ئازاد کردنی (عەرفە) و کۆتاییهێنانی ئاشوورییەکان، پایتەخت لە (عەرفە)وە بۆ ئەکباتان (هەمەدان) گواسترایەوە[٤]. دوای لە ناوبردنی ئیمپراتۆریەتی میدی لە ساڵی (٥٥٠پ.ز) بە دەستی (کۆرش ئەخمینی) ، کوردستان هەروەکو هەموو هەرێمەکانی دەوروبەری خۆی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ کەوتە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەرەکانی دەوروبەری. لە ساڵی (٣٣١پ.ز) کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەسکەندەری مەکدۆنی (دوابەدوای شکانی داریوش لە جەنگی ئەربیلا)، دواتر لە ساڵی (٣٢٣ پ . ز) ئەسکەندەری

---

ناوی (عەرفە) تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت بە کاردەهێنرێت و ، ئێستا بە کەرەکی (کرێکاران) دەوترێت، ئەو گەڕەکەی کەوا کۆمپانیای نەوتی عیراقی لە کەرکوك بونیادی ناوە.

[١] The combridge Ancient History , Vol. III, The Assyrian Empire, The University press , ١٩٢٥,pp ٣٤,٧٠,١٢٨ .٢٢٣.

[٢]- بگەرێوە سەر کتێبی : فواد حمە خۆرشید ، اصل الکورد ، الفصل الاول ، بغداد ،٢٠٠٣ .

[٣]- C.J. Edmands , op. cit, p ٢٨٩.

[٤]- ئیمپراتۆریەتی میدی لە دەوروبەری (٧٠٠) ساڵ پ.ز دامەزراوەو، حوکمەکەی (١٥٠) ساڵ بەردەوام بوو ساڵی (٥٥٠) پ.ز ڕووخێنرا، بۆ درێژەی مێژووی میدیەکان بڕوانە: herodtus,the history pengum book,١٩٧٤.

مەکدۆنی بەهۆی نەخۆشی مەلاریا کۆچی دوای کرد ، کوردستان بووە بەشی سلۆقس (دەوڵەتی سلۆقییەکان ۳۲۳ – ۱۲۹پ.ز) هەروەها دواتر کوردستان کەوتە ژێر دەستی پارسەکان (۲٤۷- ۲۲٦ پ.ز)، ساسانییەکان (۲۲٦ پ.ز- ٦۳٦ز ) لە سەردەمی ئیسلامیشدا گەلی کورد هەروەکو گەلەکانی دیکە موسلمان کەوتە ژێر دەسەلاتی ئیسلام (٦۳٦- ۱۲٥۷ ز )[١]. هەروەها لە سەرەتای سەدەی (۱٦) لە کاتی دەرکەوتنی دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانیەکان ، کوردستان شێوازێکی تەواو جوگرافی و مرۆڤایەتی و ناسنامەی شارستانیەتی کوردی بەدەست هێنا لە چوارچێوەی هەرێمەکە (( کە لە چیاکانی ئارارات درێژ دەبۆوە و سنوری جۆرجیا لە باکوور تاکو ناوچەکانی نزیك بەغدا لە باشوور و وولاتی فارس لە رۆژهەلاتی تاکو لازستان لە رۆژئاواوە))[٢] ، لەبەر ئەوەی عیراق ئەوساکە هەروەکو (ابن حوقل) دووباتی کردتەوە، کە: (( لە رووی درێژییەوە لە تکریتەوە تاکو عەبادانە ، لە پانیشەوە لە قادسییەوە لە سەر کوفەو بەغدا تاکو حەلوان))[٣] ، لە سەدەکانی (۱۷) و (۱۸) بە هۆی ململانێی نێوان عوسمانیەکان — سەفەویەکان، کوردستان بوو قەڵایەکی داخراو ، بە جۆرێك کە سنوری نێوان ئیمپراتۆریەتیەکانیان لە ناو زەوییەکانی کوردستان لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا جوولەی دەکرد ، یاخۆد لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەلات ، واتە بە گوێرەی رێرەوی شەرو جەنگەکان لە نێوانیاندا بە چ ئاراستەیەك دەرۆیشت، هەروەها بە گوێرەی ئەو پەیمانانەی لە نیوانیان دەبەسترا کە لە پەیماننامەی (زەهاو ۱٦۳۹) دەستی پێ کردووە ، پەیماننامە و رێککەوتنەکانی داواتریش (هەمەدان ۱۷۲۷) و (قوستەنتینییە۱۷٤٦) و (ئەرزەرۆمی یەکەم ۱۸۲۳)و (ئەرزە رۆمی دووەم ۱۸۲۷) و رێکەوتنی ساڵی (۱۹۱٤)[٤] کە لە ئەنجامدا نەخشەی سنووری جیاکەرەوەی نێوان هەردوو دەوڵەتەکە کێشرا ، بۆ یەکەم جار کوردستان بە سەر دووبەش دابەش کرا ، بۆ ئیران و رۆژئاوا بۆ ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانی.

١- The Encyclo paedia of Islam Volii,Leyden, London, ۱۹۲۷ , p. ۱۰۲۷.

٢- Major Fredrick Millingen ,wild hifc among the kurds , London, ۱۸۷۰ ,p. ۱٤٦.

٣- ابن حوقل ، صورة الارض، دار مكتبة الحياة، بيروت، ص ۲۰۸.

٤- C.J. Edmond ,The Iraq – persion Frontier ۱٦۳٦ -۱۹۳۸, Asian Affairs , Vol. ٦۲ , part۲, June ۱۹۷٥.

لە سەردەمی سوڵتان قانونی لە ساڵی (١٥٢٤) کوردستانی باشوور (کوردستانی عێراق) و وڵاتی نێوان دوو ڕووبار ، کەوتنە ژێر ڕکێفی عوسمانیەکان ، بەڵام عوسمانیەکان لە ساڵی (١٦٣٨) لە سەردەمی سوڵتان مورادی چوارەم بە شێوەیەکی کۆتایی ناوچەکەیان داگیر کرد و ناوچەکانیشیان بە سەر سێ ویلایەت دابەش کرد ، ئەوانیش ویلایەتی موسڵ ،ویلایەتی بەغدا و ویلایەتی کەرکووك (کە ئەو کات بە ناوی شارەزوور دەناسرا ). لە ساڵی (١٨٧٩) ویلایەتی موسڵ بووە بە ویلایەتێکی سەربەخۆ و سێ سەنجقی لە خۆوە دەگرێت ، ئەوانیش: سەنجقی کەرکووك ، سەنجقی سلێمانی و سەنجقی موسڵ[١] .

دوای جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤- ١٩١٨) دەوڵەتی عوسمانی ون بوو ، بۆ ڕزگارکردنی ئەم دەوڵەتەش ، بە کرداری سیاسەتی بەریتانی – فەرنسی چەند دەوڵەتێکی نوێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست دەرکەوتن لەوانە دەوڵەتی عێراق ، کە بەریتانیا لە ساڵی (١٩٢١) پێکی هێنا ، ئەمیش بە خستنە پاڵ یەکتری سێ ویلایەتی پێشووی عوسمانی (موسڵ و بەغدا و بەسرا) دروست بوو، بەم جۆرە کوردستانی عێراق چووە پاڵ دەوڵەتی ئێستای عێراق.

دەبێ ئەوەش بوترێ کە ویلایەتی موسڵ (کوردستانی باشوور) مەسەلەی خستنە سەر عێراق یەکلایی نەبۆوە، تا کۆنگرەی لۆزان (١٩٢٢- ١٩٢٣) هەرەسی هێنا کە لە نێوان بەریتانیا (کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا و عێراقی بەیەکەوە دەرکرد) و تورکیا لە بارەی ئەم ویلایەتەوە سازکرا، بۆیە لە ساڵی (١٩٢٤) بابەتی ئەم ویلایەتەیان ڕەوانەی لیژنەیەکی تایبەت سەر بە کۆمەڵەی نەتەوەکان کرد، ئەنجومەنی کۆمەڵەکەش هەر لەم ساڵەدا پێشنیازی کێشانی (هێڵی بڕۆکسل)ی[٢] کرد، بۆیە لە (٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٦) هەریەك لە بەریتانیا و تورکیا و عێراق لەسەر کێشانی ئەم هێڵە ڕێککەوتوون ، کە بە

---

[١]- League of Nation Question of The Frontier between Turkey and Iraq, ١٩٢٤, pp.٥٩ -٦٠

[٢]-(هێڵی بڕۆکسل) : لەو کاتەی کێشەکە ڕەوانەی ئەنجوومەنی کۆمەڵەکە کرا ، ئەوەبوو ئەنجوومەنی کۆمەڵەکە لیژنەیەکی بە سەرۆکایەتی(برانتنك Barnting) پێك هێناو لە تشرینی یەکەمی (١٩٢٤) لە شاری بڕۆکسل نەخشەی سنوورەکە کێشرا ، هەر بۆیەش ناوی(هێڵی بڕۆکسل) ی لێنرا ، کەوا هەندێ دەستکاری لەگەڵ سنووری ویلایەتی موسڵی باکوور کرد . بڕوانە :
Major H. l. Lioyd , the Geography of the mosul boundry Geographjcal journal, Vol. Lxviii , No .٢,August, ١٩٢٦.

هێڵێكی سیاسی نێوان توركیا و عیراق دانرا .[1] تا بەم جۆرە لە ساڵی (١٩٢٦) كوردستانی باشوور (ولایەتی موسل ) بە یەكجاری لە توركیا جودا كرایەوە و بووە بە شێك لە عیراق .

سەرباری ئەو هەموو گۆڕانكارییە سیاسی و گۆڕانكارییە كارگێڕییەكان، كەچی شارستانیەتی كورد لە كوردستان بە شێویەكی گشتی مایەوەو بەردەوام بوو كە ئەمەش گیرو گرفتێكی گەورەی لە نێوان لێكۆڵەران و نوسەران نایەوە ، بە جۆرێك هەندێكیان ئاماژەیان بۆ ئەوە كردووە ، كە زۆر بە دەگمەن گەلێكی گەورە لە مێژوودا دەدۆزینەوە ، كەوا پارێزگاری لە خۆی كردبێت هەروەكو كورد ، كە بە درێژایی سەردەمەكان پارێزگاری لە خۆی كردووە[2] هەموو ئەو ئیمراتۆریەتانەی كەلە دەووروبەری كوردستان سەریان هەڵداو لە نێو چوون و هەموو ئەو داگیركەرانەی كە لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوا ئاگریان تێ بەردا و كاولیان كرد، یاخۆد لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات، هەر هەموویان لە ڕاكێشانی كوردەكان بۆ لای خۆیان سەركەوتنیان بە دەست نەهێنا، یاخود نەیانتوانی شارستانیەتی خۆیان بە سەر شارستانیەتەكەیان بسەپێنن، ئاشووری و یۆنانی و ڕۆم و پارس و فارس و عەرەب ومەغۆل و توركەكان ، هەر هەموویان هەوڵیاندا ، بەڵام لە ملكەچكردنی ئەم گەلە چیاییە تێكشكان و سەرنەكەوتن ،[3] بە درێژایی نزیكەی (٥) هەزار ساڵ ((گەلی كوردی تێكۆشەر دەژیت ، پشت بەخواو بەخۆ، پارێزگاری لە خۆشەویستی ئازادی كردووە، تائێستاشی لەگەڵ دابێ ئەم گەلەی هیندۆ ئەورووپی لە پێناو ئازادییەكەی خۆی لەگەڵ هەر یەكە لە سۆمەرییەكان و ئاشووری و فارس و مەغۆل و خاچ پەرست و توركەكان جەنگاوە))[4].

نەتەوەی كورد ، هەروەكو هەر نەتەوەیەكی تر ، بە درێژایی مێژوو هەوڵی یەكێتی و ئاواتی سەركەوتنی خۆی داوە، كەوا شارستانیەت و ڕۆشنبیریەكەی لە گوتی و میدیەكانەوە هاتۆتە خوارەوە ، هەروەكو پرۆفیسۆر (ڕەمەزانی) ئاماژەی بۆ ئەوە كردووە و وا دادەنێت، كە

---

[1] - بۆ زیاتر شارەزابوون لە بارەی بابەتی سنووری عیراق – توركیا بروانە:

Reflections on the mosul problem, J.R.C.A, Vol, XIII, part iv. October, ١٩٢٦ , pp. ٣٣٥ – ٣٦٤.

[2] - كتاب : شركة نفط العراق المحدودة والشركات المتحدة معها، ط ١ ، المطبعة الكاثوليكية، بيروت، ١٩٤٩ ، ص ١٥٩.

[3] - Major H.M.Burton, The kurds ,R.C.A.S,Vol .xxxl, part I ,١٩٤٤,p٧٢.

[4] - Comptons pictured Encyclopedia ,Chicago,١٩٦٢, p. ٨٠.

کوردەکان ((یەك نەتەوەی یەکگرتوونە،یەك نیشتمان و یەك زمانی هەیە، خاوەنی پێشکەوتنی مێژوویی و پەیوەندی ئابووری ناخۆیی خۆیەتی، هەروەها خاوەنی شارستانیەتێك و هەستێکی نەتەوەییە))[1]، ئەگەر مرۆڤیش پێشتر هەستی بەم ڕاستییانە کردبێت یاخود نەکردبێت، ئەوا بزوتنەوەی نەتەوەی کورد بە شێوەیەکی تەواو لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، ڕێگای خەباتی بڕیوە،[2] نەتەوەی کورد، نەتەوەیەکی سەربەخۆیە و بە هیچ شێوەیەك بەشێك نییە لە هەر نەتەوەیەکی تر، یەکێکە لە نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست، ئەم نەتەوەیەش هەست بە بوونی هەموو پرانسیپەکانی نەتەوە سەربەخۆکانی دەکات .

کوردستانیش بە سنوورە جوگرافیەکەی خۆی، ڕووبەرەکەی (٥٠٠) هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، کە ئەمەش نیشتمانی نەتەوەیی ئەم نەتەوە ڕەسەنەیە. لەوکاتەی کە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆتە نیشتمانی گەلە ڕەسەنەکان و ئەو گەلانەی ئێستا تێیدا دەژین لە کورد و فارس و عەرەب و تورك (ئاری ، سامی ، تورانی )و ئەوانی تر، مێژووی ناوەراستی نوێ هیچ بەڵگەیەکی نەخستۆتە ڕوو لە بارەی ئەوەی کە گەلی کورد هەوڵی فراونکردن و داگیرگاری خۆی دابێت لەسەر حیسابی نیشتمانی گەلەکانی چوار دەورو نزیکی خۆی ، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەو کات و ئێستاشی لەگەڵدا بێت ، ئەو حکومەتە نەتەوەییانەی کە لەگەڵ کوردستان هاوسنورن، ڕێگەیەکی دوژمنکاری ڕەگەز پەرستی دەکێشن بۆ تەعریب کردن و تەفریسکردن و تەتریککردنی سنووری نیشتمانی کورد.

بە کورتی لە ئەنجامدا دەتوانین ئەوە دەست نیشان بکەین و بسەلمێنین، کە کورد لە نیشتمانی گەورەیان کوردستان بە شێوەیەکی گشتی هەبوو، پێش (٤) هەزار ساڵ لە کۆچکردنی تورکەکان لە ناوەراستی ئاسیاوە بۆ ئەنەدۆڵ،[3] پێش (٢٥٠٠) ساڵ لە دەرچوونی عەرەبەکان لە یەمەنەوە بۆ دەوروبەری باکووری نیمچە دورگەی عەرەبی و[4] پێش (١٠٠٠)ساڵ لە هاتنی فارسەکان بۆ ئێران[5] .

---

[1] Rouhollah K.Ramazani, (The Northern Tier), Princeton , ١٩٦٦ ,p ٣٦.-

[2] Rouhollah K.Ramazani ,op. cit, p.٣٦.-

[3]- تورکەکان لە ساڵی (١٠٧١ ز) گەیشتنە ئەنەدۆڵ دوابە دوای جەنگەکەیان لەگەڵ بیزەنتینییەکان.

[4]- لە دەوروبەری (٥٠٠ ساڵ پ ز) عەرەبەکان لە یەمەنەوە کۆچیان کرد.

[5] - فارسەکان لە دەوروبەری ( ٢٠٠٠ ساڵ پ .ز )گەیشتونەتە ئێران (وولاتی فارس).

## خێڵ چی یه ؟ پێناسه‌یه‌کی خێڵ :

خێڵ له کۆندا یه‌که‌یه‌کی کۆمه‌لایه‌تیی سیاسیی بووه، هه‌ستی به‌جۆشی ده‌مارگیری (تعصب) بۆ خێڵ تاکه‌کانی خێڵی پێکه‌وه گرێ داوه. هه‌ر ئه‌م ده‌مارگیریه‌شه بۆیان بووه‌ته سه‌رچاوه‌ی هێز، توانای مانه‌وه و به‌رگری پێ به‌خشیون. ته‌واو نه‌ته‌وه ئارییه‌کان سه‌ره‌تا، له‌سه‌دان خێڵی خاوه‌نی بروا ،ئاین ، شێوه‌زارو زمانی جیاواز پێك هاتبوون. وه‌ك گه‌لێك له‌سه‌رچاوه مێژوویه‌کان باس ده‌که‌ن، له‌باکوری ئه‌وروپاوه رووه‌و باشور ره‌ویان کردووه. کوردیش کۆمه‌لێك خێڵ بووه له‌نێو ئه‌م سه‌دان خێله‌دا و له‌نیشتمانی ئیستایدا گیرساوه‌ته‌وه .

خێڵ له‌کۆمه‌ڵه خه‌لکانێك پێك دێت که په‌یوه‌ندیی خوێن ، واته خزمایه‌تی له‌گه‌ڵ یه‌کدا کۆی کردوونه‌ته‌وه. به‌رده‌وام به‌هۆی هاوسه‌رگیری له‌نێوان خۆیاندا ئه‌م خزمایه‌تییه نوێ و پته‌وتر ده‌کرێت. ئه‌مانه به‌زۆری، له‌بنه‌چه‌دا باپیره گه‌وره‌کییان هه‌بووه‌و هه‌موو له‌وه‌وه که‌وتوونه‌ته‌وه. پاشان لکیان لێ جودا بووه‌ته‌وه. کاتێك تاکێکی خێڵ ژن له‌خێلێکی دیکه ده‌خوازێت، ئه‌وا منداڵه‌کانی پاشناوی خێڵی پیاوه‌که هه‌ڵده‌گرن نه‌ك ژنه‌که. هه‌ندێك جاران که‌سانی بێ پشت و په‌ناش خۆیان به‌نێو خێلێکی به‌هێزدا کردووه تاکو بیان پارێزێت و له‌سایه‌یدا هه‌ست به‌پشت و په‌نا بکه‌ن .

ئه‌ندامانی خێڵ سۆزبه‌ندییان له ناودا هه‌یه و ده‌مارگیرییان بۆ هۆزه‌که‌یان به‌هێزه . واته به‌ته‌نگ ئێش و ئازاری یه‌که‌وه‌ن. سوورن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی له‌سه‌ر یه‌کدی هه‌ڵبده‌نێ و به‌ده‌سته‌جه‌معی خۆیان له‌هێرشی هێرشبه‌ران بپارێزن. به‌شێوه‌زار. یان زمانێکی هاوبه‌ش ده‌دوێن. خاوه‌نی کولتوورێکی ناوکۆیین ، که به‌ته‌نگیه‌وه‌ن، پارێزگاری لێ ده‌که‌ن و په‌یره‌وه‌ی ده‌که‌ن. به‌تێپه‌ربوونی زه‌مانه‌ش ئه‌م خێڵانه لکی نوێیان لێ بووه‌ته‌وه .

کاتێك توێژه‌رێکی رۆژئاوایی کۆمه‌لگه‌یه‌ك به‌خێڵه‌کی پێناسه ده‌کات. مه‌به‌ستی ئه‌وه‌یه بڵێت: هێشتا نه‌گه‌یشتووه‌ته ئه‌و ئاسته‌ی پێی بوترێت گه‌ل یان میلله‌ت و نه‌ته‌وه. به‌ڵام له‌کن ئێمه‌ی کورد و گه‌لانی دیکه، هێشتا خێڵ جێی شانازییه خه‌لکی پێیان شه‌رم نییه خۆیان بده‌نه پاڵ خێڵ .

وه نه‌بێت خێڵ دیارییه‌کی تایبه‌ت به‌کورد بێت. به‌ڵکو ئه‌م ئه‌وروپا پێشکه‌وتووه‌ی ئێستا سه‌رده‌مانێك جێگه‌ی ململانێی ده‌یان خێڵی جه‌ربه‌زه‌ی جێ به‌خۆ نه‌گرتووی چه‌کداری وه‌ك ئیگلۆسه‌کسۆن و کیلتی و ڤیکینگ بووه. به‌ڵام ئه‌وان له‌گه‌ڵ پێشه‌وه چوونی زه‌ماندا له‌شاره‌کاندا ئۆقره‌یان گرتووه و داسه‌کناون. جڤاکی نوێ و شارستان و نه‌ته‌وه‌یان پێك هێناوه .

پاشان دەست بەرداری زۆریکیش لەئاکارە ناجۆرەکانی خۆیان بوون و روویان لەکشتوکاڵ و پیشەسازی کردووە. کیانیشیان بۆ خۆیان پێك هێناوە. ئیبن خەلدوون پێی وایە دوو هۆکاری گرینگ هەن، کەبەسن بۆئەوەی دەولەتیان پیێ پێك بهێنیێت، یەکەم: تەعسوب واتە دەمارگیری، کەمەبەست پێی ئەوەیە ئەو کۆمەلەخەلکە خۆیان بەجیاواز لەدەوروبەر بزانن و بەهۆی زمان و داب و نەریت و کولتور و هەندێك جاران ئاینەوە خۆیان لەوانی دیکە هەلاوێرن و شێلگیرانە داکۆکی لەو جیاوازییانەی خۆیان بکە. مەرجی دووەمیش فاکتەری ئابووریـیە کە بەبیێ وی دەولەت پێك نایەت .

**سیستەمی خێلّ هێشتا لەزۆر شوێن بەرقەرارە**

تاکو ئیستاش زۆرێك خێلّ ، لە ئاسیاو ئەفریقیادا، بەو شێوە سەرەتاییەی سەدان سالّ لەمەو بەر، هەر ماون و خەریکی مەرو مالات و وشتر بەخێوکردنن . ئاین و بیرو برواو پۆشاك و خۆراك و تەواوی داوونەریتە کۆنەکانی خۆیان پارستووە . وەك خێلەکانی بوشمێن، کە ئینسکلۆپیدیای ویکیپیدیا. ئاوا باسیان دەکا: تاکو ئێستاش هەر لە بیابانی کالاهاری، لە سنوری ولاتانی ئامیبیا، بۆتسواناو باشوری ئەفریقادا، بەمالات بەخێوکردن ژیان بەسەر دەبەن . ئاینی سەرەتایی و تەواوی نەریتەکانی خۆیانیان پاراستووە. جیێ ی باسە بۆشمین، ناوێکە داگیرکەرانی ئەوروپا. کاتێك بۆیەکەمین جار گەیشتوونەتە ناوچەکەیان بەسەریاندا دابریون .

ئینیسکۆپیدیای ناوبراو باسی خێلەکانی بیجاش دەکات. کە نموونەیەکی دیکەن، لەباکوری رۆژهەلاتی ولاتی سوداندا دەژین. هەروەها خێلە بەناوبانگەکانی تەواریق . کە بەرەگەز دەچنەوە سەر کەلی ئەمازیغ ئەمانە خەلکی رەسەنی باکوری ئەفریقان . لەراستیدا، لە زۆربەی ولاتانی ئەفریقادا هێشتا هەر دەمارگیریی خێلّ لە نێویاندا ماوە.

لە کۆمەلگەی کوردەواری مێنتەلێتیی خێل باوەو بالّی بەسەر ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسیدا کێشاوە هەندێك جاران کەسانی خوێندەوار، ناوی دیاری ناو کۆمەلیش ، بیێ ئەوەی مەبەستیان بوویێت کەوتوونەتە داوی خێلّەوە و لەدیدی خێلەوە دنیایان دیوە، خێلەکیانەشیان بیریان کردووەتەوە. ئەمەش مانای وایە خێلّ بەتەواوی هزرو میکانیزمەکانیەوە لەنێو جەنگەی شارەکانیشدا ئامادەیە.

سەردەمی زوو ، سەرژمێری دانیشتوان بەم شێوەیە ئیستا نەبووە. لەم بارەیەوە رۆژهەلاّت ناسی رووس ب. لیرخ کتێبەکەی خۆیدا . کاتێك باس لەهەر خێلێکی کورد

دەکات، بۆ دەرخستنی حەشیمەت و قەبارەیان . لەبری ژمارەی تاکەکان بە رەشماڵ حیسابیان دەکات. وادیارە پێشتر هەر بەو شێوەیە سەرژمێری خێڵ کراوە . لیرخ نووسیویەتی. (( شێخ بزێنی برێتین لە ۱۰۰۰۰ رەشماڵ و سورچی ۲۰۰۰ رەشماڵ.. هتد )) ئەوی راستی بێت رەشماڵێك دەکاتە خێزانێك. ئیستاشی لەگەڵدابێت، ئەو خێڵەی ژمارەی سوارچاك و تفەنگەکانی زۆرتر بێت. ئەوا لەوانی دیکە خۆی بەگەورەترو لەپێشتر و بەرێزتریش دەزانێت و پێوەی دەنازێت .

بۆیە لێرەدا واتە لەکۆمەڵگە نیمچە داخراوەکی خێڵدا، نەخەڵك بەو رادەیە ئاڵۆزن و نە ژیان و پێویستیەکانیشی ئەوەندە گران و بەگرێ و گۆڵن. لێرە هەر نەبێت دیوەخانێکی گەرم و گوڕ هەیە، تەواوی ئەو خەڵکە کۆدەکاتەوە. کە تاك دەتوانێت بە ئازادی دەردی دڵی خۆی تێدابکات و کەسانێکیش هەن بە پەرۆشەوە گوێی لێ بگرن و بەتەنگیەوە بن. ئەگەر پێویستی کرد بەهاناشیەوە بچن لێرەدا رێورەسمەکان ئاسان بەرێوەدەچن. دەرگەی ماڵەکان ئاوەڵان بگرە زۆر ماڵی گوند بێ دەرگەن لێرە کەمتر هامشۆ دیدەنی. پێویستی بەزەنگ لێدان و پێشەکی لێ گێرانەوە روخسەت خواستن دەبێت .

هەموو لایەك پێیان خۆشە و بە ئەرکی سەرشانی دەزانن لە خزمەتی ئەوانی دیکەدا بن و خۆیان بەکەسی یەکتری دەزانن. لێیان تێ دەگات و لێی تێ دەگەن. هەمیشە هەیە، دەمەتەقێ و شەوچەرە، خەلك سلاو لەیەك دەکەن و لە مزگەوتدا رۆژانە چاویان بەیەك دەکەوێت. لە بۆنە ئایینیەکاندا ماڵی یەکتری بەسەر دەکەنەوەو گەردن ئازادی لەیەکتری دەکەن. ئاین و و ئاینزا و ماڵی خوا، گەرمیان و کوێستان و خەم و خولیایان تارادەیەکی زۆر چوونیەك و هاوبەشە .

لە ژیانی رۆژانەی خێڵدا، عورف و ترادسیۆن و داوونەریتەکان جێ ی یاساو سیستەمە نوێیەکان دەگرنەوە. پەیوەندی خزمایەتی و خوێن جێی پەیوەندییە چینایەتی و کۆمەڵایەتییەکان دەگرنەوە، ئاغای سەرخێل و ئەنجومەنی خێڵیش کاردەکەن بۆیەکسانی و دادی کۆمەلایەتی، بەتایبەتی بەر لە نیشتەجێبوونی خێل ، تارادەیەك لەنێو ئەندامانیدا بەرقەرار بووە .

ئەگەر قسە لەسەر ژیان و گوزەران بێت ، ئەوا بۆ هەمووان چوونیەك بووە . خۆ ئەگەر جەنگ و مەرگیش بێت ئەوا هەموو لایەك پێکەوە بەرەو پیری چوون.

**بەرچاوتێری و مێوانداری**

دیوان، وشەیەکی بە ڕەگ و ڕیشە فارسییە، مەبەست پێ ئەو جێیەیە بەنیازی چارەسەری شەڕ و دەعواکان لێی کۆبوونەتەوە. هەروەها بەواتای ئەو شوێنەش دێت، کە کاروباری دەوڵەتی تێدا ڕێك خراوە، بەڵام دواتر عارەب و تورکیش هەمان وشەیان بەکاربردووە و برێکیش دەستکارییان کردووە. عوسمانی بە ژوور، یاخۆ بەجێی حەوانەوەی میوانیان وتووە (دیوەخانە)، کە بە ئاغا و کوێخایان تایبەت بووە. جێی وتنە وشەی (دیوان: دیڤان) لە زمانەکانی ئینگلیزی و دانیمارکیشدا هەیە. واتە وشەیەکی قەرز کراوە. لای ئەم دوو گەلە بەواتای (قەنەفەیەکی نەرمی بێباڵ و پشت دێت، پاڵی بەدیوارەوە دەدرێت و بۆ خەوتنیش بەکار دێت) لە زمانی کوردیشدا زارەوەکانی دیواخان، دیوەخان، دیواخانە) بە واتای (هۆدەی میوانی ئاغا و خان و گزیر) هاتووە.

سەرخێڵ و ئاغاکان خاوەنی دیوەخان بوون. لەوێدا کە بەشێکی جیاواز بووە لە شوێنی نیشتەنی خۆیان، پێشوازی لە مێوان کراوە. ئێستاشی لەگەڵدا بێت ژووری میوان لە ژوورەکانی دیکەی ماڵ گەورەترە، تاکو زۆرترین ژمارە میوان بگرێت. لە ژوورەکانی دیکەش پۆشتە و پەرداخترە. ئەو ژووری میوانە کە ئێستاش لە زۆر ماڵە شاریشدا ماوە، هەر درێژەی دیوخانەکەی دەورانی زووە. لە ئێستادا بەجوانترین تاخمی قەنەفە دەڕازێنرێتەوە و لە ژێریدا فەرشی پان و پۆر (هۆرتە) ڕادەخرێت، چونکە ئەگەر ژووری میوان ڕووت و ڕەجاڵ بوو ئەوا تەواوی ماڵەکە ڕووت و بێ دەرەتان دێتە پێش چاو.

ئێمە بێ ئەوەی بەخۆمان زانیبێت لاساییی سەرخێڵ و کەیخوایان دەکەینەوە، کاتێك ژوورێکی وەهای پۆشتە چێ دەکەین. ئەگەرچی لە هەندێك ماڵدا مەگەر جەژناوجەژن دەنا میوان بەخۆیەوە نابینێت. بەڵام لە هەندێ بنەماڵەدا کە خاوەن پێگە و خانەدانن دیوەخان زرمەی دێت هەروەها لە گوندان، لێ ڕاهاتوون پێشوازی لە میوان بکەن. لە دیوەخانی لادێدا بەستەکە نوێن لە سەریەك هەڵچنراوە. زۆپا، ئەسبابی چایی، سەرینی پەڕی گەورە گەورە، بەرماڵ، ژێرسیگار و هەندێك جاران باوەشێن بەدی دەکرێت. لە گوند، میوان شەو و ڕۆژی بۆ نییە و بەبێ ژووان دێت و دەبێت خزمەت بکرێت. کاتی خۆی دیوەخانی سەرخێڵ وێڕای میوان، مەکۆی بەیتبێژ، حیکایەتخوان و مەتەڵزان لاوك زان و شاعیر بووە. بەڵام لە کن ئاغایان خزمەتکاری تایبەت بەدیواخان هەبووە. گوندنشینان شەوانە لێرە کۆبوونەتەوە. لە هەواڵی دەوروبەر و ناوەخۆش ئاگاداربوون. ئەگەرچی لە شاردا (میوانخانە: ئوتێل) هەیە بەڵام

زیاتر بۆ بیانییە. گوندنشینان کاتێك بە سەردان دێنە شار، خزم و ناسیاوی خۆیان دەکەنە خانەخوێ.

لە ڕووی میواننەوازییەوە پێم باشە گوندی کەورگۆسك وەربگرم کە دیوەخانەکەی هەردەم پڕ بووە لە ڕێبوار و کاروان و سەرا و هەژار و کەم دەرامەت زۆر خزمەتی مێوان کراوە لەم دیوەخانەیەدا کە جێگەی هەڵوەستە لەسەر کردن و ئاماژە پێ کردنە.

دیارە ئەم نانبدەیی و میواندۆستییە، بەم ڕادەیەش، لە دنیای نوێدا بەرچاو ناکەوێت و بێ وێنەیە. لەلای خێڵی کورد میوان کاتی بۆ نییە. هەر کاتێك شەو بێت یان ڕۆژ بەبێ لێگێڕانەوەی پێشوەخت، بۆی هەیە بچێتە میوانیی و گەرەکە خزمەت بکرێ.

خێڵی کورد بێجگە لە نانبدەیی و ڕێزگرتنی میوان، خاوەنی گەلێك ئاکاری دیکەی جوان بوون.

خێڵەکیی کورد دەڵێن: «خێوەت دەرگەی نییە» بەو مانایەی لە ئاستی میواندا هەردەم ئامادەن و دەرگەیان ئاوەڵایە. ئەوان بۆ خزم و ناسیار و نەناس چوونیەك ئامادەی میوانداری و هاوکارین. ئەگەر سالانێك بگەڕێینەوە دواوە و زەینی بدەینێ، دەزانین ئەم بەرچاو تێرییە زیاتر لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، مرۆڤی خێڵەکی لە جێیەك توێتکەیان نەخواردووە. ئەوان هەردەم بەرێی گەرمیان و کوێستانەوە بوون. جێگیربوونیان بۆ ماوەیەکی کورت بووە و ژیان لە ڕەشماڵدا بەسەر بردووە. کەلوپەل و تفاقی سادەیان بەکار هێناوە. قەراریان نەگرتووە هەتا وشکەدان و ئازووخە و پێداویستی دیکەی ڕازاندنەوەی ناوماڵ (کەمالیات) لە دەوری خۆیان خڕش بکەنەوە. ئەوان کەمتر بەلای پاشەکەوت و کالا ئەمبارکردندا چوون.

ڕەنگە هۆیەکی دیکەی نانبدەییی خێڵ بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، ئەوان بۆ خۆشیان برسێتییان نۆشیوە. کاتێك بەو کەژ و کێوانەوە یان بەو ساکە دەشتانەوە بەدیار پەزەکانیانەوە برسێتی زۆری بۆ هێناون و کەسێك نەبووە لایەکی بەخێریان لێ بکاتەوە. بۆیە دەشێت هەر ئەو ئەزموونە تاڵە بێت لە نەستیاندا بنی نابێتەوە، بۆیە وا ڕووخۆشانە بەدەم ڕێبواری شەکەت و برسێیەوە بچن و بیلاوێنن و خزمەتی بکەن. ئەوان هەردەم تانەیان لە جووتیار داوە و مۆری ڕژدی و دەست نووقاوییان پێوە ناون.

خاوەن پێگە و دیوەخان وەك مرۆڤی شارستان بیریان لەلای پاشەڕۆژ نەبووە. بەڵکو پاشەڕۆژ لە فەرهەنگی ئەواندا نەخش و نموودێکی ئەوتۆی نەبووە، تاکو خەمی هەڵبگرن. بۆیە میتۆد و شێوازی ژیانیان وەهای خواستووە دەست و دڵ کراوە و بەرچاو تێر بن و بەتەنگ ماڵی

دنیاوە نەبن. بەزۆری ئاستی ژیان و بژێویشیان چوونیەك بووە. ئایە و مایەیان ئاژەل بەخێوکردن بووە. پاشان هاتوونەتە سەر کشتوکاڵ، ئەویش بەشێوازێکی ساکار و سەرەتایی. بە تێپەڕینی زەمان و دووبارەبوونەوەش ئەم سیفەتی دڵ فراوانییەیان لەلا جێگیر بووە و پشتاوپشت لەگەڵیاندا هاتووە.

هەر لەمەڕ دڵئاوایی تاکی خێڵەکی، دەبێت ئەوەش بڵێن، بەپێی کتێبی (خێڵەکانی کوردستان) بێت، کورد لە دەوروبەری جەنگی یەکەمی جیهانیدا «خاوەنی ٤٠ ملیۆن سەر مەڕومالآت بووە.. ل ٩٧». ئەمەیش بە بەراورد لەگەڵ حەشیمەتی ئەوکاتەی کورددا، ژمارەیەکی زۆرە و ڕەنگە ئێستا ئەوەندی پێ هەڵنەسووڕێت.

خێڵەکی لەنێو کۆمەڵگە بۆ ئەوەی ناو دەربکات، دەبێت دیوەخانی هەبێت و بەرچاوتێر بێت. هەندێك جار وشەی ئازا بەواتای ئانبدە دێت. ئەوان زاراوە گەلێکی فرەیان لەم ڕووەوە هەیە وەك: بەدەست و دڵ، سەخی تەبیعات و بەخشندە. دەستبلآوی لای خێڵ سیفەتێکی جوان و ئەرێنییە. پێچەوانەکەشی وەك: «چرووك، نانتاڵ، ڕژد، هەتیوچە، کوێرنان، نانکوێر، ڕەزیل، بەرچاوتەنگ، سەقیل، دەخس، چکود، جەبوون، پوولەکی، پارەخۆشەویست، پارەپیس، پیسکە، دەست نووقاو، دەست قووچاو، پارە بەقنگ هەڵگر، چاوچنۆك، چاوچلێس، ماڵپارێز، قارنان، چکووس، قەمتەر، قەمتەرکراو...».

لێرەوە بەدیار دەکەوێت، کە لە دیدی خێڵەوە خاوەن پێگە و دیوەخان سیفەتی ئانبدەیی بەدەست و دڵی لە پێش هەموو ئاکارە جوانەکانی دیکەوە دێت، هەر بۆیە مامۆستا سەعد شێخ بزێنی لە کتێبی (لە دیوەخانی یوسف ئاغای شێخ بزێنیەوە) کاتێك باسی یوسف ئاغای سەرۆك هۆزی شێخ بزێنی دەکات لە سەرەتاوە باسی سەخی تەبیعاتی و دەست بلآوی و چاوتێری و ئاندەری ئەو عەگیدە دەکات، هەروەها دکتۆر حەسەن جاف، لە کتێبی (تەئریخی جاف)دا، کاتێك پەسندی کەریم بەگی فەتاح بەگی کوڕی حەمەپاشای جاف، کە یەکێکە لە سەرخێڵە ناودارەکانی عێلی جاف دەدا، بەری هەر شتێك ئاوا دەست پێ دەکات: «کەریم بەگ پیاوێکی تەبیات ئاچوخ و دەستبلآو بوو، لە سەخاوەتدا گەلێك مەیدانداریی کردبوو، قاپیی

دیوەخانی بۆ هەموو کەس بەربڵاو بوو» واتە ناوبراو سیفەتی سەخاوەتی پێش هەموو سیفەتە جوانەکانی دیکە خستووە[1].

**-ئەو ڕاو سەرنجانەی کە باس لە ناوی (شێخ بزێنی) دەکەن:**

١-یەکێك لە بۆ چوونەکان کە گومان دەکرێ ناوی (شێخ بزێنی) لەم داستانە وەرگیرابێ ئەویش ئەوەیە کەباوك یان باپیری ئەو چوار برایانە کە چوار بەرەبابەکەی شێخ بزێنی لێ پێك هاتووە شێخێکی زاناو خۆپارێزو ڕێبەری کۆمەڵە دەروێشێکی لە ژمارە نەهاتوو بوو. ڕۆژێك لەگەل یەکێك لەخزمەتکارەکانی بەسواری ئێستر بەدەشتێك دا تێدەپەرێ ، کە تاخمێك لە پیاوخراپ و دزو جەردە ڕێی پێ دەگرن . بۆیە شێخ لەگەل هەر دار (عەسا) لێدانێکی لە هێسترەکەی، ژەنگە سورەیەك لەگۆیی ئێسترەکە دەردەپەرێ و پەلاماری پیاو خراپ و ڕێگرەکان دەدات و هاوارو نالەیان لێ بلند دەکات، خزمەتکارەکەی شێخ کە شاهیدی ئەم ڕووداوە بوو، بە گوتنی فارسی بەشێخ دەلێت: (( شیخ بزن ، شێخ بزن)) واتە ((شێخ لێی دە ، شێخ لێی دە )) ئەوی پتر هانداوە، بۆ ڕاوەدوونانی ئەم دزو جەردانە، بۆیە ئەمەش یەکێك لە بۆچوونەکانە کە گومان دەکرێت وشەی (شێخ بزێنی) سەرچاوەی ناولێنانەکەی لەوەوە هاتبێت[2].

٢-یەکێك لە بۆچوونەکان کەگوایە وشەی (شێخ بزێنی) سەرچاوەکەی لەوەوە هاتووە، کە شێخێکی تەریقەت بەخۆی و یەکێك لە موریدەکانی ڕۆژێك لە ڕۆژان لەسنوری کۆماری ئیسلامی ئیرانی ئیستادا لە ڕێگادادەرۆن تووشی کۆمەلێك لەپیاو خراپ و دزو جەردەو ڕێگردەبن ، دیارە شێخیش دار عەساێکی پێ دەبێت کە بلندی دەکات لە دزو جەردە و پیاو خراپ و ڕێگرەکان ، لەسەری دارعەساکەی شێخ زەردەواڵە(زەنگە زوورەی) لێ دەردەچێت بۆ سەر گیانی هێرشبەرەکان بۆ سەر شێخ لە دزو جەردەو پیاو خراپ و ڕێگرەکان، بۆیە گۆرەپانەکە پربوو لە هاوارکردن و ئیش و ژانی دزو جەردەو پیاو خراپەکان ، کەموریدەکەی

---

[1] - محمد فریق حسن ، مینتەلیتی خێل ، چ١ ، ٢٠٠٨ ، هەولێر، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، ل١٢.

[2] - سیسیل جۆن ئیدمۆندز، کورد تورك عەرەب، وەرگێرانی: حامید گەوهەری، چ٢، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٦٦ .

شێخ بەراستیەکەی زانی بۆ ئەوەی شێخ زیاتر هیممەت بکات بۆ ئەوەی هێرش بەرە پیاو خراپ و دزەکان نەهێلی لەناوچەکە ، بۆیە خزمەتکارەکەی شێخ بۆ شێخ هیتافی لێ دەدا بەزمانی فارسی دەیگوت(شیخ بزن ، شیخ بزن ) بەواتای شێخ لێیان بدە ، شێخ لێیان بدە) ، لە ئەنجامدا شێخ گشت دزو جەردەو پیاو خراپ و ڕێگرەکان ڕاوەدودەنێت ، بۆیە ئەمەش یەکێك لە بۆچوونەکانە کە گوایە وشەی (شێخ بزێنی) سەرچاوەی ناولێنانەکەی لەوەوە هاتووە.

٣-یەکێکی تر لە بۆچوونەکان کە گومان دەکرێ ناوی (شێخ بزێنی ) سەرچاوەکەی لەوەوە هاتبێت ئەویش ئەوەیە کە لەناوچەی پێنجوینی سەربەپارێزگای سلێمانی لە نزیك سنوری کۆماری ئیسلامی ئێران گوندێك هەیە بەناوی (بزێنیان) ە کە دەڵێن لەم گوندە شێخی دینی و لە خواترس هەبوونە ، کە گوایە خەڵك لەزۆر لاوە هاتووچۆی ئەم ناوچەیان کردووە بۆلای ئەم ماڵە شێخانە ، بۆیە خەڵك زۆر پرسیاریان کردووە تاکو ناوچەکەیان دۆزیوەتەوە کە گوتوویانە (شێخی بزێنیان)، بۆیە لە پرسیارو وەڵامی ئەم خەڵکانە لەسەر زمان بۆتە (شێخ بزێنی) کە ئەمەش یەکێك لە بۆچوونەکانە کە باسی دەکرێت ، ناوی (شێخ بزێنی) لەوەوە هاتبێت .

٤-یەکێکی تر لە بۆچوونەکان کە مەزەندە دەکرێت ناوی (شێخ بزێنی) سەرچاوەکەی لەوەوە هاتبێت ئەویش ئەوەیە کە لەدەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی عوسمانیەکان ناوچەکانی دەوروبەری ناحیەی ئاغجەلەرو ئەمانە پێیان وتوون (بازیان)، ئەم ناوچانە سەردەمی عوسمانیەکان بەم شێوەیە ناونراوە، هەروەها ئەم ناوچەیە شێخی دینی و پیاو چاك و لەخواترسی تێدا بووە، کە لە سەردەمی خۆی لەلایەن خەڵکی ناوچەکە ووتراوە (شێخی بازیانی) کە دیارە ئەم ناوچەیە شێخی دینی لێ هەبووە، دواتر لەسەر زمانی خەڵکی ناوچەکە (شێخی بازیانی) بووەتە (شێخ بزێنی)، کە ئیستاش لەگەڵدابێت ئەم ناوچانە زادگاو شوێنی بەشێك لە هۆزی شێخ بزێنیە، بۆیە ئەمەش یەکێك لە بۆچوونەکانە کە باسی دەکرێت ناوی (شێخ بزێنی) لەوەوە سەرچاوەی گرتووە .

٥-یەکێکی تر لە بۆچوونەکان کە مەزەندە دەکرێت ناوی (شێخ بزێنی) سەرچاوەکەی لەوەوە هاتبێت ئەویش ئەوەیە کە هۆزی شێخ بزێنی گشت خێزانەکانی نیشتەجێ بوون لەدەوری زێ گەورەو بچووك، واتە لە قەراغ ئاو و زێ و رووباردا نیشتەجێ بوون ، کەوا باسی دەکرێت کە شێخێك یان پیاوێکی باش لەهۆزی شێخ بزێنی لە دورگەیەك نیشتەجێ بووە لەسەر زێ ، کە لەم دوورگەیە ئاو دوو لەت دەبێت کە بەلەهجەی شێخ بزێنی پیێ ی دەڵێت (دوو بز) بەواتە (لەت) بەرامبەر (بز) دادەنێت، ئەم شێخەش پیاو چاك بووە خەڵکی ناوچەکە هاتووچۆی ئەم

شێخەیان کردووە و لە نێو خۆیان ووتویانە(شێخی بزێن) لەجیاتی (شێخی دوو بز) دواتر لەنێو خەلکەکە بەتێکرایی بۆتە (شێخ بزێنی) ، بۆیە ئەمەش یەکێك لە بۆچوونەکانە کە سەرچاوەی ناوی (شێخ بزێنی ) لەوەوە هاتبێت .

٦-یەکێکی تر لە بۆچوونەکان کەمەزەندە دەکرێت وشەی (شێخ بزێنی) سەرچاوەکەی لەوەوە هاتبێت ئەویش ئەوەیە کەشێخێکی پیاوچاك و لەخواترس دەبێت کە شێخی بەرمال دەبێت ، رۆژێك لەرۆژان ئەم شێخە دزی لێ دەکرێت، هەندێك کەل و پەلی دەدزرێت لەگەل بزنێك کە گوایە شێخ ئەم بزنەی زۆر خۆش ویستووە ، ئەم بزنە سالێ دوجار دەزا ، هەرجارێك سێ کاری دەهێنا ، بۆیە شێخ زۆر پەرۆشی بزنەکەی بووەو دزینی بزنەکەی زۆر کاریگەری لەسەری هەبووە، بۆیە شێخ گومانی لە کەسێك هەبووە کەدزیەکەی لێ کردووە ، هەلدەستێت دەچێت بۆ مالی ئەو کەسە ، کە گومانی لێ هەبووە کە دزییەکەی لێ کردووە ، لەوێ کەسەکە زۆر دەشێوێت و شێخیش دەلێت : ئەوکەسەی کەبزنەکەی لێ دزیوم هیچ دەنگ نەکات بابگەرێنیتەوە شوێنەکەی خۆی، دیارە لەوکات بزنەکە(باعەباع) دەکات لەمالی کابرا بۆیە زۆر دەشێوێت و دەشلەژێت ، بۆیە کابرا هەلدەستێت بەکوشتنەوەی بزنەکەی شێخ، دواتر لە مالەوە خەریکی پارچە پارچەکردنی گۆشتی بزنەکە دەبن، شێخ بەکابرای گومان لێ کراو دەلێت: ئەگەر بزنەکەم بۆ نەگەرێننەوە ئەوا هاواری خوار گەورە دەکەم کەوا بزنەکە خۆی بگەرێتەوە ، بۆیە کابرای گومان لێ کراو دەترسێت و بێ دەنگ دەبێت لەوکاتە، شێخیش هاواری خوای گەورە دەکات کە بزنەکەی خۆی بۆ بگەرێنێتەوە ، بۆیە لەگەل هاوار کردنی شێخ بۆ خوای گەورە و میهرەبان ئەوا هەموو پارچە پارچەکانی گۆشتی بزنەکە لە ناودەستی مالی کابرای گومان لێکراو یەکتر دەگرێتەوەو دەبێتە هەمان بزنی جاران دێتەبەردەم شێخ لەمالی کابرای گومان لێ کراو ، بۆیە ئەم رووداوە لە نێو خەلکی ناوچەکە بلاو دەبێتەوە تاوای لێ دێت وشەی (شێخ بزێنی) دروست دەبێت لەسەر زاری خەلکی ناوچەکە، بۆیە یەکێك لەبۆچوونەکان ئاماژە بەوە دەکات کە وشەی (شێخ بزێنی) لەوەوە سەرچاوەی گرتووە ، ئەم بۆچوونە بیرورای شێخ بزێنیەکانی سنوری وولاتی سوریا دەگرێتەوە .

٧-یەکێك لە بۆ چوونەکان کەگومان دەکرێت ناوی (شێخ بزێنی) لەوەوە هاتبێت ئەویش: دەلێن شێخێك دەبێت ئەم شێخە زۆر ئایین پەروەر وخواناس و خاوەن کەرامەت بووە، کەخەلك لەناوچەکە زانیوویانە ئەم شێخە کەسێکی نوورانی وچاك و پاك و لەخوا ترسە، بۆیە خەلکی

ناوچەکە پێیان ووتووە (شێخ زین) کەلەزمانی عەرەبی دا بەواتای (شێخی چاك یان باش)، ئەوەش یەکێك لە بۆچوونەکانە کە باس دەکرێ ناوی (شێخ بزێنی ) لەودوە هاتبێت .

٨-ئەم حیکایەتەی خوارەوە یەکێکی ترە لە بۆچوونەکان کەباس دەکرێ لەسەر بنچینەی ناوی (شێخ بزێنی) کەلە چی هاتووە ، ئەویش بەم شێوەیە :-

دەلێن باوکی ئەم چوار برایە یان باپیرانی وسەرەوە تری ئەم چوار برایە کەگوایە شێخ بووەو پیاو چاك بووە ، عالم ( زانا ) بووە ، لەخواترس (المتقی) بووە ، مورشید بووەو ئیرشادی کردووەو چەندین موریدی هەبووە ، رۆژێك لە رۆژان سواری وولاخ بووە ، یەکێك لەخزمەت کارەکانی لەگەڵی بووە ،دەسوڕایەوە شێخ لەناوچەکە، کەوتە ناودەستی عەسابە (رێگر) و دزەکان، شێخ هەوڵی دا بەلێدانی گۆپاڵەکەی خێرا بروات، هەموو جارێك بەلێدانی گۆپاڵەکە لە وولاغەکەدا، قۆچەك لەسەری وولاغەکە شین دەبوو، بۆ ئەوەی لێ بدات لەیەکێك لە مهاجمەکانی (هێرشبەرەکانی) بۆ سەر شێخ لە دزو رێگرەکان، بۆیە گۆرەپانەکە (فـضـا ء )ەکە، یان (جەو)ەکە، پڕ بوو لە هاوارکردن و ئیش و ژان، کە خزمەت کارەکەی شێخ بە (حەقیقەتەکەی) راستیەکەی زانی، تاکو رۆیشت بۆ ئەوەی شێخ زیاتر (جهد) و (هیمەت) سەرف بکات بۆ ئەوەی هێرش بەرە دزەکان نەهێڵێ لە ناوچەکە، بۆیە خزمەتکارەکەی شێخ بۆ شێخ هیتافی لێ دەدا بەزمانی فارسی دەیگووت (شێخ بزن ! شێخ بزن) بەواتای (لێ ی دە یا شێخ، لێ ی دە یا شێخ)، ئەمەش یەکێکی ترە لەبۆچوونەکان کەسەرچاوەی ناوی (شێخ بزێنی) روون دەکاتەوە[1] .

٩-یەکێکی تر لە بۆ چوونەکان کە مەزندە دەکرێت ناوی (شێخ بزێنی) سەرچاوەکەی لە وەوە هاتبێت ئەویش ئەوەیە کە ئەم شێخ بزێنیانە شێخ بوونە و خاوەن ئاژەڵ بوونە و ئاژەڵیان بەخێوکردووە، بەتایبەتی خاوەنی بزنێکی گەلێك زۆر بوونە، کە لە ناوچە شاخاوییەکان ئەم بزنانەیان لەوەڕاندووە، بەهۆی ئەوەی کەوا ئەم بزنانە گەلێك زۆر بوونە بۆیە لە ناوچەکە دارو درەخت و پاوان و گژو گیا هیچ نەماوە، لەبەر ئەوە خەڵکی ناوچەکە چوونە لای میری بۆتانی لە جزیرەی بۆتان سکالایان تۆمارکردووە لەسەر خاوەنی ئەم هەموو بزنانە ، کە گوایە دارو درەخت و گژوگیا هیچ نەما لەو ناوچەیە، بۆیە میری بۆتانی گوتوویەتی ئەمانە زۆر لەمێژە لێرە نیشتەجێ بوونە، ناکرێ دەریان بکەین لەم ناوچەیە بەلام دەبێ نێری بەرنەدەنە ناو بزنان

[1]- سی.جی.ادمۆندز، کرد وترك وعرب، ترجمە: جرجیس فتح الله، بغداد، ١٩٧١، ل٤١-٤٢.

تاکو بزن زاوزێ نەکات و زیاد نەبێت، بەلاّم بزنەکان هەر لەزیاد بوون بوونە چونکە نێری کێوی لە شاخ هەبوونە ئەوکات هاتوونەتە ناو بزنان بۆیە هەر لە زیاد بوون بووە ، بۆیە خەڵکی ناوچەکە بەو شێخەیان ووتووە (شێخ بزێنی) کە گوایە خودانی بزنەکی گەڵەك زۆریان کردووە کەلەرادەبەدەر بووە دەنگی داوەتەوە لەناوچەکە ئەو کات، بۆیە ئەمەش یەکێك لە بۆچوونەکان باس دەکرێت کە ناوی (شێخ بزێنی) لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت.

١٠-یەکێکی تر لە بۆ چوونەکان کە مەزندە دەکرێت ناوی (شێخ بزێنی) سەرچاوەکەی لە وەوە هاتبێت ئەویش ئەوەیە کە ئەم شێخ بزێنیانە شێخ بوونە و خاوەنی جۆرە بزنێکیان کردووە بە ناوی (بزنی فیللك) کە گوایە ئەم جۆرە بزنانە ئەوان هێناویانە ناوچەکە لەوکات ، بۆیە ئەم جۆرە بزنە بۆ ئەوکات تایبەت بووەو یەکەم جار بووە لەو ناوچەیە بەدەربکەوێت کەوا لە سنوری وولاّتی تورکیای عوسمانی ئەوکات، کە خاوەنداریەتی بزنێکی یەکجار زۆریان کردووە لەو ناوچەی کە جۆرێکی تایبەت بووە بە ناوی (بزنی فیللك) ، بۆیە لەنێو خەڵکی ناوچەکەی ئەوکات شتێکی سەیر بووە ئەم جۆرە بزنە بۆیە پێیان وو توون (شێخ بزێنی) ، ئەمەش یەکێك لە بۆچوونەکانە کە ناوی (شێخ بزێنی) سەرچاوەکەی لەوەوە هاتبێت .

١١-یەکێکی تر لە بۆ چوونەکان کە مەزندە دەکرێت ناوی (شێخ بزێنی) سەرچاوەکەی لە وەوە هاتبێت ئەویش ئەوەیە کە لەسەردەمی عەباسیەکان بەشێك لە ئاغاکانی شێخ بزێنی لە تیرەی خۆڵە زەردی ، حکومەتی عەباسی ئەوانی هێنا نیشتەجێ ی ناوچەی (تەق تەق) ی کردن و دەسەلاتی پێدان بۆ ئەوەی کۆنترۆلی ناوچەکە بکەن ئەو ئاغایانە کە سەرپەرشتی ئەو ناوچەیان دەکرد، پێیان دەگووتن (شێخ) کەلە زمانی عەرەبی دا بەواتای (گەورە) یان (بەتەمەن) یان (سەرۆك) کەزۆرجار بۆ سەرۆك هۆز ئەم وشەیە بەکاردێت (شێخ العشیرە) کەخەڵکی ناوچەکە بە (شێخ) یان دەگوت شێخ بە (زین)ی واتە شێخ بەچاکی یان بەباشی بەجوانی هەلس وکەوت بکەن لەگەڵمان بۆیە لەسەر زاری خەڵکی ناوچەکە ئەمانە بە (شێخ بزێنی) ناوبران، کە ئەمەش یەکێك لە بۆ چوونەکانە کەمەزندە دەکرێت ناوی (شێخ بزێنی) لەوەوە هاتبێت.

١٢-یەکێکی تر لە بۆچوونەکان کەمەزندە دەکرێت ناوی (شێخ بزێنی) لەوەوە هاتبێت ئەویش ئەوەیە کەگوایە ئەم کۆمەڵە کەسە خاوەن ڕەفتارو خاوەن چاکە بوونە لەناوچەی لێ ی ژیاون بۆیە خەڵکی ناوچەکە پێیان ووتوون (شیوخ البوزینیە) واتە گەورەکانی یان ئاغاکانی خاوەن چاکەو جوانی، کە گوایە لەو ناوچەی کەلێ ی ژیان ڕەفتارو هەڵس وکەوتیان بەباشی لەگەڵ

خەلکەکە کردووە، بۆیە لە نیو خەلکی ناوچەکە ڕەنگیان داوەتەوەو پێیان ووتوون (شیوخ البوزینیە) کەدواتر بەدرێژایی کات لەسەر زاری خەلکی ناوچەکە بووەتە(شێخ بزینی) کە ئەمەش یەکێك لە بۆچوونەکانە کەمەزەندە دەکرێ ناوی ( شیخ بزێنی) لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت.

١٣-یەکێکی تر لەبۆچوونەکان کەمەزەندە دەکرێ ناوی ( شیخ بزێنی) لەوەوە هاتبێت ئەویش ئەوەیە، کەوا شێخێکی خواپەرست و دیندارو تەقوادار هەبووە، کەخەلکی ناوچەکە ئیشێك یان کارێکیان پێ چارەسەر نەکرابایە ئەوا ڕوویان دەکردە شێخ و دەچوونە لای شێخ و دەیانگوت دەبێ شێخ بزانی و چارەسەری بکات، هەر بۆیە ئەم ( شیخ بزانێ) یە، بەدرێژایی کات لەسەر زاری خەلکی ناوچەکە بۆتە ( شیخ بزێنی) بۆیە ئەمە یەکێکی ترە لەبۆچوونەکان کەمەزەندە دەکرێ ناوی ( شیخ بزێنی) لەوەوە هاتبێت.

١٤-یەکێکی تر لە بۆچوونەکان کەمەزەندە دەکرێ ناوی ( شیخ بزێنی) لەوەوە هاتبێت ئەویش ئەوەیە کەگوایە دووبرا بوونە، شێخ بوونە ، لەخوا ترس ودیندار بوونە ئەم دوشێخە، دیارە لەو سەردەم و لەو ناوچەی نیشتەجێ بوونی ئەم دووشێخە، شێخیکی تریش دەبێت، ناوبانگی ئەم دووشێخە زۆر بووە لەناوچەکە، بۆیە شێخەکەی تر دەلێت: دەبێت بچمە لای ئەم دووشیخە و گفتوگۆیان لەگەل بکەم، بۆیە کە شێخەکە دەچێت بۆلای ئەم دووشێخە، کەمەزەندە دەکرێ ناوی شێخ بزێنی لەوەوە هاتبێ، بۆیە پاش گفتوگۆیەکی زۆری ئەم دووشێخە لەگەل شێخەکەی تری دینی، ئەوا لەئەنجامدا دووشیخەکە، شیخەکەی تر دەبەزینن، بۆیە هەر لەوەوە خەلکی ناوچەکە پێیان ووتن ( شیخ بەزێن) دواتر لەسەرزاری خەلکی ناوچەکە بۆتە ( شیخ بزێنی) کەئەمەش یەکێکی ترە لە بۆچوونەکان کە گومان دەکرێ ناوی (شیخ بزێنی) لەوەوە هاتبێت .

١٥-یەکێکی تر لە بۆچوونەکان کە گومان دەکرێ ناوی( شیخ بزێنی) لەوەوە هاتبێت ئەویش ئەوەیە کەوا تاکەکانی یان ڕۆلەکانی ئەم هۆزە گەلێ نەبەردو قارەمانن بۆیە لە سوارچاکی و قارەمانی و ئازایەتی وێنەیان نەبووە، بۆیە هەریەکێك بکەوێتە بەرامبەریان دەیبەزێنن، بۆیە گومان دەکرێ کەرۆلەیەکی نەبەردی ئەم هۆزە لە سوارچاکی و قارەمانی و ئازایەتی دا لەبەرامبەر شێخێك دا دەکەونە پێشبرکێ وە وا مەزەندە دەکرێ کەوا ئەو شێخە برا گەورەی هۆزێك بێت کە لە ئەنجام دا شێخەکە دەبەزێت بەرامبەر ئەم قارەمانە کە گوایە هۆزی شێخ بزێنی لەنەسلی ئەم سوار چاکە پەیدا بێت هەر بۆیە خەلکی ناوچەکە پێیان ووتووە (شێخ

بەزێن) دواتر بۆتە ( شیخ بزێنی) لەسەر زاری خەلکی ناچەکە کە ئەمەش یەکێکی ترە لە بۆچوونەکان کەگومان دەکرێ ناوی( شیخ بزێنی) لەوەوە هاتبێت .
لەکۆتاییدا سەبارەت بەناوی (شێخ بزێنی) کەلەچیەوە سەرچاوەی گرتووە، دەمەوێ ئەوە بلێم کەزۆربەی بیرورا مەزەندەکراوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەوانە شێخی دینی بوونە یان پیاو چاك و لەخوا ترس بوونە یان برا گەورەو سەرەی ناوچەیەك یان بنەمالەیەك یان هۆزێك بوونە، دواتر بەدرێژایی مێژوو ئەم هۆزە گەورەیەی لێ دروست بووە کەناونراوە هۆزی ( شیخ بزێنی).

**ڕیشەی ناوی جوگرافی و مێژوویی گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی :**

هەر گەلێك لە هەر چاخێك بۆ چاخێکی تر، فەرهەنگی زمان و ناوە جوگرافییەکانی گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەویش بەهۆی تێکەل بوونیەتی لەگەلٚ گەلاٚنی دەوروبەری بەتایبەتی و گەلانی پێشکەوتوو بەگشتی، جا تێکەلٚ بوونەکە لە ڕێگەی ئاینەوە بێت، وە یا لە ڕێگەی داگیرکردن و بازرگانییەوە بێت، بۆیە لە کۆنەوە هەر گەلێك بکەوتبایە ژێرحوکمی گەلێکی ترو بووبێتە ژێر دەستەی، ئەوا زمان و ناوی جوگرافی ئەم گەلە ژێر دەست و چەوساوەیە، کاری تێدەکرێت و دەشێوێندرێت لەلایەن گەلە بە هێزو داگیرکەرەکە، بۆیە بە ناو داب و نەریت و ئاوازو مۆسیقاو گۆرانی و فۆلکلۆرو مێژوو و ناوی جوگرافییەوە دەکەوێ و بەئارەزووی خۆی ناوی هەر ناوچەیەك هەر چیایەك هەر گوندێك هەر شارێك ڕای لێ نەبێ، لە قوڕی هە لٚدەکێشێت، وەیا سەروگێلاکی دەشکێنێت، ئەگەر حەزیش بکات ئەوا لە ڕەگ و ریشەوە هەلٚیدەکەنێ و ناوێکی تری لە شوێن دەروێنێ و تام و چێژی جارانی دەبڕێ، گوێ ناداتە مێژوو و هۆی ناولێنانی ئەم گوندە یان ئەم شارە دەلێ ئەم ناوە لەبار نییە و لەگەلٚ سەردەم ناگونجێ، ناوی جوگرافی (کوردستان)یش، ناوی گوند و دۆلٚ و چیاو گردو گردۆلکە و ڕووبارو شارو شارۆچکە دەگرێتەوە.......... زۆربەشیان ڕیشەیان دەگەرێتەوە سەر زمانی کوردی، بەشێکیشیان ڕیشەکەیان دەگەرێتەوە سەر زمانی گەلانی داگیرکەر، هۆی ناولێنانی هەر ناوێکیش دەگەرێتەوە بۆ ناوی سەرۆك هۆز یان ناوی پاشای ولات، یان ناولێنان بە هۆی زۆری جۆرە ڕووەکێك یان زۆری جۆرە گیانەوەرێك، یان ڕەنگی خاکەکە. ناوە جوگرافییەکانیش بە درێژایی مێژوو لەسەر زمانی گەلانی فەرمانڕەوا شێوەیەکی وەرگرتووە بە گوێرەی کرۆك و تەلەفوزی زمانەکەیان و خستویانەتە قالبی فەرهەنگەکە یان و تۆماریان کردووە، وە یا برگەی (با) کەواتای بێت- نیشتمان- لە زمانی ئارامی دەگەیەنێت لە بەرایی ناوی

جوگرافییەکانەوە ژمارەیەکی زۆریش (ال)یان خستۆتە سەر، گەلی (عەرەب)یش بە هەمان شێوەی گەلانی ئارامی، ئەگەر ناوەکەی نەگۆریبێ ئەوا بە گوێرەی تەلەفوزی زمانەکەی تۆماریان کردووە، ئەم تۆمارکردنەش بە تایبەتی لەلایەن نووسەرەکانی باج و زەوی و زارەوە بووە، (عەرەب)یش برگەی (رأس، وادی قصر، سوق، تل، ام، ابو، قلعه.......) یان خستۆتە سەر ناوە جوگرافییەکان و ناوێکی زۆریش (ال)یان خستۆتە سەر کە هیچ یاسایەکی زمانەوانی نەسەریان جێبەجێ نابێت، (تورك)یش بە هەمان شێوە بڕگەی (تەپە، قەرە، ئاسکی.....) یان خستۆتە سەر ناوە جوگرافییەکان، بێجگە لەمانەش هەندێ ناوی جوگرافی بەڵگەی هەبوونی کانزاکانە وەك (کونە قیر، دەرماناو، کفری، شۆرە، شوریجە )، هەندێکیش بەڵگەی هەبوونی گۆڕی پێغەمبەران و سەیدو چاك و پیرانە وەك (سەید عوێز، سەید عوبێد، ......هتد) بەلام کورد هەر لە کۆنەوە ئامرازی (ئاوا - ئاباد)ی کردۆتە پاشگر بۆ ناوی جوگرافی، کە واتای ئاوەدان و ئاوایی و شوێنی جێواربوون دەگەیەنێت، وەك گەڕەکی کورداوای شاری مەدائن و گوندی کورداوای نزیك شاری عەمارە و ناوی شاری نەینەواو گەلێکی تریش، جا لێکۆلینەوەو توێژینەوە لەم ناوانە سوودی جۆراو جۆری هەیە لە ڕووی مێژوو جوگرافییا و زمانەوانی و ڕامیاری و ئاسەوارو...هتد، وەك بەدیارخستنی زۆر نهێنی مێژوویی و کاروباری کۆمەڵایەتی کۆن و لێکۆلینەوەی زمانەوانی بە تایبەتی زمانی کۆن یان ئەو زمانانەی کە لە ناو چووینە و قسەیان پێ ناکرێ، جا ئەم لێکۆڵینەوەیە زمانەوانیانە دەبێتە هۆی دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگەکەمان[1] .

ناوی جوگرافی زۆربەی گوندو ناوچەکان لە ناوی کەندو دۆڵ و گردو گردۆلکە و چیاو کانی و بیرو شارو شارۆچکەکانەوە هاتووە، ڕیشەی ناوی زۆربەشیان دەگەڕێتەوە سەر زمانی کوردی، هەندێکیشیان ڕیشەکانیان دەگەڕێتەوە سەر زمانی ئەو گەلانەی کە کاتی خۆی کوردستانیان داگیر کردووە، میللەتی کوردیان کەوتۆتە ژێردەست، زۆربەی ئەو ناوانەش ئێکدراون یان دارێژراون لە (ناو + پاشگر)ێك، یان (پێشگر + ناو)ێك، پێك هاتووە، بۆ نموونە پاشگری (ئاوا — اوا - اوە)، دەلکێت بە دوای ناوێکەوە، وا پیشان دەدات کە ئەو کەسە ئەو

---

[1] - عەباس سلێمان سمایل، مێژووی دەشتی هەولێر، بەرگی یەکەم، لە بلاوکراوەکان سەعدوللا شێخانی ژمارە (٦٧)، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٢٣،٢٤ .

جێگایەی یان ئەو گوندەی یان ئەو گەڕەکەی ئاوەدان کردبێتەوە کە بە ناوی ئەوەوە ناو نرابێت، نموونەشمان یەکجار زۆرە وەك: ئۆمەر - ئۆمەراوە، رەحیم — ڕەحیماوە .

ئەو گوندانەش بە ناوی ئەو کەسانە کراون کە بۆ یەکەم جار ئەو شوێنەیان ئاوەدان کردۆتەوە، وەکو: (کورداوە — ئۆمەراوە — عەلیاوە — مەحسوناوا — شێراوە — ئاریاوە — سمایلاوا)، هەندێك لە ناوی گوندو شوێنە جوگرافییەکان بە ناوی سەرۆك هۆزو عەشیرەتەکان کراون، یان ئەو پیاوانەی مرۆیەکی بەرچاو و دیاربوونە لە هۆزەکەدا وەکو: (حەسەن بەگ — میرزاغا...... هتد). یان ئەوەتە هەندێکیان بە ناوی پیاوانی خواناس کراون لە چاك و پیرو سەیدو شێخ و مەلاو حاجی، کاتی خۆی لە زەمانی جیاجیا بە (سەید) یان (شێخ ) وتراوە (پیر) وەك ( پیرداود — پیرڕەش (پیرە ش) — پیرزین — پیرمەم — بابی پیر — سەیدەمین (سەید ئەمین ) — سەید عوبێد — سەیدۆکە — سەید عوزێز )، یان بە ناوی شێخێك کراوە وەك: شێخ شێروان (شەروان ) — شێخانان — گەڕە شێخان — شێخە لاس — شێخ گەزنە— شێخ عبدالعزیز — شێخۆمەر (شێخ ئۆمەر ) — شێخ زادە — شێخ ڕەش، یان ئەوەتە بە ناوی مە لا و زانایانی ئاینی کراون وەکو: مەلا ئۆمەر — مەلا قەرە، یان بە ناوی حاجییەك کراون وەکو: حاجی شێخان — حاجی عەلی، یان بە ناوی قەبری پیاو چاکان کراون وەکو: قەبری عەلی — قەبری سەییدی، لەبەر ئەوەی ئەو دەشت و بنارەکانی و چەم و رووباری کەمە یان کەمتر بووە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان دا ، ناوی سەرەکیان ئاوی بیر بووە، بۆیە هەندێ گوندو شوێنە جوگرافییەکان بە ناوی ئەو (بیر)انە کراون کەلێیەتی یان بە ناوی خاوەن بیرەکان کراون کە هەڵیان کەندوون یان ئەوەتا ئەو ئاژەڵەی ئاوی ئەو بیرەی خواردۆتەوە، وەك: سێبیران — بیرە بەرازە — بیرە جنە — بیری حەمۆکی — بیری حاجی ڕەحمانی عاللآیی — بیرەبات — بیرە قامیشە — بیرە پیران — بیرە دزەیی — یان بە ناوی ئەو کانییە کراوە کەلێیەتی کانییەکەش بە ناوی ئەو گیاندارو باڵندە و ڕووەکە کراوە کە لەوێدا هەیە وەکو : کانی قرژاڵە — کانی سەگان — کانی داودە ڕەش — کانی خەزەران — کانی دێواری - کانی هەنجیر، یان بە ناوی ئەو گردانە کراون کە لێیانەوە نزیکن و شێوە و ڕەنگی خاکەکەی و جۆری گیاو گوڵ و ڕووەکەکەی کە لێی شین دەبن وەکو : گردە سۆر — گردە بۆر — گردە ڕەشە — گردەشینە — گردە زەرد — گردە چاڵ — گردە پان — گرد گلیخە، یان ئەوەتا (گرد)ەکە بە ناوی هۆزێك یان پیاوێك کراوە وەکو : گرد عازەبان — گردمەلا، یان هەندێکیان بە ناوی تام و بۆن و جۆری ئاوەکە کراون وەکو: گڕاو — خۆشاو — سیراوە — ماستاوە — ڕەختاوە — شۆرە زەردکە —

شۆڕە پەلکە – شۆڕاو – شۆڕیجە – دەرماناوە، هەروەها بەشێکیشیان بە ناوی ئەو دارو درەخت و گیاو گولاّنە کراون کە لێی شین دەبن وەك: دارەتوو – دارەخورما – دارەبەن – خورمەلە – تورەق – کەبەرۆك –پونگینە – باخچە هەنجیرۆك، یان ئەوەتا هەندێك لەو ناوانەش دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کاتی کە عوسمانییەکان کوردستانیان داگیرکردووە و ئەو ناوانەیان لێناوە وەکو : قولتەپە – قوشتەپە – باشتەپە – دوزتەپە – گۆگ تەپە (گۆپتە پە ) – قەرەتەپە – قەرەچناغە – قەرەچووغ – قەرە دەرە – قەرە بۆت – قەرە بێتك – مەلا قەرە – قشاغلو – یەدی قوو – یەدی قزلەر، هە ندێکیش بە ناوی هەوارەکە کراون کە کاتی خۆشی رەشماڵ نشین و مەرِدارەکان هەواریان لێ هەڵداوە وەکو: هەوار غەر–دوازدە هەوار– بەرزە هەوار– هەوارە قورە، ئەو ناوە تورکیانەش لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانی ناونراون زیاتر ئەو ناوانەش ئەو خەتە دەگریتەوە کە بە تەلەعفەر–موصل–هەولێر–پردێ– کەرکوك– دووز–کفری– خانەقین–مەندەلیدا دەڕوات، ئەو هێلەش خەتی عەسکەری و ستراتیجی بوو، بەلاّم ئەو ناوە تورکیانە لە ناوچە و دەڤەرەکانی دیکەی کوردستاندا وەکو: ناوچەی خۆشناوەتی– باڵەکایەتی – سورچیایەتی – دەڤەری بارزان و دەشتی زرارەتی هەر نین ئەگەر هەشبن زۆر کەمن، یان هەندێکیان لە ناوەڵ فەرمانێك وەك (سەر) لەگەڵ ناوێك پێك هاتوون وەك سەر مەزرا – سەر گەڕ (سەرگەڕان) – سەر بەشاخ–سەردەریان، یان بە ناوی ئەو (شیو ) و کەندانە کراون کە رِەنگی ئەو کەندو خاك و رووەك و باڵندەیە وەردەگری کە تێیدا دەژی وەکو: شیوە سۆر–شیوەڕەش– شیوە پیران–شیوە شار – کەندێناوە– کەندە بەکرە– کەندار– کەندارە قەل– کەندار مەم– کەندی خەلیفەی– کەندی کفران، یان ئەوەتە لە وشەی (شا–شە) وەکو پێشگرێك لەگەڵ ناوێك پێك هاتوون : شامامەر – شا نۆمەر –شانەشین–شەمامك، جا لێکۆلینەوە لە ڕیشەی ناوی جوگرافی گوندو شوێنەوارەکانمان دەبێتە هۆی دەوڵەمەند بوونی زمان و کولتوری میللەتەکەمان [1]، بۆیە گوندو ناوچەکانی هۆزی شیخ بزێنیش بێ بەش نین لەو هەموو دەستکارییەی عوسمانیەکان و هەموو ئەو هۆکارانەی سەرەوە کە باس کران.

[1]- هۆشیار عبدالله، لێکۆلینەوەیەك لە ناوی جوگرافی و مێژوویی گوندەکانی دەشتی هەولێر، گۆڤاری هەولێر، ژ: ١٤، بەهاری ٢٠٠٢، ل٧-٨ .

**-هۆزی شێخ بزێنی بەزۆری لە دەوری زێی گەورە و بچووك نیشتەجێ بوونە:**

**ناوچەی زابی بچووك و پەیوەندی بە پارێزگای هەولێرەوە**

زابی بچووك ناوچەیەكە لە ڕۆژهەلاّتدا لە نێوان هێڵی درێژی ( ٤٣- ٤٦ )و لە باكور لە نێوان هەردوو بازنەی پانی ( ٣٤- ٣٦ ) دایە و دەكەوێتە باكووری ڕۆژهەلاّتی كوردستانی عێراق. ئەم ناوچەیە جگە لە شوێنە جوگرافیە گرنگەكەی لە ڕووی گەشت و گوزار و كشتوكاڵ و دانیشتوانیشەوە گرنگی خۆی هەیە، هەروەها جگە لە گرنگیە ئابووریەكەی شوێنێكی مێژوویی ستراتیژی گرنگیشە چونكە چەندین دەشتایی بە پیتی تێدایە كە سەرچاوەی ئاوی زۆریان هەیە و هەر لە چاخە كۆنەكانەوە مرۆڤ لەوێدا نیشتەجێ بووە و ژیاوە، ئەو مرۆڤانەش بە كشتوكاڵ خەریك بوونە. لە شوێنەوارە كۆنەكانی زابی بچووكیش (زرزی )یە، كە پاشماوەیەكی چاخی بەردینی كۆنە و ئەو ڕێڕەوە گرنگانەش كە تێدان سوپا داگیركەرەكان لە عێراقەوە بۆ ئێران و ئازەربێجان و دەریاچەی و ڕێی پێدا تێپەڕیون. هەروەها سەرجۆن لە كاتی شالاّوی هەشتەم لە ساڵی ( ٧١٤ پ.ز ) بە دەربەندی (رامكە) پەڕیوەتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ زۆر شارستانیەتی كۆن لە ناوچەكەدا ژیاون و كۆمەڵێك بنكەی ئیداری وەك سلێمانی و هەولێرو كەركوك و موسڵ دەكەونە سەر ڕۆخی زێی بچووك. ڕووبەری ناوچەی زاب بە نزیكەی ( ٢٠,١٤٩ كم ) مەزندە كراوە كە دەكاتە( ٤٦٪ )ی ڕووبەری عێراق، بەپێی هەندێ سەرچاوە زێی زاب پێی دەگوترێ (تەهماسب ) و ئاشوورییەكان بە (زاباشبالو ) ناویان ناوە و (بە تلیمۆس ) پێی گوتووە (كابروس) . لە كاتێكدا (زەینەفون ) پێی گوتووە (زابو توس )[1] .

كۆمەڵێك گەریدەی بیانی بەو ناوچەیەدا تێپەڕیون، وەك (رادولف) كە ماندوو بوونێكی زۆری لەو پەڕینەوەیە بینیوە، شت و مەك لەوێوە گوێزراوەتەوە، هەروەها ئەو كاروانانەی بۆ هیند چوون بەوێدا ڕۆیشتوون .

هەر لە كۆنەوە ئالتّوون كۆپری بە ناردنی دانەوێڵە بەهۆی (كەلەك ) ناوبانگی دەركردووە . لە سەردەمە كۆنەكانیشدا ڕووداوی مێژوویی ترسناك و جەنگی پڕ زەبرو زەنگ لەسەر هەردوو كەناری زێی بچووك دا ڕوویانداوە كە گرنگترینیان ململانێی نێوان ئەمەوی و

[1]- جاسم محمد الخلف، جغرافية العراق الطبيعية والبشرية والقتصادية، جامعة الدول العربية، مطبعة البيان، القاهرة، ١٩٦١ ، ل ١٥ .

عەباسییەکانە نزیك (کوشاف). بەشێوەیەکی گشتی دانیشتوان لە هەموو ناوچەی زێی بچووکدا لە گوند و شارەکان بڵاوبوونەتەوە ئەوەی یارمەتی ئەوەشی داوە بارینی بارانی زۆرو چاندنی گەنم و جۆو هەبوونی ئاوی هاوین و سەرچاوە و کانیاو و بیرە، لە هەمان کاتدا لە وەرگای سروشتی زۆری لێیە. بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٦٥) نزیکەی ( ٤٦٪ )ی دانیشتوانی عێراق لەوێ دەژین[1] و ( ٨٦٪ ی) ئەوانەش بە کشتوکاڵ خەریکن . ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی بەم جۆرە لە دەشتاییەکان بڵاوبێتەوە، چونکە خاکەکەی بە پیت و بەرەکەتە و ئاوی زۆرە. لە رووی جیۆلۆژییەوە ئەم ناوچەیە بۆ دوو بەش دابەش دەبێ کە یەکیان ناوچەی شاخە گۆڕەکان (الجبال المحدبە ) و گردەکانە و دووەمیان ناوچەی شاخە بەرزەکان و ڕۆخەکانی چیایە (الحانات الجبلیە ) وەك ناوچەی رواندز کە پێکهاتەی جیۆپۆلۆژی و پرۆژەکانی ژێر دەست و عەمبارکردن وەك لە بەنداوی دوکان دەردەکەوێ پەیوەندیان پێکەوە هەیە[2]. هەروەها لە ناوچەی زابدا بڕێکی باش ئاوی ژێر زەوی هەیە کە لە ڕێی زۆری باران و زۆر بەفر بارین کۆبۆتەوە و تاشە بەردەکانیشی لە کلس و لمی بەردین پێکهاتوون. ئەمە و کانیاوی سەرچاوەکانی ئاوی لە قولاًیی (١- ١٣٠ )م دان ، وەك لە ناوچەی مەخموور بەرچاو دەکەوێ[3] . هەروەها قووڵی بیرەکانی هەولێر لە نێوان ( ٤ — ٢٥ )م دان و لەبەر ئەوەی دەشتی هەولێر لە چیاکانی دەوروبەری مەسیف و سەفین نزیکن بۆیە ئاوی زۆر لەو دەشتە هەیە و بۆ قولاًیی ( ٢٣م )چۆتە خوارەوە، پاشانیش بۆ جاری دووەم لە باشووری رۆژئاوای چیای قەرەچوغ هەڵدەقوڵێتەوە. بەلایەنی کەم ( ١١٥ ) چیا لە ناوچەی زابدا هەیە و گرنگترین دەشتی سەر بە پارێزگای هەولێریش لە ناوچەی زاب دەشتی دیبەگەیە کە پانییەکەی (١٦کم) و درێژی (٨٠ کم) و بەرزایی (٢٧٥)مەترە. ئاوی ئەم دەشتەش دەچێتە سەر دەشتی کەندیناوە . بەلاًم دەشتی هەولێر لەلای باکوری چیایی (ئاوانە داغ ) لە شێوەی سێگۆشە دایە و بەلای رۆژئاوا بۆ بانەکانی کەرکوك درێژ دەبێتەوە و بریتییە لە دەشتێکی بە پیت و پشت بەستن بە ئاوی باران، گەنم و جۆی لێ دەچێنرێ .

[1] - شریف ابراهیم ، الموقع الجغرافی للعراق واثرة فی تاریخە العام حتی الفتح الاسلامی، مطبعة شفیق، بغداد- ١٩٦٢ ، ل٤٥.

[2] - عباس فاضل السعدی، منطقة الزاب الصغیر فی العراق، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٧٦ ، ل ٤٢ .

[3] - عباس احسان البغدادی، المیاه الجوفیة فی العراق، بغداد، ١٩٦٠ ، ل ١٤٠.

هەرچی دەشتی مەخموورە دەکەوێتە نێوان چیای قەرەچوغ و زێی بچووك. کەش و هەوای ناوچەی زابیش لە هاویندا گەرم و وشکە و لە زستانان ساردو باراناویە، جۆری بارانەکەی لە جۆری (رەهێلەیە ) یا (گەردە لوولیە ) کە سەرچاوەکەی دەریای ناوەراستە[1]. زۆر بارینی بارانیش وای کردووە دارستانی عێراق پێك دێنێ. ئاوەرۆی زێیەکە لای چیاکانی کۆیێ و چیاکانی سورداش تەسك دەبێتەوە و لە تەقتەق دا بەرەو ناوچەیەکی شاخاوی بۆ ئالتّون کۆپری دەروات ، کە لەوێ کشتوکاڵ زۆرە و دێهاتی زۆری لێ بڵاوبۆتەوە[2]. لێژایی زێیەکەش لەم شوێنەدا دەگاتە (١١١:١) و پاش ئەوەی ئالتّون کۆپری بە جێ دێڵێ بەرەو باشووری رۆژئاوا پێچ دەکاتەوە، ئینجا پاش (٩کم) بەنداوی دبیل دێ کە لە ساڵی ( ١٩٦٥ ) دامەزراوە. ئەم ناوچەیەش کە دەکەوێتە نێوان ئالتّون کۆپری و ئاوەلێژی (مصب )ی زێی بچووك لە دیجلە دا (٩٦کم) بەڵام درێژی زێی بچووك دەگاتە نزیکەی (٤٠٠کم)، ئەگەرچی پێوانەی تریش بۆ ئەم درێژییە هەیە. بڕی ئاوی زێیەکەش ڕووبەرێکی کشتوکاڵی چاك ئاو دەدات کە بە ( ٨٥,٠٠٠ ) دۆنم مەزندە دەکرێت. پاش دروستکردنی بەنداوی دوکان کەل و پەل و پێویستییەکانی ئاو زیادی کرد و ئاوەکەی ( ١,٥ ) ملیۆن دۆنم لە ناوچەی زابدا ئاو دەدات. دەشکرێ سوود لە ئاوی زێیەکە بۆ بەرهەم هێنانی وزەی کارەبا وەربگیرێ بە نداوەکەش وا دروست کراوە تا بتوانێ بڕی ( ١٠٣,٧٣ ) کیلۆ وات کارەبا بەرهەم بێنێ . خەڵکی ناوچەکە ئەوانەی راستەوخۆ سوود لەو ئاوە وەردەگرن دەگاتە (٣٨٤,٠٠٠) کەس[3]. پرۆژەیەکی ئاودێری لە مەخمور دروستکراوە بۆ ئەوەی ئەو زەوی و زارانە کەوتوونەتە نێوان ئاوەلێژی زابی گەورە لە باکوور و زێی بچووك لە باشوور و چیای قەرەچوغ لە ڕۆژهەڵات و رووباری دیجلە ئاو بدات.

زێی بچووك لقی مەخموری هەیە کە سوود لە عەمباری دوکان وەردەگرێ. ئە م پرۆژەیەش ئاودانی نزیکەی (٢٥,٠٠٠) دۆنم زەوی و زاری لە سەرە و ئەو زەوی و زارەی لە ڕێی زێی گەورە ئاو دەدرێ بە نزیکەی (١٦٢,٠٠٠) دۆنم مەزندە دەکرێ[4] .

---

[1]- فتح اللة سعيد وآخرون، الري في المحافظات الشمالية ، وزارة الري، بغداد، ١٩٧٠ .

[2]- حسن كتاني، الغابات في العراق، بغداد، ١٩٥٥ ، ل ٥.

[3]- احمد سوسة، الري في العراق، مطبعةالاهلية، بغداد، ١٩٦٥ ، ل٦٩.

[4]- مشروع خزان دوكان، الحكومة العراقية، مجلس الاعمار، مطبعة االعاني، بغداد، ١٩٥٥ ، ل٩.

هەرچی کارێزەکانە ئەوا بە سەرچاوەیەکی دیکەی ئاو لە ناوچەی زابی بچووك دەژمێردرێ. ئەو کارێزانەش بۆ سەردەمی کۆن دەگەڕێتەوە و بۆ مەبەستی خواردنەوەو ئاودان بە کاردێن. ڕەنگە کۆنترین کارێزیش لە هەولێر بۆ چاخی پێش زاین بگەڕێنەوە وەك کارێزی سوڵتان موزەفەر. جگە لەمە لە ژمارەیەکی زۆر ترۆمپای ئاو کە بۆ ئاودانی بێستان و مەزارەکان بەکاردێن، هەروەك لە دەشتی هەولێر هەن و لە ئاڵتون کۆپری و دوبزو کەندێناوە و مەخمور و قوشتەپەش بەکاردێن. سیفەتی دیاریش بۆ چاندنی گەنم لە ناوچەی زێی بچووك ئەو پەیوەندییەیە کە لەگەڵ جۆدا هەیەتی، واتا چاندنی جۆ لەو ناوچانەی گەنمی لێ دەچینرێ کەمە و بە پێچەوانەش ڕاستە، چونکە نرخی تەنێك گەنم سێ بەرامبەری نرخی یەك تەن جۆیە. هەروەها ئەو ناوچانەی گەنمیان لێ دەچینرێ دەکەونە مەخمور و زەویەکانیش بە پیت و بەرەکەتن. هەروا ئەو زەویانەی کەمتر بە پیتن ئەوا جۆیان لێ دەچینرێ، کشتوکاڵ لە قەزای مەخمور لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی دەگۆڕێ. بۆ نموونە لە دەشتی قەراج بە چاکترین ناوچە بۆ کشتوکاڵ نەك هەر لە زاب بەڵکو لە هەموو عێراق دا دەژمێردرێ، بە پلەی دووەمیش کەندیناوە دێ. ئەم جیاوازییەش بۆ هۆکاری کەش و هەواو خاك دەگەڕێتەوە و قوشتەپە لە ڕووی چاندنی گەنمەوە بە پلەی دووەم دێ، لە کاتێکدا شارۆچکەی ئاڵتون کۆپری بە پلەی سێیەم دێ. هۆی کەمی ئەو ڕووبەرەیەش کە جۆی لێ دەچیندرێ بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پتر بۆ چاندنی گەنم بەکار دەهێنرێ[1]. ژمارەی دانیشتوانی ناوچەی زێی بچووکیش لە شوێنەکەوە بۆ شوێنێکی دی جیاوازی هەیە، بە تایبەتی دانیشتوانی ئەو گوندانەی دەڕواننە زاب و ئەوانەی لە شارەکان دەژین .

ڕێژەی باران بارین لە ناوچەی زێی بچووك بەپێی ئەو ئامارانەی کە بڕی بارینی بارانیان تۆمار کردووە، بە تایبەتی لە وەرزی زستان و بەهاردا ساڵانە تێکڕای لە رواندوز گەیشتۆتە (٧٣٣,٣ ملم) و لە شەقلاوە گە یشتۆتە (٩٢٩,٥ ملم) و لە هەولێر (٥٣٠,٦ ملم) و لە مەخمور(٢٤٣,٣٦ ملم).

---

[1] - عبدالقادر الناجي، المحاصيل الزراعية في العراق، وزارة الزراعة، تقرير الاستهلاك المائي في الزراعة، مطبعة الحكومة، ١٩٦٦.

جیاوازیش لە پێویستییەکانی ئاو بۆ بەکارهێنانی تازە بەپێی ژمارەی دانیشتوان هەیە کە پشت بە ئاوی ناوچەی زێی بچووك دەبەستن. لە ئاماری ساڵی (١٩٦٥) ژمارەی دانیشتوانی ناوچەی زێی بچووك وەك لەو خشتەیەی خوارەوە دەردەکەوێ گەیشتۆتە:

| جۆری ژیان | ژمارەی دانیشتوان | تێکرای بەکارهێنان |
| --- | --- | --- |
| لە شار | ٢٠٥٣٤١ | ٦٦ |
| لە گوند | ١٧٩١٢٤ | ٣٣ |

ئاماری ساڵی ١٩٦٥

شارەزایانیش پێیان وایە پێویستییەکانی ئاوی بەکارهاتوو لە لایەن خەلکەوە بەپێی مەزندە کردنی بەکارهێنان و پەیوەندییەکانی بە ژمارەی دانیشتوان ڕوو لە زیادبوون دەکات. نموونەی ئاماریش دەربارەی ئەو بەکاربردنانە و بەپێی مەزندە کردنی ساڵی (١٩٨٥) بەم جۆرە بووە [١].

| جۆری ژیان | ژمارەی دانیشتوان | بە کار بردنی ئاو |
| --- | --- | --- |
| شارستان | ٥٩٥٤٩٢ | ٩ |
| گوندی | ٣٣٥٣٣٩ | ١١ |

ئاماری ساڵی ١٩٨٥

بەلاّم لە مەزەندەی ساڵی (١٩٩٥) جیاوازی زۆری لە نێوان ئەو ژمارەیە و ژمارەکانی پێشوو دەرخستووە، کە بەکارهێنانی ئاو لەگەڵ زۆر بوونی ژمارەی دانیشتوان بەپێی خشتەی خوارەوە زیاد کردووە .

| جۆری ژیان | ژمارە ی دانیشتوان | بە کار هێنانی ئاو |
| --- | --- | --- |
| لە شار | ٦٩٣٣٣٨ | ١٤٤ |
| لە گوند | ٣٧٦٣١٥ | ٢٠ |

ئاماری ساڵی ١٩٨٥

[١]- يحيى هاشم محمد، سياسة تخطيط المشاريع الزراعية في العراق، مجلة الاقتصاد، العدد: الخامس، السنة الاولي تموز ١٩٦٨.

- **زێی گەورە:**

ئەم زێیە بەگرنگترین لقی ڕووباری دیجلە دەژمێردرێ ،لە چیاکانی هەکاری لە ناوەڕاستی نێوان دەریاچەی وان لە تورکیا و دەریاچەی ورمێ لە ئێرانەوە هەڵدەقوڵێ و بەزەوی شاخاوی زۆر سەختدا تێدەپەڕێ کە بەرزاییان لە ڕەشکۆ داخ و چیاداخ دەگاتە (٤١٦٨م)و چەندین دەربەندو تەنگەبەریان هەیە . بەرلەوەی بێتە ناو خاکی عێراقەوە ڕووبارەکە ئاراستەی باشووری ڕۆژهەڵات وەردەگرێ لەنزیك گوندی چال لەباکوری قەزای ئامێدی و بەناوچەی بارزاندا تێدەپەڕێ دوای ئەوەی بەنێوان هەردوو زنجیرە چیای شیرین و پیرسدا تێدەپەڕێ و بەرەو باشوری ڕۆژهەڵات لادەدات و لەوێ ڕووباری شین و شەمدینانی تێدەرژێ کە لەکوردستانی ترکیاوە هەڵدەقولێن لە بلێ لقی ڕووباری کوچکی تێدەرژێ ، دوای ئەوەی ڕێڕەوی ڕووبارەکە لەلای چیاکانی شێروانە تەنگ دەبێتەوە لقی ڕواندزی تێدەڕژێ کەوا پێشنیار کرابوو لەباشووریەوە ئاوبەندی بێخمە دروست بکرێ ، پاشان ڕووبارەکە ڕێڕەوی خۆی بەئاراستەی باشووری ڕۆژئاوا دەگۆڕێ و لقی بەستۆڕەی تێدەرژێ و پاشان بە خازر دەگات کەلە هەردوو لقی خازرو کومل پێکهاتووە و لەنزیك گوندی نەمرود دەرژێتە دیجلەوە، درێژی زێی گەورە (٣٩٢کم)ە، بەلاّم ڕووبەری حەوزو گۆمی خۆراکدانی دەگاتە (٢٦٤٧٢کم٢)ی، دەکەوێتە ناوچەی شاخاوی و (٧٠٠٢کم) ی، دەکەوێتە ناوچەی گرد و دۆڵەکانەوە. تێکرای ئاو لەبەر ڕۆیشتنی زێی گەورە لەوێستگەی کەلەك خۆی لە (٤٢١/٤م ٣/چرکە) دەدات ، کەچی داهاتی ئاوی ساڵانەی تێکڕای دەگاتە (١٣/٢٩ملیار م٣). لەساڵی (١٩٦٩)دا کەساڵانێکی بەلافاو بوو ڕووبارەکە بەرزترین لەبەر ڕۆیشتنی تۆمارکرد کە گەیشتە (٩٧١٠م٣/ چرکە) و بەرزترین داهاتی ئاوی ساڵانەشی ( ٢٣/٦٣ ملیار م٣ )بوو لەهەمان ساڵدا. ئەم ڕووبارە بەرێژەی (٣٢/٦٤%) بەشداری لە کۆی ساڵانەی ئاوی دیجلە دەکات ، دوو ڕوانگەشی بۆ ڕوانینی لەبەر ڕۆیشتنی ئاو لەسەر ئەم زێیە دروست کراوە یەکێکیان لە ئاسکی کەلەك و ئەوی دیکەیان لەسەر ڕووباری خازرە.

زێی گەورە: سەرچاوەی ئەو ڕووبارە دەکەوێتە نێوان دەریاچەی ورمێ لە کوردستانی ئێران و دەریاچەی وان لە کوردستانی تورکیا و لە نزیك ئامێدی دێتە ناو خاکی هەرێمەوەو ئینجا بەرەو خوارووی ڕۆژهەڵات شۆڕ دەبێتەو دوای ئەوەی دەگاتە ڕواندز بە ناوچەیەکی وادا دەڕوات کە چەند زنجیرە گردۆلکەیەکی بەرزایی جیاوازیان تێدایە و لەدووری (٤٩کم) لە خوارووی

موسڵ دەرژێتە ڕووباری دیجلەوە لە ڕێرەوە بەرزەکەیدا زێی گەورە بۆ ڕووبارەونی دەست نادات ، چونکە دۆڵاییەکەی تەسکەو چیای بەرز دەورەی داوە. دوابەدوای خاڵی بەیەك گەیشتنی بەستۆڕە بەزێی گەورە لەلای چەپەوە دۆڵاییەکەی فراوان دەبێت و لەوێوە هەردوو بەری زێیەکە تا لە دیجلە دەکاتەوە وردە وردە ڕاست و ڕێك دەبێ و تەنیا بەشەکانی خوارەوەی بۆ ڕووبارەوانی دەست دەدا [1].



**ئەستان (لیواء - پارێزگا):**

گەورەترین یەکەی ئیداریە لە باشوری کوردستاندا. کاروباره ئیداریەکانی ئەستان، لەلایەن کاربەدەستێکی دەوڵەتەوە بەناوی پارێزگار بەڕێوەدەبرێت. ناوبراو بەفەرمانی کۆماری یان بە بڕیاری سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دادەمەزرێت و دەستیشی لە کار دەکێشرێتەوە. ئەو کارمەندە بەرپرسیاری یەکەمی بەڕێوەبردنی هەموو کاروبارە ئیدارییەکانی ئەستان و هەندێ جار کاروباری سەربازیش لە ئەستۆی خۆی دەگرێت. لەهەمان کاتدا بڕیارو فەرمانەکانی

[1]- جیۆگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق ، دانانی کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ ،چ ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ١٩٩٨، هەولێر، ل ١٣٤،١٣٣،٣٧٤ .

دەوڵەت جێبەجێ دەكات و بەنامە و ڕاپۆرتی تایبەتی و سەردان بۆ پایتەخت دەسەڵاتی ناوەندی لەهەموو دەنگوباسەكانی ئەستانەكە ئاگادار دەكاتەوە. ئەستان لەچەند یەكەی ئیداری لە خۆی بچوكتر بەناوی قەزا پێك دێت .

**قەزا:**

ئەو یەكە ئیدارییە یە لەڕووی دەسەڵات و ڕووپێو و ژمارەی دانیشتوانەوە لە دوای ئەستانەوە دێت . لەسەر هەریەكێ لەو یەكە ئیداریانە كاربەدەستێكی دەوڵەت بەناوی قائیقام دادەنرێت، كە ئەویش بەفەرمانی تایبەتی كۆماری دادەمەزرێت و لادەبرێت. ئەو كاربەدەستە بەزۆری پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ پارێزگار هەیە لەهەمان كاتیشدا لە جێبەجێكردنی فەرمانەكان و ئاگاداركردنەوەی لایەنەكانی سەرووتر لەخۆی ، لە هەموو كارو بارە ئیداری و ئابووری و كۆمەڵایەتی و ڕامیاری و سەربازییەكان لە چوارچێوەی یەكە ئیداریەكەی خۆیدا بەرپرسیارە .قەزا لەچەند یەكەی لەخۆی بچوكتر بەناوی ناحیە پێك دێت .

**ناحیە:**

سێیەمین پلەی ئیدارییە لە باشووری كوردستاندا. گەورەترین بەرپرسیاری ئەو یەكە ئیدارییە كاربەدەستێكە بەناوی بەڕێوەبەری ناحیەوە (مودیری ناحیە) كەبەفەرمانی وەزیری ناوخۆ دادەنرێت و دەستی لەكار دەكێشرێتەوە هەندێ جاریش بەفەرمانی كۆماری دادەنرێت. ئەركەكانی سەر شانی مودیری ناحیە زیاتر خۆی لە هەڵسووڕاندنی كاروباری ئیداری لە ناحیەكەو ئاگادار كردنەوەی قائیقام لە بارەی دانیشتوانی ناحیەكەوە دەنوێنێت، هەروەها بڕیارو فەرمانەكانی پارێزگار و قائیقام بە خەڵكی دەگەیەنێت و جێبەجێیان دەكات .

**گوند :**

بچووكترین یەكەی ئیداریە لە باشووری كوردستاندا و لە چەند خێزان پێك هاتووە. كاروباری ڕۆژانەی هەمەچەشنەی گوندەكان، لەلایەن یەكێ لەدانیشتوانی گوندەكەوە، بەناوی (موختار) ەوە دەبردرێت بەڕێوە، بەهەڵبژاردن یاخود بە دەست نیشانكردن لە لایەن بەڕێوەبەری ناحیەوە دیاری دەكرێت . ئەركی سەرشانی موختار، ئاگاداركردنەوەی سەنتەری ناحیەیە لە هەموو

جۆرە جموجۆڵێکى دانیشتوانى گوندەکان و گەیاندنى هەموو بڕیارو راسپاردەکانى بەڕێوەبەرى ناحیەیە بە خەڵکى گوندەکان[1] .

**چەمکى گوند:**

بەر لەناساندنى چەمکى گوند ،دەمەوێت ئەو ڕاستیە دیار بخەم کە لە زمانى کوردیدا جیاوازى لەنێوان (القریە والریف)ى عەرەبى و(village – rural – countryside) ى ئینگلیزى دا ناکرێت ،لێرەدا هەوڵدەدەین کۆمەڵگاى لادێ و لادێ بەرامبەر الریف و(rural) و گوند بەرامبەر القریە و(village) بەکاربهێنین ، بەو واتایەى لادێ و کۆمەڵگاى لادێ شوێنى بەرفراونى گوند دەگرنەوە . گوند لەڕووى زمانەزانییەوە چەند ناوێکى ترى پێ دەگوترێت ، ئەمەش پەیوەستە بە ناوچە جیاجیاکانى کوردستان و بە لەهجەو شێوە زارەکییەکانى زمانى کوردى . بەم شێوەیە گوند پێى دەگوترێت (گوند، دێ، لادێ(هەو_هەورامییە)دەگا: دەماردار، زەبەردەست، دێهات، ئاوایى)[2] .

گوندو کۆمەڵگاى لادێ، بەبەراورد لەگەڵ شارو کۆمەڵگاى شار، جیاوازییەکى زۆریان هەیە، ژمارەیەکى زۆر لەزاناو کۆمەڵناسان ئاماژە بە جیاوازییە جۆراوجۆرەکان دەکەن و پێناسەى لادێ(گوند) لەپێناسەى شار، جیادەکەنەوە .

ئیبن خەلدون کۆمەڵگاى لادێ بە کۆمەڵگاى بەدوو(البدو) پێناسە دەکات، زاناى ئەڵمانى فردیناند توینز، زاراوەى گەمینشافت (gemeinschaft) واتە کۆمەڵگاى خێزانى (لادێی) بەکاردەهێنێ، ئەمیل دورکائیم، وەك کۆمەڵگایەکى میکانیکى ناوى دەبا، هوار بیکر بەکۆمەڵگاى پیرۆز ناوى دەهێنى، ڕۆبرت ڕێفلید بە کولتوورى نیللى وەسفى دەکات، تشارلز کوولێ بە کۆمەڵگاى سەرەتایى دادەنێت . سۆرکین، باس لە سێ جۆر پەیوەندى دەکات کەیەکێکیان بەپەیوەندى لادێ ناوى دەبات . لومس و بیجیل، کە دوو زاناى ئەمریکین،

---

[1]- د. عەبدوڵلا غەفور، جوگرافیاى دانیشتوانى باشورى کوردستان، چ١، چاپخانەى حاجى هاشم هەولێر، ٢٠١١.

[2]- گیوى موکریانى، فەرهەنگى کوردستان ، دەزگاى ئاراس، چاپى یەکەم، هەولێر، ١٩٩٩، ل:٧١٩.

هەردوو کۆمەڵگای شارو لادێیان بە کۆمەڵێك خاڵی بەراوردکاری لەیەك جیاکردوەتەوە و شرۆڤەی تەواویان بۆ هەریەك لە کۆمەڵگاکان ڕێکخستووە[1] .

د.شاکر مستەفا سەلیم دەڵێ: (گوند(القریە)) کۆنترین شێوازی نیشتەجێبوونە کە مرۆڤ ناسیویەتی، باوەڕوایە کە گوند لەمیسر لەپێش نزیکەی دە هەزار ساڵ، لە چاخی بەردینی نوێ سەریهەڵداوە. گوند پێك دێت لەکۆمەڵێك ماڵ ، کە یەکەیەکی خۆجێی پێکدەهێنێت و ناوچەیەکی دیاریکراو لە کۆمەڵگای (لادێ) دەگرن، ژیان وگوزەرانیان لەسەر زەوییەکانی دەوروبەری خۆیان دەبێ، کە قەوارەیان بچوکە کەئەمەش وادەکات دانیشتوانەکان یەکتری بناسن. گوندیش بە بنچینەی کۆمەڵگای لادێ دادەنرێ. دانیشتوانەکانی وەك یەکەیکی ئابووری وان و بۆ وەبەرهێنانی زەوییەکانیان ، هەردەم هاوکاری یەکتری دەکەن[2] .

چونکە لەگەڵ قۆناغی کشتوکاڵیدا، مرۆڤ لەگوندا نیشتەجێ بووە، کە پێکدێت لە کۆمەڵێك خانووی تێدا ژیان، کەیەکەیەکی نیشتەجێی تایبەت پێکدێنن و ناوچەیەك لەلادێ داگیردەکەن، کە لەژیانیاندا پشت بە کێڵگەی دەورووبەریان دەبەستن.

پێوەرەکانی گوندبوون و پێناسەکانی گوند، جۆراوجۆرە ، هەندێك پێناسە لەسەر بنەماو پێوەری زۆریی و کەمی دانیشتوان دەکەن، هەندێکی تر لەسەر بنەمای پیشە و کارکردن دەیکەن، بەتایبەت پیشەی کشتوکاڵ، هەندێك جاریش پێوەری یەکە ئیداری و کارگێرییەکان دەکرێنە پێوەر، لەم بارەیەوە د.عبدوڵلا غەفوور دەڵێت (گوند ئەو ناوەدانیەن کەبەر پێناسەی ڕەسمی شار ناکەون.واتا ئەو ئاوەدانیانەی نەیەکەی سەنتەری ئیدارییان هەیە (پارێزگا، قەزا، ناحیە) نە ژمارەی گشتیشیان دەگاتە دە هەزار کەس[3] .

هەروەها دەڵێ: گوند جگە لەدانیشتوانی سەنتەری سەر ناحیەو، ناوچەو بەرناوچەکان،هەموو دانیشتوانی ئەو ئاوەدانیانەی تری کوردستان دەگرێتەوە[4] .

---

[1]- د.علی فواد احمد، علم المجتمع الریفی ، دار النهظة العربیة ، بیروت، ١٩٨١، ص٣٧-٤٤.

[2]- د.مصطفی شاکر سلیم، قاموس الأنثروبولوجیا، الطبعة الأولی، جامعة کوین، ١٩٨١، ص١٠١٧

[3]- د.عەبدوڵلا غەفور، جوگرافیای کوردستان، دەزگای موکریانی ، چاپی چوارەم ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ل٢٤٣.

[4]- سەرچاوەی پێشوو، ل:٦٥ .

مەنوچێهەر موحسنی، بەم جۆرە پێناسەی لادێ دەکات (لادێ: بریتیە لەناوەندێکی دانیشتوان و شوێنی نیشتەجێ بوون و کاری هەرەوەزی خێزانەکان ، کەلەزەویەکانیاندا خەریکی کاری کشتوکاڵین و زۆربەی دەرامەتی تاکەکان لەڕێگەی کشتوکاڵکردنەوە دابین دەبێت و بەشێوەیەکی ئاسایی لەناوچەکەدا بەلادێ یان گوند بناسرێت). لەم پێناسەیەدا پیشەی جووتیار لەبەرچاوگیراوە . پێوەری دیموگرافی( دانیشتوان ): ئەم پێوەرە گوزارشت لە تەواوی دانیشتوانی ناوەندی نیشتەجێبوونەکە دەکات، دەوڵەتان لەڕووی قەوارەی گونجاوی دانیشتوانی ناوەندی شارنشینەوە جیاوازن، لە کۆریا (٤٠)هەزار کەسە، لە ژاپۆن(٤٠)هەزار کەسە، لە میسر (١١)هەزار، لە هندستان(٥)هەزار، هەندێك لەمانە چڕی دانیشتوانیش لەگەڵ بەکاردەهێنن ، بۆنمونە هندستان (١٠٠٠)کەس بۆ یەك میللی چوارگۆشە، لەئەمریکا بەهەمان چڕی و هەمان شێوە [1]. لە پاکستان تەواوی ئەو ناوچانەی کە ژمارەی دانیشتوانیان لە (٥٠٠٠)کەس کەمترنییە بەپێی بڕیاری پارێزگا بەشار دادەنرێت. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەر شوێنێك ژمارەی دانیشتوانی لە(٢٥٠٠)کەس کەمتر بێت بەلادێ ناو دەبرێت، هەرچەندە لادێنشین بە کشتوکاڵ خەریك بێت، بەلاَم کە ژمارەیان لەم ڕێژەیە واتە(٢٥٠٠)زیاتر بێت ، بەلادێ دانانرێت. لەم پێناسەدا ژمارەی دانیشتوان لەبەرچاو گیراوە [2].

لێرەدا پێناسەی لادێ پەیوەندی بە پیشەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە ئامارو ژمارەوە هەیە [3] .

برۆدۆل لەکتێبەکەی (سەرمایەداری و ژیانی ماددی_١٩٦٧)دا دەڵێت: (ئەگەرچی شار بەتەواوی بەرهەمهێنانی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان و بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتی بە گوند نەسپارد، گوندیش بەهەمان شێوە هەموو چالاکییە پیشەسازیەکانی خۆی ڕانەگرت، بۆ بەرژەوەندی شارە نزیکەکان .بۆیە هەرگیز لادێکان چۆڵ نەبوون لە پیشەکاران [4] .

---

[1] - د.خەلیل محمد ئیسماعیل ، شارو کەنارەکانی شار ، گۆڤاری مەدەنیەت، ژمار: ٦، سلیمانی، ١٩٩٩، ل:١٤.

[2] - مەنوچێهر موحسنی، دەروازەکانی کۆمەڵناسی ، و: ڕێبوار سیوەیلی و ئەوانی تر، دەزگای موکریان ،هەولێر، ٢٠٠٢، ل٢٨٤ ، ٢٨٥ .

[3] - د.علی فواد احمد، علم الاجتماع الريفي، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦.

[4] - مەنۆچێهەر محسنی ، سەرچاوەی پێشوو، ل: ٢٨٥.

گوند پێش هەر شتێك جۆری لە ژینگە دەردەبڕێت، واتا پارچە زەوییەك کە لەلایەن مرۆڤەوە داچێنراوە، هەربۆیە ئەو ناوچانەی نەچێنراون بە گوند ناونانرێن[1] .

لە هەندێك ولآتانی خۆرئاوادا ، پێناسەی لادێ بەستراوەتەوە بە جۆری پیشەسازی بۆ ئەم مەبەستە پیشەسازی بەپێی ئاست دابەشکراوە، یەکەمیان پیشەسازییە سەرەتاییەکانە، کە بریتین لە دەرهێنانی ماددەی خاو، وەك کشتوکاڵ، ڕاو ، کاری ڕەژوو دەرهێنان، ئەسفەنج دەرهێنان ئاستی تری پیشەسازی بریتین لە پیشەسازی گۆڕاو (التحویلیە) یان ناوەندی .

لە باشووری کوردستان، یەکە ئیدارییەکان ڕۆڵی بەرچاویان دەبێت لە جیاکردنەوەی لادێ و شاردا، ئەوگوندەی یەکەی ئیداریو کارگێری ناحیەکی بۆدابمەزرێ، ئەوا لەپێناسەی گوند دەچێتە دەرو دەبێت بە شارۆچکە (ناحیە) یان شارە دێ، لەم کاتەدا تەنیا شوێن وهەڵکەوتەی ستراتیجی و جوگرافی گوندێك بۆچەند گوندێکی دەوروبەری خۆی، ڕۆڵ دەگێڕێ و هۆکاری لەبارو گونجاو دەبن بۆگواستنەوەی گوندێك و خالی بەیەکەوە بەستنەوەیان[2]. لە مێژووی بەشارۆچکەبوون چەند گوندێکی ناوچە شاخاویەکانی باشووری کوردستان ئەمە زۆر بەڕوونی بەرچاو دەکەوێت، کەوایکردووە شوێن پێگەی هەندێك گوندی بچووك، گوندەکە بکاتە سەنتەری کۆمەڵێك گوندی دەوروبەری خۆی و پێناسەی شارەدێ یان شارۆچکەی پێبدرێ و ڕۆژلەدوای ڕۆژ گەشە بکات ، کەواتە پێوەری ژمارەی دانیشتوان یان پێوەری پیشەیی لادێ ناتوانن هێندە ڕۆڵیان لە گۆڕینی گوند بۆ شار هەبێت، بەتایبەت بۆناوچە چیاییەکانی باشووری کوردستان، ئەمە زۆر ڕاست دەبێت. گوند لەزۆربەی کاتەکان لەباکوری عێراق (کوردستان)[3] پێکدێت لەژمارەیەك ماڵ کەلە نێوان(١٥-٢٠) ماڵ دەبێت، بەلآم لەگوندە

---

[1]- موراد حەکیم محەمەد، ئاکامە کۆمەڵایەتیەکانی سیاسەتی ڕاگواستنی کورد، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کورد، سلێمانی ، ٢٠٠٤، ل :٧١.

[2]- د. محمد عبدالهادی دکلە و نەوانی تر، المجتمع الریفی، وزارة التعلیم العالی و البحث العلمی، جامعة بغداد، ١٩٧٩، ل: ١٤٩.

[3]- باکووری عیراق، قسەی د. محمد عبدولهادیە، کە وەك خۆی لە سەرچاوەکە وەرگیراوە .

گەورەکان کۆمەڵێك دامەزراوە هەیە[1] ، وەك : قوتابخانە، بنکەی تەندروستی، مزگەوت، بنکەی پۆلیس، کۆمەڵێك دوکان، کۆگا....تاد[2] .

د. عەبدوڵلاّ غە فوور دەڵێ: (لەڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە جیاوازیەکی زۆر لە نێوان گوندەکان دا هەیە ، بۆ ئاسانکردنی باسەکەمان گوندەکان بەسەر پێنچ دەستەدا دابەش دەکەین) .

١- کوێرە گوند (١-٥٠) کەس. ٢- گوندی گچکە (٥١-٣٠٠) کەس. ٣- گوندی ناوەنجی (٣٠١- ٧٥٠) کەس. ٤- گوندی گەورە (٧٥١-١٥٠٠) کەس. ٥- شارە گوند (١٥٠١) کەس بەرەو ژوورو)[3] .

## -کۆچکردن

کۆچکردنی دانیشتوان، دیاردەیەکی مێژوویيە. مرۆڤ بە مەبەستی دابینکرنی بژێوی ژیان لەشوێنێکەوە بۆشوێنێکی دیکە، چووە. هەروەها بەشێکی زۆری لەژیانی خۆی بە کۆچەری بەسەر بردووە. کۆچکردن دیاردەیەك نیە تایبەت بێت بە قۆناغێکی ئابووری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا، بەڵکو بە ئەندازەو فۆرمی جودا جودا لە گشت سەردەمێکدا، دووبارە بووەتەوە. جوگرافیا زانان، لەبەر ئەوەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خاك دەردەخات، لێی دەکۆڵنەوە و چارەسەری بۆدادەنێت بەلاّم کۆچکردن لەو لایەنییەی ژیانی مرۆڤە، کەتەواو بوونی بۆ نیە. جوگرافیازانان، لەسەر پێناسەکردنی کۆچکردن کۆك نین بەلاّم هەندێکیان پێیان وایە کۆچکردن بریتییە لە هەرجۆرە بزووتنەوەیەك. ئەگەر کۆچکردن بەو شێوەیە بێت ئەوە هاتنی قوتابیان و خویندکاران لە ماڵەوە بۆ کۆلیژ یان چوونە بازار، دەبێتە شێوەیەك لە شێوەکانی کۆچکردن. ئەو جۆرە بزوتنەوانە، لەبەر ئەوەی پەیوەندیان بەگۆڕینی شوێنی هەمیشەیی ژیانەوە نییە، ناکرێت وەك کۆچکردن سەیریان بکرێت. هەر لەبەر هەندێکەش دەکرێت کۆچکردن، وەکو هەندێك بۆی دەچن، هەر ئەو جۆرە بزووتنەوانە بێت کە مرۆڤ بە مەبەستی نیشتەجێبوون ئەنجامیان داوە.

---

[1] - نادر روستی، گوندی کوردیی و گۆڕان لە پیشەدا، چ١ ، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ١٤- ١٩.

[2] - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل: ١٤٨.

[3] - د. عەبدوڵلا غەفوور، جوگرافیای کوردستان، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٤-٢٤٧ .

**-ئه‌و ڕاو سه‌رنجانه‌ی له به‌ڵگه‌نامه فه‌رمییه‌کاندا له‌سه‌ر هۆزی شێخ بزێنی نووسراوه:**

- **شێخ بزێنی** : (٦٠٠) مالیکن له ده‌وری که‌رکوك و خانه‌قین له ڕۆخی خوارووی زێی بچووك به‌شێکیان له وولآتی (ئه‌رزروم) دانیشتوان[١].

به پێی په‌یمانی ساڵی ١٦١٢ ی زایینی،شاره‌زوور، وه‌ك به‌شێك له خاکی کوردستان، له‌ژێر کۆنترۆلی عوسمانیه‌کاندا مایه‌وه، تا له‌م سه‌رده‌مه‌دا شاه عه‌باسی سه‌فه‌وی (١٥) هه‌زار له هۆزه کوردییه‌کانی باکوری کوردستان وه‌ك حه‌یده‌رانلو، زه‌عفه‌رانلو، گه‌لآلی .. هتد گواسته‌وه خوراسان بۆئه‌وه‌ی له‌پێش سنووری ده‌وڵه‌تی سه‌فه‌وی ڕێ له‌کۆچه‌ره تورکمانه‌کان بگرێت بۆ ئه‌وه‌ی شۆڕ نه‌بنه‌وه ناوخاکی ئێران. عوسمانییه‌کانیش له‌لایه‌ن خۆیانه‌وه ئاڵوگۆری جێنشینی ئه‌و هۆزه کوردانه‌یان کرد، که سه‌ریان بۆ تورك دانه‌ده‌نواندبوو وه‌ك (شێخ بزێنی )یه‌کانی ناوچه‌ی که‌رکوك ، که گواسترانه‌وه ئه‌نه‌دۆل ( خوار ئه‌نقه‌ره) و چه‌ند هه‌زار خێزانێکی هه‌مه‌وه‌ندیش، که‌له ڕۆژهه‌لآتی که‌رکوکه‌وه گواسترانه‌وه ناوچه‌کانی مێردین و ئورفه له خوار ئه‌نادۆل و به‌شێکی دیان گه‌یاندرانه ولآتانی لیبیا و جه‌زائیر له سه‌رووی ئه‌فریقیادا [٢].

**-هۆزی شێخ بزێنی له ساڵی (١٩١٩)دا به‌پێی ڕاپۆرتێکی وه‌زاره‌تی هه‌نده‌رانی به‌ریتانی:**

له هه‌مان فایلی ژماره (١٢٤٦/٢٤٨)ی وه‌زاره‌تی هه‌نده‌رانی حکومه‌تی به‌ریتانی دا ڕاپۆرتێکی بایه‌خدار ده‌رباره‌ی هۆزی شێخ بزێنی هه‌ڵگیراوه که گه‌لێك زانیاری ده‌گمه‌ن و نه‌زانراوی تێدایه، کاپته‌ن سی تی بێڵی یاریده‌ده‌ری ئه‌فسه‌ری سیاسی سلێمانی ئه‌و ڕاپۆرته‌ی نووسیوه[٣]، که بریتییه له چوار لاپه‌ره‌ی چاپکراوی قه‌واره و ئه‌مه‌ی لای خواره‌وه‌یش ده‌قی وه‌رگێرانه‌که‌یه‌تی:

---

١- محمد مه‌ردۆخی، مێژووی کوردو کوردستان، به‌شی یه‌که‌م، چاپخانه‌ی سه‌رکه‌وتن، به‌غدا، ١٩٥٨، ل ١٣٥.

٢- د. جه‌مال ره‌شید ئه‌حمه‌د، که‌رکوك و ناوچه‌ی گه‌رمیان و مافی کۆنترۆڵکردنیان له‌لایه‌ن کورده‌وه، چاپی یه‌که‌م، چاپخانه‌ی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨.

٣-N.A.,F.O.,٢٤٨/١٢٤٦,C.T.Beale,Captain,AssistantPolitical Officer,Sulaimaniyah,Note On the Shaikh Bizaini Tribe,PP.١-٤.

## تێبینی دەربارەی هۆزی شێخ بزێنی

### ١- مێژوو:

شێخ بزێنی هۆزێکی نیشتەجێی هەردووک قەراغی زێی بچووکە، هۆزی ناوبراو دەورووبەری سەد ساڵ لەمەوبەر لەلایەن ئەم دوو برایەوە دامەزرێنراوە: مەلا عباس و حاجی هەمزە کە لە زاخۆی نزیک مووسڵەوە هاتوون و تاوەکو ئێستایش ژمارەیەکی کەم لە ئەندامانی لە زاخۆ و هەولێر دەژین، گەلێك جار ئەندامانی ئەم هۆزە دژی تورك یاخی بوون، ئەوان لە ڕووی ئایینەوە شافیعی سوننە مەزهەب و لە ڕووی زوبانیشەوە سەر بە کرمانجی باشوورن.

### ٢- سنووری مەڵبەندی ئەم هۆزە:

بەپێی نەخشەی هاوپێچ[١] سنووری ناوچەی شێخ بزێنی بەم شێوازەی لای خوارەوەیە:

لە باکوورەوە — ناوچە قەزای کوێسنجەق.

لە باشوورەوە - هۆزی شوان.

لە ڕۆژهەڵاتەوە — تەق تەق لەلای ڕاستی زێوە و ڕووباری شیوەسووری (Shiwah sur) نزیك گوندی گەلناغاچ (Gundalghach)ی لای چەپی زێوە.

لە ڕۆژئاواوە — ئاڵتوون کۆپری و هۆزی ساڵەیی.

### ٣-هێزی ئەم هۆزە:

هۆزی شێخ بزێنی لە پەنجا گوندی هەردووک قەراغی زێ دەژین، بە نیازی بەراوردکردن ئاماژە بۆ خەملاندنێکی بەر لە جەنگی یەکەمی جیهان — ك.م. دەکەین:

| ناوەکان | لای‌چەپی زێی بچووک | | لای راستی زێی بچووک | |
|---|---|---|---|---|
| | ئیستا | بەر لە جەنگ | ئیستا | بەر لە جەنگ |
| ژمارەی گوند | ٣٠ | ٣٥ | ٢٠ | ٢٥ |
| ژمارەی ماڵ | ٢٣٠ | ٦٠٠ | ٢٠٠ | ٤٥٠ |
| ژمارەی پیاوی بالق | ٣٠٠ | ٧٠٠ | ٢٤٠ | ٥٠٠ |
| ژمارەی وولاغ | ٤٠ | ؟ | ٣٠ | ؟ |
| ژمارەی سەر مەڕ | ٢٠٠٠ | ١٠٠٠٠ | ١٥٠٠ | ٧٠٠٠ |
| ژمارەی سەر مانگا | ٢٠٠ | ١٤٠٠ | ٢٠٠ | ٧٠٠[١] |

[١]- بەداخەوە نەخشەی ناوبراو لەم فایلە هەڵنەگیراوە.

کۆی هێزی ئەم هۆزە پەنجا گوند و (٤٣٠) خێزان و (٧٠) سوارەو (٥٠٠) پیادە دەبێ .

**٤-باری کارگێری:**

أ-هۆزی شێخ بزێنی سەرۆکی بالآی نی یە ، ئەمەیش دەگەرێتەوە بۆ دابەشکردنی دەسەلاتی کارگێری هۆزەکە لەلایەن حکومەتی تورکیاوە. گوندەکانی ئەم هۆزە لە نێوان موتەصەریفییەتی کەرکوك و سلێمانی و قایمقامییەتی کۆیسنجەقدا دابەش کرابوون. بەم جۆرە گەلێك دبەشبوونی دەسەلات-ك.م. دروست بوو کە هەریەکەیان لە سێ چوار گوند پێکهاتووە، هەر چۆن بێ ئەم هۆزە هۆزێکی هێمن و گوێڕایەڵە و پەیڕەوی نەریت و پەیوەندیی هۆزایەتی[2] دەکات و کۆ سەرۆك هۆزە بچووکەکان دژی دانانی سەرکردە (سەرۆکی بالآ-ك.م.) نین.

ب-هەرچی گوندەکانی لای چەپی زێ (فارس ئاغا)ی سەرچناریان وەك سەرکردە دەوێ، فارس ئاغا کوری (رشید ئاغا)ی سەرۆکی پێشووی هۆزەکەیە

گوندەکانی لای راستی زێش (محموود ئاغا)ی سارتك (Sardik)یان وەك سەرۆك لا پەسندە، مەحموود ئاغای کوری (عبداللە)ی کوڕی (حاجی همزە )یە کە یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی هۆزەکە ( بڕوانە بەشی کەسایەتیەکان )[3]

ئەم دووانە هەردووکیان بۆئەو شوێنە دەست دەدەن،پێشموایە شێخ مەحموود پشتیان دەگرێت. بە پێی بۆچوونی من دانانی سەرۆکێکی بایەخدار کارێکی باش نییە[4]، زێی بچووك (کە تەنها

---

[1]- بێ گومان ئەم جۆرە ئامارە دەگمەنانە بە ڕوونی ئاماژە بۆ ئەو کاولکارییە دەکەن کە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بەهۆی جەنگی یەکەمی جیهانەوە گیرۆدەی هاتوون، هەڵبەت ئەگەر ئەم جۆرە زانیارییانە لەبەر دەست خاوەنی کتێبی (کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا) بە کوردی، بەغدا، ١٩٧٥، بە عەرەبی، وەرگێرانی محەمەدی مەلا کەریم، بەغدا، ١٩٧٧و١٩٨٤، بە ئینگلیزی، وەرگێرانی عەلی ماهیر ابراهیم، لەندەن، ١٩٩٤ دەبوو ئەو بەرهەمەی زەنگینتر دەبوو.

[2]-لێرەدا نووسەری ڕاپۆرتەکەزاراوەی (esprit de corps) فەرەنسی بەکارهێناوە کە بە واتای (العصبیە القبلیە) دێت.

[3]- واتا بڕگەی پێنجەم لە دامێنی هەمان لاپەڕەدا.

[4]-هەڵبەت ئینگلیز سەرۆك هۆزێکیان دەویست ئامادە بێت ببێتە بووکە سەماکەرەی دەستیان.

لای سارتك و تەق تەق دەتوانرێ ببڕێ) سنوورێکی کاریگەر پێك دەهێنێ و کۆسپیشە لە بەردەم دروستبوونی پێوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان هەردوو بەشەکەدا.

ج-بەهۆی پەرەسەندنی بایەخی گوندی تەقتەقەوە لەوانەیە دەسەلاتی کارگێڕیی ڕاستەوخۆی ئەو گوندە کارێکی پێویست بێ، لەو حاڵەتەشدا گوندەکانی تاڵەبان (کە دوو گوندن) و گەرمکیش لە یەکبوونی هۆزایەتی دوور بخرێنەوە، ئێستا ئەم گوندانە لەگەڵ تەقتەقدا بەشێکی بچووك بە سەرۆکایەتی کوێخا ڕەشید پێك دەهێنن و کە گەیشتمە کوێسنجەق ڕاپۆرتێکی دیکەتان دەربارەی تەق تەق بۆ دەنێرم.

د-دەتوانرێ گوندەکانی لای ڕاستی زێ لە ڕووی کارگێڕییەوە بخرێتە ژێر دەستی یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی کوێسنجەقەوە، پێویستە گوندەکانی لای چەپی زێش لە ڕووی کارگێڕییەوە لە سلێمانییەوە ببرێن بەڕێوە.

بازرگانی گوندەکانی لای ڕاستی زێ لەگەڵ کۆیە دایە و دەتوانرێ بە ئاسانی بگەنەوە ئەو شارە.

وەك لە بڕگەی (ب)دا ڕوون کراوەتەوە هیچ کۆسپێك بەهۆی ئەم دابەشکردنی دەسەلاتەوە نایەتە ئاراوە.

**٥-کەسایەتیەکانی هۆزەکە:**

کەسایەتی دیاری هۆزی شێخ بزێنی ئەمانەن :

محموود ئاغای سارتك، تەمەنی (٧٠) سالە، پیرەمێردێکی چاونەترسی خۆشمەشرەب و بەخشندەیە، دەتوانێ کاربەدەست (ڕەهبەر) بێ .

فارس ئاغای سەرچنار، کەتەمەنی (٣٠) سالە، کەسێکی ئەسلزادەو پێزانە، کوری (رشید ئاغا)ی ڕەهبەری پێشووی هۆزەکەیە.

تۆفیق ئاغای قەسرۆك، تەمەنی (٤٥) ساڵە، ئەمەش مامی فارس ئاغایە، ڕووخۆشێکی تەلەکەبازەو بەرپرسی کوشتنی گەلێك کەسە.

فارس ئاغای پەلکانە[1] .

مەحموود ئاغای کوڕی یوسف ئاغا[1] .

---

[1]- لە بەلگەنامەکەدا هیچی دەربارە نەنووسراوە.

هاوپێچی[٢] درەختی بنەماڵەی سەرۆك هۆزەكان كە ئاماژە بە ئەندامە زیندووەكانیشیان دەكات:




---

[١]- مەحموود ئاغایش بە هەمان دەستوور لە بەڵگەنامەكەدا هیچی دەربارەی نەنووسراوە .

[٢]- N.A.,F.O.,٢٤٨/١٢٤٦,C.T.Beale,Captain,AssistantPolitical Officer,Sulaimaniyah,Note On the Shaikh Bizaini Tribe,PP.١.

### ٦-دووبەرەکی هۆزایەتی:

من چارەسەری دووبەرەکی هۆزایەتی نێوان مەحموود ئاغای کوڕی یوسف ئاغای سارتك و فارس ئاغای سەرچنارم کردووە.

مەحموود ئاغای سارتك لەکاتی کەوتنی کەرکوکدا[1] دوو گوندی لای چەپی زێی زەوت کردو شەش کەسی کوشت، مەحموود ئاغا قایل بوو یەکێك لە گوندەکان بگێڕێتەوەو سەد و دە لیرەیش بداتە کەس و کاری کوژراوەکان.

بەپێی نەریتی هۆزایەتی هەر گوندنشینێك لەکاتی دووبەرەکایەتی هۆزایەتیدا بکوژرێ پێویستە هەزار قرانی ئێرانی و کچێك شیربایی بدەن، خۆ ئەگەر هاتوو یەکێك لە بنەماڵەی شێخ کوژرا ئەوساکە دەبێ فەسڵی نێوانیان گوندێکی ئاوەدان و ئافرەتێکی تێدابێ، یا ئەگەر هاتوو میراتگرەکان ویستیان لە بریتی ئەوە دوو سەد تا سێ سەد لیرەیان پێ بدرێ، ژیانی گوندنشینێکی پیاویش بە پێنج سەد قرانی ئێرانی دەژمێردرا، ولاغێکیش بە سی تا پەنجا لیرە بەپێی نرخی ڕۆژ.

کچی فارس ئاغای کوڕی مەحموود کە لە بنەماڵەی ئاغاوات بوو چەند ساڵێك لەمەوبەر بە سودفە کوژرا، خوێنبایی سێ سەد و پەنجا لیرەو کیژێك بوو.

### ٧-لیڤیی هۆزەکە:

پێشنیازەکانی مێجەر نۆئیل دەربارەی لیڤی لەناو هۆزە (کوردەکاندا-ك.م.) بە ڕێك و پێکی بۆ ئاغایانی شێخ بزێنی ڕوون کراوەتەوە، ئەوان ئەو بیرۆکەیان لاپەسند بوو، بە وێنە بەپێی قسەی[2] فارس ئاغای سەرچنار تەنها شەست کەس لەنێو گوندەکانی لای چەپی (زێ-ك.م.) دەتوانرێ کۆبکرێتەوە، هەرچی مەحموود ئاغایە گوتی ئەو دەتوانێ لە گوندەکانی لای ڕاستی (زێ-ك.م.)دا پتر لە سەد کەس لەنێو گوندەکانی لای ڕاستی (زێ-ك.م.)دا کۆ بکاتەوە.

من پێم وایە بەئاسانی لە هەردووك بەری زێ دەتواندرێ دوو سەد پیاو کۆ بکرێتەوە.

---

[1] - مەبەستی یەکەم داگیرکردنی شاری کەرکوکە لەلایەن هێزە چەکدارە بەریتانییەکانەوە لە ڕۆژی حەوتی مایسی ساڵی ١٩١٨دا.

[2] - لە دەقی بەڵگەنامەکەدا لە بریتی فارس ئاغا بەهەڵە فاتیس (fatis) ئاغا چاپ کراوە.

**٨-سەرژمێریی گوند:**

تێبینی-دووروودرێژ دەربارەی هێزو پێکهاتەی گوندە هەرە بایەخدارەکانی ئەم هۆزە نیشان دراوە، هەروەها نەخشەیەکی گشتی شوێنی گوندەکانیش کە ژمارەکەی (ئای.د.دەبل یو. و ١٥٢٢)ە، پێشکەش کراوە و تێیدا ژمارەیەك هەڵەیش دەربارەی شوێنی گوندەکان راستکراونەتەوە[١].

**گوندەکانی شێخ بزێنی (لای چەپی زێ)**

گوند گەڵناغاج-گوندی هەمزە ئاغای کوڕی مستەفایە کە خوارزای فارس ئاغای سەرچنارە. هەمزە ئاغا پەنجا ساڵان دەبێ و بێ گومان پیاوێکی سەربەخۆیە، ئەو هەمان کات گوندی کانی هەنجیریشی هەیە کە گوندێکی بچووکە و چوار میل کەوتۆتە ئەولای ڕۆژهەلاتی گوندی گەڵناغاجەوە. کانی هەنجیر ئێستا بریتییە لە چواردە ماڵ و چل جووت لەکاتێکدا بەر لە جەنگ بریتی بوو لە حەفتا ماڵ و چوار جووت، گشت زەوی و زاری دیکەش دێمەو ئیمساڵ ناوچەیەکی فراوانی لێ ڕوێنراوە و چل و حەوت ڕەی سلێمانی لێ وەشێنراوە.

بەپێی قسەکانی هەمزە لە ساڵی هاتدا بەرووبوومی ناوچەکە پێنج بە یەکە، بەلام من بۆ خۆم لە ئاگادارانم بیستووە کە پازدە بە یەکە[٢]. ژمارەی مەڕو ماڵاتی ئەو گوندە سەد و پەنجا سەر دەبێ، بەر لە جەنگ ئەو ژمارەیە خۆی دەدا لە هەزار تاوەکو هەزاو پێنج سەد سەر.

هەمزە ئاغای فارس ئاغای سەرچنار بە سەرۆك هۆز دەزانێ.

سەرچنار-خاوەنی ئەم گوندە فارس ئاغای کوڕی رەشیدە کە پیاوێکی لێهاتووی بەتوانای سی (٣٠) ساڵەیە، باوکی سەرۆك هۆزی گوندەکانی لای چەپی زێ بوو، فارس ئاغا خاوەنی دەوروبەری بیست گوندی لای چەپی زێیە کە لە هەموویان گرنگتر ئەمانەن: قەسرۆك و گردخەبەرو قامیشە (کە ئێستا کاولە) و گوندی گەڵناغاج و تووتەقەل (Tutkal) و چۆغلیجە (Chukh Lija) و جەلەمۆرد (Jela Mord) و شێخان و مامەلێسی (Mama Laisis) و ئەسکەندەر بەگی (Askuna Darbegi) و کانی هەنجیرو

[١]- وەك لە پەراوێزی ژمارە دوودا ئاماژەمان بۆی کردووە بەداخەوە ئەو نەخشەیە وەك هاوپێچ لەناو ئەو فایلەدا هەڵنەگیراوە.

[٢]- دیارە هەمزە ئاغا ژمارەیەکی کەمتری داوە بۆ ئەوەی باجی کەمتر بداتە میری، ئەوەیش دیاردەیەکی باوی رۆژگاری خۆی بوو.

سەرچنارو هەر گوندەی بریتییە لە پازدە ماڵ و پێنج جووت، بەرانبەر حەفتا ماڵ و بیست جووت بەر لە جەنگ، بە پێی قسەی فارس ئاغا ساڵی ڕابردوو پێنج سەد مانگایەکی ئەم گوندانە بە نەخۆشی مرداربوون.

لەم ناوچەیەدا ئەم ساڵ چل و حەوت ڕبەی سلێمانی تۆو وەشێنراوە کە لە ساڵی پار کەمترە، لە ساڵی هاتدا بەرووبوومی دەغل و دانی ئەم ناوچەیە پازدە بە یەکە[١] .

قەرەناو (Karanao)-ئەم گوندە لە بیست ماڵ پێکهاتووە و هی جەمیل ئاغای برای مەحموود ئاغای کوڕی (یوسف)ە.

یوسف ئاغا دە کوڕی هەبوو کە حەوتیان تاکو ئێستا (واتە ساڵی ۱۹۱۹-ك.م.) ماون. یوسف ئاغا بەم جۆرەی لای خوارەوە ماڵ و مولکی بەسەر کوڕەکانیدا دابەش کردووە:

جەمیل نەجیب گوندی قەرەناو و کەپەنگ (Kapanak)

سەعید گوندی جگیلە (Jegila)

حەسەن گوندی سماقە (Samaka)

مەحموود ئیسماعیل گوندی مەرزیخە (Marzikha)

فارس گوندی زوڕناسوور (Zornasur) کە ئێستا داڕووخاوە.

چۆغ لیجە-دە ماڵە نزیك قەسرۆکە، شەریف ئاغای مامی فارس ئاغای سەرچنار خاوەنی ئەم گوندەیە.

پەلکانا (کەلکانا) (Kalkana) بیست ماڵەو هی فارس ئاغای کوڕی محەمەدە.

زوڕناسوور-ئێستا داڕووخاوە، جاران هی فارس ئاغای کوڕی یوسف بوو کە ئێستا لەگەڵ مامیدا لە گوندی گەڵناغاج دەژی.

شاوگێڕ (شەوگێڕ) (Shaogir) دە ماڵە، هی محەمەد ئاغای کوڕی یوسف ئاغایە .

تولکی (تورکی) (Tulki) بیست ماڵە، هی کوێخا تۆفیقە.

تووتەقاڵ (Tuta Kal) پێنج ماڵە، یەك دەر چواری میلێك لەولای سەرچنارەوەیە، هی فارس ئاغای سەرچنارە.

---

١- N.A.,F.O.,٢٤٨/١٢٤٦,C.T.Beale,Captain,AssistantPolitical Officer,Sulaimaniyah,Note On the Shaikh Bizaini Tribe,PP.٢.

جەلەمۆرد (جێلەمۆرد) دە ماڵە، سێ میل لە خوارووی سەرچنارەوەیە، هی فارس ئاغای سەرچنارە.

گردخەبەر- ئەم گوندە لە سێ ماڵ و یەك جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە سی ماڵ و دە جووت، شەریف ئاغا خاوەنی ئەم گوندەیە کە جاران گەلێك ئاوەدان بووە.

قەسرۆك- لە دە ماڵ و شەش جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە پەنجا ماڵ و پازدە جووت، هی تۆفیق ئاغای مامی فارس ئاغای سەرچنارە، چل و حەوت ڕبەی سلێمانی تۆوی تێ دەوەشێنرا، بەڵام پار هیچی تێدا نەڕوێنرا چونکە لەلایەن حکومەتی تورکیاوە لەسەر ئەوە سووتێنرا کە خەلکەکەی قایل نەبوون باجی بدەنێ. لەم گوندەدا دوو سەد سەر مەڕو بیست سەر مانگا هەیە، بەر لە جەنگ قەسرۆك خاوەنی هەزار سەر مەڕ بوو.

قامیشە-ئەم گوندە کاول کراوە، دەلێن هی تۆفیق ئاغایە، ناوبراو دەلێ فەقێ ئەمین قامیشەی سووتاندووە لەکاتی بەرپابوونی کوشتاری نێوان هۆزەکانی ناوچەکەدا دوای کشانەوەی بەریتانییەکان لە کەرکووك[1] .

کانی هەنجیر-سەرۆکی ئەم گوندە کوێخا مستەفای کوڕی هەمزە ئاغای گوندی گەڵناغاجە، کانی هەنجیر ئێستا بریتییە لە سێ ماڵ و دوو جووت، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە بیست ماڵ و چل جووت.

عەمدوون-ئەم گوندە لە بیست ماڵ و شەش جووت پێکهاتووە، تۆفیق ئاغای قەسرۆك ئیدیعای خاوەنییەتی ئەم گوندە دەکات و دەلێت بەر لە سیازدە ساڵ دوو دەر سێی عەمدوونی بە شەست لیرە کڕیوە، ئەوسا نرخی ماینێك پەنجا لیرەو تفەنگێکی مارکە مارتین بیست لیرەو دەمانچەیەك پێنج لیرە بوو، هەرچی یەك دەر سێی ئەم گوندەیە ئێستایش وەك جاران هی گوندنشینەکانە، تۆفیق ئاغا دانووی لەگەڵ کاربەدەستانی تورکدا لە کەرکووك نەدەکولا و کاتی خۆی عەبدولڕەحمان (کوڕی تۆفیق ئاغا-ك.م.) داوای لە قاسم پاشای موتەسەریفی

[1]- دوای یەکەم داگیرکردنی کەرکووك و دەوروبەری لەلایەن بەریتانییەکانەوە لە ڕۆژی حەوتی مایسی ساڵی ۱۹۱۸دا ناچاربوون لەژێر فشاری عوسمانییەکاندا ڕۆژی بیست و چواری نیسانی هەمان ساڵ بکشێنەوە و تاوەکو ڕۆژی بیست و شەشی مانگی ئابی هەر ئەو ساڵە نەیانتووانی بەیەکجارەکی عوسمانییەکان لە کەرکووك و دەوروبەری وەدەرنێن.

کەرکووك کردووه ئەو گوندەی بۆ بگێڕێتەوە کە لێی دەربەدەر کرا دوای ئەوەی پێنج ساڵ بەسەر خاوەنییەتی ئەودا تێپەڕی.

لەو کاتەدا کە تۆفیق ئاغای قەسرۆك دوو دەر سێی عەمدوونی کڕیوە، گوندەکە لە سی تا چل ماڵ پێکهاتبوو، بەرهەمی ساڵانەیشی خۆی دەدا لە سێ تا سەد تەغاری کەرکووکی. عەبدولڕەحمان دوو ساڵ لەمەوبەر کۆچی دوایی کرد و ئێستاکە تۆفیقی کوڕی لەو گوندە دەژی، ئێستاش وا دەزگا بەرپرسەکان بە بەڵگەنامەکانی تاپۆی عەمدووندا دەچنەوە.

قەرەسالم- سی تا چل ماڵ دەبێ، سەرۆکی ئەم گوندە حەمەد ئاغای کوڕی قادر ئاغایە.

مەرزیخاه (مەرزیخە) (Marzikhah) دوو گوند بەم ناوەوە هەیە و هەموویشی بەسەر یەکەوە نیو میل لە یەکدییەوە دوورن، ناوی یەکێکیان مەرزیخەی گەورەیە و ناوی ئەوی دیکەشیان مەرزیخەی بچووکە، یەکەمیان لە شازدە ماڵ پێك هاتووەو هی مەحموود ئاغای کوڕی (یوسف)ە، کە سەرۆکی گوندەکەیە، بەڵام گوندنشینەکانیش بەشیان هەیە. هەرچی مەرزیخەی بچووکە لە پازدە ماڵ پێك هاتووەو هی کەریم ئاغاو دانیشتووانی دیکەیە و حەوت جووت و دوو سەد سەر مەڕی تێدایە.

## گوندەکانی شێخ بزێنی (لای ڕاستی زێ)

تەق تەق-ئەم گوندە لە پازدە ماڵ و سێ جووت پێك هاتووە، بەر لە جەنگ لە پەنجا ماڵ و دە جووت پێکهاتبوو، ئێستا گوندنشینەکانی تەق تەق سەد سەر مەڕو پازدە مانگایان هەیە، بەر لە جەنگ پێنج سەد سەر مەڕو سەد سەر مانگایان هەبوو، کوێخا ڕەشید و خزمەکانی خاوەنی تەق تەقن.

تەق تەق سەرەتای قەیاغی هاتووچۆی ناو زێی بچووك پێك دەهێنێ، لە کوێسنجەقەوە بە کەلەك تووتن و خوری و گەنم و جۆ و کەل و پەلی دیکە دەهێنرێتە تەق تەق و لێرەوە هەر بە کەلەك دەنێردرێن بۆ بەغداو تکریت و شوێنی دیکە و زێش ساڵ دوازدەی مانگ بۆ هاتووچۆی کەلەك کراوەیە. بەر لە جەنگ لە نێوان بەغدا و تەقتەقدا بیست کەلەك بەردەوام لە هاتووچۆدا بوون. گوندنشینەکانی ئەو ناوچەیە ئێستا چالاکانە خەریکی دروستکردنی کەلەکی نوێن و بەم زووانە جووتێك لەو کەلەکە نوێیانە بە بارە تووتنەوە لە کوێسنجەقەوە بەرەو بەغدا دەکەونە ڕێ. هەر کەلەکێك چوار سەد و پەنجا ڕبەی سلێمانی هەڵدەگرێ، کە دەکاتە دەوروبەری دوازدە تۆن. بەر لە جەنگ نرخی گواستنەوە بۆ باری هەر ئێسترێك (واتا بۆ هەر دوو سەد و پەنجا کیلۆ) نیو

لیرە بوو، بەڵام ئەوە هێشتا دەستنیشان نەکراوە چونکە تازە بە تازە بزوتنەوەی بازرگانی دەژێتەوە، لە تەقتەق چوونە بەغدایش بە کەلەك حەوت تاوەکو هەشت رۆژ دەخایەنێ و دوای گەیشتن کەلەکەکان هەڵدەوەشێنرێنەوەو دارەکانیان هەر لەوێ دەفرۆشرێن و پێستەکانیش بە ئێستر دەهێننەوە تەقتەق، دروستکردنی هەر کەلەکێکیش نزیکەی هەزار روپیی[1] تێدەچێ.

وا چاوەڕوان دەکرێ تەقتەق لەمەودوا جۆرە بایەخێکی ببێ، وا پێدەچێ ببێتە مەڵبەندێکی لەبار بۆ دامەزراندنی دائیرەی باج و کۆنترۆڵ، وێڕای عەمباری هەڵگرتنی شتومەك.

ساتووقەلا-جاران گوندێکی سەرەکی هۆزایەتی شێخ بزێنی بوو، ئێستا وا نەماوە، سەرۆکی ئەم گوندە کوێخا سەعیدی والییە کە لەناو دێکەدا مولکی هەیە، بەڵام زۆربەی مولکەکان هی گوندنشینەکانن. ساتووقەلا ئێستا لە حەوت ماڵ و چوار جووت پێك هاتووە، بەڵام بەر لە جەنگ بریتی بوو لە پەنجا تا شەست ماڵ و بیست جووت، ئێستا لە ساتووقەلا سەد سەر مەڕو دە سەر مانگا هەیە و خەلکەکەی ئەم ساڵ شەست ڕبەی سلێمانی تۆویان وەشاندووە، بەڵام پار لەبەرئەوەی گوندەکەیان کاول کرابوو هیچیان نەوەشاند[2] .

سێگردکان (Saigirdagh) سەرۆکی ئەم گوندە محەمەد ئەمینی کوڕی حاجی قادرە کە مولکیشی لە ناو دێکەدا هەیە، بەڵام دانیشتووانی دێکە بۆ خۆیان خاوەنی بەشی زۆری مولکی سێگردکانن کە لە چل و پێنج ماڵ و حەڤدە جووت پێکهاتووە، بەڵام بەر لە جەنگ ئەم گوندە لە سەد و بیست ماڵ و بیست و سێ جووت پێکهاتبوو، لەم گوندەدا چوار سەد سەر مەڕو چل سەر مانگا هەیەو کشتوکالیشی دێمەو ئەم ساڵ خەلکەکەی گەلێك لە پار زۆرتر تۆویان وەشاندووە، ئەم ساڵ سەد و پەنجا ڕبەی سلێمانی تۆویان وەشاندووە، واش چاوەڕوان دەکرێ بەرووبوومی ئەم ساڵ باش بێ بگاتە پێنج بە یەك چونکە زەوی و زاری سێگردکان زۆر بە پیت نییە.

محەمەد ئەمین دەیەوێ ببێتە سەرۆکێکی سەربەخۆ و دەڵێ دانیشتووانی سێکانی و ئۆمەرگومبەت (Auma Gumat) و سەمەکە و میرکە وەك سەرۆك هەڵیانبژاردووە، ناوبراو مەحموود ئاغای سارتکی وەك سەرۆکی (بالأی-ك.م.) هۆز لاپەسندترە وەك لەوەی وەك ناوچەیەکی بێ هۆز لەلایەن کوێسنجەقەوە ببرێ بە ڕێوە.

---

[1]-روپی پارەیەکی هیندییە، ئینگلیزەکان هێنایانە عێراقەوە و تاوەکو ساڵی ١٩٣١ بەکاردەهێنرا، هەر روپییەك بەرامبەر حەفتاو پێنج فلس بوو، لەك روپیش هەبوو کە بریتی بوو لە سەد هەزار روپی.

[2]- N.A.,F.O.,٢٤٨/١٢٤٦,C.T.Beale,Captain,AssistantPolitical Officer,Sulaimaniyah,Note On the Shaikh Bizaini Tribe,PP.٣.

سێکانی —بەر لە چەند مانگێك کوێخای سێکانی لە هەرایەکی دانیشتووانی گوندەکەدا کوژرا، دانیشتووانی سێکانی چوونە کوێسنجەق بۆ چارەسەری کێشەی دانانی کوێخایەکی نوێ بۆ گوندەکەیان. سێکانی لە (٣٠) سی ماڵ و چوار جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە حەفتا ماڵ و نۆ جووت، ژمارەیەك لە دانیشتووانی ئەم گوندە کە لەگەڵ کوێخادا ناکۆك بوون ماڵی نوێیان لە دووری چارەکە میلێك لە سێکانییەوە دروست کرد و بەو جۆرە بە ناوی گورگەوە دروست بوو.

شەیتانییە (شەیتان) (Shaitania) ئەم گوندە هی مەحموود ئاغای سارتکە،لە دە ماڵ و دوو جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە بیست ماڵ و هەشت جووت.

ئاوماڵ (Aumal) گوندی عەبدوڵلا ئاغای کوێسنجەقە، لە بیست ماڵ و شەش جووت پێکهاتووە.

ئۆمەرگومبەت (Auma Gumat) گەورە پیاوی ئەم گوندە محەمەدی کوڕی حاجی قادرە، براکەی کوێخای سێگردکانە (Saigirdkan)ە، ئۆمەرگومبەت لە بیست ماڵ و یازدە جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە حەفتا ماڵ و بیست و دوو جووت.

سارتك-گوندی مەحموود ئاغایە و لە دە ماڵ و حەوت جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە (٣٠) سی ماڵ و دە جووت، لەم گوندەدا چوار سەد سەر مەڕ هەیە و خەڵکەکەی ئەم ساڵ نۆوەت ڕەی سلێمانی تۆویان وەشاندووە، دەڵێن لە ساڵی هاتدا بەرووبووم یەك بە پێنج تا حەوتە و نرخی بەرخێکی قەڵەو دوو لیرەیە، وەك گووتمان سارتك هی مەحموود ئاغایە کە سەنەدی تاپۆی بەدەستەوەیە، بۆیە کە خەڵکی دیکە خاوەنی هیچ نین[١].

**کاپتەن سی.ت.بێل**
**یاریدەری ئەفسەری سیاسی سلێمانی**[٢]

---

[١] - کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکوومەتی بەریتانیادا، کەمال مەزهەر،ئامادەکردنی: شەهلا تاهیر حەیدەری، ب٢، لە بلاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٤،ل٣٥-٥١.

[٢] Ibid,p.٤.-

*** بزین- شێخ بزینی:**

(ابن العماد الحنبلي) کە لە (١٠٨٩ك/١٦٧٨ز) کۆچی دوایی کردووە دەڵێت: ((بزێن بە کۆکراوەیی و بە بچووککراوەیی هۆزێکە لە کوردان)) (شذرات الذهب، ٣٣١/٨)، لەوانەشە بزێنی هەر بریتی بێت لە هۆزی شێخ بزێنی خۆی، کە لە بنجدا لە هۆزەکانی قەلای (دیردە)ی سەر بە دەڤەری تەنزی (تەنزە)ی سەر بە جزیرەی بۆتان بوو (شرفنامە، ص٢٧٤)، بەلاّم بەشێکیان لەوێ هاتنەخوار و بەرەو کوردستانی باشوور هاتن، بەدرێژایی کەناری چەپی زابی خواروو لە ئاڵتوون کۆپری بۆ تەقتەق نیشتەجێ بوون.

ئەوانەی سەر بە (بزێن)ن، فەقیهی شافیعی (عبدالرحمن کوڕی اصفهان) و (عبدالله)ی کوڕینە، کە (عبدالله) زانستەکانی نەحو و سەرف و مەنتیق و بەلاغەی لەلای باوکی و لەلای زانایانی سەردەمەکەی خوێندووە، لە ساڵی (٩٦٢ك/١٥٥٥ز)، لە شاری (قەصیر)ی (شام) کۆچی دوایی کردووە. (شذرات الذهب، ٣٣١/٨-٣٣٢)[١].

**- ناحیە دیراندە (دیردە):** یەکێکە لە ناحیەکانی (طنز)، سەر بە شارۆچکەی جزیرەی بۆتانە لە باکوری کوردستان واتە ولاتی تورکیای ئێستا، بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە[٢]، دانیشتوانەکەی خەریکی کاسبکارین لە ناوچەکەدا.

**-سی.جی.ادمۆندز لە پەرتووکەکەی خۆیدا لەبارەی شێخ بزێنی دەڵێت:**

دوای جیاونەوەی دەولەتی عێراق لە دەولەتی عوسمانی عەشیرەتەکانی شێخ بزێنی و ساداتی جەباری و لەگەل شیخ مەحمود ڕیك کەوتبوون ، لە ئاکامدا قەوارەی ئەم قەزایە لە ڕادەبەدەر تێك چوو .

هۆزی شێخ بزەینی هۆزێکی نیشتەجێیە و ئەندامانی لە کۆمەلە گوندێکی هەردوو لای (زێ) دەژین و ناوچەکەیان نزیکەی چل مایل درێژە و لە باکوری ڕۆژهەڵاتی کەرکوك[١]

---

[١]- د.زرار صدیق تۆفیق، هۆزو دەسەلاّتە هۆزەکییە کوردییەکانی چاخی ناوەڕاست، وەرگێرانی: ئیدریس عەبدوللاّ مستەفا، دەزگای توێژینەوەو بلاّوکردنەوەی موکریانی (چاپخانەی هاوسەر)، چ١، هەولێر، ٢٠١٠، ل٦٠-٦١ .

[٢]- ا.د.خلیل علی مراد، الکرد وکردستان فی کتاب (جهان نما)، لکاتب جلبی (١٠١٧-١٠٦٧ه/١٦٠٩-١٦٥٧)، مطبعة: الحاج هاشم، اربیل، ٢٠١٣، ص٦٠ .

هەڵکەوتووە . ئاغاکانی ئەم هۆزە دەڵێن لە تۆرەمەی چوار بران بەناوەکانی : حسن ئاغا و محمودئاغا و حاجی همزە و مەلا عباس لە نێوان ئەو چوار برایانەدا بە گومانم دووکەسی دواییان لە سەرەتای سەدەی هەژدەدا لە باکورەوە هاتونەتە ئەم مەلبەندە[2] .

کەم هەڵدەکەوێ کوردێکی ئاسایی بنەچەو ئەژدادی خۆی نەناسێ. بۆنموونە شێخ بزینییەکان داستانی خوارەوە دەگێڕنەوە : باوك یان باپیری ئەم چوار برایانە شێخێکی زاناو خۆپارێزو ڕێبەری کۆمەلە دەروێشێکی لە ژمار نەهاتوو بووە. ڕۆژێك لەگەڵ یەکێك لە خزمەتکارەکانی بەسواری ئێستر بەدەشتێکدا تێپەردەبێت ، کەتاقمێك ڕێی پێدەگرن . شێخ هەوڵ دەدات ئێسترەکەی توند بازوێ و بۆ ئەم مەبەستە بەدار لە ئەسپەکەی دەدات لەگەڵ هەر دار لێدانێکی شێخ. زەنگەسورەیەك لە گوێی ئێسترەکە دەردەپەرێت و پەلاماری ڕێگرەکان دەدات هاوار و نالەیان لێی بڵند دەکات. خزمەتکارەکەی ، کە شاهێدی ئەم ڕووداوە بوو، بە گوتنی فارسی (شێخ بزن ، شیخ بزن ! واتە (( شێخ لێی دە ، شێخ لێی دە ))، ئەوی پتر هانداوە.

لە سەردەمی دەسەلاتداریەتی تورکاندا، شێخ بزێنیەکانی باشوور دابەش ببوون لەسەر قەزاکانی کۆیە، چەمچەماڵ و قەزای ناوەندیی کەرکوکدا، بەلام چونکە ئاغاکانی ئەو سەردەمەیان بەنیسبەت هۆزێکی بچووك زۆریان گەشە کردبوو، پەیوەندیان بەیەکەوە مابوو

[1] - بەپێی لیستەیەك کە ئەو کات نوسیوومە نزیکەی (٢٥) گوند (واتە ٥٠٠ بنەماڵە )لە باشوور (ڕۆخی چەپ ) و (١١)گوندیش (٣٥٠ بنەماڵە) لە باکوور بوون . لە سەرووی ڕووبار و نزیکی کۆیەش چەند گوندی تر هەبوون کە دەیانگوت لە ئەسڵدا شێخ بزینی بوون لێیان بڕاون .

[2] - شەرەفنامە (١٥٩٦ ) لە باسی هۆزی ناحیەی (جەزیرەی بنی عمر ) دا، باسی شیخ بزەینی دەکات ، بەلام شی ناکاتەوە، نەوەو نەوەزاکانی حسن ئاغا لە چەند گوند دەژین، لەرۆخی چەپی زێی گەورە باکووری جادەی هەولێر بۆ موسڵ هەلکەوتووە ، جیهانگەڕەکان باسی بوونی شیخ بزەینیەکان لە تورکیا ، باشوری ڕۆژهەلاتی کاستامونو (Kastamonu) لە نزیك قزل ئێرماق لە باشوری ڕۆژهەلاتی ئەنقەرە باکوری ئەرزەرۆم دەکەن . جوامێر کوری تۆفیق قەسرۆك کە لە نووسراوەکەدا باسی لێکراوە، لە درێژەی داستانی زەنگەسوورەکاندا گوتی ناوی ئەو هۆزە لە ئەسلدا (( دەربەندی )) بووە ، بەلام بەگومانم بوونی ئەوچوار گوندانەی کە لە فەسلی بیست و یەکەمدا ئاماژەیان بۆ دەکرێ ، بوونەتە هۆی پێکهێنانی تارمایی لە مێشکدا

بەتێکرایی پشتی شێخ محمودیان دەگرتوو یارمەتیان پێ دەگەیاند، دوای ماوەیەك بەشێك لە گوندەکانی رۆخی راستی (زێ) لەگەل گوندەکانی سەر بە قەزای کۆیە خرانە سەر هەولێر، بەلام لە رۆخی چەپ، بەشێکی باریك هەبوو کە بیست مایل دەبوو درێژو پانترین شوێنی بە زەحمەت دەگەیشتە چوار مایل لەنێوان رووبارو ناحیەی شوان هەلکەوتبوو. گوندەکانی ئەو بەشە پێشتر سەر بە شوان بوون دوایی لەگەل ناحیەیەك بەناوی (زێ) لەسالی ۱۹۲۳ دا خرانە سەر چەمچەمال ، هۆی راکێشانی سەرنجی ئێمە بۆلای ئەو هۆزە ئەوە بوو، کە گوندی تەق تەق و رێگای گەشتی قەرەولەکانی نێوان کەرکوك کۆیەمان بە ناوچەی شێخ بزەینییەکاندا تێدەپەری. سەرۆك عەشیرەتە گرنگەکانی ئەم هۆزە، کە ئێمە پەیوەندیمان لەگەلیان هەبوو ، لە رۆخی باکوور بریتی بوون لە محمود ئاغای ((سارتك)) نەوەی حاجی هەمزە کەپیاوێکی هۆشیارو بە ئەزموون بوو، لە رۆخی باشوور تۆفیق ئاغای (قەسرۆك) نەوەی مەلا عەباس لەگەل برازاکەی تۆفیق بە ناوی فارس ئاغای سەرچنار .

ناحیەی ئالتون کۆپری بە (١٥,٠٠٠) کەس نفووس لە قەراخی چەپی هەردوولای جادەی کەرکوك و هەولێر جێی گرتووە ، بەشی ئەسلی شارۆچکەکە ، کەناوی خۆی بەو ناحیەوە داناوە لەناو دوورگەیەکی ناو رووبار سازکراوە. ئالتون کۆپری واتای (پردی زێر) دەبەخشێ. بەگوێرەی داستانێك ئەم شارۆچکەیە ناوی خۆی لە ناوی ژنێك بە ناوی ئالتون وەرگرتووە، کەدوو پرد بە فەرمان یان سەبارەت بەو سازکراون ، بە پێی داستانێکی دیکە ناوی ئەو پردەیان بۆ تەوس لێدان سەبارەت بە پارەیەك کردووەتە ((زێر )) کە لە رێگای سازکردنی ئەوپردە فەوتاوە، عەرەب پێی دەلێن ((القنطرە)) وە کوردکانیش ((پرد)) ی پێدەلێن و هەردوو واتایەکیان هەیە، ئەو جێیە ، یەکێك لە ناوەندەکانی ((کەلەك )) ئاژۆیە. جیا لە بنەمالەی بەگزادەکانی کورد، کەدەلێن لە ((شنۆ ))ی نزیك ورمێ هاتونەتە ئالتون کۆپری .

شوان بە (١١,٠٠٠) کەس نفوس لە باسکی چەپی زێ لە رۆژهەلاتی ئالتون کۆپری جێی گرتووە. تەپۆلکەکانی لای باشوری زۆر چرو تەسکن ناوچەی لای دۆلی زێ هەندێك بەرز دەبێتەوە دەگاتە ناودەشتێکی بەرزی بێ دار و دەوەنی چڕ، کە بەرزایی لە تەپۆلکەی خالخالاندا دەگاتە نزیکەی (٣٠٠٠) پێ و سەرئەنجام دیسان بەرەو دۆلی ((خاسە ))دەشتی کەرکوك شۆڕ دەبێتەوە جێیەکی پڕ ئاوە و بۆ ئاژەل راگرتن زۆر باشە بەتەواوی لە نزیك

ڕووبارەکە، زنجیرە گوندێکی لێیە، کەمولکی شێخ بەزەێنیەکانن و پێشتر ئاماژەم بۆکردوون، ئەو گوندانە بۆماوەیەك خرانە سەر سلێمانی لە شوێنەکانی تری ناحیە شوانەکان دەژین.

دوای کشانەوەی شێخ مەحموود لە سلێمانی لە بەیانی چواری مارسدا ، تا یەك دوو ڕۆژ ڕاپۆرتی دژ بەیەکمان دەربارەی ئەو پێ دەگەیشت، بەلام زۆری پێ نەچوو شوێنی ئەومان لە باکوری ڕۆژئاوای سورداش دیتەوە: ناوەندی بارەگاکەی لەناو ئەشکەوتێکی گەورە لە جاسەنە دانابوو وە ئەندامی یەکەکانی هێزی ناوچەیی و عەشایری و لایەنگرانیشی لە گوندەکانی دەوروبەری جێگیر کردبوو ، خەریکی کۆکردنەوەی باج یان بە وتەیەکی تر خەریکی دەسەلاتداریەتی لە ناوچەی سورداش، سەرچنار، شارباژێر بوو، بەداخەوە ئاگادارکرام دۆستە کۆنەکانم واتا ڕەزابەگ و عبدالرحمن ئاغا سەرکردەی چەند گروپ لە سلێمانی مابونەوە ترس وخۆفیان خستبووە ناو شارو باجیان لە بازرگانەکان و ئەو کەسانە دەستاند کە لەگەل شێخ محمود نەبوون . شێخ تەنانەت چاپخانەی شارەوانیشی لەگەل خۆی بردبوو و ڕۆژی هەشتی مارس یەکەم ژمارەی ئۆرگانی نوێی خۆی بەناوی ((بانگی حەق)) بلاوکردەوە. ئەو ئۆرگانە، لەسەر لاپەرە کاغەزیك چاپ دەکرا و لە ڕاستی دا لە جیاتی ڕۆژی کوردستان بلاودەکرایەوە و گۆڤارێکی ڕەسمی و سیاسی و ئەدەبی و کۆمەلایەتی بوو ، بەلام لە سەرکردایەتی گشتی لەشکری کوردستاندا چاپ دەکرا. ناوی بلاوکراوەکە پێشوازی لە بیرو باوەری خەلك دەکرد ، چونکە هەروەك دەزانین گوتنی حەق لەزمانی عیرفاندا واتای خودا دەگەینێ . تەنیا وتاری ئەو بلاوکرایەوە ڕاگەیاندنی غەزابوو. ئەوکارانە و هەلسورانی ڕەزا بەگ کە دوای ڕاکردنی شێخ محمود هەلوەشانی شورای پەسەند کراوی کۆمیسێری بالای بەدواوە بوو پێشانیدا کە شێخ محمود هەرگیز لە کردەوەی خۆی پەشیمان نییە . لەبەرئەوە ، چەند هەلفڕینی شناسایی بەسەر سلێمانی و سورداشدا ئەنجامی گرت و هێندێك جاریش جاسەنەو کاروانەکانی ناو ڕێگای جاسەنە بۆمباران کران. داوایان لێکردم بەرپرسایەتی چەمچەمال وەربگرم و بۆ سەرپەرشتی کردنیشی قایمقامێکی ((دژی گولله )) ی بۆ دانیم . ئەو قایمقامە ئەمینی ڕەشید ئاغا سەر بە تایفەی ڕەمەوەند لە هۆزی هەمەوەندو دوژمنی کەریی فەتاح بەگ بوو کە پشتگیری شێخ محمودی دەکرد بەهەموو توانامەوە هەولمدا دۆستان و میانڕەوەکان دژی دانی باج بە نوێنەرە حاکمە وەلانراوەکان ڕاپەڕێنم دژی شێخ محمود.

لاین ئەفسەری سیاسی کاروانەکەبوو . بریارم دا داوای فڕۆکە نەکەم و بە ڕێگای زەوی و ناوچەی شوان و گوندەکانی شێخ بزێنییدا کە هەردوولای زێیان گرتبوو و لەم دوایانەدا

خەلکەکەی هێندێکمان لێ سارد ببوونەوە ، تێپەرم و خۆم پێشان بدەم . بەسواری ئۆتۆمبێل و بەجادەی تەق تەقدا چوومە جێیەك کە چوارده مایل لە کەرکوك دوور بوو . لەوێ چاودێرەکانم بە ئەسپەوە چاوەروانم بوون .

بڕیارمدا بچمە ئالتون کۆپری دوای ئەو ناحیەی مەلحە ببینم ، کە تا ئێستا لەبەر گێروگرفت و سەرقالبونم بە ڕووداوەکانی سلێمانی لێی غافل بووم. دوای بیست خولەك ڕێ ، لە ((هەرموتە )) تێپەریم کە تەنیا گوندی ((قەزای )) کۆیەیە و تەواوی دانیشتوانی فەلەن . ڕێگا چەند مایل بە ڕۆخی رووباری ((کۆیە )) دا تێدەپەرێ، کەلەو وەرزەی سالّدا ئاوی زۆرەو بە ڕوالەت بەر لە گەیشتنی بە باریکە ڕێیەکی بەشی ڕۆژئاوای، کە دەچووە گوندەکانی ((ئۆمەرگونبەت )) و (( سێگردەکان )) چەند جار پەرینەوە. سەروبەندی خۆر پەڕین گەیشتینە رەشماڵەکانی محموود ئاغای شێخ بزینیی ، کەلە قەراخی (( بەستی هەوار )) هەلیان دابوون و یەك مایل بۆ گوندی ((سارتك )) و نزیکەی سێ مایلیش بۆ کۆیە مەودای هەبوو .
شەوێکی ئارامم لە جەوێکی شوانانەی خۆشدا بردە سەر ، کە دەتگوت هەزاران مایل لەو شوێنە شەرگرتووە دوورە، کە بەیانی ئەو ڕۆژە لێی بووم. خانە خوێیەکەم گوتی خەلکی ئەو دوو گوندانەی کەمن ئەمرۆ لێیان تێپەر ببووم ، واتە ((ئۆمەر گونبەت )) و (( سێگردەکان )) ، بەزاراوەیەك دەدوێن ، کەتایبەتمەندیی خۆیانە . گوتی ئەوانە لەباری بنەچەوە ، وەك تەواوی خەلکی گوندەکانی ئەو ناوچەیەی ، کە هەردوو لای زێیان گرتووە ، شێخ بزێنیین ، بەلام لە جیاتی(( ئەو کوردییەی )) کە ئەندامانی تری ئەو تیرەیە لە رۆژگارانی هێندێك کۆنەوە قسەی پێدەکەن ، ئەوان زمانی کۆنتریان پاراستووە . چەند وشەیەکی لەو زمانە گوت کە بەرای من لە زاراوەی کوردی کرماشانی یا لەکی باکوری لوڕستان دەچوو.

لەبیرمە ، شێخ بزێنییەکان بەگوێرەی داستانێك لە ئەسلّدا لە موسلّ یا لە بەشەکانی سەرووی باکورەوە هاتوون . لەبەرئەوە، ئەو ئاخافتنە پتر لەگەل داستانێك دەهاتەوە کە جەمال ئاغای کۆیە بۆی گێرامەوە.

بەپێی ئەوداستانە ، خەلکی ئەودوو گوندانە سەر بەهۆزێکن بەناوی ((دەربەندی)) و لەناوچەی ((رەجەب )) لەباکوری جادەی نزیك کەلی ((تەقیەگرە))وە هاتوون ، واتا ئەو جێیەی کە ڕووباری ((حەلوان)) بەرێگای قەسری شیرن و خانەقیندا دەچێتە ناو دەربەندی ((دەرتەنگ)).

ئەو راپۆرتەی خوارەوەم دەربارەی دۆخی سیاسی و سیاسەتی عەشیرەتی بۆ فەرماندەی کاروان نوسی دوای دەرکردنی شێخ محمود لە سلێمانی و هەلوەشانەوەی دەزگای ئیداری ئەو شارە ناوچەیەکی بچووك لە گوندەکانی شێخ بزێنی کە ناحیەی شوان لە زێ جیا دەکاتەوە وە بە ناڕوونی مابوونەوە وە بەردەوام بوون لە پشتگیری کردنی شێخ محمود بەهۆی قەتڵێك و کۆمەڵە ئاژاوەیەك کە لەو ناوچەیەدا ڕوویان دابوو ناچاربووم مودیرێکی (( دژی گوللە)) بەناوی وەهاب بەگ لەگەل ژمارە پۆلیسێکی کەم، کە خەرجیان لە داهاتی ناوچەکە دابین دەکرا ، لە کەرکوکەوە بەرمە ئەو ناوچەیە و گوندەکانی باکووری ((قەلا سێوەکە))[1] شی لەگەل بخەم و ناحیەی پێشوو ئاوەدان بکەمەوە . بەم جۆرە ، عەشیرەتی شێخ بزێنی دەکەوتە ژێر فەرمان[2] .

***جوگرافیای نیشتەجێ بوونی لوڕەکان:**

زۆرینەی ئەو شوێنانەی کە لوڕەکان تیایدا نیشتەجێن هەڵکەوتوّتە ڕۆژهەلاتی کوردستان و بەدوای ئەوە ژمارەیەکی زۆریش لە لوڕەکان دانیشتووی باشوری کوردستان و وولاتی عێراقن . لە وولاتی ئێران نزیکەی (۷) پارێزگا بە تەواوەتی بە جوگرافیای سروشتی و ڕامیاریەوە ژینگەی مێژوویی و هاوچەرخی لوڕەکانە کە ئەمانەن :

ئیلام (پشتکۆ)-لوڕستان یان خۆرماوا (خوڕەم ئاباد)- چهارمەحالّ و بەختیاری-کۆهگیلۆیەو بویرئەحمەد-پارێزگای شیراز کە ئێستا بە فارس دەناسرێت-بوشەهر-هورموزیان (هورموزگان).

---

[1] - گوندی گرنگی ئەو گروپە ((عەسکەر )) ی ناوبوو ، کە شوێنی زاد و وەلەدی بنەماڵەی جەعفەر پاشا عەسکەریی . هاوکاری فەیسەڵ لە راپەرینی عەرەبەکان دژی تورکان مێردی خوشکی نوری سەعید پاشابوو . هەروەها خوشکی جەعفەر پاشا ژنی نووری سەعید بوو لە سالی ١٩٢٤ دا ناحیەکی کاتی بەناوی (زێ) پێك هات : ناوچەی شێخ بزێنی درابیەوە بە شوان و قەلاسێوەکە تێکەلی چەمچەمالّ کرا .

[2] - سیسیل جۆن ئیدمۆندس، کورد تورك عەرەب، و: حامید گەوهەری،چ٢، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤. - كتاب التاخي ادمۆندز، كرد و ترك و عرب، ت: جرجيس فتح الله، ١٩٧١، ص ٤١ ،٤٢، ٤٣، ٢٦٩،٢٧٠، ٢٨٩، ٢٩٠، ٢٩٥. — سی.جی.ادمۆندز، كورد و ترك و عرب، ت: جرجيس فتح الله، دار اراس للطباعة والنشر، ط١، اربيل، ٢٠١٢.

جگە لەمە لوڕەکان و ناوچە لوڕ نشینەکان بەشێکی زۆر لە پێکهاتەی کۆمەلآیەتی و جوگرافیایی ئەم پارێزگایانە پێکدێنن واتە پارێزگاکانی:

کرماشان_ هەمەدان_ مەرکەزی (ئەراك) – ئەسفەهان – باشووری کرمان – خوزستان.

لە باشووری کوردستان و ولآتی عێراق لوڕەکان لەم پارێزگایانە نیشتەجێن :

هەولێر( ئەربیل) – کەرکوك – سلێمانی – دیالە – واست – میسان.

واتە لە شارو شارۆچکەکان و دەشتەکانی وەکو : چەمچەماڵ، خانەقین، دوزخورماتو، جەلەولا، دەشتی هەولێر، دەشتی کۆیە ، شارەزوور، دەشتی بیتوێن، مەنەلی ((مەندەلی)) ، جسان ، ترساق، هەشیمە، زرواتیە ،بایرای بەدرە، عەلی غەربی ، عەلی شەرقی، باغسای ، کووت و ...هتد.

جیاواز لەمانە ژمارەیەکی زۆر لە لوڕەکان لە دەرەوەی جوگرافیاو ناوچەکانی خۆیان دەژین ، بۆ وێنە بەشێکی زۆر لە لوڕەکانی ئێران لە باکووری ئێران لە پارێزگاکانی گیلاڵن و مازەندەران ، لە باکووری خۆرهەلسان (خوراسان)، قەزوین، زەنجان و ناوچەی ساین قەلآی پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژئاوا دەژین کە زۆرتر لە خێڵەکانی "چگنی"،"پاپی" ،"بەیراوەند" و "چاردوڵی (چەرداواڵی) ن ، بەشێکی دیکە لە لوڕەکان کەلەبنەچەکدا لە خێڵی مامەسەنی (مەمەسەنی) ناوچەی نوورئابادی شیرازن کەوتوونەتە پارێزگای سیستان و بەلووچەستان. لە ولآتی عێراقیش جگە لەو لوڕانەی کە دانیشتووی ناوچەکانی باشووری کوردستان و لێواری سنووری عێراق و ئێرانن هەتا پارێزگای میسان، ژمارەیەکی زۆر لە لوڕەکان (کە هەندێ لە سەرچاوەکان ژمارەیان بە ملیۆن دەگەیەنن) دانیشتووی شارە گەورەکانی عێراق وەکو بەغدان کە بە " لوڕ یان کوردی فەیلی " ناسراون.

گروپێکی دیکەش لە لوڕەکان دانیشتووی ولآتی تورکیاو باکووری کوردستانن کە لە باشووری کوردستانەوە کۆچبەر کراون بۆ ئەو ولآتە، وەکو خێڵی "شێخ بزەینی" کە بەشێکیان لەناوچەی "هایمانا" لە پارێزگای ئەنقەرە دەژین . بە گوێرەی هەندێ سەرچاوەی نافەرمی ژمارەیەك لە لوڕەکان لە چوارچێوەی خێڵ و عەشیرەت کە ڕەنگە ژمارەیان بگات بە (٥٠٠٠٠)کەس دانیشتووی ولآتی ئیسرائیلن و مێژوویەکی تایبەت بە خۆیان هەیە .

***جوگرافیای سروشتی و سەرچاوە سروشتیەکانی ناوچە لوڕ نشینەکان:**

زۆرینەی جوگرافیای سروشتی ناوچە لوڕ نشینەکان بەتایبەت لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان شاخاوین و لە زنجیرە شاخ وداخی بەرزو نزم و زۆر دەربەند و دەشت و دۆڵ پێکهاتوون و لە نیوە زۆرتری زنجیرە چیای زاگرۆس لە خۆ دەگرن.

بەرزایی شاخەکان لە هەندێ ناوچە وەکو چیای "دنا" دەگاتە (٤٥٠٠)مەتر ، زۆربەی مەڵبەندەکان دارستانین و بەهۆی بارینی بەفر و باران بەڕادەیەکی باش چەندین چەم و ڕووباری گەورەو بچوك لەم شاخانەوە سەرچاوە دەگرن کە لە سەرچاوە سەرەکیەکانی ئاو لە ئێرانن .لە باشووری کوردستان و عێراق زۆرینە ئەو ناوچانەی کە لوڕەکان تیایدا نیشتەجێن گەرمیانن و پێکهاتوون لە دەشتی پان و بەرین و شاخ و هەورازی نزم[1] .

هەربۆیە لەناوچەی لوڕستان و لەکستان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سنووری کوردستانی ئێران هۆزی شێخ بزێنی هەیە بەتایبەتی لەوناوچانە لە پارێزگای خورەم ئاباد – شیراز –قەزای کازڕۆن...هتد، بۆیە لە زۆر ناوچەی لوڕنشینەکان هۆزی شێخ بزێنی بەدی دەکرێت .

**-محمد امین زکی بەگ لە کتێبەکەی بەناوی( خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان)دا دەڵێت:**

**لە پێش شەری گەورەدا (١٩١٤ – ١٩١٨ ی میلادی)**

دەرهەق بە وەزعیەتی عەشایری کوردی ئەم دەورە ، لە تەرەف (سێر مارك سایکس )و (مێجەرسۆن)ەوە، بەعزێ مەعلوماتی زۆر چاك دراوە. واقعیەن سێر (مارك سایکس) هەر باسی عەشائیری مەملەکەتی عوسمانی قەدیمی کردوەو، ئەوەندە لە حلودی ئێران تێپەڕنەبووە. بەلاَم (مێجەرسۆن) دەرحەق بە کوردستانی مەرکەزی ، کە لە هەردوولای حدودی قەدیمی (عوسمانی – ئێران) کەوتووە، تەدقیقاتێکی باشی کردووەو، بەدەرەجەیەك ئیکمالی نوقصان دەکا، بەلاَم دیسان نەتیجەی سەعی ئەم دوو زاتە مەعلوماتێکی تەواومان ناداتێ و ، دەرحەق بە کوردانی دوور لە مەرکەز باش تەنویرمان ناکەن. لەبەر ئەمە مەجبوور بووم سەرنجم لە بەعزێ ئاساری تردا بەدەرەجەیەك ئەم نوقصانەم ئیکمال کرد.

[1] - کورتەیەك سەبارەت بە لوڕ ،لە بلاَوکراوەاکنی سەنتەری هاویەشی لوڕ ، ل١٢-١٧.

سێر مارك سایكس، لە ژێر عینوانی عەشائیری كوردی دەوڵەتی عوسمانیدا باسی عەشایری كوردی توركیای كردووە . وە بۆ دۆزینەوەی مەوقعیان و بەعزێ مولاحەزاتی تر تەقسیمی دەكا بە شەش مەنتیقەوە : A, B, C, D, E, F لە موقەدیمەكەیدا باسی عەشایری گاوور دەكاو ، دەڵێ : بەڕیوایەتی بەعزێك ئەمانە ئەصلەن كوردن و بەعزێكی تر خیلافی ئەمە ئیدعا دەكەن. بەلاّم من وا دەزانم كە ئەم گاوورانە لە موصڵ و عێراقەوە ڕایان كردوّتە ناو كوردی هەكاری یەوە. نەفسی كوردیش مومكینە بكرێت بە سێ بەشەوە :

**بەشی ئەووەڵ:** كوردی نیوە گەڕۆكی دەشت و شاخانی جنووبە. عەشائیری ئەم بەشە لە خصوص تەبیعات و عاداتەوە لەیەك زۆر نزیكن . خاكەكەیان بە بەردەكەتە.

بەقەد ئیحتیاجی خۆیان زراعەت دەكەن ئەغلەب بۆ جۆری تیاری و ئیشووكاری زراعەت و نەقلییات و خدمەت بە غەیرە دەكەن. لە ئاسنگەری بەزەو سوجادەو، ڕەشماڵ دروستكردندا شارەزان. بە نەزەر ئەكسەریەتی كوردەو زۆر پێشكەوتوون ، خوێندەوارن لە ئیش و كاردا وریاو زیرەكن و زۆر بە سەلیقەن.

لەژێر ئیدارەی ڕوئەسای ئیرسی خۆیاندا دەژین، شەڕانی و دڕن. ئەو كوردانەی لەژێر عینوانی بەبەدا نیشان دراون ، سوارچاكن، سەجییەیان بەرزەو ڕێگە بڕن، تفەنگیان هەیە. لام وایە كە ئۆردووە گەورەكانی سوارەی (پارس — ئەشكانی) لەمانە كۆكراوەتەوە . گەورەی موقەدەسی ئەم كوردی بەبەیە خالید بن وەلیدە، زۆر تەقدیسی دەكەن و بەڕیوایەتی خۆیان، ئەو كردوونی بە ئیسلام[1]. عەشائیری ئەم صنوفە هەمووی سوننە مەزهەبە.

لە تشرینی ئەووەڵەوە تا شوبات لە گوندەكانیاندا دادەنیشتن و لە مارتدا دەچنە ناو ڕەشماڵ، وە بەعزێكیان تاخاكی وزنە دەچن . گەلێك ڕوئەسای ئەم صونفە لەگەڵ عەرەبدا مناسەبەتی زاوایەتیان پەیا كردووە. ئافرەتیان جوان سەربەستەو زۆریان دەخوێنن و وە وەكو پیاو دەچنە ڕاو.

**بەشی دووەم :** عەشائیری دامەزراوی ناو چیایە ، وە ئەمانە لە هەموو خصوصێكەوە لەبەشی دووەم جوێن . زوراعێكی باشن و زۆر لەگەڵ زراعەت خەریك دەبن . لە ئاو هەڵگرتن و ئاو تەقسیمكردندا شارەزان. ئەنواعی حبوبیات دەچینن و توتن پێ دەگەیەنن . ئیدارەیان بەدەست ڕەئیسی عەشیرەتەكەوەیە. وە ئەغلەب لەگەڵ یەكدا لە شەڕدان تفەنگیان هەیە و تفەنگچی و

[1] - ئەم مەنسووبینی خالیدی یە ڕەنگە لە خالیدی—كالیدی قەدیمی مەنتیقەی (وان)ەوە پەیدا بووبێ.

ڕاوکەری باشن . هەر گوندیەك یەك قەلاّی هەیە وە لەوەقتی مودافەعەدا ئیستیفادەی لیّ دەکەن. حەیاتی مالّیان عادەتەن وەکوو صونفی ئەووەلّ وایە . بەعزێ جولەکەشیان لەناوایەو لەگەلّیانا چاکن. بەلاّم حەقی سیلاح هەلّگرتنیان نییەو ، داخلی شەڕی عەشائیری نابن . کەلعادە ئەم جوولەکانە بە کاسبی و تجارەتی بەینی عەشایردا مەشغولن. ئەو عەشائیری گاووری نەستۆرییە کە لە بەینی ئەم کوردانە دان لە شکلّێکی تابعدان.

**بەشی سێیەم :** نیوە گەڕوك و چیانشینن . بەعزێکی لەگەلّ زراعەتداو بەعزێکیشی لەگەلّ مالّیاتدا — اغنام خەریکن و ، بەشێکیشی بەرزە ولاّخ پیّ دەگەیەنن . لە پۆشتندا وەکو بەشی دووەم وانە . خراپەو شەڕیان زۆرە .نافرەتیان زۆر ئیشکەرەو ولاّخیان گویّ درێژو ئێسترە. لە خصوصی شکلّ و قیافەتەوە لە دوو صونفەکی تر فەرقیانەهەیە .ئەم صونفە بەخۆوە تر و زەلامترن . سیلاحیان باش نیە ، زەخیرەیان کەمەو کەم زاتن . لە خصوصی دین و مەزهەبەوە مەعلوماتیان کەمەو بەلاّم بە صورەتی عموومی ئیسلامن.خولاصە ، لازمە مەعلوم بیّ کە لە عیراق و زنەو ئەتراِفی موصلّیشدا عەشائیری گەڕوك هەیە . بەلاّم خەلّکی چیاکان کە بە کۆچەر دادەنرێن جاهیل و ئیبتیدائین.

**لە منتیقەی Aدا:** ئەم مەنتیقەیە لە بەینی (سلیمانی ،بەحری ورمیّ، بەحری وان، سعردو دجلەدایە) بەشی عەشائیری کوردی عیّراقی ئیّستای[1]

| ناوی عەشرەت | فیرقەکانی | عەدەدی مالّی | حالّی ئیجتماعی | مەوقیعی و بەعزێ مەعلومات دەرحەقی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| شێخ بزێنی | | ٦٠٠ | ساکین وزراعە | لە قەراغی جنوبی زێی کۆیە(زابی صەغیر)یە.سوننی یە |

**لەمەنتیقەی Dدا:** حدودی ئەم مەنتیقەیە ، حدودی قەدیمی (عوسمانلی— ڕوس) و(عوسمانلی— ئێران) و ساحلی شیمالیی گۆمی وان و خەتی (بتلیس-مووش-ئەرزنجان) و چەمی (چووروخ)ە، یەعنی (ولاّتی بایەزید، شیمالی مووش ، ولاّتی ئەرزەڕۆم وبەشیکی ئەرزنجانە.

[1] - ئەم مەعلوماتانە بۆ عەشائیری لیوای سلێمانی و کەرکوك و لیوای دیالە لە ئەسەرەکەی (مێجەرسۆن) {مەعلومات دەرحەق عەشائیری کوردستانی جنوبی ، بەغداد، ١٩١٨)، بۆ عەشائیری لیوای هەولێر لە ئەسەرەکەی کاپتن های (دوو سالّ لە کوردستان) دا، بۆ لیوای موصلّ لە "مفصل جغرافیە العراق و ئەسەرەکەی سێر مارك سایکس وەرگیراوە} .

| ناوی عەشیرەت | شکڵی ئیجتماعی | عەددەی ماڵی | موقع و فرقەکانی و ئەحواڵی |
|---|---|---|---|
| شێخ بزەینی | ساکینە | ٤٥٠ | لە نزیك ئەرزەرۆم دوو سێ دێیان هەیە- |

- ئەغلەبی ئیحتمال فرقەیەکی عەشیرەتی شێخ بزەینی کەرکوکە. فرقەیەکیشی لە تورتووینەو ئەمەش لە شێخ بزەینی کەرکوکە.

لەمەنتقەی (فارس) دا کە لە دوای شەڕی گەورە کەوتە دەست تورکیا، بەعزێ عەشائیری کورد هەیە، وەنەفسی شاری (قارص) یش بەشێکی کوردە.

**لە مەنتیقەی Fدا:** حەوزەی قزل ئیرماق و سەقاریا(وڵاتی قەدیمی سیواس و ئەنقەرەو قۆنیە) ، ئەم مەنتیقەیە بە تەواوی لەکوردستان بەدەرەو، لە نەتیجەی تەهجیرێکی جەبری یە کە لەکوردستانەوە بۆ ئەم وڵاتانە لە تەرەف سولتان سەلیمەوە کراوە . لە جیهەت ئەنقەرە تووشی بەعزێ کورد بووم کە جل و بەرگ و قەڵافەتیان لە بەعزێ تورکی دەوری ئەرزەرۆم دەچوو. سەبەبی ئەمەم لەو تورکانە پرسی ، گوتیان ئێمە نەتەوەی یەکترین و ئەجدادمان لە تەرەف سولتان سەلیمەوە لێرە ئەرازیان دراوەتێ .ئەمە وا دەر دەکەوێ کە ئەمە ئەرازی عەشائیری تەهجیرکراوی کورد بووە کە بەو تورکانە بەخشراوە. لەلایەکی تریشەوە وا دەر دەکەوێ کە کورد لە دوای تەهجیری ئیجبار کراوە کە لیباسی تورك بپۆشێ و ئەم لیباسەش بە گوێرەی قیافەتی دەوری سولتان سەلیم — تەقریبەن لیباسی ئەو زەمانەیە .

| ناوی عەشیرەت | عەددەی ماڵی | شکڵی ئیجتیماعی | مەوقع و ئەحواڵی |
|---|---|---|---|
| شێخ بزەینی | ١٢٠ | گەڕۆك | لەنزیك بوی ئاباد ئەژی ، لە |

ئەصڵی شێخ بزەینی کەرکوکەو لەتەرەف سولتان سەلیمەوە هێنراونە ئێرە ، بە کرمانجی قسە ئەکەن

| ناوی عەشیرەت | عەددەی ماڵی | شکڵی ئیجتیماعی | مەوقع و ئەحواڵی |
|---|---|---|---|
| شێخ بزەینی؟ | | نیوە گەڕۆك | لەغەربیی گۆمی قوچ حصارو لە قوچەتاغ دایە فرقەی |

شێخ بزەینی ئەلشکەردبن و لەوێ هێنراون

ئەمە خولاصەی مەعلومات و تەفصیلاتی (سێر مارك سایکس)ە، کە لە نیهایەتی کتێبەکەیدا (دوای وارسانی خولەفا) دەرهەق بە عەشایری کوردی حکومەتی عوسمانی داوە بە گوێرەی ئیفادەی مودیری عمومی موهاجرینی تورکیا . دەبێ میقداری کوردی ئەم

مەنتیقەیە (مەرکەزی ئەناتۆلی) لە (٥٠٠٠٠) کەس وزیاتر بێت [1]. (کوردلر،لاپەڕە ٨٠، حاشیە).

**هۆزو خێڵەکانی ناو کوردستان (تورکیا، ئێران ،عێراق، سوریا)**

خێڵ و هۆزەکانی کوردستانی باکور(تورکیا)

خاکی کوردستان پێش دابەش بوون هەموو یەك پارچە بووە بۆیە دەبینین هەر لەکۆنەوە خێڵ و هۆزە کوردیەکان لە یەك شوێن نیشتەجێن بەلاَم لەسالَی (١٥١٤ز)یەکەم دابەش بوون بۆ خاکی کوردستان کرا لەو شەڕەی نێوان ئیمپڕتۆریەتی فارسی سەفەوی و عوسمانی لە جەنگی بەناوبانگ لە ناوچەی (چالَدێران ) ، و دواتر پاش کۆتایی هاتنی شەڕی جیهانی یەکەم و شکستهێنانی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بەرامبەر بە ولاَتانی هاوپەیمانی شەڕ بەمەش دەست کرا بە دابەش کردنی هەموو زەوی و زاری بەسەر وولاَتانی سەرکەوتووی شەڕ( بەریتانیاو فەڕەنساو رووسیای قەیسەری ) بەپێی ڕێککەوتن نامەی (سایکس بیکۆ) سالَی (١٩١٦ز) و لە ئاکامی ئەم شەڕەدا خاکی کوردستان کرا بۆ پێنج پارچە لە هەریەکە یە (تورکیا — عێراق — سوریا --- ئێران — ڕووسیا) لەو ڕوانگەوە دەبینین بەشێکی زۆری خێڵ و هۆزەکانی ئەوانەی کەلە هەردوو بەری سنوور دەژین درێژکراوەیان دەبێت لە وولاَتێك بۆ وولاَتێکی تر ، وە لەو هۆزو خێلاَنەی کە درێژ دەبنەوە لە نێوان عێراق و تورکیاو سوریا ئەوانیش هۆزەکانی (مزووری،دۆسکی، سندی، میران ، گەردی ، هەرکی، بالکی، شێخ بزێنی ....هتد)

خێڵەکانی ناوچەی (هەکاری ،حەکاری)

ئەم ناوچەیە زۆر فراوانە کە پێك دێت لە (٢٥) ناوچە گرنگترینیان (هەکاری ،وان، ماردین،جزیرە)و زۆرجار ناوزەند دەکرێن بەناوی خێڵەکانی دیاری کراو.

هۆزەکانی ناوچەی جەزیرە:

هۆزەکانی قەلاَت و شاری فینیك:

- هۆزی شێخ تیرین

[1]- محمد امین زەکی بەگ، خلاصە تاریخ کوردو کوردستان، ئامادەکردنی : ڕەفیق صالح، بەرگی چوارەم ، لە بلاوکراوەکانی بنکەی ژین ، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ٢٤٧ — ٢٦٩.

- هۆزی نام دیربزنی
- هۆزی بزێنی (شێخ بزێنی)
- هۆزی ماسك
- هۆزی ڕشكی
- هۆزی دوتروان
- هۆزی شیرویان
- هۆزی بلان
- هۆزی بلاستوران
- هۆزی بیكان
- هۆزی منح نهران
- هۆ.ی مستوری
- هۆزی ألوتشی
- هۆزی مرسی
- هۆزی أردنانی

لە دەوروبەری ناوچەی (ماردین و ئورفەو نسێبین) ئەم هۆزانەی خوارەوە نیشتەجێن:

١- هۆزی شێخ بزێنی ٢-- هۆزی بیران علی ٣-- هۆزی كومبل

هۆزەكانی پارێزگای كەركوك و خێلەكانی :

هۆزی شێخ بزێنی و لقەكانی : ئەم هۆزە درێژبوونەوەیەكی گەورەی هەیە لە نێوان پارێزگای كەركوك و ئەربیل و دەوروبەری سلێمانی ، وەسەنتەری وولاتیان شارۆچكەی (شوان)ەو ، لقی لێ دەبێتەوە بۆ (١٣٠) سەدو سی گوند، لە ناوچەی كەركوك و دەوروبەری كۆیەو بەشێكیشیان سەر بە چەمچەماڵن و ناوچەی تەق تەق لە لقەكانیان دا

A. حاجی همزە
B. ملا عباسی [١].

---

[١] - نزار بابان ، كردستان جنة الله وحجیم أمة، مراجعة وتدقیق: خضر ابو العینین، عام ٢٠١٠، الاردن،عمان، ص٣٥٧، ٣٥٨، ٣٥٩، ٣٨٣.

## هۆزه كوردییه‌كان له‌عێراق

### هۆزی شێخ بزێنی :

أ-هۆزی شیخ بزێنی: له هۆزه نیشته‌جێ بووه‌كانه له گوندی بچوك بلاو بوویته‌وه له هه‌ردوو به‌ری زێی بچووك و له‌ناوچه‌ی به‌ستۆره. ئه‌م هۆزه دوزرایته‌وه له لایه‌ن دوو برا كه ناسراون به مه‌لا عه‌باس و حاجی همزه، سه‌ره‌تای په‌یدا بوونیان له زاخۆ هاتوونه‌ته خواره‌وه و پێش (١٠٠) ساڵ. تاكو ئێستا پاشماوه‌ی ئه‌م هۆزه ماون به ژماره‌ی بچوك له زاخۆ . ئه‌م هۆزه له شۆرشی به‌رده‌وام بوونه له دژی تورك ، ئه‌مانه‌ش په‌یره‌و كه‌رانی مه‌زهه‌بی سوننی شافعین، ئه‌م هۆزه پێش ئه‌وه‌ی نیشته‌جێ بن و ببنه هۆزێكی گه‌وره ژماره‌یان ده‌گه‌یشته (٤٠٠٠) خێزان. وه پیاوه‌كانیان سوارچاكی گه‌وره بوون وئه‌م هۆزه جۆره تفه‌نگێكیان دروست ده‌كرد به‌ناوی (مارتینی هنری ). ئه‌مانه‌ش زستانان له گونده‌كانیان نیشته‌جێ ده‌بوون و له به‌هاران ئه‌ندامانی ئه‌م هۆزه ره‌شماڵه‌كانیان له ده‌ورو به‌ری گونده‌كانیان هه‌ڵده‌دا، پاش دروێنه‌كردن له حوزه‌یران ئه‌مانه كۆچی هاوینه‌یان ده‌ست پێ ده‌كه‌ن بۆ سنووری فارس له‌گه‌ڵ مه‌رو مالآته‌كانیان . پاشان ده‌گه‌رێنه‌وه گونده‌كانیان له مانگی ئه‌یلول، ئه‌م هۆزه نیشته‌جێ ی(٥٠) گوندن. به‌پێی ئه‌و دابه‌شبوونه‌ی كه ده‌وڵه‌تی عوسمانی ئه‌نجامی داوه ، توانی دابه‌شی بكات به‌سه‌ر پارێزگاكان ئه‌مه بووه هۆی كه‌رتبوونی هۆزه‌كه ، ئێستاش ده‌بینرێت له گونده‌كانی (كه‌روگۆسك، گاینج، كه‌له‌ك یاسین) و به‌شێكیشیان له ئێرانن له نێوان (خرم ئاباد) و (شیراز) و زۆریان ئه‌مرۆ له ناوچه‌ی(علی اللهیه).

ب-سه‌رۆكی هۆزه‌كه : یوسف ئاغا حاجی محمود ئاغای كه‌ورگۆسك

ج-سه‌رژمێریان :٣٠٠ كه‌سن

د-توانای شه‌ركردنیان: مام ناوه‌ند

ه-شێوازی شه‌ركردنیان : خێله‌كی

و-پرچه‌ك كردن : چه‌كدار نین

ز-لایه‌نگیریان بۆ ده‌سه‌لآت و چه‌ندێتی سوود وه‌رگرتنی وولآتانی دراوسێ: لایه‌نگری ده‌سه‌لآتن و ناتوانرێت سوودیان لێ وه‌ربگیرێت

ر-دار ره‌چه‌له‌كی هۆزی شێخ بزێنی[١]

[١]- العشائر الكردية في العراق، مديرية الاسخبارات العسكرية العامة، المعاونية الاول ، سري،ص ٦٣، ٦٤.



**هۆزی شێخ بزێنی**

ئەم هۆزەیە باسێکی کۆنم لە بارەیدا نەدۆزیەوە، ئەوانەشم نەبینی کەباسیان کردووە بەڵام خاوەنی شەرەفنامە[1] باسی هۆزی شێخ بزێنی کردووەو بە هۆزەکی ناوچەی جزیرەی هەژمارکردووە و بەدووری نازانێت کە گەڕابنەوە بۆ وولاٚتیان لە کەرکوك و ئەربیل بۆ هۆکاری پێویست و پێویستی خۆسەپاندن و هاوشێوەیان زۆرە .... وە بەگەورەتر لە هۆزی ساڵەیی هەژمار دەکرێت و گومانی تێدانیە کە زیادەڕۆیی پێوە دیارەو ولاٚتیان لە شارۆچکەی (شوان)ە، کە (١٣٠) گوندە. هەندێك لەوان (لك) لە خۆیان هەژماردەکەن ، بەشێکی زۆریان لە کەرکوك و دەوروبەرینە و هەندێکیان لە کۆیەو دەوروبەری، بەشێکی تریان لە چەمچەماڵ و دەوروبەری یە، وە بەشێکی تریان لە تەقتەق و دەوروبەری یە وەچەکانی شێخ بزێنی دانیشتوی کەرکوك پۆلێن دەکرێت بۆ :

[1] - الشرفنامە،ص١٥٩.

١-حاجی همزە
٢-ملا عباس
ئاشکرایە گەڕانەوەیان یاخود پێك هاتنیان نوێ یە بۆ ئەم لیوایەو نەمان پچڕاند بۆ ئەم هۆزە گەورانەی کە بۆیان دەگەڕێتەوە.
لە گوندەکانیان لە ناو لیوای کەرکوك ولیوای ئەربیل:

١-سارتك ٢-شەیتان ٣-ئاومال ٤-قەرە سالم
٥-کاولە سوار ٦-شەوگیر(لیل ثقیل)(شەوی پڕ) ٧-سێکانی
٨-سێگردکان(التلول الثلاثة) (سێ گرد) ٩-ئۆمەر گونبەد
١٠-کانی لەلە ١١-قەنبەر ١٢-نێرەگین ١٣-بانە مۆرد
١٤-میرکا ١٥-بلەبان ١٦ساقە ١٧-تەتەق
١٨-ئێلنجاغ ١٩-ئێلنجاغی بچووك ٢٠-ناکبان. بچووك
٢١-شێخان ٢٢-روخان ٢٣-لك

ئەوەی تێبینی دەکرێت کە هۆزی تێکەلاوە تەنها هۆز نیە و لك چونەتە پالیان و لەوانەش نینەو ، لەوانەشە هی تریش تێکەلاویان بوونە . وەپێش تر باسمان کرد کە گوند بریتی یە لە کۆمەلگایەکی بچووك ، بە کۆمەلێك گوند هۆزێك پێك دێت و ،میرنشینی ، بۆیە پێویست ناکات زۆر بیر لە نەژدو لق بکەینەوە[1].

**شێخ بزێنی** : مارك سایکس ئەم هۆزەی بەهۆزێکی گەورە ناوبردووە (چوار هەزار خێزان)، ئەمانەش حەزیان لەشەڕکردنە ، بەشێك لەم هۆزە لە ناوچەی (تەق تەق) دەژین لە نێوان کەرکوك و ناوچەی هۆزەکی، تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ئەمانە لە ڕووی هێزی سەربازیەوە دەسەلاتیان لاوازە .

[1] - عباس العزاوی ،عشائرالعراق ،الجزء الثانی ،مکتبة الصفنی والمروی ،لندن،ص١٦١ - ١٦٣

**خێڵەکانی**

قارس --- کاغیزمان --- أرزەروم

ژمارەی دانیشتوانی شاری قارس(٢٥٠٠٠٠) دوو سەدوپەنجا هەزار کەسە ئەمەش مەڵبەندی ناوچەیەکی فراوانە لە باکووری دەریاچەی وان ، کوردو تورك و ئەرمەن تێیدا نیشتەجێن لە پێش شەری جیهانی یەکەم ، پاش ڕۆیشتنی ئەرمەن کوردو تورك تێیدا مانەوە .

تورکەکان بە ژمارەیەك دیالێکت قسە دەکەن، ئەمانەش لە تورکی قەوقازو تورکی ئازەری پێك دێت، ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردنە روسەکان ویلایەتی فارسیان داگیر کرد لە ساڵی (١٨٧٨ز ) تاوەکو ساڵی (١٩١٨ز) ، بۆیە لەدەرەوەی نەخشەی سایکس بۆ خێڵەکان ماوە .

بەپێی یەکێك لەسەرچاوەکان لە تەنیشت شاری فارس خێڵی کوردی نیشتە جێن ئەوانیش : میلانی (کە گەورەترینە) ، جمال الدین، کاش خانی، و جلالی ، و ئەمەی دواتر پەیوەندی خزمایەتی لەگەل هۆزی جلالی هەیە کە نیشتە جێی باکووری ئێرانن .

هۆزەکانی تر لە قارس:

-**شێخ بزێنی** : سەرژمێریان (٤٥٠) چوارسەدو پەنجا خێزانە لەسەردەمی سایکس نیشتەجێی ژمارەیەك گوندن لە ئەرزەرۆم و لە ناوچەی تر، وە لەوانەیە خزمانی هۆزی شێخ بزێنی بن لەباشووری ئەربیل لە عێراق[١] .

**- ئەو ڕاو سەرنجانەی کە لەپەرتوکەکاندا لەسەر هۆزی شێخ بزێنی نووسراوە:**

سەبارەت بە کوردانی ناوچەکە دەتوانم بەم سێ بەشەی لای خوارەوە دابەشیان بکەم .

*بەشی یەکەم : ئەمانە هۆزە نیمچە کۆچەرەکانی دەشت و گردەکانی باشوورن.

*بەشی دووەم : ئەوە پەیوەندی بەبەشی (١) ەوە هەیە.... ئەم هۆزانە زۆر لەیەك دەچن .. چ لەبارەی بارو گوزەران و نەریتەوەو چ لە ڕووی ڕومەت و ڕوخسارەوە ...ئەم هۆزانە . نیشانەی دەوڵەمەندی و دەرامەتی باشیان پێوە دیارە.. چونکە زۆربەی زۆریان چێوارو شوانی دەوڵەمەندن .. کە خەریکی جوتیاریش بن .. ئەوە لەبەر هۆیەکی دوهەمینی یە.. هەر چەندە زۆر جاریش .. خەڵکی دی بەکرێ دەگرن .. هەروەها لە نێو ئەم خێڵانە .. ئاسنگەری

---

[١] - ویلیام ریغلتون ، القبائل الكوردية ، ترجمة : د. احمد محمود خليل ، ط١ ، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر ، اربيل ،٢٠٠٦ ، ص ١٠٤ ، ١٢٢ ،١٢٣ .

کارامەو جوڵای دەست ڕەنگین و خێوەت دروست کردنی چاك بەدی دەکرێت.. توانای مێشکیشیان ڕەنگە لە سەرووی هۆزەکانی تردا بێ.. لە بواری خوێندن و فێربوونیش دا دەستێکی باڵایان هەیە.. سەرەڕای ئەمەش.. کۆمەڵێ پیاوی لێهاتووی پیشەسازو بازرگانی وریاو کارامەشیان تێدا هەڵکەوتووە کە شایەنی ئەوەن ببنە خاوەن لێپرسینەوەی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگایەکی شارستانی و پێشکەوتوودا.

ئەم کەسانە .. وان لەژێر ڕکێفی دەسەڵاتی وراسی هەندێ شێخ و میر و بەگزادە و ئاغادا کە زۆر ئاژاوەچی و حەز لە هەراو بگرو ناشوبن سەرباری ئەمەش بە دەستی دوژمنایەتی نێو خێڵەکانیش دەتلێنەوەو ناڵە ناڵیانە ئەو کوردە نیمچە کۆچەرانە کە بە کوردی بەبە یان بابان ناسراون ناوبانگێکی چاکیان پەیداکردووە لە بواری ئازایەتی و لاوچاکی و توانایی ڕامیاری و چەلەنگی و میوانداری ... ئەگەرچیش .. ناتوانین ئەو مەیلەیان بۆ چەباو جەردەیی لەبیر بکەین بەلآم .. بەگشتی سوارەی چاك و نیشان شکێنیان زۆرە کە گوللەیان قەت سەر ناکات لەم چەند ساڵەی دواییەدا وازیان لە بەکارهێنانی ڕم و شمشێر و زەرگ و خەنجەر هێناوە چونکە بوون  بە خاوەن چەکی نوێ وەك تفەنگ و دەمانچە. بەش بەحاڵی خۆم گەیشتومەتە ئەو بڕوایەی کە لەسەر ئەوە سوورە کە هەر لەباپیرە گەورەکانی ئەم هۆزانە وادی خۆی سوارەی سوپا مەزنەکەی پارسیەکان پێکهاتووە ... چونکە هەڵس و کەوت و نەش و نەماکردن و پیلانە تاکتی کیەکانی ئەم هۆزانە زۆر زۆر لەوانەی هێزەکانی سورنیاس Surenas دەچن وەك بلوتارخ لە پەرتوکە بەناوبانگەکەی کە لەژێر ناونیشانی  ژیانی کراسوس ە ،باسی کردوون.

خالید کوری وەلید وەك نمونەیەکی ئازایەتی و ئاینی پیرۆز لەلایەن ئەم هۆزانەوە تەماشا دەکرێت هەروەهاش خۆیان بە قەرزارباری ئەو پێشەنگە مەزنە دادەنێن کە وادی خۆی مەشغەڵی ئاینی موسڵمانەتی بۆ ناوچەی کوردستان هێناوە هەر ئەویش بووە کە بە هۆی ڕووناکی ئاینە تازەکەوە ئەمانی لە شەوە زەنگی تاریکی بت پەرستی و ئاگرپەرستی ڕزگاری کردوون .

تێکڕای خێڵاتی ئەم بەشە سوننین.. ئەمانە لە مانگی تەشرینی یەکەم و تەشرینی دووەم و کانونی یەکەم و کانونی دووەم و شوبات دا لەو شوێنانە دەژین کە بە ژمارە لەسەر نەخشەکە دەستنیشان کراون.

هەر ... زوو و لەسەرەتای مانگی ئازارەوە دەچنە خێوەت و دەوارەوە تا دەوروبەری حوزەیران لە هەمان کاتیشدا بەشێکیان بۆ وەزنە کۆچ و ڕەو دەکەن و لەوێش هەر لە مانگی گەلاوێژەوە تا مانگی ئەیلول دەمێننەوەو خێوەت و دەواری خۆیان هەڵ دەدەن و کەپری جوان جوان دروست دەکەن . کە تیایاندا .. ئەو وەرزە دەبەنە سەر بە هەر حاڵ گوزەرانیان لەو شوێنانەدا خۆشە .. کە سەرماو سوڵەی پاییز دەست دەکا بە نوقورچ گرتن . ئەو کاتە دیسانەوە بۆ دێکانیان دەگەڕێنەوە...

گەلێ دەم چەرمگ و ئاغا و سەرخێڵەکانی ئەم هۆزانە ژنیان لە هۆزە عەرەبەکانی ناوچەی مێزوپۆتێمیا هێناوە.. هەر چەندە ژنانی ئەم هۆزانە هێندە .. شۆخ و شەنگ و ناسکن هەر نەبێتەوە سەرەڕای ئەوەش سەربەست و گفت لفت جوان و ئازاو ڕێك و پێکن تەنانەت هەندێکیان نیشان شکێن سوارچاکیشن ... لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ئەرکێکی پێ ڕانەسپێردراوە جگە لە بەڕێوەبردنی ئیش و کاری ناوماڵ و مەڕو مالات دۆشین و مەشکەو کەرەو ماست دروست کردن.

## *شێخ بزەینی( Sheikh Bzeing)

چوار هەزار خێزانن . هۆزێکی کوردی ئازاو جەنگاوەرن. هەندێکیان خەریکی تالآن و چەپاون بەلآم سوار چاك و پیاوی ئازایان زۆرە .. مرۆڤی زیرەك و دنیا دیدەشیان زۆرترە ... وەستای کارامەشیان هەیە کە خەریکی دروست کردنی دەمانچەی مارتینی --- هیندین . زستان لە دێکانیان دەبەنە سەر هەرچەندە لە وەرزی بەهار ڕوو دەکەنە ئەو دەشتە سەوزانەی دەوروبەریان و خێوەت و دەواری خۆیان هەڵ دەدەن و بۆ ماوەیەك سەقام گیر دەبن تا پاش دەغڵ و دان دورین .. واتە تا مانگی حوزەیران .

لەگەڵ ڕان و گاکانیاندا بەرەو سنوری ئێران دەکەونە ڕێ لەوێش دەمێننەوە تاوەکو (پایز) واتە (مانگی ئەیلول) یان نەختێ درەنگتر ئەگەر وەرزەکە گەرم بوو ، ئەمانە کوردی بەبەن .

## *شێخ بزەینی (Shaykh Bezaini)

(١٢٠) خێزانن .. کۆچەرن .. لە دەوروبەری ( بویاناباد)ەوە ... لەناوچەی (ئەنەدوڵ)ەوە .. گیرساونەتەوە ... دیارە ئەمانەش لەوانەن کە وادی خۆی (سولتان سلیم) لە شوێنی باوك و باپیرانیانەوە بەزۆر ... هەڵی کەندن و ڕەوانەی ئەم ناوچەیەی کردن لە ژمارە (٣) ی بەشی

(A) ەوە.. ئەمانە جل و بەرگ بە دەستووری ئەنەدۆڵی یەکان لەبەر دەکەن هەرچەندە ئیدیش هەر بە کرمانجی ئاخافتن دەکەن .

***شێخ بزەینی (Shaykh Bezeni)**

خێزان ؟ ... ووتیان هەندێکیان لە نزیك ئالاش کیردەدا ...نیشتەجێن ... ئەمانە لە تیرە (٣) ی بەشی (A) ەوە .. بۆ ئەم ناوچەیە بەربونەتەوە .

***شێخ بزەینی (Shaykh Bezaini)**

(٤٥٠) خێزانن دوو یان سێ گوندیان لە نزیك ئەرزەرۆمەوە هەیە ... دیارە ئەمانە لە ژمارە (٣) ی بەشی (A) ەوە ... بۆ ئەم شوێنە کۆچیان کردووە[1] .

**- شیخ بزەینی ( sheikh bzeiny)**

چوار هەزار خێزانن. هۆزیکی کوردی ئازاو جەنگاوەرە. سوارچاك و پیاوی ئازایان زۆرە..مرۆڤی زیرەك و دنیادیدەشیان زۆرترە..وەستای کارامەشیان هەیە کە خەریکی دروستکردنی دەمانچەی مارتینی-هیندین. زستان لە دێکانیان دەبەنە سەر هەرچەندە لە وەرزی بەهار ڕوو دەکەنە ئەو دەشتە سەوزانەی دەوروبەریان و خێوەت و دەواری خۆیان هەڵدەدەن و بۆ ماوەیەك سەقام گیر دەبن تا پاش دەغل و دان دورین..واتە تا مانگی حوزەیران.

لەگەڵ ڕان و گاکانیاندا بەرەو سنوری ئێران دەکەونە ڕێ لەوێش دەمێننەوە تاوەکو (پایز) واتە (مانگی ئەیلول) یان نەختێ درەنگتر ئەگەر وەرزەکە گەرم بوو . ئەمانە کوردی بەبەن[2] .

[1] - هۆزەکانی کورد، وەرگێران و ئامادەکردنی: حسین ئەحمەد جاف، بەشی دووەم، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی (دار الحریة للطباعة)، بەغدا، ١٩٩٢،ل٩٣،١٠٦،١٠٥،١٠٤،٢٣،١٩،١٨،١٧،١٦.

[2] - هۆزەکانی کورد، وەرگێران و ئامادەکردنی: حسین جاف، بەشی دووەم،دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، دار الحریة للطباعة، بەغدا، ١٩٩٢،

## - شێخ بزینی sheikh bizaini

ـەرۆکی بالآیان نییە.

تیرە: هیچ تیرەیەکیان ناوێکی تایبەتیان نییە و هەریەکە لە بەگزادەکان گروپگەلی تایبەتی خۆی بەڕێوە دەبات.

بەگزادەکان: کوڕەکانی عەبدولوەهاب ئاغا، تۆفیق لە قەسرۆك. شەریف ئاغا لە توتەقەڵ. کوڕەکانی حاجی یوسف ئاغا، عومەر لە قەرەناوە. کوڕەکانی ڕەشید ئاغا، ئەسەد ئاغا و فارس ئاغا لە سەرچنار. کوڕەکانی ئیسماعیل ئاغا، میرالێ ئاغا لە ساتووقەلآ. کوڕەکانی عەباس ئاغا، فارس ئاغا لە پەلکانە. کوڕەکانی حاجی یوسف ئاغا، عەبدولڕەحمان ئاغا لە عەمدون. کوڕەکانی گۆران ئاغا، هەمزە ئاغا و ڕەشید ئاغا لە گەڵناغاج. کوڕەکانی ئەحمە، محەمەد ئاغا لە شەوگێر.

هێز: نزیکەی ٦٠٠ بنەماڵە، ٤٠٠ ئەسپ، ٣٠٠ پیادە.

شوێن: لەسەر زەوییەکانی ئەو ئاوایانەی کە سەر بەو هۆزانەن کە کەوتوونەتە کەناری باشووری زێی بچووك و شوان و ڕووبارەکە .

تێبینییە گشتییەکان: هۆزێکی نیشتەجێ، کشتوکاڵکار و شوانکارەن. وێڕای ئەوەی کە هۆزەکە هیچ کات پەنا بۆ پەلاماری ڕاو و ڕووت نادەن و لە دژی تورکەکان یاخی نابن، کەچی لە ئێستادا ژن و منداڵەکانیان ناردۆتە ناو چیایەکان بەرەو باکوور-ڕۆژهەلآت. هۆزەکە بە توندی خزمایەتی لەگەڵ هۆزی شوان هەیە و بەگزادەکانیان زۆر بە دەگمەن لەناو خۆیاندا دەبێتە شەڕیان. لە بنچینەدا کرمانجی ناوەڕاستن، لە ڕووی ئایینەوە سوننەی شافیعین و کرمانجی خواروو قسە دەکەن.

مێژوو: هۆزەکە (١٠٠) ساڵ بەر لە ئێستە لەلایەن شێخ بزێنی خۆشناو (کوردستانی ناوەڕاست) دروستکراوە. لەوساوە تا ئێستاکە هەمیشە هەمان شوێنی نیشتەجێ بوونیان پاراستووە[١].

---

[١]-مێجەر ئی.بی.سۆن (ئەفسەری سیاسی ئینگلیز)،چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵلآ، لە بلآوکراوەکانی بنکەی ژین (چاپخانەی شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٧٩-٨٠ .

- ال بزینی: بنەڕەتی ڕەسەنی (ال بزینی) یەکێکە لە هۆزە گەورەکان، ئەم هۆزە نیشتەجێ بوونە لە هەولێرو کەرکوك و موصل و کەلەك، بنەرەتی ئەم هۆزە دەگەرێتەوە سەر خەلیفەی عەباسی بەناوی (المستعصم بالله) کۆتا خەلیفەی عەباسی یە لە عێراق، ئەمانە لە وەچەی (زوریەتی) ئەمیرەکانی شاری (العمادیە)ەی، عەباسین[1]. وە لە نێویاندا (ال ویسی بك) و (ال نشأت بك) لە شاری دهۆك، وە باسی ئەم هۆزە کراوە لە پەرتووکی (امارە بهدینان العباسیە) لەلایەن (محفوظ العباسی)[2].

## -هۆزی شێخ بزێنی (SHAIKH BIZAINI)

هۆزی شێخ بزێنی لە هۆزە نیشتەجێ بووەکانە کە لەو گوندە بچووکانەی هەردوو لای زێی بچووك بلاو بوونەتەوەو نیشتەجێ بوون ، ئەم هۆزە لەلایەن دوو براوە دروست بووە[3] ، کە مەلا

---

[1]- تاریخ مدینة سامراء، للشیخ یونس السامرائی، ج٢، ص٢٦٨ .

[2]- یونس الشیخ ابراهیم السامرائی، القبائل والبیوتات والاعلام فی شمال العراق، مطبعة الامة، بغداد، ١٩٨٥، ص٢٧ .

[3]- هۆزی شێخ بزێنی نیستا لە هۆزە شارستانیەکانن . لە دوو زنجیرە گوند نیشتەجێ بوینە کە لەلێواری زێی بچووك و لە نزیك ئەو . ئاغایەکان دەڵێن ئەمانە لە نەوەی چوار برانە کە ئەمانیش : (حسن ئاغا ، محمود ئاغا ، حاجی همزە ، ملا عباس)ە ، وە مارك سایکس ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەم هۆزە پێش ئەوەی جێ نشین و شارستان ببیت هۆزێکی گەورە بور کە ژمارەیان دەگەیشتە (٤٠٠٠) چوار هەزار خێزان و پیاوەکانیان سوارچاکی گەورەبوون وە ئەم هۆزە جۆرە تفەنگێکیان دروست دەکرد بەناوی ( مارتینی هنری) (Martini-Henry) و ئەمانەش زستانان لەگوندەکانیان نیشتەجێ دەبوون و لە بەهاران ئەندامانی ئەم هۆزە رەشماڵەکانیان لە دەوروبەری گوندەکانیان هەڵدەداو پاش دوروێنەکردن لە مانگی حوزەیران ئەمانە کۆچی هاوینەیان دەست پێ دەکەن بۆ سنوری فارس لەگەل مەرو مالاتیان پاشان دەگەرێنەوە گوندەکانیان لەمانگی ئەیلول یاخود پاش ئەو . لەسەردەمی عوسمانیەکان دا هۆزی شێخ بزێنی دابەشکرابوو لەنێوان قەزای کۆیەو چەمچەمال و سەنتەری قەزای کەرکوك . ئەو تیرانەی کەلەرەچەلەکی ئەم ئاغایانە هاتوونەتە خوارەوە ژمارەیان یەکجار زۆرە گەربەراورد بەبچووکی قەبارەی ئەم هۆزە بکەین و توانیویانە یەکێتی ئەم هۆزەو یەکێتی نێوانیان و هاو هەڵویستیان بپارێزن . ئەم هۆزە لە سالی (١٩١٩ز) لایەنگیریان بۆ (شێخ محمودی حەفید) راگەیاندووەو چوونەتەپالی ، بۆ زیاتر وردەکاری پێداچوونە بکە بە:

١-Sykes, sir mark, op.cit,p.٥٥٧.

عباس و حاجی همزە بوو، ئەمانە سەرەتا لە زاخۆ هاتبوونە خوارەوە پێش (١٠٠) ساڵ و تاکو ئێستاش دەتوانین هەندێك لە پاشماوەی ئەم هۆزە ببینین بە ژمارەی بچووك بچووك لە هەولێر و زاخۆ. ئەم هۆزە بەردەوام لە شۆرش دابوون دژی تورك ئەمانە لەپەیرەوکەرانی مەزهەبی سوننی شافعینە و نەبەستراوەتەوە بەهیچ هۆزێکی تر ، وەبەشێوە زاری کرمانجی خوارو قسەدەکەن .

-**سنووری ئەم هۆزە:** ئەم نەخشەیەی کە لەگەڵی دایە سنووری ئەم هۆزە دیاری دەکات و روون دەکاتەوە بەم شێوەیە[1] :-

باکور : لقی کۆیە

باشوور : هۆزی شوان

رۆژهەلات : تەق تەق لەلای راستی زێی بچووك و روباری (شیوەسور) نزیك گوندی (گەلناغاج) لەلای چەپی هەمان رووبار .

رۆژئاوا : پردی (ئالتون کۆپری) و هۆزی سالەیی

-**هێزی هۆزەکە :** ئەم هۆزە (٥٠) پەنجا گوند لەخۆوە دەگرێت کە دەکەوێتە هەردوولای زێی بچووك، ئەم نەخشەیەی خوارەوە دەتوانین وێنەیەکی روونمان بداتێ لەبارەی ئەم هۆزە پێش جەنگ و دواتریش :

| | لای چەپی زێی بچووك | | لای راستی زێی بچووك | |
|---|---|---|---|---|
| | ئیستا | پێش جەنگ | ئیستا | پێش جەنگ |
| ژمارەی گوندەکان | ٣٠ | ٣٥ | ٢٠ | ٢٥ |
| ژمارەی خانووەکان | ٢٣٠ | ٦٠٠ | ٢٠٠ | ٤٥٠ |
| پیاوی گەنج | ٠٠ | ٧٠٠ | ٢٤٠ | ٥٠٠ |
| ماین | ٤٠ | ؟ | ٣٠ | ؟ |
| مەڕ | ٢٠٠٠ | ١٠٠٠٠ | ١٥٠٠ | ٧٠٠٠ |
| مانگا | ٢٠٠ | ١٤٠٠ | ٢٠٠ | ٧٠٠ |

٢- Edmonds,c.j, op.cit, p.٣٧-٣٩.

[1] - ئەم راپۆرتە هیچ نەخشەیەکی لەگەڵ دانەبوو . پشت راستمان کردەوە لە پێداچوونەوەی ئەم دوو دانە لە هەمان راپۆرت لە پەرتوکخانەی متحف عیراقی لەژێر ژمارەی (١٦٥/٦٢٩٠٣٥٦٧) وەرگیراوە.

دەتوانین لەم نەخشەیەی سەرەوە ئەمەی خوارەوە بەدی بکرێت:
هێزی ئەم هۆزە کە لە(٥٠) پەنجا گوندو (٤٠) خێزان و (٧٠) سوار چاك و (٥٠٠) پیادە لەخۆ دەگرێت .

-**بەرێوەبەرایەتی هۆزەکە** : ئەم هۆزە سەرۆکی بالآی نی یە ، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ دابەشبوونی کارگێری کە نەخشەی بۆ کێشرابوو لەلایەن حکومەتی عوسمانی بەمەبەستی دەست بەسەر داگرتنی ئەم هۆزە . ئەوگوندانەی بۆ دەسەلاتی ئەو دەگەرێنەوە بەپێ ی ئەم پلانانە دابەش کراوەو هەر کۆمەلەیەکیشیان سەر بە پارێزگایەکن لەوانە کەرکوك، سلیمانی ، قەزای کۆیە .

ئەم دابەش کردنەش یارمەتی ئەوەی داوە بۆ دروست بوونی بەشی لاوەکی بۆ ئەم هۆزە کە هەر یەکێکیان سێ تا چوار گوندی هەیە ئەم هۆزەش لەهۆزە ئاشتی خوازەکانە سەرەرای پابەندبوونیان بەدەمارگیری هۆزەکی و سەرۆکەکانیان دژی ئەوەنین کە کە سەرۆکێکی بالادەست بەسەریانەوە دابمەزرێنرێ .

-ئەو گوندانەی دەکەوێتە لای زێی بچووك کە سەر بەم هۆزەیە رازی بوون بەوەی کە (فارس ئاغا)ی سەرچنار ببێت بە سەرۆکیان و ئەم پیاوەش کوری (رشید ئاغا)یە، کە پێشتر سەرۆکی ئەم هۆزە بووە بەلام ئەم گوندانەی کە دەکەوێتە لای راستی زێی بچووك کە رازی بوون بە (محموود ئاغا)ی سارتك کەببێت بەسەرۆکیان ئەمەش کوری (عبدالله)یە ، نەوەی (حاجی همزە) یە کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ئەم هۆزە ( بگەرێوە بۆ کەسایەتیەکانی ئەم هۆزە )
زێی بچووك کەدەتوانی لەلای گوندەکانی سارتك و تەق تەق بپەرێتەوە توانایەکی جوگرافی کاریگەر پێك دەهێنێت، بەربەستێکی کاریگەر پێك دەهێنێ لەبەردەم پێشکەوتنی لایەنی بازرگانی و کۆمەلایەتی لەنێوان هەردوو بەشی ئەم هۆزە .

بەمەش گرنگی گوندی (تەق تەق)کەدەتوانرێ بکرێ بەبنکەیەکی کارگێری راستەوخۆ لەبەر ئەوەی ناکەوێتە ژێر دەسەلاتی راستەوخۆی هۆزەکە ، لەوانەیە ئەنجامدانی ئەم کارە پێویست بێت لەبارێکی ئاوادا گوندی تالەبان و گوندی گەرمك لەم دوو کۆمەلە هۆزەی ئەم ناوچەیە جیادەکرێتەوە .

کەسایەتیەکانی هۆزەکە

**گرنگترین کەسایەتیەکانی ئەم هۆزە ئەمانەن :-**

**١-محمود ئاغا دانیشتووی گوندی سارتك ، تەمەنی (٧٠) سالە .پیاوێکی چاونەترس و بەتەمەنە، مەردو خۆشەویستە کەدەسەلاتی خۆی بەشێوەیەکی باش سەپاندووە .**

**٢-فارس ئاغا لەگوندی سەرچنار کەتەمەنی (٣٠) سالە ، پیاوێکی راستگۆ و خۆشەویستە کە کوری (رشید ئاغا)ی سەرۆکی پێشووی ئەم هۆزەیە کە ئەویش لەو کەسانەیە کە پشتگیری (شێخ محمود ) کرد و هاریکاریان کردووە .**

**٣-تۆفیق ئاغا لەگوندی قەسرۆك ، تەمەنی (٤٥) ساڵە ئەمەش مامی فارسی ئاغایە پیاوێکی کەیف خۆش و دڵخۆشە ، توندەو زۆر تاوانی کوشتنی ئەنجامداوە و یەکێك بووە نەلایەنگرانی شێخ محوودی حەفید .**

**٤-فارس ئاغا لەگوندی پەلکانە**

**٤-مەحموود ئاغا یوسف ئاغا**



تێبینی // ئەم داری خێزانییەش ئاماژەیە بۆ رەچەلەکی سەرکردەکان و بەس دیاری کردنی داری خێزانی بۆ ئەم هۆزە بەتەواوەتی پێویستی بە کاغەزێك هەیە کەچەند گەزێکی چوارگۆشە گەورەبێت لەبەرئەوەی چەندین ئاغاهەیە کەبۆ ئەم هۆزە ناگەرێنەوە.

**ململانێی هۆزەکی :-**

داب و نەریتی هۆزایەتی سزای تایبەتی داناوە بەرامبەر بەتاوانەکانی کوشتن ، سزای سەرپێچی کوشتن بۆ کوشتنی پیاوێك سزاکەی دەگاتە (١٠٠٠) قران فارسی و ئافرەتێك .
بەلاّم ئەگەر لە ململانێ و ناکۆکیدا یەکێك لەئەندامانی خێزانی شێخەکان بکوژرێت ئەوا سزای خوێنەکەی دەگاتە پێدانی گوندێکی ئاوەدان و ئافرەتێك و ئەگەر میراتگرەکان بیانەوێت ئەوا (٣٠-٥٠) لیرە بدات سەرباری ئەمە بەلام ئەگەر ئافرەتێك بکوژرێت ئەوا خوێنەکەی (٥٠٠) قرانی فارسیەو سزای کوشتنی ماین (٣٠-٥٠) لیرەیە ، بەلاّم ئەم نرخە بەپێ ی بازار دیاری دەکرێت.
برای فارس ئاغا نەوەی مەحمود ئاغا کە لە چینی ئاغایەکانە بەرێکەوت کوژرا پێش سێ ساڵ لەمەو بەر ، سزاکەی گەیشتە (٣٥٠) لیرە و پێدانی ئافرەتێك .
لیفی هۆزایەتی ( بەواتای چەند پیاو دەتوانێ ئامادەبکات بۆجەنگ)
پێشنیازی قازی مێجەر نۆئیل بەرێکخستنی هێزی اللیفی لەرۆلەی هۆزەکان ئەم پێشنیارەی بۆ سەرۆك هۆزەکان کرد بیرەکەیان لا باش بوو قبولیان کرد بەلام لەگەل ئەمەش ژمارەی زۆر تەواویان نەدا بۆ پیاوەکانیان لە بۆچوونەکانیان زۆر وریابوون فارس ئاغا لەگوندی سەرچنار رونی کردەوە کەناتوانێ زیاتر لە (٦٠) پیاو ئامادە بکات لەو گوندەی کەلەلای چەپی زێی بچووکن بەلام لەکاتێك محمود ئاغا روونی کردەوە کە دەتوانێ زیاتر لە (١٠٠) پیاو ئامادە بکات لە گوندەکانی لای راستی زێی بچووك[١].
- لە هۆزەکانی قەلای (دیردە)ی سەر بە دەڤەری تەنز (تەنزە)ی سەر بە جزیرەی بۆتان باسکراوە لەلایەن (ابو الفداء) لە باسی (قلعە فینیك)، بەپێ ی ووتەکانی (ابو الفداء و ابن الاثیر): فینیك لە سەدەی دوازدەهەم لەژێ کۆنترۆڵ و چاودێری کورد بووە بەتایبەت هۆزی

[١]- مارك سایکس ، عشائر الکردیە ، ترجمە: فواد حمە خورشید، مطبعة الحوادث، بغداد ، ١٩٧٩ ، ص ١١١ - ١١٦.

(البشنويه)، هەروەها لەلایەن شەرەفخانی بدلیسی باسکراوە کەوا هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ بووە لە ناوچەی (فینیك).

تێبینی: (فینیك) ناوی ناوچەیەکە لە جزیرەی بۆتان دا .

- بەپێ ی ڕیوایەتی (نیپور) ئەم هۆزە کوردییانە لە دەوروبەری شاری ماردین دەژین: شێخ بزێنی (١٠٠٠٠) دە هەزار ماڵ دەبن لە نێوان (شاری ماردین) و (پالۆ)دا دەژین[1].

## (پەرێشانی شێخ بزێنی )

لە نوسخەی پێشودا بومباردمان دیهات شێخ بزێنی مان نووسی بوو لە پاش ئەمە کە پێنج دێ بە تەواوی بومباردمان کرابوو ٣٠٠ سوار لە کەرکوکەوە هاتبوون ئەو دێهاتانەیان سوتاندو لە پاش ئەمە لەسەر ئیفادەی توفیق اغای رئیس شێخ بزێنی کە ئێستا تەشریفی لە سلیمانیدایە دراوسێکان خۆیان یەعنی عشیرەت شوان چوونە سەریان بۆ تالان ٤٥٠ مەڕو قەدرێکیش ڕەشە وولاغیان بردووە. بزانن لەم واقیعەیشداو لەم حالە پەریشانیەشدا چیان کرد مەرحەمەتی نەکردووە خودا هەمووومان اصلاح بکا[2] .

*** تیرەکانی هۆزی شێخ بزێنی**

١-خوڵە زەردی : ئەم تیرەیە بەرەبابی ئاغاکان دەگرێتەوە ،کەزۆربەی گوندەکانی شێخ بزێنی دەگرێتەوە .

٢-دەربەندی: ئەم تیرەیەش زۆرتر لە ناحیەی سێگردکان و گوندی ئۆمەر گومبەت نیشتەجێ بوونە.

٣-جوغەڕەشی : ئەم تیرەیەش زیاتر لە گوندەکانی چەمەزەردەڵە و قەرغەتوو و مەلحەوالی و قەرەبەگ ...هتد، نیشتەجێ بوونە[3].

---

[1] - ب.لیرخ، دراسات حول الاكراد واسلافهم الخالديين الشماليين، ترجمة: د. عبدی حاجی، الطبعة الاولى، منشورات مكتبة خانی، دمشق، ١٩٩٢، ص٥٦-٥٧ .

[2] - گۆڤاری بانگی کوردستان ، ١٩٢٢، ژ: ١١ ، ساڵ (١)، ل٣.

[3] - لەك: ئەم تیرەیەش زیاتر لە گوندەکانی قەشقە و خوڕخوڕ و بەردەسپی...هتد، نیشتەجێ بوونە. ئەم تیرەیە کە هەژمارکراوە لەسەر هۆزی شێخ بزێنی بە پێ ی چەند ووتەیەکی کەسایەتی ناوداری هۆزی شێخ بزێنی بەتایبەتی حاجی هەمزەی دانیشتووی گوندی پەلکانەی شێخ بزێنی.

_ هۆزی شێخ بزێنی جگە لەم تیرانەی سەرەوە چەند بەرەیەك لە خۆ دەگرێت واتە (چەند بەرەبابێكی تری تێدایە) ئەوانیش:

١-بەرەی بەگ زادە: كە زۆرتر لە گوندەكانی قەمیشە، كانی هەنجیر نیشتەجێ بوونە .

٢-بەرەی جبور: كە زۆرتر لە گوندی قەرەناو نیشتەجێ بوونە (كە لەبەنی رەبیعەن) خۆیان بە بەرەیەك لە هۆزی شێخ بزێنی هەژماردەكەن.

٣-بەرەی حەیدەر بەگی: كە زۆتر لە گوندی قەسروك و قەمیشە نیشتەجێ بوونە.

٤-بەرەی گوڵ بەدەم (گوڵ باغی): كەئەمەش بەرە بابێكە لە هۆزی شێخ بزێنی .

٥-بەرەی ترێ خۆر: كە زۆرتر لە گوندی قەمیشە نیشتەجێ بوونە، بەرەیەكە لە هۆزی شێخ بزێنی.



**دەوری هۆزی شێخ بزێنی لە شۆڕشی شێخ مەحموودی حەفیدا :**

هەر لە دوو توێی دەست بە سەرداگرتنی سەربازییانەی بەریتانیا بۆ وولاتی عێراق لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا ، ئەو هێزانە توانیان دەست بە سەر کفری و دوز خورماتوو شاری کەرکووکدا بگرن ، لە (٧)ی مایسی ساڵی(١٩١٨ز) هیزەکانی عوسمانی ساری سلێمانیان چۆڵ کرد و سەرۆك عەشیرەتەکانی کوردیش لە نێوانیاندا عەشیرەتی شێخ بزێنی بڕیاریاندا حکومەتێکی کوردی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود دابمەزرێنن . ئەوەبوو هێزە داگیرکەرەکانی بەریتانی چەند نامەیەکیان لە شێخ مەحموودەوە پێگەیشت، کە داوای لێیان دەکرد کە مافی کورد لە ئازادی و سەربەخۆی دابین بکەن [1] ، بەڵام تێکچوونی هەڵوێستی باری سەربازی بەریتانی لە سەرجەم بەرەکانی جەنگ بە تایبەتی لە قەوقاز و باکووری خۆرئاوای ئێران و هەروەها بە هۆی زێدەبوونی چالاکی سەربازی تورکی لە کوردستاندا بەتایبەتی لە کەرکوك، ئەمەش تەنیا (١٧)رۆژ دوای داگیرکردنی ئەم شارە لەلایەن هێزەکانی بەریتانیاوە ، واتە لە (٢٤)بیست و چواری مایسدا ئەمانە هێزەکانی بەریتانیایان ناچار کرد، کە لە شارەکە پاشەکشە بکەن هەتا سەر سنووری کفری و دوزخورماتوو، ئەو دۆخە نالەبارە بووە هۆی کە پاڵی بە دەسەلاتدارانی داگیرکەرانی بەریتانییەوە نا ، کە بڕیارێك دەربکەن

[1] - المس بيل ، فصول من تاريخ العراق القريب ، ترجمة حقو خياط ،بيروت، ١٩٧١، ص١٨٧.

بەوەی شێخ مەحموود وەکو نوێنەرێکی خۆیان لە شاری سلێمانی دابمەزرێنن،[1] لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەڵویست وەرگرتنە بەرەو ئامانجی چارەسەرکردنی هەڵوێستە دڵە ڕاوکێیەکەی هەنگاو دەنا، ئەمەش لە دووتوێی وە دەستهێنانی خۆشەویستی گەلی کورد ، دیارە کە سیاسەتی بەریتانیا لەو وەختەدا بەرامبەر گەلی کورد خۆی لەو سیاسەتە دەبینییەوە ، کەوا هیچ بەڵێنگەلێکی ئاشکرا لە بارەی دامەزراندنی قەوارەیەکی کوردی سەربەخۆ نەدات ، هەتا ئەگەر بەلێنی خودموختاریش بێت[2].

ئەوەبوو بەهۆی ئەو تێکچوونە سەربازیەی بەریتانی ، هێزەکانی تورك بەرەو پێشەوە هەنگاویان نا دووبارە شاری سلێمانی و کەرکووکیان خستەوە ژێر دەستی خۆیان شێخ مەحموودیشان لە کەرکوك دەستگیر کرد ، بەڵام لەبەر ڕەچاوکردنی فراوان کردنی دەسەڵات و هەبوونی ناوبانگی لە نێو تورکەکان ئازادیان کرد.

لەدوای چاکبوونی هەلوێستی هاوپەیمانی سەربازی و سەرکەتنی هێزەکانی (ئەلبەنی) لە فەلەستین و چاکبوونی هەلوێستی هێزەکانی بەریتانی لە باکووری ڕۆژئاوی ئێران ، نەخشە و پلانی گشتی هێزەکانی داگیرکەر بەم جۆرە دارێژرا کە بەرەو باکوور هەنگاو بنێن لە سەر ڕۆخی ڕووباری دیجلە هەتا دەگەنە شاری موسڵ هەروەها هێزێکیش لە کفرییەوە هەنگاو بنی بەرەو کەرکوك و ئالتوون کۆپری و پاشانیش بەرەو هەولێر . ئەوەبوو لە (٢٥) تشرینی یەکەم هێزەکانی بەریتانی توانیان کەرکوك بخەنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان لە ١٠ تشرینی دووەمیشدا توانیان بەشێکی زۆری ولایەتی موسڵ ، جگە لە شاری سلێمانی بخەنە ژێر دەستی خۆیان [3] ، واتە دوا بەدوای ڕێککەوتنی نامەکە ئەم ویلایەتەی کە لە (٣٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨ز) ڕاگەیەنرا بوو ، بە تەواوی خستیانە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و بە ماوەی (١٠) ڕۆژان و لە پیناوی کۆنترڵ کردنی هەموو پارچەکانی کوردستان بە شاری سلێمانییەوەش ، دەسەڵاتدارانی داگیرکەری(مێجەر نوئێل)یان نارد بۆ سلێمانی ، ئەوەبوو لە نێوەندی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٨)ز گەیشتە ئەم شارە و چاوی بە شێخ مەحموود کەوت ، تاکو ئەوەی

[1] - Office of civil commissioner precise of affairs in southern Kurdistan during the great War- Baghdad Government press, ١٩١٩,p. ٦ .

[2] - C.J.Edmands ,kurds turks and arabs ,Oxford University press London, ١٩٥٧, .p.٢٩.

[3] Office of civil commissioner, op ., cit p. ٧.

پێ ڕابگەیەنێت کە دەسەڵا تدارانی بەریتانی وەکو حاکمێك لە ناچەی کەرکوکدا دانیان پێی ناوە ، کە ئەو کاتە سنووری ناوچەی کەرکووك لە لای باکوورەوە لە زێی بچووکەوە درێژدەبۆوە، تادەگەیشتە ڕووباری سیروان (دیالە) لە لای باشوورەوە لە لای خۆرئاواشەوە لە زنجیرە چیای حەمرینەوە درێژ دەبۆوە هەتا دەگەیشتە سنوورەکانی تورکیا و ئێران لەلای خۆرهەڵاتەوە،[1] هەروەها لە کانوونی یەکەمی ساڵی(١٩١٨ز) بڕیاری حاکمی گشتی بەریتانی لە عیراق (کۆلۆنیل ولسن) سەردانی شاری سایمانی کردو کۆبوونەوەیەکی گرێدا کە نزیکەی (٦٠)سەرۆك هۆزی ناوداری کوردستانی ئامادەی ئەم کۆبوونەوەیە بوون داوایان لە حکومەتی بەریتانیا کرد ،کە یارمەتی گەلی کورد بدەن تاکو بە چاکی بەرەو پێشەوە بچێ ، پەیمانیشیاندا کە ئەگەر بێ و حکومەتی بەریتانی یارمەتی ئەم گەلە بدات ئەوانیش لە ژێر فەرمانەکانی خاوەن شکۆی بەریتانیدا دەبن و ڕاوێژی پێ دەکەن[2] .

بۆ وەڵام دانەوەی ئەو داوایە حاکمی بەریتانی بەڵگەنامەیەکی (وثیقة) مۆرکرد کە تیایدا هاتبوو ، هەر هۆزێکی کورد لەو هۆزانەی کە لەو زەویانەی لە زێی گەورەوە درێژ بوونەتەوە تا دەگاتە ڕووباری سیروان نیشتەجێنە (تەنیا هۆزەکانی ئەو دیوی سنوری ئێران نەبێ) ئەگەر بە ئارەزووی خۆی سەرۆکایەتی شێخ مەحموودی قبوڵ بێ ، ئەوا بەریتانیا ڕێی پێ دەدات و لە داهاتووشدا پاڵپشتیەکی مەعنەویانەی شێخیش دەکات لە فەرمانڕواییکردنی ناوچەی ناوبراو [3] ،بەمە بەریتانیا وای نیشاندا کەوا سیاسەتیان لە کوردستاندا(کوردستان بۆ کورد) دەبێ لە ژێر چاودێری بەریتانی دابێ[4]، بەڵام لە لایەنی کردارییەوە ئەوا ئەفسەرە سیاسیەکانی بەریتانی چالاکبوون لەگەڵ دروستکردنی مەڵبەندەکانی دژایەتیکردنی شێخ موحموود لە ڕێی بە گروپکردنی سەرۆك هۆزەکانەوە، بۆ بەرژەوەندی لکانی کوردستان بە دەوڵەت عیراقی نوێ ، کە مەرامی دامەزراندنی هەبوو بەڵام شێخ مەحموود هەر لە سەرتاوە ڕووبەڕووی ئەو سیاسەتە بوویەوەو زۆر بە توندی ڕەتی کردوە ، بۆ ئەم مەبەستە شۆڕشەکەی لە دژی ئینگلیز لە (٢٣)ی مایسی ساڵی(١٩١٩ز) ڕاگەیاند،کە هۆزی شێخ بزێنیش یەکێك بوو لەو هۆزانەی کە پشتگیرییەکی تەواوی شۆڕشەکەی شێخ مەحموودی کردووە ، کاتێکیش

---

[1] Office of civil commissioner, op ., cit p. ٩.

[2] - Driver G. R. kurdustan and the kurds , op, cit.

[3] - المس بیل، المصدر السابق ، ص ١٩١ ، ١٩٠.

[4] - Office of civil commissioner, op . cit. p. ١٠.

شۆرشەکە لە جەنگی دەربەندی بازیان شکستی هێنا و شێخ بە دەست بەسەرکراو بۆ وولاتی هیند دوورخرایەوە ، بەریتانیا لە پێشنیازەکانی پاشگەزبوویەوە بەوەی خودموختاری کوردستان ببەخشی و بەدوای سەرکردەیەکی دیکەی کوردیدا گەڕایەوە لە بری سەرۆکایەتی شێخ مەحموود [1] هەروەکو چۆن چەند هەنگاوێکی خێرای هاویشت بەرەو پەلە کردن لە لکاندنی کوردستان بە وولاتی عێراقەوە [2] دەسەلاتدارانی داگیرکەری بەریتانی لە ئامادە نەبوونی سەرۆکی بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانی کورد کە شێخ مەحمود بوو ، هەڵیان بەدەست کەوت بۆ وەستان لە بەردەم بزاڤی نەتەوەی کورد و بنەبڕ کردنی ئامانجیش لە دوورخستنەوەی شێخ مەحمود بۆ وولاتی هیند هەر ئەمە بوو، ئەوە بوو حاکمی شاهانەی بەریتانی (ئارنۆلد ولسن) بە بروسکەیەکی ژمارە (٦٦٦٦) لە (١٣) ی حوزەیرانی ساڵی (١٩١٩) کە ئاراستەی حکوومەتی هیندی کرد ، پێشنیازی کرد کە هەریەکە لە زاخۆ و دهۆك و سلێمانی و ئالتوون کۆپری و کەرکووك بە عیراقیەوە بلکێندرێت ، ئەوەش لەبەر گرنگی ئەم ناوچانە لە هەردوو لایەنی ئابووری و ستراتیژیەتیان بۆ سەرو بەرکردنی دەوڵەتە تازەکەیان[3]، شێخ مەحموودیش دوای گەڕانەوە بۆ سلێمانی لە ساڵی(١٩٢٢) ، حکومەتێکی کوردی پێکهێناو جەماوەریش وەکو پاشایەکی کوردستان پێشوازیان لێکرد ، حکومەتەکەی شێخ مەحمود دەرکی بە ڕەهەند و مەرامە سیاسییە بنچینەیەکانی بەریتانیا دەرکرد ، کە ئامانجیان لە ناو بردنی هەر شێوە خۆبەڕێوەبردنێکی کوردی و لکاندنی کوردستان بە دەوڵەتی عیراقی عەرەبییەوە بوو ، بۆیە سیاسەتی فریودەرانەی بەریتانی لەگەڵ ئەودا بۆ قەناعەت پێکهێنانی چوونە ژێر باری ئەو سیاسەتە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا ، ئەمەش لەبەر ئەوەی بە تەواوی لەگەڵ ئامانجەکانی گەلی کورد و مافی چارەنووسی پێچەوانە دەبۆوە .

---

[1] - ئەدمۆندز ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە دەسەلاتدارانی داگیرکەر لەم بارەوە پەیوەندیان بە ڕاگری خێزانێکی کوردی بابان لە بەغدا کرد بەلام دەرکەوت ئەو لە زمانی نەتەوەکەی بێ ئاگایە و خەریکی بنەماڵەکەیەتی ، سەیری ئەمە بکە :

١٠-C.J .Edmands, Kurds Turks and Arabs , Oxford University Press London ,١٩٥٧, P.١٢٣.

[2] ١٠ C.J .Edmands, op. cit .PP.١١٧ -١١٨.

[3]- Major E.W.C Notel , Noe on the Kurdish Situation , Baghdad, ١٩١٩ ,pp .١٨-٢٠.

شێخ مەحموود لە کانوونی دووەمی ساڵی(١٩٢٣ز) بڕیاریدا بازنەی دەسەلات حکومەتەکەی فراوان بکات و هەرێمی کەرکووکیشر بە تەواوەتی بخاتە باڵ خۆیەوە ، ئەمە لە کاتێکدا بوو ، کە تورکمانەکانی دانیشتوانی کەرکوك خەریکی خۆئامادەکردن بوون بەرپاکردنی شۆڕشێك لە دژی بەریتانیەکان[1]، لە بەرامبەر ئەو پێشوەچوونە مەزنەش فرۆکەکانی بەریتانی لە(٣)ی ئاداری (١٩٢٢) بارەگاو فەرمانگەکانی حکومەتی کوردییان لە سلیمانیدا بۆمباران کرد و شێخ مەحموودیش ناچار بوو شاری سلێمانی چۆڵ بکات[2] ، بەلاّم زۆر پێنەچوو دووبارە لە(١١)ی تەمووزی هەمان ساڵدا گەرایەوە سلێمانی [3].

هەر بۆیە ڕۆڵی هۆزی شێخ بزێنی لە شۆڕش شێخ مەحموودی حەفید دا دیارو بەرچاوە، شۆرشی شێخ مەحموودی حەفید جێگەیەکی زۆر دیارو بەرچاوی لە مێژووی هاوچەرخی عیراقیدا هەیە، وردەکاری بە سەرهاتەکانی ئەم شۆرشە بە دوور و درێژی لەلایەن مێژوو نوسانی خۆمان و دەرەوە زۆر بەجوانی باسی کراون ، ئەوەی جیّ ی هەلّوەستە لە سەر کردنە و شایانی باسە ئەوەیە کە هاوکاری و کاریگەری هۆزی شێخ بزێنییە بۆ ئەم شۆرشە بۆیە لێکۆلەران و مێژوونوسان زۆر کەمتەرخەمن لە باسکردنی ئەم هۆز و عەشیرەتانەی کوردستان کە پشتگیری شۆڕشەکەی شێخ مەحموودی حەفیدیان کردووە ، بەتایبەتی هۆزی شێخ بزێنی کە هەلّوێستێکی نموونەیی هەبووە لەبەرەو پێش چوونی شۆرشی شێخ مەحموودی حەفیدا،بۆیە تاکو ئێستاش شتێکی ئەو تۆ نەنوسراوە لە سەر هۆزی شێخ بزێنی بەرامبەر ئەم شۆرشەی شێخ مەحموودی لەلایەن مێژوونووسان و لێکۆلەرانەوە ، بۆیە بە باشم زانی ئەگەر بە شێوەیەکی کورتیش بێت کەمێك لە سەر براگەورە و ئاغاو پیاو ماقووڵ و ڕۆلە ئەبەرد و قارەمانەکانی هۆزی شێخ بزێنی بنووسم لە ڕووی دارایی و سیاسی و کۆمەلاّیەتی .....هتد ،

---

[1] - His Majesty office,op .cit, ١٩٢٣, ١٩٢٤, p .٣٩ .

[2] - کرکوك لە بەلگەنامەکاندا، فواد حەمە خورشید ،وەرگێرانی : نەریمان عەبدوللا خۆشناو، چ١، ٢٠٠٧، هەولێر، ل٩٤ .

[3] - بۆردمانەکانی بەریتانی لە ناوچە کوردییەکان تەنیا لەم ساڵەدا بە ئەوەندەوە نەوەستا ، بەلکو ڕۆلێکی سەرەکی بینی لە کوژانەوەو دامرکاندنەوەی شۆڕشەکانی شێخ مەحموود لە ساڵانی ١٩٢٢ و١٩٢٤و١٩٣١ و١٩٣٠و١٩٣٢ بۆ زیاتر زانیاری بگەرێوە سەر : البرت م . منشاشقیلی ، العراق في سنوات الانتداب البریطاني ترجمت هاشم صالح التکریتي .مطبعة جامعة بغداد ١٩٨٧ . ص ٣١٧ -٣٤٣.

کە بە خوێن گیان بەرامبەر هێزی داگیر کەری ئینگلیز وەستاون بۆ پاك کردنەوەی خاکی پاکی کوردستان لەو هێزە داگیرکارانە، هەر بۆیە لەم شۆرشە دا چەندین رۆلەی قارەمانی هۆزی شێخ بزێنی شەهید بوون لە سەر خاك و وولات ، هەروەها براگەورەو پیاوماقوولانی هۆزی شێخ بزێنی رۆلێکی بەرچاو و کاریگەرییان هەبووە لەم شۆرشەدا لەوانە کەسایەتی دیار و بەرچاوی هۆزی شێخ بزێنی بەتایبەتی (تۆفیق ئاغا ) کوری (عبدالوهاب ئاغا) کورِی (مەلا عەباس) کوری (مەلا ئەحمەد گەورە )باپیرە گەورەی هۆزی شێخ بزێنی لە تیرەی خۆڵەزەردییە ، کە رۆڵێکی بێ وێنەو بەرچاو و کاریگەری هەبووە لە پشتگیری کردنی ئەم شۆرشە دژی بە داگیر کەرە ئینگلیزکان ، کە رۆڵێکی گرنگی هەبووە و بەشداری زۆربەی شەرەکانی کردووە، هەروەها (فارس ئاغا) کورِی (رەشید ئاغا) کورِی (عبدالوهاب ئاغا) کورِی (مەلا عەباس) کورِی (مەلا ئەحمەد گەورە )ی باپیرە گەورەی شێخ بزێنی ئەویش دەورێکی بالآی هەبووە لەم شۆرشەدا، هەروەها کەسایەتیەکانی تیرەی چۆغەرەش لە هۆزی شێخ بزێنی دەورێکی بالآی گرنگیان هەبووە لەم شۆرشەدا، هەروەها بەشداری کردنی کەسایەتی ناسراوی شێخ بزێنی (تۆفیق ئاغا) لە شەرێك کە لە نزیکی تاسلوجەوە لە رۆژی (٢٣)ی مایسی ساڵی (١٩١٩) روویدا شۆرشگێرەکانی کورد بە پێ ی سەرچاوە بەریتانیەکان توانیان ژمارەیەك سەربازی ئینگلیزی داگیرکەر بکوژن و چەندین چەك و جبەخانەیان تێك بشکێنن و توانیان سەربکەون ، لەم شەرەدا (تۆفیق ئاغا) دەورێکی بالآی هەبووە، هەروەها لە زۆربەی بەرەکانی شەردا دژ بە ئینگلیزی داگیرکەر وەستاوە و پشتگیری شۆرشەکەی شێخ مەحمودیان کردووە ، هەر بۆیە (تۆفیق ئاغا) باوەرِ پێکراوترین کەسایەتی بووە لە لایەن شێخ مەحموودی حەفید دا ، بۆیە هەر لە بەتەمەکانی ئەو کاتەوە گێراویانەوە ئەم بەسەرهاتە کەوا جارێکیان مەلیك فەیسەڵ کۆبووەوە لەگەڵ شێخ مەحموودی حەفید ، پاسەوانەکانی مەلیك نەیان دەهێشت تۆفیق ئاغا چەك بباتە ژووری کۆبوونەوەکە بەلآم تۆفیق ئاغا بەهیچ شێوەیەك رازی نەدەبوو چەك دابنێت ، دواتر چوون بە مەلیکیان ووت، کە لەگەڵ شێخ مەحموودی حەفید دانیشت بوو، هەر بۆیە شێخ مەحموود ووتی بە مەلیك فەیسەڵ ئەوە (تۆفیق ئاغا) یە بەهیچ شێوەیەك چەك دانابێت با بێتەژوورەوە ، مەلیك فەیسەڵیش ووتی بابێتە ژووردوە. هەروەها هەر لە سەردەمی شۆرشی شێخ محمود دا (عەزیز شەریف جەلال) ناوێك کە پیاوێکی ئازا بوو لەو سەردەم بەخۆی و دووسەد و پەنجا چەکدارەوە هاتنە پاڵ فارس ئاغای خێلی شێخ بزێنی کە ئەویش بە خۆی و

پەنجا چەکدارەوە چوونە پاڵ شێخ محمود بۆ پشتگیری کردنی شۆڕشەکەی دژی ئینگلیزی داگیرکەر[1].

شێخ مەحموودی حەفید داوای لە هەموو هۆزەکانی کورد کرد کە هەر هۆزێك ئەوانەی توانای جەنگیان هەیە بە چەندین جەنگاوەرەوە لەگەڵ نوێنەرێکی ئەو هۆزە ئامادە بن بۆ جەنگ دژی ئینگلیزی داگیرکەر ، هەر بۆیە هۆزی شێخ بزێنی بە چەندین جەنگاوەری قارەمان بە نوێنەرایەتی (تۆفیق ئاغا) ئامادە بوو بۆ جەنگ دژی بەریتانی داگیرکەر، هەر بۆیە ئەم هۆزە چەندین شەهیدی داوە لەم شۆڕشە دا یەکێك لەوانە (أسعد ئاغا) برای فارس ئاغای سەرچنارە و برازای (تۆفیق ئاغا) یە ، کە کوری (رشید ئاغا) کوری (عبدالوهاب ئاغا) کوری (ملا عباس) کوری (مەلا ئەحمەدی گەورە) یە، کە باپیرە گەورەی هۆزی شێخ بزێنی یە، لەبەرئەوە هۆزی شێخ بزێنی دەورێکی کارا و کاریگەرییان هەبوو لەبەرەوپێش چوونی ئەم شۆرشەی شێخ محمودی حەفید دژ بە ئینگلزی داگیرکەر کەناکرێ ئەم دەورە بالآیەی ئەم هۆزە فەرامۆش بکرێ چونکە چەند شەهیدیان داوە لەم شۆرشەدا، هەروەها لە ڕووی سیاسی و ئابووری کۆمەلآیەتی....هتد، پالپشت بوونە بۆ ئەم شۆرشە هەستی نەتەوایەتی تاکە تاکەی رۆلەی نەبەردو قارەمانەکانی هۆزی شێخ بزێنی پالنەرێکی کاریگەر بوو بۆ پشتگیری کردنی ئەم شۆرشەی شێخ محمود دژ بە داگیر کەران ، هەر بۆیە هۆزی شێخ بزێنی لە هەموو شارو شارۆچکەکانی عیراق دەوری کاریگەرییان هەبووە لەم شۆرشە ، پالپشتی تەواوی شێخ محموودی حەفیدیان کردووە ، وێرای یارمەتی و هاوکاری ئابووری چەك و پێداویستی سەربازی و خواردن و کەل وپەل و پێداویستی جەنگ لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ ئەم شۆرشە بەبێ بەرامبەر بە ئەرکی سەر شانی خۆیان زانیوە ، بۆ ئەوەی خاکی پاکی کوردستان لە دوژمنانی ئینگلیزی داگیرکەر ڕزگار بکەن بۆ گەیشتنی گەل و نەتەوە بە سەربەخۆیی وولات و سەرفرازی گەل و نیشتمان، ڕوو ڕەشی و ڕیسوایی بۆ دوژمنان و داگیرکاران.

لە بەرواری (٢٧)ی ئەیلولی سالّی (١٩٢٢) لە سلێمانی شێخ مەحموودی حەفید لەگەڵ بەشێك لە سەرۆك هۆزەکان چاوپێکەوتنی ئەنجامدا لە نێویاندا هۆزی شێخ بزێنی کە لە کاتژمێر

---

[1] - نووسینی کاپتنی ئینگلیز c.n.y وە مێجەر نۆئیل لە بەلگەنامەی مارك سایکس، و: حسین عوسمان نێرگسەجاری و حسین احمد جاف-چ١، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس- هەولێر،٢٠٠٢، ل٦٦.

(١١:٤٠) یانزدەو چل دەقیقە بۆ (١١:٥٥) یازدەو پەنجاو پێنج دەقیقە ماوەی چاوپێکەوتنەکە بوو سەبارەت بە بارودۆخی کوردستان و شۆڕشی سەربەخۆیی کوردستان[١] .

**شێخ محموود حفید زادە کوری شێخ سەعید بەرزنجی** : لە سلێمانی لە سالی (١٨٨١ ) لە دایك بووە لە شاری بەغدا (٩/١٠/١٩٥٦) کۆچی دوایی کردووە ، لەبنەمالەیەکی ئاینی و کورد پەروەر گەورە بووە، خوێندنی ئاینی لەسلێمانی تەواو کردووە ، لە سالەکانی جەنگی جیهانی یەکەم بەتەك عوسمانیەکان جەنگاوە، سالی ١٩١٨ لە سەردەمی ئینگلیزەوە حوکمرانی ناوچەی سلێمانی کردووە، بەلام هەر زوو سالی ١٩١٩ دژی ئینگلیز وەستاوەتەوە، دوای بەدیل گرتنی سالی (١٩١٩ ) لە کۆتایی سالی (١٩٢٢) گەرایەوە سلێمانی و بوو بە سەرۆکی حکومەتی کوردستانی جنووبی تاسالی (١٩٢٤ ) دوای بەستنەوەی یەکجارەکی ویلایەتی مووسڵ بە عیراقی تازە دەستکرد، پەنای بردۆتە بەر ئێران و تا سالی ١٩٣١ هەر لەشەری حکومەتی عیراق و بەریتانیا بووە دواتر دورخراوەتەوە بۆ بەغداو ناسریە و بەسرە تا دواجار لە دوورە ولاتیداو لە بەغدا دوا هەناسەی ژیانی دا [٢]

---

[١]- احمد خواجە، چیم دی (شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی مەزن)، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، چاپخانەی شفیق، بەغدا، ١٩٦٨، ل١٠٥.

[٢] - کورد و کوردستان بەلگە نامە نهێنیەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا (١٩٢٠ – ١٩٢٢) و: د. شێرکۆ فەتحوڵلا ، ئامادەکردن و بلاو کردنەوەو پێشەکی: د. نەجاتی عەبدولا ، چ ١ ، ٢٠١٢ ، هەولێر ، دەزگای چاپ و بلاو کردنەوەی ئاراس، ل ١٢٨ .





**دەوری هۆزی شێخ بزێنی لە شۆڕشی کوردا:**

شۆڕشی کورد کە لە ساڵی (١٩٦١)دەستی پێ کردوو، ڕۆڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی وەکو هەر یەکێك لە هۆزە تێکۆشەرەکانی تر بەشداریان کردووە و قوربانی و فیداکاری و شەهیدی زۆریان داوە هەر لە سەرەتای دەست پێ کردنی ئەم شۆڕشە تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت، ڕۆڵەکانی ئەم هۆزە لە هەموو جموجۆڵێکی سیاسی و سەربازی بەشداری شۆڕشی ساڵی (١٩٦١)یان کردووە، هەروەها زۆرێك لە ڕۆڵەکانی ئەم هۆزە دەوری کاریگەریان هەبووە لەم شۆڕشە، هەروەها بە سەدان ڕۆڵەی نەبەرد و قارەمانی تری هۆزی شێخ بزێنی بەشداری ئەم شۆڕشە گەورەیەی کوردیان کردووە کە بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی بەڕێوەچوو، هەر بۆیە هۆزی شێخ بزێنی بە سەدان ڕۆڵەی قارەمانی شەهید بوون و خۆیان بەخت کرد لە پێناوی خاکی پاکی کوردستان و ئازادی و سەربەخۆیی وولات، وە بە هەزاران ڕۆڵەی شێخ بزێنی ئەنفال کراون، هەر بۆیە کاریگەری ئەم وێرانکاری و ئەنفال و شەهیدانەی کە ڕۆڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی لەسەر خاك و وولات داویانە تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەر ماوەو کە ناکرێ ئاماژەی بۆ نەکرێ کە نزیکەی (٥٠٠٠) پێنج هەزار ڕۆڵەی شێخ بزێنی بەس ئەنفال کراوە و بەسەدانی تر شەهید بوون وخۆیان بەخت کرد لە پێناوی ڕزگاری و سەربەخۆیی گەلی کوردستان.

## توێژینەوە لە ناوی جوگرافی نهێنی مێژوو ئاشکرا دەکات

ناوی جوگرافی و کۆنینە ناسی رەگەزی ناو لە کوردستان و دەرەوەی کوردستان ، یارمەتییێکی باشمان دەدات لە دۆزینەوەی ناوو کۆلکە ناوو ساغکردنەوەیان و بەهۆیانەوە زۆر لایەنی مێژوویمان بۆ ئاشکرا دەبێت . هەر گەلێکیش یاسای تایبەتی خۆی هەیە لە داڕشتنی ناوی جوگرافی و کۆنینە ناسی ناوی تیرەو هۆزەکان.

زۆر ناوی جوگرافی هەیە لە دەرەوەی کوردستان خشتبڕێکی کوردیان هەیە ، بە لێکۆڵینەوە لەم جۆرە ناوانە دەگەینە هۆی ناولێنانی ئەم ناوەو هەڵبەت باسێکی مێژوویشی بە دواوەیە.

هەروەها دۆزینەوەی ناوی تیرەو هۆزانی بێگانە کە خشتبڕێکی کوردییان هەبێت ، وە یا ئەو ڕەگەزناوە بێگانانەی بە پێشگری کوردی دەستیان پێکردووە یا بە پاشگری کوردی کۆتاییان پێهاتووە، ئەمەشیان دوای توێژینەوە لاپەڕەیەکی نوێی مێژوومان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

جا هەرچەندە ئەم جۆرە بابەتانە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی هەیەو ماندووبونێکی تەواوی دەوێت ، بە هۆی گەڕان و سۆراغکردنی پیرە مێردی رۆشنبیرو وریاو دنیا دیتە.

ناوی جوگرافی (دەشتی هەولێر) یش ژمارەیەکی زۆری لە بیرچووەتەوەو ناوی نوێ شوێنیانی گرتۆتەوە و، ئەویش بەهۆی نائارامی ئەم دەشتە زۆرجار بە هۆی شەڕو شۆڕەوە چۆڵ بووەو بووەتە خەرابە و کاولگە، پاشان ئاوەدان بووەتەوە.

بۆیە مێژووی ئەم دەشتە پچڕپچڕەو زۆر لە قۆناغەکانی نەنوسراونەتەوە و ناوە جوگرافیەکانی ڕەش بووەتەوەو لە بیر کراون.

جا ناوە جوگرافیەکانی ئەم دەشتە زۆربەیان نوێیەو مێژووەکەیان لە (٢٥٠) ساڵ تێناپەڕێت و بەشێك لەمانەش تورکینەو لەلایەن باج کۆکەرەوەی کارمەندانی عوسمانیان دانراون.

رەگەزناوە کۆنەکانیش بەهۆی توانەوەی هۆزانی ناوچەکە لە نێو هۆزانی نوێ وەیا کۆچ کردنی هۆزانی کۆن لە ناوچەکە ، بە جارەکی رەگەزناوە کۆنەکانمان لێ ون بووەو شارەزاییەکی ئەو تۆمان لێ نییە ، بۆ نموونە هیچ زانستێکمان دەربارەی (ئەو کوردانەی کە (ابن حوقل) بەر لە (١٠٠٠) ساڵ باسی کردوون کەلە ڕەشماڵان لەم دەشتە نیشتەجێ بوون ، هەروەها هۆزانی هەزبانی ، مازنجانی ، میرانی، حەمیدی(ئامێدی) ، و شەبەکەکانی مێجان و کانی وەکازو ئێزدیەکانی زوورگەزراو) نییە.

جا توێژینەوە لەم بابەتە لە کەم و کورتی بە دەرنییە چونکە زیاتر لە دەمی خەڵکەوە وەردەگرێت.

**-شێخ بزێنی هەمەوەندو کۆیی یەکان :**

چوار پێنج هەمەوەند لە گوندی (شیوەجان)ی بنکەی دادەنێن ، سەرانەیان لەهەموو گوندەکانی دەشتی کۆیە دەستاندو تالآنیان دەکردو دەیان – پەڕاندەوە بۆ ئەو پەری زێیە ، بۆ ناو هەمەوەندەکان ، وە هیچ شەرمیان لە (حمە اغای ) نەدەکرد .

(عواللە )ی (محمود)ی کە بە تاقە ماڵە لە گوندی (یارەمیش) دەبێ گوتی: (( دوو سوارم لێ میوان بوو ، یەکێکیان لەجیاتی پشتێند خرێنەیەکی لە پشتی بەستبوو ، یەکێکی تر کەواو سەڵتە لەبەر ، عەبایەکی بەخۆی دادابوو، هەتا نان حازر بوو، عەبایەکەی بەسەر سەری دادەداو خەوی لێ کەوت ، کابرایەکەی دی گوتی : ((ئەمە سمایل اغای شێخ بزێنی یە، دەیەوێ بچیتە کۆیە شەر لەگەڵ هەمەوەندان بکا . ))

سمایل اغا بە (عواللە )ی (محمود) ی دەڵێ: (( ئەوە تۆم کردە وەکیل لەم ناوە هەر کەسێکی سەری ڕاست کردەوە ، سەری پان بکەوە )) وە یەك دوو کەسی بەگەر دەکەوێ و دەڵێ : ئەوە دەچینە (شیوەجان) وە بە براگەورەکەی هەمەوەندان دەڵێن : (( ئیتر ئێرە چۆڵ بکەن ، ئەگەر بە قسەیان کردین ، ئەوە باشە، دەنا من کە دەستم بە لاسمێلێکم داهێنا، ئێوە لێیان دەدەن ))

کە دەچن(سمایل اغا ) دەڵێ: (( ئێوە ئێرە بەجێ بێڵن ئەوانیش پابەند نابن ( سمایل اغا ) اشارەتی دەکاو تەقەیان لێوە دێنن ، چواریان لێ دەکوژن ، پێنجەمیش تفەنگێکی لەدەستی دەدەن ، تفەنگەکەی خۆی بە ددانی دەگرێ و هەڵدێ و خۆی دەرباز دەکات ، ماین و (بێ جان) و هەموو شتومەکیان بە تالآن دەبەن و ئیدی هەمەوەند بەیەك جاری پەرینەوە ئەو بەری زێ یە ، وە ئەم ناوە بۆ (سمایل اغا)و (شریف اغا) ی برای مایەوە )) . دواتر هەریەك لە هۆزی شێخ بزێنی و هۆزی هەمەوەند ئاشت دەبنەوە لەگەڵ یەکترو خزمایەتی لەگەڵ یەکتر دەکەن ، هۆزی هەمەوەند ژنێك دەدات بە هۆزی شێخ بزێنی کە هیچ منداڵی لە ژنەی هەمەوەند نابێت ، هۆزی شێخ بزێنیش ژنێك دەدات بە هۆزی هەمەوەند ، بەلآم لە ژنەکەی شێخ بزێنی کە دراوە بە هۆزی هەمەوەند ئەوا (کەریمی فتاح بەگ ) لە دایك دەبێت ، کە دواتر ئەو عەگیدە کە خوارزای شێخ بزێنی یەکانە[1] ، دەبێتە سەر لەشکری شێخ محمودی حەفید ،وە دەورێکی بالآی دەبێت لە شۆرشەکەی شێخ محمودی حەفید بەرامبەر بە خاك و ولآت .

[1]- م. سەعد فاروق یوسف شێخ بزێنی ، لە دیوەخانی یوسف ئاغای شێخ بزێنی یەوە ،چ١، چاپخانەی ولآت، هەولێر، ٢٠١٣ ، ل٢١٦ ، ٢١٧ .

لە شەرێکی شێخ بزێنیان ، مەنگورو پیران لەشکری بۆ حەمە اغا دەکەن ، (حاجی جلیل اغا) ی (حوێزی) گێراوویەوە : (( ئێمەش کۆیەکان بۆ حەمە اغای چووبووینە لەشکری ، بەلاّم لەگەل (حسن اغا) ی برای (حەمە اغا)ی لێك ئەمین نەبووین ، وە بارگەمان تێکەلّ نەدەبوو ، لەبەر (حاجی قەلاّ)یە هەلّماندا ، بەهاربوو ، لەشکر متبەق و نالّبەندو جبەخانەی لەگەلّ بوو.
سمایل اغای شێخ بزێنی لە خراپەی دادەنیشت ، لە دوای وی (تۆفیق اغا) دادەنیشت ، عەشیرەتەکان شارەزا بوون ، شەو تەقەیەکی زۆرکرا ، گوتیان : (( هیچ نیە لەدەست خۆمان دەرچووە .)) لەبۆ بەیانی لەگەلّ شێخ بزێنیان تێك هەلّقزان ، (١٠٠) سواری شێخ بزێنی دەستیان بە چاویانەوە گرت و لەبۆ لەشکری کۆیی یان دێن ، هیچ ناگەڕێنەوە ، لە هەردوولا مەیتەکی زۆر دەکەوێ ، دوو کوری (محمود اغا)ی (سارتکە) دەکوژرێن ، وە لەو سەفەری (سمایل اغا)ی (شێخ بزێنی)ش دەکوژرێ ، دەبتە شەرێکی گەورەو شێخ بزێنی یەکان دەڕۆن هەتا دەگەنە (ساتوو قەلاّ) . لە سالّی ١٩٥٠ کە (حسن اغا) کوژرا ، (شێخ بزێنی)یەکان — کە خەریکی تقسیماتی ولاّتی کۆیە بوون . شێخ بزێنی یەکان وایان لێ هات سەرانەیان لەجوولەکەو لە کۆیی یان دەستاند ، تەنانەت خەرمانێکی گەورەی حەمە اغاوحسن اغایان سووتاند ، شوێنەکە ناوی بووە : خەرمان سووتای .
شەڕی دەشتی کۆیە لەسەر ئەمە قەوما، (جمیل اغا) لەبەر مصرفی میوانان گوندی (خرابە) ی فرۆشتە (شێخ بزێنی)یان ، وە (حەمە اغا ) کە زاوای بوو، بەمەی زانی گوتی: (( بە منی بفرۆشە ، با عەشیرەتی تر نەکەونە ولاّتی کۆیە )) لەسەر ئەمە هەرایەکە گەورەتر بوو[1] .
**-گوندی خرابە:** ئەم زاراوەیە لە کوردەواریدا بۆ ئەم شوێنە بەکاردێت کە لە کۆندا ئاوەدان بووەو ئەمڕۆ ئاوەدان نییە و قشراغ و مێرابی کاولە خانووگۆزەو کەل وپەلی چەندین سالّ لەمەو بەر بەکارهاتووی لێدۆزراوەتەوە ، کەواتە گوندی خەرابە بەمانای (کاولان یان کاولە هەوار)دێت.

---

[1] - تاهیر ئەحمەد حویزی، مێژووی کۆیە، بەرگی دووەم بەشی یەکەم، چاپخانەی( نمیر )، بەغداد،١٩٨٤، ل٩٧-١٠١.

**پێشینەیەکی مێژوویی:** نوسین لەسەر مێژووی هەرگوندێك لەم کوردستانە ئاسان نیەو توشی ئاستەنگی دەبیت، بۆیە کە باس لە مێژووی ئەم گوندە دەکەین بێگومان دەبێت پشت ببەستین بە پەرتوکە زیندوەکان و چەند کەسایەتیەکی دیارو باوەڕپێکراو بدوێنین و پرسیاریان لێبکەین ئایا چیت بیستووە لەسەر ناوو مێژوو پێکهاتەو ڕووداوەکانی ئەم گوندە؟ یا چیت بیستوە لە ڕووداو بەسەر هاتەکان ....هتد بەڵگە نەویستیشە توشی بیرو بۆچونی جیاجیا دەبین چونکە هەر بۆچونێك سەد دەر سەد ئامانج ناپێکێت بەلآم دەچێتە بواری ئەوەی قەناعەت بە عەقڵی مرۆڤ بهێنێت .

ئەم گوندە ناوەکەی خۆی لە خۆیدا مێژوویەکە چونکە(خرابە) واتە وێرانە ، دەکرێت بەر لە ئاوەدانکردنەوەی ژیان و گوزەرانی تێدا بوو بێت و بەمەش ڕاستی مێژووەکەمان بۆ دەرناکەوێت ، کاتێ ئەم ناوچەیە لە ژێر دەسەلآتی پیاوانی عەشیرەتی هەمەوەند بووە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم، هەر بۆیە حەماغای کۆیە داوا لە ئاغاکانی شێخ بزێنی سەروو دەکات، کە قەڵەم ڕەوی (هەمەوەند)ییەکان لە ناوچەکە کەم بکەنەوە ، تۆفیق ئاغاو سمایل ئاغای برای توانیویانە دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرن، سمایل ئاغا پیاوێکی ئازاو بە ویژدان بووە بەلآم تۆفیق ئاغای برای توند بووە ، ئەمانە لە (گۆمەشین ) نیشتەجێ بوون و، بۆماوەیەك لە ناوچەکەدا دەمێننەوە ، بەلآم دواتر پەیوەندیان لەگەڵ حەماغای کۆیە تێك دەچێت و حەسەن ئاغای برای حەماغا دەکوژن و ، بەمەش حەماغای کۆیە لەشکر دەنێرێتە خرابەو لە خوار گوندی (شیوەشان ) سمایل ئاغای شێخ بزێنی ڕووبەڕوویان دەبێتەوەو دوای شەڕو پیکدادان (سمایل ئاغا) دەکوژرێت دواتر ئاشت دەبنەوەو (صولح) دەکەن و ناوچەکەش دەکەوێتە دەست صالح ئاغای باوکی عەزیز ئاغای خرابە کە ئەویش زاوای شێخ بزێنییەکانە کە کچی عبێد ئاغای شەوگێری لەلا بوو، کە ناوبراو زۆر هاتووچۆی دیوەخانی یوسف ئاغای سەرۆك هۆزی شێخ بزێنی کردووە لە هەولێر.

هەرچۆنێك بێت کە باس لەمێژووی ئەم گوندە دەکەین دەڵێن (ئاغا دێ) بووە هەر بۆیە لە ململانێی نێوان ئاغاکانەوە مێژوویەك بۆ ئەم گوندە دروست بووە ، بە تایبەت لە نێوان ئاغاکانی شێخ بزێنی سەروو غەفوریەکانی کۆیە ، ئیتر (صالح ئاغا) گوندی خرابەی ئاوەدان کردۆتەوەو زێی بچووك بووە بە سنور لە نێوان شێخ بزێنی و دەشتی کۆیە ، بەو شێوەیە تا ئەمڕۆ ژیان و گوزەرانی تێدا بەردەوامە ، کۆمەڵێك تیرە بەیەکەوە ژیاون وەك(باجوڵی و کەلۆری و جاف و شینکی و مەلا زادەی شێخ بزێنی و ئاغاکانی غەفوری کە ئەمانەش لە

(کۆیەو سورە قەڵاو شیوەشان و باغەجنێرو قازبەگیان و شێخ بزێنی ) هاتوون . جگە لە باجۆڵیەکان کە بە (خرابەیی ) دادەنرێن و لە دێر زەمانەوە لە خرابە بوون ، مام عەلی صالح دەڵێ "قەلاّی خرابە قەلاّیەمی تورەگە ڕێژە و ماڵی عەزیز ئاغای لێبووە لە کۆندا ، دەڵێن لەسەردەمی پاشای کۆرە دروست کراوە کەواتە گوندی خرابە مێژوویەکی کۆنتری هەیە دەگەڕێتەوە بۆسەدەی نۆزدەیەم زۆر دوورتر لە ئاکۆکی و دۆستایەتی ئاغاکانی شێخ بزێنی و غەفوریەکانی کۆیە.

وەك کەرتێکی کشتوکاڵی (٤٦٢٠)چوارهەزارو شەش سەدو بیست دۆنمە[1]، لەگەڵ بیست لە گوندەکانی ڕۆژهەلاّتی تەق تەق لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٩بووە بە ناحیە و بەناوی ناحیەی (ئاشتی) یەوە ناونراوە . لەساڵی ١٩٩٩ ناوچەقی خرابە (٦٠) ماڵی تێدابووەو ژمارەی دانیشتوانی (٣٩٤) کەس بووە ، ساڵی ٢٠٠٦ (١١٠) ماڵ لە ناحیەکەدا هەبووە و ژمارەی دانیشتوانی (٦٧١) کەس بووە، کەبەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، ناحیەی ئاشتی (خرابە) (٢٠)کەرتی کشتوکاڵییە بەڕووبەری (٧٦٦٥٠) دۆنم، ساڵی(٢٠٠٠)، (٣٥٥١) جوتیاری هەبووە ،بەلاّم وەك ئاوەدانی و گوند (٢٣) ئاوایی هەیە ئەوانیش (کلێسە، کانی سوور، بۆگد، الا الله، کانی بی ، ئەلیاسە سوور،کێلە زیندان، کانی کوردەو داوداوە ، کاولان، قزلو، گۆمەشین، کانی هەنجیر ، قەسر خرابە، قازبەگیان، شیوەشان ،قولقوڵە، سوورە قەلاّ، بانە گوڵان، سوێرەڵە، هەواری تازە لە سنووری ئاقاری قزلو، چالاو لە سنووری کاولان) تێکڕای ڕووپێوی ئەم گوندانە(١٩٢)کم٢ دەبێ ، گرنگترین پارچە زەویەکانی ئاوایی خرابە "چڵە خانە، کانی بۆکان ،مەیدانگە، دەشتی کێلە سپی ، پەینکەبڕ، کانی ماران ، دەشتی قەسرێ ، چەمرگە، گردی چەمرگە، شیوە قوول، ئاودەلوك)ە، لە کانییە سەرەکیەکانی(خانکە، ئاغاژن، قولکە، کانی پیاوان، کانی خەزان، )ە بیرەکانی ئاوی خواردنەوەش ( بیری مام عەلی لە کانی خەزان ، بیری عبێد احمد فقی رسول لە چڵەخانە ، بیری سەعیدی ئەحمەد لە دەشتی قەسرێ ، بیری عەبد ئاغا لە قەسرێ ، گۆڕستانەکانیش(تۆەگچکەل و تاعونان و شیخ وەلاو شێخ محمد)ە.

سنوری ناحیەی ئاشتی (خرابە) لە قۆناغی ئەنفالی چواردا بەر شالاّوەکە کەوتووەو (٥٦٠) هاولاّتی ناوچەکە ئەنفال کراون گوندەکانی (کلێسەو قزلو وگۆمەشین ) زۆرترین کەسیان ئەنفال

[1]- لە لقی کشتوکاڵی خرابە وەرگیراوە لە ١٧/١٠/٢٠٠٦.

کراون ، چەقی ناحیەکەش (١٢) هاولاتی ئەنفال کراوی هەیە ، کەبەشێك لەو ئەنفال کراوانە لە هۆزی شێخ بزێنی دانیشتووی ناوچەکە بووە .

**-کۆیە لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا**

جەنگی یەکەمی جیهانی لە ١١/١١/ ١٩١٨ دا کۆتایی هات و بەرەی ئەڵمانیاو هاوپەیمانەکانی وەك دەوڵەتی عوسمانی ژێر کەوتن و هەرێمی کوردستانی باشوور دەستەلاتی عوسمانی تێدا نەماو ، هێزەکانی بەریتانیا لە رێگەی (کەرکوك و پردێ)وە لە رۆژی ١٢/٢٥/ ١٩١٨ بەسەرکردایەتی کاپتن های لەسەر داوای دانیشتوانی گەیشتنە شاری کۆیە .

کاپتن های وەسفی چۆنیەتی هاتنی سوپای بەریتانیا بۆ ئەم شارەی کۆیە دەکات و لە کتێبەکەی (دوو ساڵ لە کوردستاندا ) دەڵێ: (( لە مانگی دوانزدەی ساڵی ١٩١٨ دا ئەرکەکانی خۆم لە ئالتوون کۆپری بە یاریدەدەری حاکمی سیاسی کەرکوك ، نەقیب لونگریك سپاردو رێی کۆیەم گرتە بەرو دوای رۆژێك گەیشتینە گوندی سارتکە ی محمود اغای شێخ بزێنی کە بەڵێنی دابو پاسەوانێکمان بۆ دابین بکات بۆ رێگەی کۆیە ، کەچی ١٥ چەکداری رێك و پێکی ئامادە کردبوو بە سەرۆکایەتی عەباس اغا ناوێك و سووریش بوو کە خۆی لەگەڵماندا بێت )) ئینجا کاپتن های بەوردی باسی رێگاکە دەکات تاکو دەگاتە گوندی ئیلنجاغ [١] .

دابڕانی حەماغا بەدوا کارەساتەکەی ١٢٨٤ك . دا لە حاڵ و باری ولاتی کۆیی بۆ ماوەی پازدە ساڵ تەرازووی دەسەلاتی ئەم بەرو ئەو بەری زێی بچووکی بە تێشکانی بەری کۆیێدا لە نگاندبوو . لەو کتێبەی ((دوو ساڵ لە کوردستان)) کابتن های نەختێك یارمەتیمان دەدا بۆ چۆنیەتی ئەو دالەنگانە بێ ئەوەی بیبەستێتەوە بە بەندیبونی حەماغا هەر ئەوەندە دەڵێ بۆ بەرگریکردن لە دەستدرێژی هەمەوەندەکان حەماغا دۆستایەتی لەگەڵ شێخ بزێنییان گرت تا هەمەوەندەکانی پاشگەز کردنەوە . ئەمجار کە ئاغایانی شێخ بزێنی لە پیت و بەرەکەتی دەشتی کۆیە چەشە خۆر بوون . تەمایان لە ولاتەکە ناو خەریکی خۆ چەسپاندن بوون . ئەم کێشمەکێشەی نێوان حەماغاو شێخ بزێنییان دوای دەرکردنی هەمەوەندان هەتا دەورووبەری

[١] - کۆیە لە رەوتی شارستانیەتدا، کەریم شارەزا – نازم حوێزی – عوسمان مستەفا خۆشناو، مەجید ئاسنگەر، چ١، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٩ ، ل١١٦ .

١٢٣٠ك – ١٩١٢ز . بەردەوام بوو کەپتر لە ٢٥ ساڵ دەگرێتەوە . مێژووی باسکراوی ١٢٣٠ك لەوە دێت کە شکاتی زێدە گرنگ و سەخت و پڕ جورئەتی ڕەسمی لەلایەن حەماغاو دۆستانیەوە دژی شێخ بزێنییەکان پاش مەرگی حاجی مەلا عەبدوڵلاّ بووە . واتە پاش ١٩١٠ ز . بووە کە دەکەوێتە بەرانبەر ١٢٢٨ ك باسی ئەم شکاتەش نەختێکی دیکە نۆرەی دێت وەی کاشکی کاتی خۆی وەك لە زاری بابمەوە بیست بمنووسیبایەوە دەستدرێژی شێخ بزێنییان بە زۆر کەوت لەسەر کۆیە و لە سەر حەماغاش شەڕێك کە لە دێی شەو گێڕ ڕووی دا حەسەناغای برای حەماغا.

وەها ڕێك دەکەوێ جەمیلاغای حاجی ئەسعەداغا زێدە مەسرەفی بە ملدا هاتبوو لە دوای مەرگی باوکی، میراتیشی بەسەر چەندین میراتگردا دابەش بوو بوو ئیتر پشکی برا گەورە بایی مەسرەفی دیوەخانی نەدەکرد سەرەڕای ئەوەی کە جەمیلاغا خۆی بە تەبیعات حەزی لە سەخاوەت و مێواننەوازی دەکرد ئا لەبەر ئەم هۆیانە جەمیلاغا دێیەکی خۆی کە عومدەدێ بوو لە دەشتی کۆیێ و مە شورە بە (خرابە) فرۆشتیە تۆفیق ئاغای شێخ بزێنی . حەماغا کەبەم مامەڵەتەی زانی بە دوای جەمیلاغایدا ناردو پارەکەی پێ داوەو دێیەکەی بۆ خۆی هەڵگرتەوە و پارەی تۆفیق اغا بۆ خاوەنی چووەوە حەماغا خوارزایەکی خۆی لەسەر دێیەکە دانا کە زاواشی بوو لە هەرای شێخ بزێنییان دێی خرابە هەم لەبەر نزیکی لە زێی گچکە کە سنووری نێوان ولاّتی کۆیەو هەرێمی شێخ بزێنییانە و هەم لەبەر چالاکی (صالح اغا) ی خوارزاو زاوای حەماغا دەورێکی گەورەی هەبوو. ساڵحاغا کوڕی عەبدوڵلاّغا ی ئەبا بەکراغای عەبدڵلاّغای غەفووراغایە. حەماغاش کوڕی مەحموداغای کوڕی حەمەداغای کەریماغای غەفوراغایەو دەگەنەوە یەك دەگێڕنەوە جارێکیان شێخ بزێنییەکان هرووژم دێنن بۆ ناو دێی خرابە سالحاغا گوللەیەکیشی بەر دەکەوێ کوشندە نابێ لەو شەڕەدا .

دواتر ئاشت دەبنەوە لەگەڵ شێخ بزێنی یەکان عزیز ئاغا ژنێکی لە هۆزی شێخ بزێنی هێناوە کە خەڵکی گوندی (شەو گێڕ)ی شێخ بزێنی یە، ساڵحاغا یەکجارەکی لە خرابە نیشتەجێ بوو، حەماغا کەم وەها بووە ملّك لەسەر خۆی تاپۆ بکا . بەلاّم لەبەر وەزعی تایبەتی ئەو ڕۆژگارە خرابەی بەناوی خۆی تاپۆ کرد . بەلاّم داهاتی بۆ ساڵحاغا بوو کە زاواشی بوو ، دوای ساحاغا عەزیزاغا کە کوری گەورەی بوو خووشکی بچووکی کاکە زیادیشی مارە کرد و لە خرابەش بە برا گەورە مایەوە . لە تەسوییە دێیەکە بە ناوی ئەو خوشکەی کاکە زیاد تۆمار کرا .

هەروەها عزیز ئاغا زۆر هاتووچۆی دیوەخانی یوسف ئاغای شێخ بزێنی کردووە لە هەولێر .

بە هۆی ئازایەتی و سوار چاکی و قارەمانیەتی ڕۆڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی کە کۆیی یەکان بە هیچ شێوەیەك نەیان دەتوانی بەرامبەریان بووەستن ، بۆیە ناچار پەنایان بردە بەر میری و سولتانی عوسمانی کەبە هانایانەوە بێتن بۆیە چەند قسەو توهمەی ناماقوڵ و ناڕەوایان بۆ شێخ بزێنییەکان دروست کرد لە لایەن سوڵتانی عوسمانییەکانەوە ، هەروەها پارەوپول و ڕەشوەتێکی زۆریان دا تاوەکو لەشکری سولتانی عوسمانییەکانیان هێنایە سەر هۆزی شێخ بزێنی هەر بۆیە ڕاووڕووت و خەرمان سوتاندن خەریك بوون قەلاَ چۆیان تێ بکەوێ حکومەتی قەزاو لیوا ((سنجاق)) و ویلایەت لە کۆیەو کەرکوك و موسڵ گوێی پێ نەبزووت و خۆی نەخوراندو بەکەسی نەگوت پشتی چاوت برۆیە، کە هەرا درێژەی کێشاو ساڵەو ساڵ لە توندیو تیژی و خەسارەت و خوێن ڕێژی و ماڵکاولی زیاد کردو حکوومەت لە قەزا هیچ دەنگێکی نەکرد لەگەڵ حەماغا دا ڕاوێژم کردو بڕیارماندا شکات بگەیەنینە کەرکوك ، بەڵکو موتەسەڕیف لە لای خۆیەوە شتێك بکات بەو نیازەی کە هەتا کێشە لەگەڵ حکومەت بنەبڕ نەکەین واز نەهێنین نوێن و ئەسپایی رابواردنی شەو و ڕۆژمان بردە دایەرەی بەرید کە تەلخانەش هەر لە وێ بوو مودیری تەلەفۆن و بێتەل پیاوێك بوو بە ناوی ((نائل افندی )) و خەلکی ئەستەنبۆڵ بوو بەهۆی دۆستایەتی لەگەڵ کۆیی یەکان دەری بڕی کە ئەگەر وەزیفەشی لەسەر دابنێ هەر چیەکی کۆیی یەکان لێی داوا بکەن بۆیان دەکەم . ئەو موراجەعەیە ٣- ٤ ڕۆژی خایاند لەو ماوەیەدا حەماغاو جەماعەتی هەریەکە بەتاقمی خۆیەوە شەویش لە تەلخانە دەنووستن ، لەسەرەتاوە بەهۆی بێتەل لەگەڵ موتەسەڕفی کەرکوك خەریکی موراجحە بوون . دەقی بروسکەکان سەرەتا بە تورکی ڕێکی دەخست و مەسرەفەکەشی لەکیسەی حەماغا دەردەچوو لەگەڵ کەرکوك خەریك بوونیان بێ سوود بوو ، ئەمجار یەخەی والی موسڵیان گرت و ڕووداوی لەو دەمە بە پێش و موراجەعەی کەرکوکیان تێ گەیاندبوو لە موسڵیش هیچ پەیدا نەبوو حەماغا داوای کرد لە نائل کە دەنگمان بگەیەنێتە وەزیری داخلییە ئیتر بەرقیەی بەرێ دەکرد بۆ وەزیر، کە لەوەلاَمدا وەزیر پرسی ئایا هۆی ساردی نێوان غەفوری و شێخ بزێنی چیە ؟ لە وەلاَمدا پێمگووتەوە دنیا هەمووی ئاگری تێ بەربووە تۆ لە ساردایی دەپرسی ؟ لەوە بەو لاوە کە ئومێدیان بە داخلییەش نەمابوو حەماغا داوا لە نائل دەکات بەرقیەیان بۆ ((مابین — بلاط )) بنێرێ نائیل بێ دوودڵی گوتبووی تێشدا بچم بۆتانی دەکەم ئیتر لەنووکەوە هەموو کەمتەرخەمی چەند ساڵەی قەزاو بێباکی و بێپەرۆشی کاربەدەستانی دیکەیان بە تەفسیلاتەوە بۆ سوڵتان کرد بە بەرقیە. حەماغا کە نائیل پێوەندی بە مابەینەوە کردو وەلاَمی وەرگرتەوە

بە وشەی ((مابین)) ڕاچلەکی و لە جێی خۆی ڕاست بووەوە و دانیشتەوە لەوەشدا حەقی بووە ، چونکە مەودای نێوان مەئمووریکی بەرق و سوڵتانی عوسمانی سنوور بەدەرە ، ئافەرین بۆ کور کە جورئەتی کردووە دەرگەی لێ بدات . کە دەنگ گەیشتە سوڵتان باری مەسەلەکە گۆڕا لە پێشەوە دڵی جەماعەت دەداتەوە کە چاوەنۆری کردەوە بێ .

هەر ئەوەندەبوو خەڵق زانی کە والی یەو نەقڵ دەبێت و موتەسەریفە عەزل دەکرێت و پیاوی عەسکەری یە چی بەسەر دێت . پەرتان پەرتانێك بەو مەئموورە زلانە دەکرێت عالەم واقی وڕ دەمێنێ . بە فەرمانی سوڵتان هێزێکی زۆر بێ ئامانی سوپای دەوڵەت بە فەرماندەی تازەوە چووە سەر شێخ بزێنییان و زۆر لە ڕۆڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی دەگیرێن ڕاپێچەك دەدرێن بۆ کۆیێ کۆیێیەکان پارەو پول و ڕەشوەتی زۆریان دابوو بەو زابت و فەرماندەی کە ئەو ڕۆڵە قارەمانانەی هۆزی شێخ بزێنییان گرتبوو . تاکو بەرێی بزرو نادیار شاخ و داخ بیان بەن بۆ هەولێر لە ترسی لەشکری هۆزی شێخ بزێنی نەخۆ بەسەریاندا بدەن و ئەو ڕۆڵە قارەمانە گیراوانە قوتار بکەن لە چنگیان هەر بۆیە بەفەرمانی سوڵتانی عوسمانی شێخ بزێنییەکان بەینێك لە بەندینخانە مانەوە تۆڵەی زەرەرو زیانیشی بایی مومکین لێیان وەرگیرایەوە.

لەبارەی هەرای نێوان حەماغاو شێخ بزێنییەوە مراد حیکایەتێکی خۆشکەڵە لەزاری ڕەحمانی کێخا حەوێزی شاخە پیسکە ((ڕەحمان مامی مرادە )) دەگێڕێتەوە گووتوووەتی ، حەمەد تیماری خەڵکی دێی تیمارۆك بۆی باس کردم ، گوتی بە جحێڵی لەگەڵ شێخ بزێنییەکان بووم وردە بەندم بۆ دەگوتن ناویان نابووم حەمەد حەیران ، شەوێك لەدیوەخانی تۆفیق ئاغا لە دێی خرابە دانیشتبووین یەکێك گووتی ماڵە دۆمێك هاتوون خاوەنەکەیان حەیرانی خۆش دەڵێ تۆفیق ئاغا بەدوایدا هەنارد کە هات داوای حەیرانیان لێ کرد ئەویش دەستی خستە بناگوێی و تێی هەڵکرد . (( حەیران وەرە لە ئاوی غزری یاخوا دزەیی برایاغاتان بمری ئەو هیچ عەشیرەت خۆی لەبەر ڕانەگری )) .

حەمەد تیمار گوتی منیش دەستم لە بناگوێم نا و ڕاسامە ئەم حەیرانە : (( سواران لەمن هەر ڕاوە ڕاوە نێچیری خەڵك تەیرو تواڵە بەلا نێچیری تۆفیق ئاغا قولینگەکەی شاپەر بەخوناوە ))

حەمەد تیمار گوتی کە لێبوومەوە تۆفیق ئاغا دەمانچەکەی هەڵکێشاو ڕووی کردە کابرای دۆم پێی گووت : سەگباب دزەیی کەی پیاوی وەهایان هەبوو ئەگەر حەیران دەڵێی وەك حەمەد بڵێ حەمەد حەیران دەزانێ زۆر نەمابوو دۆمەکە بکوژێ . حەسەناغای برای حەماغاش وەکو باسمان کرد لە شەڕێکی شێخ بزێنییان کوژرابوو، ڕەنگە بەر لە گرانیی ١٩١٧

بە ١٢ ساڵێك حەسەناغا کوژرابێت ، چونکە وەك گوتمان قادراغای سمایلاغا کە ناوی دەرکردبوو لە شەڕەکانی شێخ بزێنی لە سەرەتای ١٩٠٦ ز دا مردووە ، دیارە حەسەناغا زووتر لەو ساڵە کوژراوە ، دواتر هۆزی شێخ بزێنی و کۆییەکان ئاشت بوونەوە لەگەڵ یەکترو ناکۆکی لە نێوانیاندا نەما[1].

**•حاجی قادر گۆرقەرەجیە و لە تیرەی دەربەندیە کە یەکێکە لە تیرەکانی هۆزی شێخ بزێنی :**

- **گوندی گۆڕقەرەج:** ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (تەق تەق)ەو، سەر بە قەزای کۆیەیە لە سنووری پارێزگای هەولێر، بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، هەروەها ئەم گوندە زادگای شاعیری ناسراو و ناوداری کوردە بەناوی (حاجی قادر) کە بە (حاجی قادری کۆیی) ناوزەد کراوە، کە لە بنەڕەت دا ئەم شاعیرە یەکێکە لە ڕۆلەکانی هۆزی شێخ بزێنی و لە تیرەی دەربەندی یە.

بەرزایی گۆڕقەرەج: بەدووری (٣کم) لە خۆرئاوای تەق تەق هەڵکەوتووە (٢٢٨٦)پێ لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە، لە دوو وشە پێك هاتووە (گۆڕ+قەرەج) یان ئەوەتا گۆڕی قەرەجان یان تەختایی و گۆڕەپانی قەرەجان دەگەیەنێ[2]، هەندێ جار بە چیای (کانی لەلە)ش ناو زەد دەکرێ، کۆمەڵێك کەوری گەورە گەورەی تێدایە (کەور دیان، کەور جولەکە، کەور سلێمان ئاغا، کەوری کوتکینە) بە بۆچوونی من گۆڕقەرەج لە کەوری قەرەجەوە هاتووە لەوانەیە بە خزانی زمان کەور بووبێ بە گەور، گەور قەرەج دواتر بووە بە (گۆڕ قەرەج)، کۆمەڵێك پێدەشتی پشتاو لەولاو لەولای ئەم بەرزاییە هەیە بە ناوەکانی (بانە بێدەر، قورمینگە، شێر وەزەن، بانە ڕیخ، سیخوڕە،عەلە، عاربە گوشل،دۆلی لولوە، قەلکە) قەلکە ئاقارێکی سەختە[3].

[1]- مەسعود محمد، حەماغای گەورە، دەزگای چاپ، بلاوکردنەوەی ئاراس، چ٢، هەولێر، ٢٠١٠ .

[2]- ئاراس ئیلنجاغی، ئاوڕێ لە کاولە گۆرقەرەج، گ: ڕێگای کوردستان، ژ: (٥١٣)ی ٢٠٠١/٥/٦ .

[3]- ئاراس ئیلنجاغی، گۆڕقەرەج ئەو ئەسپە قەرەجیە کە خاوەنەکەی وون کردووە، گ: تاك، ژ: (١٣)ی کانونی دووەمی ٢٠٠٦.

گۆڕقەرەج، گوندێکی وێرانەو ئەوکاولە هەوارەیە بەدوری سێ بۆ چوار کیلۆمەتر کەوتۆتە خۆرئاوای تەق تەق، لە دامێنی لاپالی خۆرئاوای بەرزایی گۆڕقەرەج بووە. کە ئەمرۆ کانی لەلەیی یەکان پێدەلێن (چیای کانی لەلە).

زاراوەی گۆڕقەرەج ، وشەیێکی لێکدراوی کوردی یە لە دوو وشەی (گۆڕ + قەرەج )پێکهاتووە، بەلام هەندێك لە تۆمەر گومبەتیەکان دەلێن " لە بنەرەتدا (گۆڕقنجە ) یە ، بە هەر حال گۆڕقەرەج دوومانا دەبەخشێ یان ئەوەتا (گۆڕ) واتای (قەبرە) بەمەش دەبێتە (گۆڕی قەرەجان) یان گۆڕ بەواتای (گۆرایی و تەختایی و ڕاستایی و گۆڕەپان و مەیدان دێت ) لەم حالەتەش دەبێتە (گۆڕەپانی قەرەجان ) یان ئەوتا لەناوی کەورەکانی نێو بەرزایەکە هاتووە وەك (کەوردیان ، کەورجولەکە ، کەوری سلێمان ئاغا ، کەوری کوتکینە ، کەوری حەمە بەسیا، کەوربارانی ، کەورجنجڕ، کەورفەتێ ، کەورجن دی ، کەور هەنجیر زەرد، کەور شێخە ، کەور تەندورە ، کەورعەلە) ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان( قەرەج) لەم کەورانە گیرسابنەوە بووبێ بە( کەورە قەرەج )دواتر لە ئەنجامی سوان و زیاد کردنی پیت بۆ وشەکە وەك (کەور — گەوڕ - گۆڕ) کە ئەمەش گۆڕ قنجە زیاتر دەچێتە عەقلەوە .

سنوری گۆڕقەرەج و ئاقاری، گوندەکانی (تالەبانی گەورەو نیلنجاغی گەورە) لەباکوری سنوری ئاقاریان داوەو (گەرمەکی تەقتەق) لە خۆرهەلات و (کانی لەلە) لە باشوری و(تۆمەرگومبەت) لە خۆرئاوادا، گرنگترین ناوی ئاقارو پارچە زەویەکانی ئەوکاولە هەوارە: بانە بێدەر ، قوڕمینگە ، شێرەوەژەن ، بانەڕیخ ، سیخوڕە ، دۆلی لۆلە ، عەلە ، قەلکە ، چەخماغین، عەرەب گوشل ، زولفەقارە .

ڕەئوف محمد کانی لەلەیی دەلێت "لەسەرووی قشراغی کاولە هەواری گۆڕقەرەج لە سالی ١٩٨٧ لە کەپکە شاخێکی گەورە ئەم دەستەواژەیە هەلکەنرابوو (بەردە قۆرتە گۆڕقەرەج ) تاکو ئەمرۆ دانیشتوانە ڕەسەنەکەی ئەم گوندە ساغ نەبۆتەوە لە چ تیرەیەك بوون ئایا دەربەندین کە تیرەیەکە لە هۆزی شێخ بزێنی یان داودەن یان زەنگەنە هەندێکیان دەلێن "ئیمە گۆڕقەرجین و بەس !؟ لە بەناو بانگترین ئەو کەسانەی لەم ئاوایییە لە دایك بوون (حاجی )یە ، کە لەسەر ئاستی کوردستانی گەورە ناوی دەرکردووە ، هەروەها ئەوانەی ڕەچەلەکیان بۆ ئەم گوندە دەگەڕێتەوە لەوانە (مەلا میرزا عزیز حەسەن جگیلەیی کە گوندێکە لە گوندەکانی هۆزی شێخ بزێنی ) و (مەلا عەبدوللای گۆمەگڕوو ) لە هەلکەوتوانی بەرەبابە پەڕاگەندەکانی

گۆرقەرەجن، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە (حاجی قادر )یش یەکێك بێت لە ڕۆڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی .

گۆرقەرەج لەکۆتایی نیوەی یەکەم و سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم(١٨٤٠- ١٨٥٠) بەگوتەی قسەی زۆربەی خەلکی ناوچەکە بە هۆی کێشەو ناخۆشی لەگەل گوندی نۆمەرگومبەت چۆل کراوە ، دانیشتوانەکەی پەراگەندە بوون بەم شێوەیە :

١- بەرەبابی (عەولا شاوە ) بۆ گوندی جێگلەی شێخ بزێنی .

٢- بەرە بابی (حمە علی هەی دایە ) کە خزمانی نزیکی (حاجی ) بوون بۆ گوندی گەرمکی تەقتەق کە بەشێکی زۆری دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنیە .

٣- بەرەبابی (مەلا عەولای گۆمەگرِو) بۆگوندی گۆمەگرِوی ناوچەی دزەیان .

٤- بەرەبابی (ئاورەحمان حیمە ) بۆ گوندی ئیلنجاغی حاجی لارەی شوان و شێخ بزێنی.

٥- بەرەبابی (هەمزە قورِاوی ) بۆگوندی قەرەناوی شێخ بزێنی .

٦- بەرەبابی (وەستا جەبار ) یش بۆ گوندی باغەجنێری تەقتەق .

٧- ئەوانەی بە خزمایەتی ژن و ژنخوازی چوونە گوندی نۆمەرگومبەت وەك بەرەبابی (عەولای مام حاجی محەمەدی هەمە ) .

تێکرایی زەوی و زارەکانیان خرانە سەر گوندەکانی (نۆمەرگومبەت )کە پشکی شێری بەرکەوتووە، (تالەبانی گەورەو ئیلنجاغی گەورە کانی لەلە و گەرمك بەلام بۆ مێژوو پێویستە بوترێت " گۆرقەرەجەکانی کە پەرانگەی گەرمك بوون تا ئەمرۆش زەویەکانیان بەناو دێنن و لەدەستی دانیشتوانە ڕەسەنەکەی گۆرقەرەجەکان دان "مام حاجی سەعیدی حاجی محەمەدی گەرمکی دەیووت " هەر ئەمەش وای کردووە (سمایل ئەحمەد شێخە ؟)کە گۆج بووە هەتامرد، دەیوت " هەر بەهیوای ئەوەبووم کە کورە کوری گۆرقەرەج بچینەوە سەر ئاقارو گوندی خۆمان " لێرە دەمەوێت بلێم شوهرەی کاولە دێ یەك دەبێت چی بێت !؟ دوای زیاتر لە ١٥٠ سال وێرانەیی و دەربەدەری دانیشتوانەکەی ناوی هەر مابێت خۆ شاری کۆیەی ئەمرۆ بێ (حاجی)یش لەبەر ناودارانی (نمونەی حەماغا ) ناوی هەردەبوو ! هەر بۆیە دەلێم حاجی قادری کۆیی گۆرقەرەجیە یەکێکە لە رۆلەکانی هۆزی شێخ بزێنی ، بەلام لە دوورە ولاتی و بێکەسیدا نازناوی (کۆیی ) بۆداندراوە لەبری کوێرەدێ یەك بۆ ئەمەش دەلێم :

یەکەم: پەرتوکی مێژووی ئەدەبی کوردی مامۆستا عەلائەدین سوجادی سالی ١٩٥٢ لە لاپەرە ٣١٠ و نامیلکەی مەلا عەبدەرەحمان (حاجی قادری کۆیی )ی مامۆستا مسعود

محەمەد سالی ١٩٧٤ لاپەرە ٣٢٩ شیعرو ئەدەبیاتی کوردی مامۆستا رەفیق حیلمی سالی ١٩٤١ لاپەرە ٩٩ و دەستنوسی کوردی دکتۆر کەمال فوئاد لە پێشەکیەکەی دا هەموو ئەمانە حاجی بە گۆرقەرەجی دادەنێن . گۆرقەرجیش یەکێکە لەو گوندانەی کە شێخ بزێنیەکان تێدا نیشتە جێبوونە هەر لە کۆنەوە دواتر پەراگەندەی گوندەکانی دەوروبەری گۆرقەرەج بوون کە ئەوانیش : (جگێلە ــ گەرمك ــ ئیلنجاغ ــ ئۆمەر گومبەت) زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندانەش لە هۆزی شێخ بزێنی بوونە .

دووەم : حاجی وەك هەموو شاعیرە کلاسیکیەکان لە کۆتایی هۆنراوەکانی ناوی خۆی بردووە بە (حاجی ) لە هیچ کام لە شیعرەکانی بەنازناو بە ( کۆیی) ناوی خۆی نەبردووە ؟! هەرچەندە نازناو ناتوانێت شوێنی لە دایك بوون بسرێتەوە وەك (حافزی شیرازی و زێد سەقزی ، نالی بەو زێد خاك و خۆلی ، حاجی قادری کۆیی و زێدی گۆرقەرەجی کە یەکێکە لە گوندەکانی هۆزی شێخ بزێنی .

سێیەم : کەسایەتیە ناسراوەکانی وەك ( مەلای گەورە و حەمائاغا و تایەر تۆفیق و دلدار شاعیرو ئەختەرو ....هتد ) هەموویان نەوەکانیان لە شاری ئەدیبان و هونەر (کۆیە ) ماون تەنها خزمەکانی حاجی نەبێت کە لە ئۆمەرگومبەت و گۆرقەرەج و گەرمەکی تەق تەقن کە ئەویش گوندێکە لە گوندەکانی هۆزی شێخ بزێنی کە تائیستاش بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنینە .

چوارەم : حاجی لەبەر ئەوەی هەستی نەتەوەیی هێندە بە هێزبوو کە ڕابەری شیعری نەتەوەیە لەکرمانجی خواروو نەك تەنها (کۆیی )یان شێخ بزێنی بەلکو (هەمەوەند و هەموو گەلی کوردی بە خزمی خۆی زانیوە ) وەك لە دەقەکانی (خزمی خۆمن ،خزمی خۆمان ، ئەی گەلی خزمان، میللەتی خزمان ) بەلام لەسەر ئاستی خود حاجی دەلێت : حاجی بێ خزم و کەسە "خالید دلێریش بە حاجی دەلێت: لەسەردەمی عەشیرەت و تایفەگەریدا نەك تەنها بێ باوك و دایك و برا و خوشك و ئامۆزا و خالۆزا و بێ کەس و بێ دەرتانیش بووە " هەر بۆیە حاجی دەلێت :

من کەسێکم زەمانەیی ناکەس
دایبڕیوم لــە قەوم و نــاکەس

پێنجەم: هەر لەبەر حاجی یە لە شارۆچکەی تەقتەق حکومەتی هەرێم گەرەکێك و قوتابخانەیەك و مزگەوتێك بەناوی گۆرقەرەج ناوناوە . کەناحیەی تەق تەق و گوندی (گۆرقەرەج) یش ، تائیستا بەزادگاو مەلبەندی شێخ بزێنیەکان دادەندرێت[1] .

شەشەم: حاجی قاردی کۆیی لە هۆنراوەیەکی دا بەناوی (شێخ بزێنی )کە دەلێت:

**شێخ بزێنی**

**شێخ بزێنی قسەی وەکوو جافە ــ خۆکەرامەت نییە ئەمیش لافە**
**ئەو وەکوئیمە نین بە ئیدراکن ــ ساحیبی نوسخەیی گەلی چاکن**
**وەکو بەهرام وخوسرەو شیرین ــ لەیل و مەجنون چەندی وا ڕەنگین**
**هەموویان ڕەمزو کانی عیرفانن ــ فێری بن چونکە خزمی خۆمانن**
**مەم و زین و دیوانی شێخی جزیر ــ گەلێ چاکن بەسەهلی بێنەگیر**
**ئەم دووانە ئەمێستە تەرجەمەیان ــ زۆرە حەتا لەنێو فەرەنگستان**
**وای بخوێنن لە وەجهی موحتاجی ــ وابزانن بە خۆیەتی حاجی**
**هەم ڕەواجی بدەن لە هەرلاوە ــ تێ نەگەن مردووم بلێن ماوە**
**قەت تەسەور مەکەن تەرەفداری ــ غەیری غیرەتکەشی و غەمخواری**
**من کەسێکم زەمانەیی ناکەس ــ دای بڕیوم لە قەوم و قیلەو و کەس**
**هەرمنم ئێستا وارسی عیسا ــ بێ ژن و مال و بێ کوڕ و مەئوا** [2]

بۆیە لەم هۆنراوەیەدا لە دێری (٧ ، ٩ ، ١٠ ) دا زۆر بە زەقی دەردەکەوێت کە (حاجی قادر) یەکێکە لە ڕۆلەکانی هۆزی شێخ بزێنی ، جگە لەمە (حاجی قادر) لەنێو دیوانەکەیدا هیچ هۆنراوەیەکی تایبەتی بە ناونیشانی هیچ هۆزێك نە گووتیە جگە لە هۆزی شێخ بزێنی نەبێت وەکو لەلاپەرە(١٧٩)ی دیوانەکەی دەردەکەوێت کە(کەریم شارەزا و سەردار حەمید میرات)

---

[1] - سەرچاوەکان: ( ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان ،بابەت ئاورێك لە کاولە گۆرقەرەج ،نوسینی ئاراس ئیلنجاغی ،ژمارە (٥١٣) ٢٩- تەموزی ٢٠٠٢ - ڕۆژنامەی هاموون، ژمارە (٣٠) ی مارتی ٢٠١١).

[2] - دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆلینەوەی کەریم شارەزاو سەردار حەمید میرات، ل١٧٩ .

لێکۆلینەوەیان بۆ کردووە ، بۆیە ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کەوا (حاجی قادر) لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

ئەو پیاوەی لەسەختترین شێوەکانی ژیاندا ژیاوە ، لەسەردەمی عەشیرەتی و تایفەگەریدا نەك تەنیا بێ عەشیرەت و تایفە بوو ؟ بگرە بێ باوك و دایك و برا و خوشك و ئامۆزا و خاڵۆزا و بێ کەس و بێ دەرتانیش بووە " ناکرێ ئەمە والێك بدەینەوە کە حاجی سەر بە هیچ تیرەو تایفەیەك نەبووە وە لە گۆری قەرەجانی تەقتەق لەدایك بووە وە لەبەری ئوکسوداری ئەستەنبول لەگۆرستانی قەرەجان (قەرەج ئەحمەد ) بەخاك سپێردراوە .

زۆرمان کە سەرەقەلەم لەسەر بابەتێك دەنوسین دوای چەند رۆژێك پەشیمان دەبینەوە ، بەتایبەت بابەتێك وەك ژیان و بەرهەمەکانی حاجی ، چۆن مامۆستا( مسعود محەمەد)دەلێت: لە هیچ گۆمێکدا بۆ تەختی بنی قول نەبۆتەوە ، لەتەنکاوی سەروی تێپەری نەکردووە (حاجی قادری کۆیی ل ٤٩ )" تا ئەمرۆش ئەم وێنانەی لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بلاّودەبنەوە پیاوێکی لەوچوی حاجی یە نەوەك حاجی ؟! وەك پەیکەرەکەی فلکەی حاجی لەشاری کۆیە دیارە ئەمەش حاجی خۆی نییە ، پیاوێکی گوندی ئۆمەرگومبەتی بەرەچەلەك گۆرقەرەجی لەو چووە ، جوانتر بچینە نێوباسەکە، هەریەك لە هونەرمەندان (زاهیر عەبدوللاّ ) و رۆژنامەنوس (رەهبەر سەید برایم ) یەکەمیان لەرۆژنامەی (بەدرخان ) دووەمیان لە رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) ،حاجی قادریان بە تیرەی دەربەندی کەیەکێکە لە تیرەکانی هۆزی شێخ بزێنی ناوبردووە، وە لە پەرتوکی (حاجی قادری کۆیی ) مامۆستا (مسعود محەمەد ) پشتی بەدەست نوسێك بەستووە کە خەلکی گۆرقەرەج بووە بەهەمان شێوە ئاماژە بەدەربەندێتی حاجی دەدات کە تیرەیەکە لە هۆزی شێخ بزێنی ، بۆیە لەبەرواری ١٩/١١/ ٢٠٠٠ سەردانی کەسایەتی ئاینی و بەتەمەنی وەك (مەلا سدیقی مەلا سالح (١٣٢١ کۆچی ١٢/٤/ ٢٠٠٣)ی گەرمك-م کرد، پرسیارم لە بنەچەی گۆرقەرەج — یەکان کردو لە وەلامدا وتی : لەخوار کەرکوك لەسەرەتادا بەشەر هاتوون و هەلاتوون بەرەو گۆرقەرەج و خانویان دروست کردووە، تەنها حاجی قادریان لێ هەلکەوتووە، لەم وەلامەدا، دەردەکەوێت لە شاری کەرکوك دا کەمەلیەندی هۆزی شێخ بزێنیە ، دەربەندیش یەکێکە لە هۆزی شێخ بزێنی ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کەوا حاجی قادر یەکێکە لەرۆلەکانی شێخ بزێنی ، لەبەر ئەوەی شێخ بزێنیەکان لەبنەرەتدا لەکوردستانی ئێرانەوە هاتون بۆیە دەربەندیەکانیش تیرەیەکن لە هۆزی شێخ بزێنی، کۆکن لەسەر ئەوەی کەلە (دەربەند شاهۆ) ی کوردستانی ئێرانەوە هاتوون ، هەروەها

مەلامیرزا عەزیزیش کە (جگیلە )یەکی بە بنەچە گۆرقەرەجی ــ یە دەیوت " لێمان پرسیوە خەلکی کوێ — یت ؟ ووتومە شێخ بزێنی ، ووتویانە بە شێخ بزێنی ناچیت ؟ منیش ووتومە " بەرەچەلەك حاجی قادرم لە خوارزای مەلا قادرم ،جگە لەمەش مەلا میرزا مەبەستی لە (مەلا قادر) مەلا قادری ڕەش — ە ، دەربەندی — یە و تیرەیەکە لە هۆزی شێخ بزێنی .
سەبارەت بەنازناوی (کۆیی )ش ئەم نازناوەی نەبووە تا نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم چونکە رۆژنامەی کوردستان لە ژمارە (٣) ی خۆیدا بەناوی (حاجی عەبدولقادر )بلاّوکردۆتەوە ، بەلام لەبەر گەورەیی و مەزنی و زێدەکەی کە گوندێکی ئەو کات و ئێستای وێرانەی سنوری ناحیەی تەقتەقی سەر بە کارگێری قەزای کۆیە یە ، ئێمەی خزمانی کۆیە ئەو زاراوە و نازناوەی دوای (حاجی قارد"کۆیی") مان بۆ زیاد کردووە بەمەش ناوی حاجی قادر بەم شێوەیەی ئەمرۆ ( حاجی قادری کۆیی ) لەدونیای ئەدەبی کوردییە.
لە لێکۆلینەوەکەی (د.عزەددین مستەفا رەسول ) دا دەربەندی بونی حاجی قادری کۆیی سەلمێندراوە، کە ئەویش تیرەیەکە لە هۆزی شێخ بزێنی.
حاجی قادر ناوی (عەبدولقادر کوری مەلا ئەحمەدی کوری مەلا سالّحی کوری مەلا ئەحمەدی گەورەی گۆرقەرەج )ە ، وە لەتیرەی (دەربەندی)یە کە تیرەیەکە لە هۆزی شێخ بزێنی لەسالی (١٢٠٠کۆچی ) لە گوندی گۆرقەرەج لەدایك بووە ، بەمندالی باوکی مردووە ، بۆ ئەوەی حاجی بە نەخوێندەواری نەمێنێتەو هێناویەتە شاری کۆیە لەوێی لەلای برازای خۆی کەناوی ( مەلا ئەحمەدی ئۆمەرگومبەتی)یە، لەمزگەوتی (موفتی ) لەبەر خوێندنی داناوە، تاپلەی بەرز بووە ئینجا لەگەلّ (مەلا عەبدوللاّی جەلیزادە )چووە بۆ مەملەکەتی (بالّەکایەتی ) لەگوندی ( شێخ وەتمان ) لەلای مەلا موحەمەدی کاك عەبدللاّ )ماوەیەك خوێندویەتی ئینجا لەوێوە چووە بۆ ئێران لە (مهاباد)خوێندنی تەواو کردووە، دوبارە گەراوەتەوە شاری (کۆیە )لەمزگەوتی گەورە لەگەل (مەلا عەبدوللاّی جەلیزادە ) زۆرخۆشی رابواردووە پاشان سەودای کوردایەتی لەکەللەی داوە ڕووی کردۆتە شاری (ئەستەنبۆل) لەوێ لای (بەدرخانیەکان) زۆرماوەتەوە و بۆتە مامۆستای کورەکانی بەدرخان پاشا هەر لەوێ بەردەوام بووە تاسالی ١٨٩٧ ی میلادی ئینجا لەوێ وەفاتی کردووە بەلگەش ئەوەیە لەسالی ١٨٩٨ی میلادی رۆژنامەی "کوردستان ، ژمارە (٣)" ناوی حاجی قادر لەلایەن مقداد لەو جەریدەیە لە (قاهیرە) نوسراوە دەلێت: یەکێك هەبوو ناوی حاجی قادر بوو، خەلکی سۆران بوو، شاعیرێکی گەلیك مەزن بوو، خودێ لەوی رازی بی پار مرد ".

ئەم شیعرەش بەلگەیە بۆ ئەوە حاجی خەلکی کۆیێ یە؟

ئۆمەرگومبەتی لەزەتی داتەپی

تەکەلتوی شکا ئەسپی ژینی حەیات

هەموو ئەو بەلگەو راستیانەش ئەو دەسەلمێنن کە (حاجی قادر ) نە کۆیی و نە هیچ عەشیرەتێکی ترە بەلکو تەنها دەربەندییە کە تیرەیەکە لە هۆزی شێخ بزێنی[1] .

**حاجی قادر لە کۆیە ژیاوە بەلام کۆیی نییە**

١. شاری کۆیە خاوەن قولایەکی شارستانی و مێژویی خۆیەتی لاپەرەکانی مێژووش باسی ئەو کەلە پیاوانەیان کردووە ، کە خەلکی شاری کۆیە بوون ئەسلّ وبنەچەیان دۆزراوەتەوە ، چونکە شاری کۆیە لە پێشەوەی شارەکانی کوردستان بووە ، لە خوێندن و خوێندەواری ، کەوایە بۆ هیچ نوسەرو روناکبیرێکی کۆیە ژیاننامەی حاجی قادریان نەخستۆتە سەر لاپەرەکانی مێژوو ، وە بە بەلگە بیان سەلماندایە کە حاجی کۆیی بووە ؟! بێگومان ئەگەر حاجی کۆیی بووە زۆر پێش ئیستا ژیاننامەی دەخرایە ڕوو بگرە لە ئیستاش زیاتر بایەخ بە حاجی و شیعرەکانی دەدرا .

٢. بەناوهێنانی زۆرجار کۆیە لە شیعرەکانی حاجی لە راستی دا بەلگەی دیکۆمێنتی نی یە بۆ کۆیی بوونی حاجی چونکە چەندین شاعیری تر هەن کەخەلکی کۆیە نین و لە شیعرەکانیان باسی کۆیەیان کردووە ، هەروەها شاعیری کۆیش هەیە هەرباسی کۆیەی نەکردووە، کەوابێ شاعیری کۆیی کەناوی کۆیەی نەهێناوە و شاعیری تر کەناوی کۆیەی هێناوە چون بتوانین بەپێی شیعرەکانیان زێدی نوێیان بۆ دروست بکەین .

٣. کێ شاهیدە و کێ بەلگەی هەیە کە حاجی شاعیر ئەو کاتەی لە کۆیە ژیاوە، نازناوی (کۆیی) هەلبژاردووە ؟ رای گونجاوتر هەیە کە دەلێ حاجی لە غوربەتدا نازناوی (کۆیی ) هەلبژاردووە چونکە کۆیە زۆر ناسراوتر بووە لە نازناوی گوندێك یان عەشیرەتێك بۆیە ئەگەر حاجی قاردی شاعیر نەیگوتبێ (حاجی قادری ئۆمەرگومەبتی یاخود حاجی قادری دەربەندی ) لەبەر ئەوە نەبووە خۆی بەخەلکی ئۆمەرگومبەت کە ناوچەیێکی شێخ بزێنیە و بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنین و خۆی بە عەشیرەتی دەربەندی کەتیرەیەکە لە هۆزی

[1] - لە ژمارە (٤)ی رۆژنامەی (تاك)ی سالّی یەکەمی نیسانی ٢٠٠٥ بلاّوکراوەتەوە.

شێخ بزێنی نەزانێ ؟! بەڵکو هۆکەی ئەوە بووە شاری کۆیە یان نازناوی (کۆیی) لە غوربەتدا ناسراوتربووە لە نازناوی گوندێك یان عەشیرەتێك، بۆ نموونە کەسێکی ئەستەنبولی دەشێ ناوی کۆیەی بیستبێ بەلام هەرگیز ناشێ ناوی گۆرقەرەج و ئۆمەر گومبەت و دەربەندی بیستبێ ، هۆی هەڵگرتنی ئەم نازناوی (کۆیی )یەش هەر ئەوەبووە .

٤. دەڵێن پرسیار ئەوەیە کە زۆر ناوی کۆیەی هێناوە و هیچ ناوی گۆرقەرەجی نەهێناوە، شاعیرانی تر وەك بێکەس و گۆران و پیرەمێرد و....تاد هیچیان ئەوەندە ناوی زێدی خۆیان نەهێناوە تاکو دایان شۆرین لە زێدی ڕەسەرنی خۆیان .

٥. ئەگەرحاجی قارد خەلکی کۆیە بوایە پەیکەرەکەی لەسەر وێنەی خزمێکی کۆیی بۆ دروست دەکرا، ئەوسا پێویستی نەدەکرد بچینە ئۆمەرگومبەت ژیاننامەی حاجی قادر لە حاجی موحەمەدی هەمەی ئۆمەرگومبەتی وەربگرن و هەر لەسەر شێوەی ئەو پەیکەرێکی بۆ دروست بکەن.



**هۆزی شێخ بزێنی لە سنووری عێراق:**

**گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی لە سنووری شاری هەولێر:**



**گوندی کەورگۆسك/ دیوەخانی حاجی مەحموود ئاغای شێخ بزێنی:**

حاجی مەحموود ئاغا کوڕی حاجی عەزیز ئاغایە، لە ساڵی (١٩١٤ز) کۆچی دوایی کردووە، پیاوێکی ئایین پەروەرو خواپەرست و مرۆڤ دۆست و دیار و ناسراوە، لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکانی خۆی هەمیشە سازو کۆك بووە، خاوەن تەلارو دیوەخانێکی گەورە بووە، دیوەخانەکەی شوێنی گردبوونەوەی خەلك و دالّدەدانی لـێـقەوماوان بووە، ناوبراو زەوییەکی کشتوکاڵی زۆری هەبووە، خاوەن سامان و گەنجینەو دارایی زۆر بووە، دوو ژنی هێناوە، شەش کوڕی هەبووە بەو ناوانە:( کەریم و مەلا حسین و عەبدولڕەحمان و کاکەمین و ڕەشید و یوسف)، ژنی یەکەم (مامز حاجی خدر)بووە کە (کەریم و مەلا حسین)ی، لەو هەبووە، ژنی دووەم ناوی (پیرۆزخان)ە، کە کچی شێخ محەمەد ئاغای سەرۆك هۆزی گەردی یە، کە ( عەبدولڕەحمان و کاکەمین و ردشید و یوسف)ی، لـێ بووە، ناوبراو صۆفی تەریقەتی نەقشبەندی بووە، لەگەڵ (شێخ ئەبوبەکر) باوکی (شێخ مستەفای نەقشبەندی) کە ناسراوە بە (شێخ غیاسەددین)؛ و شێخی (جن و انس) بووە، بە کەژاوە پێکەوە چوونەتە حەج[1]،

١- م. سەعد فاروق یوسف شێخ بزێنی، دیوانە شیعرییەکەم، چ١، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠١٢، ل٣٤.

دیوەخانی ناوبراو کە لە گوندی (کەورگۆسك) هەڵکەوتووە، دیوەخانێکی یەکجار گەورە بووە، زۆر خەڵکی هەژارو کەم دەرامەت و لـێ قەوماو ڕوویان تێ کردووە، ئەم دیوەخانە هەردەم پڕ بووە لە خەڵکی بێ چارەو ڕێبوارو کاروانچی، هەرگیز حاجی مەحموود ئاغاش درێغی نەکردووە لە یارمەتیدان و هاوکاری کردنی خەڵك، هەمیشە نان و نەسبابێکی زۆری پێداون و پێداویستیەکانی بۆ جێبەجێ کردوون، هەروا قەنارەی هەڵواسینی حەیوانی هەبووە کە ڕۆژانە حەیوانی کوشتۆتەوە بۆ مێوانان، جگە لەمانە هەموو کەرەستەو پێداویستیەکانی مێوانداری هەبووە لەم دیوەخانەدا لەوانە کە زیاتر لە (١٥٠) دۆشەکی جۆری زۆر نایاب و گرانبەهای هەبووە، وە زیاتر لە (١٥٠) لێفی گوڵاو بە دونگی هەبووە، وە زیاتر لە (١٥٠) بالیفی نایابی گرانبەهای هەبووە بۆ مێوانان، جگە لەمە شوێنی تایبەتی بۆ وڵاغ و ئاخووری مێوانەکانی هەبووە، جگە لەمە چەندین چاڵی گەنم و زەخیرەو دانەوێڵەی هەبووە، هەمیشە خزمەتی مێوانی کردووە و ڕێزی لێناون و ڕۆژانە نانی داوە بە مێوان، قاوە و چایە بە بەردەوامی لە دیوەخانەکەی گێڕدراوە، لە گرانیە گەورەکە (١٨٧٥ز) خەڵکێکی زۆر ڕووی لەم دیوەخانە کردووە بۆ یارمەتیدانیان، ناوبراویش کەسی بێبەش نەکردووە لە پێدانی پارەو پووڵ و دانەوێڵە، زۆر لە سەرۆك هۆزەکانی کورد لە ناوچەکە هانایان بۆ حاجی مەحموود ئاغا هێناوە لەکاتی لـێ قەوماندا ، هەروەها ناوبراو دەستبارگری زۆر هۆز و لایەنی تر بووە لە کاتی لـێ قەوماندا کە هانایان بۆ ئەو هێنا بێت.



یوسف اغای سەرۆك هۆزی شێخ بزێنی

**دیوەخانی یوسف ئاغای سەرۆك هۆزی شێخ بزێنی:** یوسف ئاغا کوڕی حاجی مەحمود ئاغا کوڕی حاجی عەزیز ئاغایە، لەساڵی (١٩١٤) لە گوندی (کەورگۆسك)ی سەر بە پارێزگای هەولێر لە بنەماڵەیەکی خانەدانی شێخ بزێنی لەدایك بووە، ناوبراو ئاغای گوندی کەورگوسك و سەرۆکی خێلی شێخ بزێنی بووە، کە هەردەم قۆناغ بووە بۆ ڕێبوارو لـێ قەوماوان، یوسف ئاغا مرۆڤێکی بالآبەرزی قەڵەوی سپی ڕەنگ بووە، عەباو کەوێ و سەڵتەی لەبەر کردووە وەکو نەریتێکی کۆنی خانەدان و پیاوماقووڵان و سەرۆك هۆزەکانی ئەو کات، زۆر ناندەر و سەخی تەبیعات بووە، هەر بۆیە دیوەخانی کەورگۆسك بە مەڵبەندی پیاوەتی و هەڵوێست و نان دان دادەنرێ لە هەموو بەرانەتی، پیاوێکی زۆر قسەزان و قسە خۆش بووە و چەندین زمانی زانیوەو، دیوەخانی هەردەم گەرم و گوڕ بووە، زۆر ئارەزووی لە یاری هەسپ سواری (ریسس) کردووە، وە لە زۆر بواری جیا جیا شارەزایی و دەست ڕەنگینی هەبووە، وەك لەبواری کشتوکاڵ و شینایی و مەڕو ماڵآت و قسەزانی و حیسابی سەرمای زستان و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی دیوەخان و ناندان و پیاوەتی و هەڵوێست و جوامێری و دادپەروەری و چارەسەرکردنی کێشەی کۆمەڵآیەتی و سەردان و بەسەرکردنەوە و گەلێك بواری تر، ناوبراو لە هۆزی شێخ بزینییە لە تیرەی خۆڵەزەردی یە، خوێندنی لای مەلاکانی ئەو کات دەست پێکردووە، بەهۆی ئەوەی کە ئەو بنەماڵەیە هەر لە کۆنەوە دیوەخانەکەیان جێگەی خوانی فەقیرو هەژاران و ڕێبوارو کاروان سەرای شاران و حاکم و کاربەدەستان و پیاو ماقووڵانی ئەو کات بووە، بۆیە وەکو قوتابخانەو ئامۆژگایەکی لـێ هاتووە بۆ چارەسەری کێشەی کۆمەڵآیەتی و ئابووری و سیاسی. .. هتد، خەلك زۆر ڕووی تێ کردووە، جگە لەمانە زۆر لە کەسایەتی سیاسی ئەوکات لەکاتی لـێ قەوماندا لای یوسف ئاغا خۆیان حەشارداوە لەوانە (حەمید عوسمان) کە سکرتێری حزبی شیوعی بوو،، زیاتر لە شەش مانگ یوسف ئاغا لای خۆی حەشاری داوە لە کەورگۆسك، عەونی یوسف و ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی و زۆر لە کەسایەتی سیاسی تریش هەر لە کەورگۆسك لای یوسف ئاغا خۆیان حەشارداوە، یوسف ئاغا لە ساڵی (١٩٣١) ژنی یەکەمی هێناوە و خێزانی پێکەوە ناوە، کە کچی جەمیل ئاغای گەردی بووە، دوو کوڕی هەبووە بەناوی ( محمد و احمد)، هەروەها لەساڵی (١٩٤١) ژنی دووەمی هێناوە کە کچی مەلا سادق بووە لەویش دوو کوڕی هەبووە بەناوی (مهدی و فوئاد)، هەروەها لە ساڵی (١٩٤٦) ژنی سێیەمی هێناوە کە ئەویش کچی حمدی قادر ئاغای گاینج بووە، کە لەویش تەنها یەك کوڕی هەبووە بە ناوی (فاروق)، ئێستا ئەم کوڕەی لە شوێنی یوسف ئاغا

دانیشتووەو سەرۆك هۆزی شێخ بزێنی یەو دیوەخانەکەی لە شاری هەولێرە، عەشیرەت و خەلك و ناسیاوان زۆر هاتووچۆی دەکەن، سەرپەرشتی هەموو شێخ بزێنییەکان دەکات لە هەموو لایەك، هەروەها یوسف ئاغا لە ساڵی (١٩٦٣) لە تەمەنی (٤٩) ساڵی گوندی کەورگۆسکی جێ هێشتووە و هاتۆتە ناو شار لە گەرەکی تەیراوە خانووی کردووە و نیشتەجێ بووە، یوسف ئاغا دۆستایەتی باشی هەبووە لەگەڵ مەلیکەکان و زۆر لە سەرۆك کۆمارەکانی عێراق و وەزیرو پارێزگارو کاربەدەستانی ئەوسای عێراق و سەرۆك مەزهەبەکانی شیعە و سەرۆك عەشیرەتەکانی عێراق و سەرۆك هۆزەکانی کورد لە کوردستاندا، زۆرێك لەوانە هاتووچۆی دیوەخانی کەورگۆسکیان کردووە، هەر پارێزگارێك هاتبێ بۆ هەولێر زۆر ڕێزی تایبەتی لە ناوبراو ناوەو سەردانی کردووە لە دیوەخانەکەی بەنموونە (ئیسماعیل حەقی) لە سەرەتای ساڵی (١٩٥٣) تا ساڵی (١٩٥٦) پارێزگار بووە لە هەولێر، زۆرجار لە ڕۆژی هەینی لە دیوەخانی کەورگۆسك مێوان بووە، کەورگۆسك قۆناغ بووە بۆ هەموو لێ قەوماوان، زۆر لە سەرۆك هۆزەکانی تر لەکاتی لێـقەوماوان هانایان بۆ کەورگۆسك هێناوە بۆ بەهاناوەچوونیان کە لە هەموو بارو زرووفێك وەکو دەست بارگرێك بۆ بەهاناچووان ڕاوەستاون لەهەموو ڕوویەکەوە، بەهۆی ئەوەی کە ناوبراو سەرۆك هۆزی شێخ بزێنی بووە و لە بنەماڵەیەکی خانەدان و ناسراو و دیاری شاری هەولێرە، بۆیە هاموشۆ و دۆستایەتی باشی هەبووە لەگەڵ گشت سەرۆك هۆزەکانی کوردستان و عێراق، بۆیە زۆر لە خەلکی دەست ڕۆیشتوو خانەدان و پیاوماقولان هاتووچۆی دیوەخانی کەورگۆسکیان کردووە، یوسف ئاغا زۆر وەفادار بووە بەرامبەر بە هاورێ و دۆستەکانی لە هەموو بارو زرووفێك دا، ئەم دیوەخانە وەك قوتابخانەیەك بووە لە هەستی پیاوەتی و جوامێری و مێرخاسی و ناندان، یوسف ئاغا بەهۆی ئەوەی کە لە بنەماڵەیەکی دیارو خاوەن پێگەو دیوەخان بووە، خەلك زۆر ڕووی تێ کردووە ، یوسف ئاغا لە بەرواری (١٨ / ١٢ / ١٩٧٧ز)دا لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی کەورگوسك[1] دا نێژراوە، دیوەخانی یوسف ئاغا، هەر لە کۆنەوە بەهۆی ئەوەی کە کەوتبووە سەر ڕێگای هاتووچۆی نێوان سۆران و بادینان، هەردەم پڕ بووە لە میوان و ڕێبوار و کاروانسەرا.

---

١ م. سەعد شێخ بزێنی، گەشتێك بۆ ناوچەی بەڕانەتی، گ: نەواڵەی نوێ، ژ: ٥٧، ساڵی پێنجەم، نیسانی ٢٠٠٨، ل٤٧.

یوسف ئاغای شێخ بزێنی دۆستێکی نزیکی وەصی مەلیك عەبدولئیلاه بووە، لە سەردەمی زەعیم عبدالکەیم قاسم بە فەرمی یەکێك بووە لە پێشوازیکەرانی مەلا مستەفای بارزانی لەکاتی هاتنەوەی بۆ عێراق، دۆستایەتی باشی هەبووە لەگەڵ (عبدالسلام عارف و عەبدولڕەحمان عارف و احمد حسن بەکر)، کە سەرۆك کۆماری عێراق بوون، جگە لەمانە دۆستایەتی باشی لەگەڵ خومەینی گەورە مەرجەعیەی ئایینی مەزهەبی شیعی لە نەجەف هەبووە، وە دۆستێکی نزیکی محسن عبدالحکیم و ئیمام خالصی و عبدالکریم زنجانی بووە، کە گەورە پیاوی مەزهەبی شیعی بووینە لە عێراق، کە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو یوسف ئاغای شێخ بزێنی لەگەڵ ئەم کەسایەتیانە ویستوویانە مەزهەبی شیعە و سوننە نەهێڵن و بیکەن بەیەك، تاوەکو کێشەو ناکۆکی لە نێوانیاندا ڕوونەدات.

**گوندی کەورگۆسك:**کەورگۆسك گوندێکە لەسەر ڕووباری بادینان لە باکووری خۆرئاوای قەزای خەبات هەڵکەوتووە، لەکۆتایی هەشتاکان کۆمەڵگایەك لە نزیك ئەم گوندە بەناوی کۆمەڵگای کەورگۆسك دروستکرا، ناوی ئەم گوندەش لە کەڤر (تاوێر،بەرد) + گۆسك (گۆسکە) هاتووە، لە کەندەلانێکی نزیك ئەم گوندە گۆسکەو جەرەو جۆرەها کەل و پەلی لە بەردو لە قوڕ دروستکراو بە بەردەوامی دەردەکەوێت، ناوی گوندەکەش لە ناوی ئەم تەلان یان کەندەلانە هاتووە، ئەم گوندەش هەر لە کۆنەوە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتەجێ بوونە، هەروەها خەندەکەکی تێدایە بە ناوی (خەندەکی بالول) کە تا ئەمڕۆ ئاسەواری ماوە، دەڵێن ئەم خەندەکە پڕۆژەیەکی ئاودێری سەردەمی خەلیفە هارونە ڕەشیدە، ئەوەی سەرپەرشتی ئەم پڕۆژەیەی کردووە ناوی مام خەلیفە دێوانە بووە، گۆڕەکەشی تا ئێستا ماوە[1]، گوندی کەورگۆسك دانیشتووانەکەی ئێستا نزیکەی (٢٥٠) ماڵ دەبێت، یەکێکە لە گوندەکانی بەڕانەتی، سەبارەت بە دێهاتەکانی بەڕانەتی کە هەردەم جووتیارەکانی ئەم گوندو دێهاتانە خەریکی کشتوکاڵ کردنن بە هەردوو جۆری ئاوی و دێمی، زەوی و زارێکی بە پیت و بەرەکەتی هەیە لەبارە بۆ کشتوکاڵ کردن بەتایبەتی (گەنم و جۆ)، بەشێوەیەکی یەکجار زۆر لەم گوندانە دەچێنرێت، پشت بە ئاوی باران دەبەستن، هەروەها بێستان و شینایی لەلایەن جووتیارانی ئەم گوندانە دەکرێت، بەهۆی ئاوی بیرەوە شینایی و بێستانەکانیان ئاو دەدەن،

١- عەباس سلێمان سمایل، مێژووی دەشتی هەولێر، ب١، لە بلاوکراوەکانی سەعدوڵلا شێخانی ژمارە (٦٧)، هەولێر، ٢٠٠٤، ل١٢١.

جگە لەمانە مەڕو مالآت و ئاژەڵێکی زۆر لەلایەن دانیشتووانی ئەم گوندانە بەخێودەکرێت، ئەم گوندە ئێستا بۆتە ناحیە سەر بە قەزای (خەبات)ی، پارێزگای هەولێرە، گوندەکە وا هەلکەوتووە کە زێ ی بادینانی بە قەراخ (ڕۆخ)دا دەڕوات، هەربۆیە بووەتە هۆی دروست بوونی کەش و هەوایەکی لەبار بۆ دانیشتووانی ئەم گوندە، گوندی کەورگۆسک گەلێ شوێنی دێرین و کۆن و ئەسەری تێدایە وەکو (خەرابە)، کە زۆر کەل و پەلی کۆن و دێرینی تێدا دیتراوەتەوە لەلایەن خەلکی ئەم گوندەوە، هەروەها هەر لەکۆنەوە ئەم گوندە مزگەوتی لێ بووە،حاجی محموود ئاغای شێخ بزێنی کە برا گەورەو ئاغای ئەم گوندە بووە زۆر گرنگی بە پیاوی ئاینی و زاناو مەلای دینی داوە یوسف ئاغای شێخ بزێنیش هەروەکو باوکی گرنگی زۆری بەم بوارە داوە، هەر بۆیە مەلا جبرائیل یەکێکە لەو پیاو چاك و لەخوا ترسانەی کە زۆر عەشقی خوا پەرستی بووە هەر لەو گوندە نیشتەجێ بووە، هەروەها یوسف ئاغا زۆر حەزی لە ڕاوکردن هەبووە لەوانە ڕاوە ماسی و مامزو کەو و پۆڕ...هتد، ئەم گوندە گۆڕستانەکی یەکجار گەورەی تێدایە، کە زێ ی بە قەراخ دا دەڕوات، زۆر لە پیاوی چاك و خواپەرست و ئەولیا لەم گۆڕستانە نێژراوە، هەروەها زۆر لە گوندەکانی دەوروبەری کەورگۆسك مردووەکانیان دەهێننە ناو گۆڕستانی کەورگۆسك دەینێژن، ئەم گۆڕستانە مێژوویەکی کۆن و دێرینی هەیە، یوسف ئاغای شێخ بزێنی و باب و باپیرو بنەماڵەکەی هەر لەم گۆڕستانە نێژراوە، هەروەها لەم گۆڕستانە (فەقێ مستەفا)ش نێژراوە، کە (٤٠) چل سەگی ڕاوی هەبووە و لە ناوچەکە کەسایەتییەکی دیارو بەرچاو بووە، ناوبراو کە دەکاتە مامی (حاجی عزیز) کە باپیرەی (یوسف ئاغای سەرۆك هۆزی شێخ بزێنی یە).



**شوێنی جوگرافی و ڕووبەری ناحیە کەورگۆسك:**

لە ڕووی جوگرافیەوە ناحیەکە دەکەوێتە سەر زێی گەورە ، دووری سەنتەری ناحیەکە لە شاری هەولێرەوە نزیکەی (٢٥کم)ە .دووری ناوەندی ناحیەی کەورگۆسك لە ناوەندی قەزا (١٨کم)[1] دەکەوێتە ڕۆژئاوای قەزای ناوەندی هەولێر، وە باکوری ناحیەی تۆبزاوەیە. وە باشوری ناحیەی دارەشەکران سەر بە(قەزای خەبات)ە، وە زێی گەورە سنوری ڕۆژئاوای ناحیەی کەورگۆسکە. ناحیەی کەورگۆسك یەکێکە لە ناحیەکانی سەر بە قەزای خەبات، قەزا پێك دێت لە ناحیەی (تۆبزاوە-کەورگۆسك-دارەشەکران-سەنتەری قەزا).قەزای خەباتیش سەر بە پارێزگای هەولێرە دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی (-٣٦ و٣٠- ٢٣و ٣٦)باکوری کەمەرەی زەوی ،هێلی درێژی (٤٣و٧٣- ٨٩ و٤٣) ڕۆژهەلاتی هێلی گرینیچ، ڕووبەری گشتی ناحیەی کەورگۆسك دەگاتە نزیکەی (١٢٦,٣کم$^2$) ،وە ڕووبەری قەزای خەباتیش بەگشتی (٥٢٨کم$^2$)[2] ،بەم شێوەیە ڕووبەری کەورگۆسك بە گشتی ڕووبەری قەزاکە تەنیا (٢١,٧ ٪).

**ناسینی ناوچەی لێکۆلینەوە:**

پارێزگای هەلێر پێك دێت لە حەوت (٧)قەزا، قەزای خەبات یەك لەقەزاکانە وە ناوچەی لێکۆلینەوە سەر بە قەزای خەبات پێك دێت لەکۆمەلگای زۆرەملێ ،کە لەسالی ١٩٨٩ حکومەتی بەعس بەزۆرەملێ خەلکی ناوچەکانی (تورەق-مەلاقەرە-کەرکوکی-ناوچەی شوان و شێخ بزێنی – دوزخورماتو –قەلآدزێ).ڕاپێچی ئەم ناوچەیە کردووە.سەرەتا تەنها گوندی (شیوەرەش-کەورگۆسك)هەبوو .ئەم دوو گوندەش وورده وورده خەریك بوو لە ناو دەچوون بەلام دواتر سەر لە نوێ بونیات نراونەتەوە و ئاوەدان کراونەتەوە .بەرە بەرە ژمارەی دانیشتوان ڕوو لە زیاد بوون بوو خەلکێکی زۆر ڕووی لەم ناوچەیە کردوو تێدا نیشتەجێبوون تا لە ٢٠٠١/٥/٢٦ یەکەم سەرۆکی شارەوانی دانرا بۆ بەرێوەبەرایەتی شارەوانی ناحیەی کەورگۆسك هەروەها لە سالی ٢٠٠٨ بە بریاری وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ کاروباری ناوخۆ ژمارە (٦٦١٠) لە ٢٠٠٨/٥/١٩ کەورگۆسك کرا بە ناحیە

---

[1] - پرۆفایلی ناحیەکان ،وەزارەتی پلان دانان ،بەرێوەبەرایەتی زانیاری و نەخشە سازی /هەولێر ، ٢٠٠٨ ڕاپۆرتی بلآونەکراوە

[2] -چاوپێکەوتن لەگەل بەرێز بەرێوبەری ناحیەی کەورگەسك ،٢٠١١/١١/٢٢

سەر بە قەزای خەبات[1] کە لە ١٦ گوند پێك هاتووە کە ئەمانەن:١-کەورگۆسك ٢-مامەلۆك٣- افراز کەمال ٤-افراز میران ٥-افراز حاجی ابراهیم ٦-ئاغولانی گەورە ٧-ئاغولانی گچکە ٨-شیوەرەشی کۆن ٩-شیوەرەشی هەرکی١٠-شیوەرەشی دیوان ١١-گاینجی سەروو ١٢-گاینجی خواروو ١٣-سمایلاوە ١٤-دەربەند ١٥-خرابەدراو ١٦-گردە شێرە[2]. هۆکاری زیادبوونی ژمارەی دانشیتوان لەم کۆمەلگایە لەم سالەی دوایدا بەهۆی هەلکەوتنی شوێنەکەی کە دەکەوێتە سەر هێلّی سنووری سێ شاری گرنگی کوردستان ئەویش(هەولێر و موصل و دهۆك ) کە زۆر لە شارۆچکە و لادێکان بەیەکەوە دەبستێتەوە.وە پێدانی پێشینەی خانوو بەرە بە خەلك ، وە لە رووی ئەمنیەوە ناوچەیەکی ئارامە . بوونی عەمبارگەی نەوت لەم ناوچەیەدا کە کرێکارێکی زۆر کاری لێدەکەن زۆربەی کرێکارەکانی بەمەبەستی دابینکردنی بژێوی ژانیان لەم ناوچەیە نیشتە جێ بووینە .

**- ناوی کەورگۆسك:**

لێکۆلینەوەیەکی شوێنەواری سەرەتایی لەرێکەوتی (١٩٤٥/٥/١٤)کراوە ئەم لێکۆلینەوە دەری خستووە ناوی شوێنەکە (خرابە کەورگۆسك) هیچ ناوێکی تری نییە. ناوەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەو گوندەی کە لە باشووری رۆژئاوای دا هەیە بە دووری (٥٠٠ کم) ئەم گوندە گردێکی لێیە زەوی گردەکە و زەویەکانی دەوروبەری ئەو کات مولکی کەسێك بوو بەناوی (یوسف ئاغای شێخ بزێنی) کە براگەورەو ئاغای ئەم گوندەبووە، وە سەرۆکی هۆزی شێخ بزێنی بووە، پیاوێکی ناودار و ناندەر و چاوتێر بووە ، هەروەها لە باکووری گردەکە گوندی (شیوەرەش)هەیە بەدوری (٤کم). لە رۆژئاوای زێی گەورە هەیە بە بەرزیان (٣٠٠م) وە لە باشوور رێگای ئۆتۆمبێل هەیە (گوندی گاینج-کەورگۆسك) ئەم رێگایە رێگایەکی تایبەتی ئەم دوو گوندەیە .

**باسی شوێنەکە:-** پێك هاتووە لە گردێکی گەورە بەرزاییەکی کەمی هەیە لە نێوان (٤-٥)م لە سەرەوە رووبارێکی فراوانی هەیە . لە سەر رووی پارچە گۆزەیەك دۆزراوەتەوە .کە

[1] - حوکمەتی هەرێمی کوردستان ،وەزەراتی ناوخۆ ،پارێزگای هەولێر ،ژمارە (٧٨٩٩)لە ٢٠٠٨/٤/٣٠.

[2] - وەزارەتی شارەوانی گەشت و گوزار ،بەرێوەبەرایەتی گشتی شارەوانیەکانی هەولێر ،سەرۆکایەتی شارەوانی کەورگۆسك.

دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاشووریەکان[1] بە وتەی ئەو کەسانەی کە گوێ بیست بووین بە تایبەتی خەڵکی ناوچەکە لەگەڵ موختاری گوندی (کەورگۆسك) لەگەڵ سەرۆکی شارەوانی ناحیەی (کەورگۆسك) . ناوی کەورگۆسك لەوەهاتووە لەم ناوچەیە گردێك هەیە و گۆزەیەکی لەسەر بووە (کەور) بە مانای بەرزایی دێ (گۆسك) بە مانای گۆزە دێ. زەوی چوار دەوری گردەکە کێڵدراوە و کشتوکاڵی لێکراوە لە سەر ڕووی گردەکە هیچ هەڵکۆڵین بەدی نەکراوە کە بەڵگە بێ لەسەر ئەنجامدانی هەڵکۆڵینی شوێنەواری ئەم گردە. هیچ وێنەیەکی فۆتۆگرافی لێنەگیراوە.بە ئاسانی ئۆتۆمبێل دەیگەیێنێ جگە لە ڕۆژانی باراناوی نەبێ . لیژنەی دوانزەی ڕێکخستنی مافی زەویەکانی هەولێر هەڵساوە بە ئەنجامدانی دەرخستن بەهۆی پێویستی دانانی لەسەر نەخشە و دڵنیابوونی لە شوێنەواربوونی گردەکە، ئەم پشکنینە لە لایەنی بەڕێوبەرایەتی شوێنەواری عێراقی لەلایەن (معاویە رسام) ئەنجامدراوە[2]



شیخ محمد رشید اغا شێخ بزێنی



محمد یوسف اغا شێخ بزێنی

**دارستان:** بەیەکێ لە سەرچاوەکانی سامانی سروشتی دادەنرێت کە گرنگی هەیە لە ژیانی مرۆڤ و ئەم گرنگیەی زیاد دەکات لەگەل زیادبوونی پێداویستی مرۆڤ و پێشکەوتنی زانستی و شارستانی . لە دارستان یەکەیەکی ژیانی تەواوە لە ڕووبارێکی دیاری کراوی زەوی کە

[1]- بەرێوبەرایەتی شارەوانی هەولێر ،بەشی کاروباری شوێنەوار ،زانیاری بلاْو نەکراوە، لە ٢٠١٢/٢/١٢ .

[2]- بەرێوبەرایەتی شوێنەواری هەولێر ،سەرچاوەی پێشوو .

ئاووهەوای چریەکی دیاریکراوی هەیە و بنچینەی کۆبوونەوەی رووەکی یە کە پێکهاتووە لە دار و درەخت و گژوگیا . وە لە ناوچەی لێکۆلینەوە ئێستا دارستان بەدی ناکرێت هەندێ خەلك داریان چاندووە بەلام بە رووبەرێکی وا فراوان نیە کە پیّ ی بوترێ دارستان[1] . بەلام لە کۆندا گوندی کەورگۆسك لە سەردەمی حاجی محمود ئاغا کە دەکاتە (باوکی یوسف ئاغای سەرۆکی هۆزی شێخ بزێنی ) هەمووی چەم بووە پڕ بووە لە دارستان ئەم گوندە، بەلام بە درێژایی مێژوو بەرە بەرە ئەم دارستان و چەمە کەم بۆتەوە تا دواتر وای لێهاتووە کە هەر هیچ دارێکی تیا نەماوە .

**دانیشتوانی ناحیەی کەورگۆسك:**

گەشەکردنی دانیشتوان: ژمارەی دانیشتوانی ناوچەی لێکۆلینەوە بە گوێرەی سەرژمێری و خەملادن لە گەشەکردندایە ، هەروەها لە خشتەی خوارەوە بە دیاردەکەوێت

| گەشەی سالآنە بە % | ژمارەی دانیشتوان | ساڵ |
|---|---|---|
| | ١٤٠٠٥ | ٢٠٠٨ |
| ٥,٠١ | ١٤٧٠٦ | ٢٠٠٩ |
| ٥ | ١٥٤٤٢ | ٢٠١٠ |
| ٤,٩٩ | ١٦٢١٣ | ٢٠١١ |
| ٥ | تێکرای | |

**سەرچاوە/** پشت بەستنی توێژەر بە سەر ژمێری مەزندە کراوی ،وەزارەتی پلان دانان . دەستەی ئاماری هەرێم، بەشی ئاماری دانشتوان و هێزی کار .

لە سالی (٢٠٠٨) ژمارەی دانیشتوان گەیشتۆتە (١٤٠٠٥) کەس وە لە ساڵی (٢٠٠٩) ژمارەی دانیشتوان گەیشتۆتە (١٤٧٠٦) کەس بەرێژەی (٠١، ٥ %) زیاد کردووە .

[1] - چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێز (تەها عەولا حسین) رابەری کشتوکالی یەکەم ، خەبات ، لە ٢٠١١/٣/٦ .

هۆکاری ئەم زیاد بوونە بەم ڕێژە زۆرە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکی ناوچەی لێکۆڵینەوە لە شار وایکردووە کۆچکردن بۆ ئەم ناوچەیە هەبێت واتای ئەو کەسانەی کە ناتوانن لە شارەکان بژێوی ژیان دابین بکەن ئەوە کۆچ دەکەن بۆ ناوچەکانی دەوروبەر، هەروەها بوونی پیشەسازی لە ناوچەکە وە گەشەکردنی لایەنی ئابووری بۆتە هۆی زیادبوونی ڕێژەی لە دایك بوون و کەم بوونەوەی مردن . هەروەها لەساڵی (٢٠١٠) ژمارەی دانیشتوان گەیشتۆتە (١٥٤٤٢) کەس بەڕێژەی (٥٪) زیادی کردووە . وە لە ساڵی (٢٠١١) ژمارەی دانیشیوان گەیشتۆتە (١٦٢١٣) کەس بە ڕێژەی (٤,٩٩٪) زیادی کردووە، ژمارەی دانیشتوانی ناحیەکە وەکو هەموو بەشەکانی هەرێمی کوردستان لە زیاد بوون دایە .

**-پێکهاتەی نەتەوەیی و ئایینی:**

بیر و باوەر گاریگەری زۆری لەسەر ژیانی دانیشتوانی هەر ناوچەیەك هەیە ، ئەم کاریگەرییەش لە پەیوەندی کۆمەلایەتی و چالاکی ئابووری و جۆری هەڵسوکەوت ڕەنگ دەداتەوە ، ناوچەی لێکۆڵینەوە لە رووی پێکهاتەی ئایینەوە لە (١٠٠٪) دانیشتوانی ناوچەکە موسلمانن وە نزیکەی (٨) مزگەوتی لێیە کە دابەش بوونە بەسەر سەنتەری ناحیە و گوندەکانی . وە لە رووی پێکهاتەی نەتەوەییەوە لە (١٠٠٪) دانیشتوانی ناوچەکە کوردن . هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دانیشتوانی ناوچەکە پەیرەوی هیچ ئاینێکی تریان نەکردووە تەنیا ئاینی ئیسلام نەبێت وە هیچ نەتەوەی تر تێکەڵ بە دانیشتوانی ناوچەکە نەبووینە[١] .

[١] - پرۆفایلی ناحیەکان، وەزارەتی پلان دانان، دەستەی ئاماری هەرێم، بەشی زانیاری و نەخشەسازی هەولێر ، ٢٠٠٨ .



احمد یوسف اغا شێخ بزێنی



اسماعیل رشید اغا شێخ بزێنی



مهدی یوسف اغا شێخ بزێنی



سعید رشید اغا شێخ بزێنی



فوئاد یوسف اغا شێخ بزێنی

**- لایەنی ڕێگا و بان:**

نەبوونی ڕێگاوبان یەکێکە لە کێشە سەرەکیەکانی نشینگە مرۆییەکان چونکە پسپۆڕانی ڕێگاوبان بە شادەماری ژیان دادەنێن وە هۆیەکی پەیوەندی گواستنەوەیە لە نێوان گوند و ناحیە و شارەکان هەر بۆیە ناوچەی لێکۆڵینەوە بێ بەش نییە لەم کێشەیە بەشێوەیەکی گشتی، وە گوندەکانی ئەم ناوچەیە کێشەی ڕێگا و بانی هەیە بۆ نموونە لە کاتی چوونم بۆ گوندی کەورگۆسك بینیم ڕێگا و بانی ناو گوندەکە نارێك و پێکی زۆری تێدا دیار بوو هەروەها ڕێگاکانی ناوچە پیشەسازیەکانی چاڵ و چەمانەوەی زۆری تێدابوو تا دەگەیشتە سەر ڕێگای سەرەکی، بەشێوەیەکی لاوەکیش سەنتەری قەزا و ناحیەکانیش تارادەیەك بێ بەش نین لە گرفت چونکە تۆڕی هاتووچۆی ناو نشینگەکان زۆر نارێکە بەشێوەیەك کە چەندین بەرزی و

نزمی بەخۆیەوە دەبینێ ئەمەش وا دەکات هاتووچۆ لەم جۆرە ڕێگایانە ناخۆش بێت بەتایبەتی لەوەرزی باران بارین .

**١-ڕێگای سەرەکی:** ڕێگای (عەنکاوە – افراز) ڕێگایەکی سەرەکی ناوچەی لێکۆلینەوەیە ئەم ڕێگایە بە بربرەی پشتی گواستنەوە دادەنرێت کە ڕۆژانە چەندین کرداری گرنکی بازرگانی تیادا ئەنجام دەدرێت هەروەها ڕۆژانە چەندین ئۆتۆمبێلی بارهەڵگری نەوت و بەنزینی پیایدا تێپەر دەبێ کە کاریان کردۆتە سەر دروست بوونی بەرزی و نزمی لە هەندێ ناوچەی ڕێگاکە، درێژی ئەم ڕێگایە لە سنووری ناوچەی لێکۆلینەوە تاکو دەگاتە پارێزگای هەولێر دەگاتە (٣٠,٥ کم) ، هەروەك لەخشتەی خوارەوە بەدیار دەکەوێت .

**٢-ڕێگای لاوەکی:** ئەم ڕێگایانە کە لە ڕێگا سەرەکیەکان دەبنەوە، ناوچەی لێکۆلینەوە چوار ڕێگای لاوەکی هەیە ئەوانیش وەك(خەبات – کەورگۆسك) بەدرێژایی (١١کم) کە درێژترین ڕێگای ناوچەکەیە، وە ڕێگای گوندی (خرابەدراوە – قەلاچۆغان ) بەدرێژایی (٤,٣ کم) ، لە ٢٠٠٧/١١/٢١ دەست پێکرا تاکو ٢٠٠٨/٣/١٣ کۆتای پێهات، وە ڕێگای گوندی (شیوەرەشی هەرکی) بەدرێژایی (٢,٥کم) کە لە ٢٠١٠/٨/٥ دەست بە دروست کردنی ئەم ڕێگایە کرا تاکو ٢٠١١/٣/٢٣ کۆتایی پێهات، وە ڕێگای گوندی (سمایلاوە) بە درێژایی (٥,٤٧٩کم) کە لە ٢٠١٠/٨/٥ دەست بە دروست کردنی ئەم ڕێگایە کرا تاکو ٢٠١١/٥/٢٥ کۆتایی پێهات. وەك لە خشتەی خوارەوە بەدیار دەکەوێ.

درێژی و جۆری ڕێگاکان لە ناحیەی کەورگۆسك (٢٠١١)

| جۆری ڕێگا | درێژی ڕێگا | ناوی ڕێگا |
|---|---|---|
| سەرەکی قیرتاوکراو | ٢٠,٥ | ١- عەنکاوە – افراز |
| سەرەکی قیرتاوکراو | ١١ | ٢ – خەبات – کەورگۆسك |
| سەرەکی قیرتاوکراو | ٤,٣ | ٣- خرابە دراو – قەل چۆغان |
| سەرەکی قیرتاوکراو | ٢,٥ | ٤- شیوەرەشی هەرکی |
| سەرەکی قیرتاوکراو | ٥,٤ | ٥- سمایلاوە |

| | | |
|---|---|---|
| سەرەکی قیرتاوکراو | ١,٧ | ٦- کەورگۆسك — ماملۆك |
| سەرەکی قیرتاوکراو | ٣,٦ | ٧- سیدان — ماملۆك — کەورگۆسك |
| خۆڵ | ١,٥ | ٨- شیوەرەش |
| خۆڵ | ٢,٩ | ٩- ئاغۆلان |
| خۆڵ | ٠,١ | ١٠- خرابە دراو |
| خۆڵ | ١,٢٥ | ١١- گاینچی سەروو |
| خۆڵ | ٠,٢ | ١٢- ئاغۆلانی هەرکی |

– **لایەنی گەشت و گوزار:** ناوچەی گەشت و گوزاریەکان لە ناوچەی لێکۆلینەوە بریتین لە :

١- زێی گەورە

٢- مەزارگەی ئەصحابە رەش

**یەکەم/ زێی گەورە:** دەکەوێتە بەشی رۆژئاوای ناوچەی لێکۆلینەوە، واتە سنووری رۆژئاوا پێك دەهێنێ، بەدرێژایی (١٢کم) لە ناوچەکە کە گەشتیاران ڕوو تێدەکەن لە وەرزی بەهار و هاویندا بە مەبەستی کات بەسەر بردن و مەلەوانی کردن و راوە ماسی.

**دووەم / مەزارگەی ئەصحابە ڕەش:** مەرقەد و مەزارگەکان یەکێکن لەو شوێنانەی کە بەناوچەی گەشتیاری دەژمێردرێت چونکە خەلك هەمیشە سەردانیان دەکەن بە مەبەستی دوعا و پارانەوە ، مەزارگەی ئەصابە ڕەش کە یەکێکە لە ناوچە گەشتیارەکانی ناوچەی لێکۆلینەوە کە خەلکێکی زۆر رۆژانی چوارشەمە سەردانی دەکەن، لەرووی شوێنی جوگرافیەوە (دەکەوێتە رۆژئاوای ناحیەی کەورگۆسك کە باکووری مەزارگەکە گوندی شیوەرەشی کۆنە وە لە رۆژهەلاتی سەنتەری ناحیەکەیە وە لە بەشی باشووری گوندی ئاغۆلانی گەورەیە و بەشی رۆژئاوایی گوندی (گەورگۆسك)ە ئەم پیاوە چاکە ناوی راستەقینەی (میقداد اسود الکندی)ە، لەبەر ئەوەی ئەم ناوەی لێ نراوە چونکە رەنگی پێستی رەش بووە.

مێژووی ژیانی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) درێژی قەبرەکەی نزیکەی (٧)مەترە، مەزارگەکە خزمەتگوزاری پێویستی بۆ نەچووە کە ببێتە هۆکاری ئەوەی زیاتر سەردانی کردنی گەشتیاران وەکو ڕێگاوبان و ڕێکخستنی ناوچەکە، بەلام ئەوەی بینیم خەلکی خێرخواز مزگەوتێکی بچووك و بیرێکی ئاویان دروست کردبوو لەنزیك مەزارگەکە بۆ ئەوەی خەلکی سوودی لێ وەرگرن ، لەم ناوچەیەدا دوو پاسەوانی لێ یە بۆ خزمەت کردن و پاراستنی ئەم مەزارگەیە.

**- لایەنی ئاینی :**



دیوەخانی یوسف ئاغای هۆزی شێخ بزێنی
لە کەورگۆسك ئێستا مزگەوتە

خزمەتگوزاری ئاین و دام و دەزگا ئاینییەکان لەناوچەی لێکۆلینەوە خۆی دەبینێتەوە لە (دروست کردنی مزگەوت) کە ژمارەی مزگەوتەکانی (٢٤) مزگەوتە کە (٨) مزگەوت دەکەوێتە سەنتەری ناحیە و(١٦) مزگەوتیش دەکەوێتە گوندەکانی دەوروبەر ، بەلام هیچ جۆرە پەرستگا و کلێسەی تایبەت بە ئاینەکانی تر بەدی ناکرێت چونکە ئاینی ئیسلام تاکە ئاینی دانیشتوانی ناوچەکەیە.

**- گۆرستان :** ئەو شوێنەیە کە مردووی لێ دەنێژرێ ، شار نییە گۆرستانی لێ نەبێ لەوانەیە لەشارێك زیاتر لە گۆرستانێك هەبێت. لە ناوچەی لێکۆلینەوە وەکو هەر ناوچەیەکی تری ئاوەدانی و شوێنی نیشتەجێ بوونی مرۆڤ بەدەر نییە لە بوونی گۆرستان کە (٢) گۆرستان هەیە لە ناحیەکە ، یەکێکیان دەکەوێتە نێوان گوندی مامەلۆك و گوندی کەورگۆسك، ئەویتریان دەکەوێتە سەر ڕێگای سەرەکی بە دووری (٢کم) لە ناحیەی کەورگۆسك .

لە ناو گوندی (کەورگۆسك)یش تەنیا یەك گۆرستانی گەورە هەیە کە مردووەکانی ئەم گوندە و گوندەکانی دەوروبەری (کەورگۆسك)یش دەهێننە ئەو گۆرستانە دەینێژن، بەهۆی ئەوەی مردوویەکی یەکجار زۆری لێ نێژراوە .





- **کەمپی کەورگۆسك:** ئەم کەمپە لە ساڵی (٢٠١٣) بۆ کوردانی ئاوارەبووی ڕۆژئاوای کوردستان واتە کوردانی ولاتی سوریا لە کۆمەڵگای کەورگۆسك دروست کراوە، کە نزیکەی (١٥٠٠٠) پانزە هەزار کەس لە کوردانی سوریا تێیدا جێگیر کراوە، کە لە بەرواری(٢٠١٣/٨/٢٢)ەوە، لەم ناوچەیە نیشتەجێ کراون، کۆمەڵگای کەورگۆسك سەر بە ناحیەی (کەورگۆسك)ە، سەر بە قەزای خەبات لە پارێزگای هەولێر، هەروەها بەڕێز مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان سەردانی ئەم کەمپەی کردووە لە ساڵی (٢٠١٣)، هەر

لەو ساڵە (بانکی مۆن) سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانی جیهان سەردانی کەمپی کەورگۆسکی کردووە .



مشیر ئاغا قادر ئاغا شێخ بزێنی

**گاینج :** ئەم گوندە دەکەوێتە سنووری ناحیەی کەورگۆسك سەر بە قەزای خەبات لە پارێزگای هەولێر، گاینج گوندێکە لەبەرانەتی زۆربەی دانیشتوانی لە هۆزی شیخ بزێنینە، ناوی ئەم گوندە لە گەنج هاتووە لەبەر ئەوەی خاکێکی بەپیتی هەیە، دانیشتوانەکەی بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و کاسبکارییە لە ناوچەکەدا، هەروەها مەلا صادق یەکێکە لەو پیاو چاك و زانا ئاینییەی کە هەر لەو گوندە نیشتەجێ بووە، هەروەها قادر ئاغا و مشیر ئاغا و حەمەد ئاغا و عومەر ئاغا کەسایەتی دیارو ناوداری گوندەکە بووینە .

***قەزای خەبات:** قەزای خەبات دەکەوێتە ڕۆژئاوای هەولێر لەسەر ڕێگای هەولێر - موسل بە دووری (٣٧) کم لە شاری هەولێرەوە. هەروەها دەروازەی بەیەکەوە بەستنی هەردوو شاری موسڵ و دهۆکە بە پارێزگای هەولێر. قەزای خەبات دەکەوێتە سەر زێی گەورە بەناوچەیەکی کشتوکاڵی گرنگ و گەشتیاری ناسراوە لەبەر ئەوەی گەورەترین پرۆژەی ئاودێری هەیەو ناوچەیەکی دارستانی بەرفروانی لێ یەو سوودی گەشتیاری هەیە. ڕووبەری گشتی قەزای خەبات ( ٢٧٥١٣٧ ) دۆنمەو دەکاتە (٦٨٧) کم٢. جیا لە سەنتەری قەزا

( ٣ ) ناحیە بەناوەکانی ( ڕزگاری- کەورگۆسك - دارەشەکران) و ( ٣ ) کۆمەڵگەو (٦٤) گوندی هەیە. ژمارەی تێکرای دانیشتوانی قەزا (٩٤٣٠٧) و ژمارەی دانیشتوانی سەنتەری قەزا (٢٨٤٦٢ ) کەسە. پاش بەقەزاکردنی خەبات دامودەزگای حکوومی لێیەو پێداویستی سەرەکی بۆ ئەو قەزایە دابینکردووە که سیمای شارستانی بەناوچەکە بەخشیووە. لە رووی فەلەکییەوە : ـ خەبات کەوتووەتە نێوان هەردوو هێلی درێژی (٤٥/٣٥) پلە - ( ٠٧ /٤٤ ) پلەی رۆژهەلاتی گۆی زەوی، نێوان هەردووبازنەی پانی (٣٦/٠٨) پلە - (٣٦/٣٣) باکووری گۆی زەوی. *دوابەدوای رێکەوتنامەی ( ١١ )ی ئاداری سالی ١٩٧٠ هەنجیرۆك وەك سەنتەری ناحیە دەست نیشانکرا ناحیەکە ناوی لێنرا (خەبات ). لە هەمان کاتدا کۆمەڵگەی هەنجیرۆك لە تەنیشت گوندی هەنجیرۆك دروست کراوە کە پێشتر تەنیا گووند بووە. ئەو قەزایە پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینییوە. لە رووی چری دانیشتوان و پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری گشتیەکان کە چەندین گەرەك بەناوەکانی (هەنجیرۆك، ئاشتی ١، ئاشتی ٢، ڕزگاری ، کانی مام سنج ، کۆمەڵگەی ئیداری، کشتوکاڵ ، باستام ، سەروەران )

* لە سنوورەکەدا چەندین پرۆژەی ئابووری پێشەسازی گرنگ هەن کە لە ئاستی پایتەخت و هەرێمی کوردستان سوودی لێ وەردەگیرێ وەك پاڵاوتگەی نەوت، پرۆژەی ئاوی ئیفراز کە ئاو بۆ بەشێکی زۆری هاولاتیانی پارێزگای هەولێر دابین دەکات. کارگەکانی ( ئاسن وکۆلاو - عەمباری نەوت - کارگەی شیرنەمەنی. پردی کۆنی خەبات کەوتووەتە سەر زێی گەورە کە خەبات بە ناحیەی کەلەك دەبەستێتەوەو مێژووی دروستکردنی دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی دەسەلاتی عوسمانی. دواتر لەسەردەمی ئینگلیز گۆمپانیا هیندیەکان نۆژەنیان کردووەتەوە کە لەرووی بیناسازیەوە سیمایەکی مێژووی بە دروستکردنییەوە دیارە.دارستانی خەبات لە سالی پەنجایەکان دروستکراوە کە زیاتر لە ( ٤٠٠ ) دۆنم زەوی بە دارستانی چر داپۆشیووەو ئێستا وەك ناوچەیەکی گەشتیاری سوودی لێ وەردەگیرێت.

**ناحیەکان و گوندەکان:** قەزای خەبات لە سێ ناحیە و ٦٤ گوند پێکهاتووە: ناحیەکان: ڕزگاری – کەورگۆسك – دارەشەکران)

- **شارۆچکەی خەبات (قەزای خەبات) :**

ئەم قەزایە سەر بە پارێزگای هەولێرە، زیاتر لە (٤٥) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەو قەزایە نیشتەجێ بوونە، دانیشتووانی ئەم قەزایە بەشێکیان فەرمانبەری میرین و بەشێکیشیان خەریکی کاسبکارین لەم قەزایە دا.

- **گوندی مەلا عومەر:**

ئەم گوندە سەر بە قەزای خەباتە لە پارێزگای هەولێر، نزیکەی (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، بژێوی دانیشتووانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و کاسبکارییە لەو گوندەدا.

**گوندی شاخۆلان :**

ئەم گوندە چەند ماڵی شێخ بزێنی لێ یە لەوانە ماڵی (عزیزتورکان )کە عەسافیان هەبووە، ئێستاش غارەك لەوێ هەیە ناوی (عەساف) ە ، هەروەها ماڵی (عەلی ابراهم )لە شاخۆلان بوون، ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی دارەشەکران سەر بە قەزای خەباتە لە شاری هەولێر.

**گوندی گۆپاڵ :**

ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی دارەشەکران سەر بە قەزای خەباتە لەشاری هەولێر، ئەم گوندە نزیکەی (٢٠)ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لێ نیشتەجێ بووە کە لە پێشووتردا لە گوندی چەمە ڕا هاتوون لەوێ نیشتەجێ بوونە، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕوماڵات و کاسبکاریە لەم گوندەدا.

**وەچەکانی هۆزی شێخ بزێنی مەلا ئەحمەدی گەورە:**

وەچەکانی هۆزی شێخ بزێنی پاش جەنگی چالدێران شەڕی نێوان سوڵتانی سەلیم و شا ئیسماعیل سەفەوی لەسالانی (١٦٠٠ز) بە دواوە لە ناوچەی (قصرشیرین) ەوە کە دەکاتە کوردستانی ئێران لە وێوە گواستراونەتەوە بۆ باکوری کوردستان واتە ولاتی تورکیا ئێستا لە دەوروبەری شاری ئەنقەرەو هەیمانەو قۆنیاو ئەرزەرۆم و دیاربەکر و ماردین و ئەو ناوچانە کە بەشێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی گواستراونەتەوە بۆ ئەو ناوچانە دواتر بە هۆی زوڵم و زۆری عوسمانیەکان نەوەکانی مەلا ئەحمەدی گەورە هاتوتە باشوری کوردستان بەتایبەت سنووری

شاری هەولێر لە گوندی کەورگۆسك و دەوروبەری نیشتەجێ بووە لە گەڵ دووکوڕی بە ناوی محمود ئاغاو حسن ئاغا لە گوندی کەورگۆسك و دەوروبەری و کەلەك و موصل و ئەو ناوچانە نیشتەجێ بوونە ، هەروەها دوو کوڕەکەی تری نیشتەجێ بوونە لە سنووری شاری کەرکوك و دەوروبەری لە ناحیەی شوان و ئاغجەلەر و کۆیەو تەقتەق و پردێ و ئەو ناوچانە نیشتەجێ بوونە ، ئێستاش وەچەکانیان لەو ناوچانە نیشتەجێن .

- **تۆبزاوە:** سەبارەت بە ناوی تۆبزاوەو دروست بوونی ئەوا چەند ڕای جیاواز هەیە، بەجۆرێ ڕای یەکەم دەڵێت تۆبزاوە سەنتەری ناحیەی رزگاری ئەم گوندە لەسالی (١٩٤٥) دامەزراوە، ناوی تۆبزاوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەم گوندە لەکاتی خۆی ئاوی نەبووە (بێ ئاو بووە) وە خەلکی ناوچەکە بە تۆبزی یان بە خورتی ئاویان بۆ ڕاکێشاوە بۆیە ناویان لێ ناوە گوندی تۆب زاوە، ڕایەکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە کە دەڵێن وشەی تۆبزاوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کاتێك ڕژێمی بەعس لە ساڵی (١٩٨٨) کۆمەلگای زۆرەملێ ی دروست کرد لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان، وە کۆمەلگای تۆبزاوەش کە ئێستاکە سەنتەری ناحیەی رزگارییە یەکێکە لەو کۆمەلگایانەی کە خەلکی بەزۆری یاخود بە زۆرەملێ تێدا نیشتەجێ کردووە بۆیە ناویان لێناوە تۆبزاوە، کە بەشێك لە دانیشتوانی ئەم کۆمەلگا زۆرەملێ یە لە هۆزی شێخ بزێنی یە.
وشەی تۆبزاوەش وشەیەکی داڕێژراوە لە وشەی تۆبز: واتا بەزۆری، (ئاوا)ش پاشگرە، بە واتای بەتۆبزی یان بەخورتی ئاوەدان کراوەتەوە.
ناحیەی رزگاری سەر بە قەزای خەبات و لە (١٥) گوند پێك هاتوە ، ڕێژەی دانیشتوانی (٢٤٠٠٠) کەسە .

**مێژووی ناحیەی رزگاری:**

لە نێوان سالانی (١٩٨٧ – ١٩٨٨ ) لە ئەنجامی تێکدانی گوندەکانی کوردستان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە ، کە بەشێکی هەرەزۆری گوند و ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی بوو، کە هەموویان ڕاگوێزران بۆ سنوری ناوچەکانی تۆبزاوە ، بۆیە بەشێکی گەورەی ئەو شالاوی ڕاگواستنە بەر بنەمالەکانی هۆزی شێخ بزێنی کەوت، بۆیە بە فەرمانی ئەنجومەنی وەزیران ژمارە (٢٣٧١) لە بەرواری (١١ /١٠ /٢٠٠٤ ) بریار درا بەکردنەوەی ناحیەی رزگاری سەر بە قەزای خەبات وە ناوەندەکەی لە کۆمەلگای (تۆبزاوە) دەبێت ، سنوری ناحیەکە پێك هاتووە لە چوار کۆمەلگاو پانزە گوند ، زۆربەی دانیشتوانی ناحیەکە لە کۆمەلگای تۆبزاوە

نیشتەجێن، نزیکەی (۲٤۰۰۰) کەسن مێژووی دروست بونی ئەم کۆمەڵگایە دەگەڕێتەوە بۆساڵی (۱۹۸۷) کەوا ڕژێمی ئەوکاتە لە نزیك گوندی (تۆبزاوە) ئەم کۆمەڵگایەی دامەزراندو بەناوی ئەو گوندە ناوی نا کە لە شاڵاوی تێك دان و ڕاگوێزانی خەڵکی دەڤەری سیدەکان و قەلادزێ و خەڵکی دەڤەری مەخموورو کەندێناوە و گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی لە ئاغجەلەر و تەق تەق و چەندین ناوچەی ترو هەندێك لە خەڵکی سنوری شوان و شێخ بزێنی سەر بە پارێزگای کەرکوك ڕاگوێزی ئەم کۆمەڵگا زۆرە ملێیە کراون، کە بەشێکی هەرە زۆری ئەم شاڵاوی ڕاگواستنە بەر بنەماڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی کەوت.

لە رابردوو ئەم شوێنەی ئێستا گوندی (تۆبزاوە) لەسەر بنیات نراوە (کۆنە هەوار) بووە . بەڵام نازانرێت مێژووەکەی بۆ کەی دەگەڕێتەوە، بەڵام ئاوەدان کردنەوەی ئەم گوندە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (۱۹٤٥) لەلایەن خاوەن مولکی ئەم ناوچەیە ، ئەمەش لەلایەن کۆچی چەند بنەماڵەیەکی دەشتی هەولێر و گوندی گرد مەلا وە بۆ کاولە تۆبزاوە کە هۆکاری ئەم کۆچەش خراپی باری ئابووری بوو ، دیارە پێش دروست کردنی خانوو بۆ ماوەی ساڵێك لەم کۆنە هەوارە ژیانیان گوزەراندووە لە حەسار و ژێر رەشماڵ ، پاشان دەستیان کردووە بە خانوو دروست کردن .

روبەری گشتی زەوری کشتوکاڵی گوندی تۆبزاوە (۷۹۱۳) دۆنمە ، شوێنی هەڵکەوتەی جوگرافی ئەم گوندە کەوتۆتە نێوان رێگای سەرەکی ( هەولێر – موصل ) واتا رۆژهەلاتی زێی گەورە .

**ڕووبەری سنوری ناحیەی رزگاری:** ڕووبەری تەواوی سنووری ناحیەی رزگاری پێك هاتووە لە (۹۱۹۵۰) دۆنم زەوی بە پێکهاتەی چوار کۆمەڵگاو پانزە گوند ، ئەم ڕووبەرەش دەکاتە (٥۰۰, ۸۷۰, ۲۲۹ ) مەتر دووجا واتا (۲۳۰)کیلۆمەتر دووجا، بەشێك لەم ڕووبەرە کراوەتە (شوێنی نیشتە جێبوون ) بۆ کۆمەڵگاکان و حەرەمی گوندەکان، بەشەکەی تر بەکار دەهێندرێت بۆ مەبەستی کشتوکاڵی بەتایبەت گەنم و جۆ و بەرهەمەکانی تری کشتوکاڵی ، هەروەها بەشێك لە بنەماڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی هەر لە کۆنەوە نیشتەجێبونە لەم ناحیەداو بەشێکی تریش لە هۆزی شێخ بزێنی بەهۆی ڕاگواستن و ئەنفال و وێرانکردنی گوند و ناوچە و زادگاکانیان ڕاگوێزران بۆ ناحیەی رزگاری لەوێ نیشتەجێ کراون کە تاکو ئیستاش هەنێك لەو بنەماڵانەی هۆزی شێخ بزێنی هەر لەم ناوچەیە ماون بۆتە زادگاو مەسکەنیان .

**جوگرافیای ناحیەی رزگاری:** لە باکوور کەوتۆتە نێوان بەری گوندی گاینج و گوندی ئاغۆلان، کە هەردوو گوند زۆربەی دانیشتوانەکەیان لە هۆزی شێخ بزێنینە .

لە باشووری کەوتۆتە بەری گوندی (چالوکی گەورە ) ئەم گوندەش هۆزی شێخ بزێنی تێدایە .

لە رۆژهەلات لەبەری گوندی (جدیدە زاب )ە، ئەم گوندەش بەشێك لە بنەمالەی هۆزی شێخ بزێنی تیدایە .

لە رۆژئاواشی لەبەری گوندی (گردەرەش زاب )ە ، کە بەشێخ لە بنەمالەی هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە.

ڕووبەری زەوی ناحیەی رزگاری .

| شوێن | ڕووبەری زەوی |
|---|---|
| تۆبزاوە | ٧٩١٣ دۆنم |
| جدیدە زاب | ٨٠٥٢ دۆنم |
| کانی قرژالە | ٩٠٣٧ دۆنم |
| سێبیران | ٢٢٢٠٠ دۆنم |
| گردەرەشە | ٥٤٣٤ دۆنم |
| چالوکی بچووك | ٩٣٠٥ دۆنم |
| چالوکی گەورە | ٨٧٣٨ دۆنم |
| کەورەبەن | ٨١٤٦ دۆنم |
| ساتوور | ٩٣٤٤ دۆنم |
| قەریەتاغ | ٣٧٧٨ دۆنم |

بەشێکی زۆر لە خانەوادە و بنەمالەکانی هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێی بوونە لە هەریەك لەم گوند و ناوچانە (تۆبزاوە – جدیدە زاب – کانی قرژالە – گردەڕەشە – چالوکی بچووك – قەریەتاغ ).

ناحیەی رزگاری (تۆبزاوە) لەسەرەتادا گوندی تۆبزاوە بووە کە مێژووی دروست بوونی دیار نییە، لە سالّی (١٩٧٨) تێکدراوە لەلایەن رژێمی پێشوو دواتر لە سالی (١٩٨٨)

کۆمەڵگایەکی زۆرەملێ ی لێ دروست کراوە بە هەمان ناوەوە واتە (کۆمەڵگای تۆبزاوە)، وە دانیشتوانە زۆرەملێیەکە پێك هتبوون لە هۆزی (شیخ بزێنی- شوان-برادۆست-قەلادزەیی- هەرکی و خەلکانی تر)، لەساڵی (٢٠٠٠) شارەوانی لە سەنتەری ناحیە دامەزراوە، لە ساڵی (٢٠٠٤) ناسرا بە ناحیەی رزگاری.

ناحیەی رزگاری پێکهاتووە لە چوار کۆمەڵگا کە ئەمانەن: (کۆمەڵگای تۆبزاوە کە سەنتەری ناحیەکەیە، جدیدە زاب، سێبیران، کانی قرژالە)، وە هەر کۆمەڵگایەك لە چەند گوندێك پێك دێت:

| کۆمەڵگا | ناو و ژمارەی گوندەکان |
|---|---|
| رزگاری(تۆبزاوە) | (٥)گوند:(چالوکی گەورە،چالوکی بچووك،تۆبزاوە، گردەڕەشە، کەورەبەن) |
| جدیدە زاب | (١) گوند |
| سێبیران | (٣) گوند:(سێبیرانی گەورە، سێبیرانی بچووگ، قەلاتکە) |
| کانی قرژالە | (٦)گوند: (کانی قرژالە، قەریەتاغ، قەریەتاغ هەرکی، سەردەشت، کونە سیخورە، ساتور)، هەریەك لە ناوچەکانی: (تۆبزاوە، گردەڕەشە، جدیدە زاب، کانی قرژالە، قەریەتاغ) هەندێك لە دانیشتوانەکانیان لە هۆزی شێخ بزێنیە. |

**- گوندی چالووکی بچووك :**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی تۆبزاوەیە، سەر بە قەزای خەبات لە پارێزگای هەولێر، زیاتر لە (١٥) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو مالات و کاسبکارییە.

**بایەخدان بە کەلتوور ئەرکێکی نەتەوایەتییە:**

ئەمرۆ باشترین خزمەت بە هەرێمی کوردستان بەرزکردنەوەی ئابوورییەکەیەتی لە رێگای کارگە دروستکردن و پرۆژەی هەمەجۆری خزمەت گوزاری ، تەواوکاری ئەمەش لە رۆژگاری ئەمرۆی هەرێم، بایەخدان بە کەلتوورە، چونکە کەلتوورە، ناسنامەی گەلە، گەلیش لە رێگای کەلتوورەوە لە رابردووی خۆی دەگات و بە هۆیەوە بەرەو پێش دەچێت و بە توێژینەوەی

کەلتووری دەتوانرێ لایەنە باشەکانی گەش بکرێتەوەو لەگەڵ ڕۆژگاری ئەمڕۆ بگونجێنرێت و شارستانیەتی پێ بەرز بکرێتەوە ، هەروەها لە ڕێگای کەلتورەوە دەتوانین خۆمان بە گەلان بناسێنین، کە گەلێکی خاوەن هەست و هزری خۆمانین ، سەرەڕای ئەوەی بایەخدان بە کەلتوور لە پەڕارەو ناکۆکی دوورمان دەخاتەوە ، ئەگەر بەردەوام بین لە چالاکی کردنەوەی پێشانگای فۆلکلۆری و ئاهەنگ گێرانی میللی ، کەلتوریش هەموو بوارەکانی زمان و ڕۆشنبیرو کەلەپوورو ئەدەب و مێژوو...هتد دەگرێتەوە. دەشتوانین بڵێین کەلتوور میراتێکی کەلەکەبووی هەزاران ساڵی لە مەو بەرە، پشت بە پشت پێمان گەیشتووەو پێویستیشە ئێمە بە نەوەکانی داهاتوو بگەیەنین ، کەواتە کەلتووری ئەمڕۆمان بریتییە لەو ڕۆشنبیرییەی کە هەیتمان . لە قۆناخی یەکەم یا دەستپێك پێویستە تۆمار بکرێت و بلاوبکرێتەوەو ئامادە بکرێت بۆ قۆناخی دووەم بۆلێکۆڵینەوە لە تێکستەکانی ، ئەمەش بە کردنەوەی لقی بەڕێوەبەرایەتی کەلتووری میللی دەبێت لە هەموو شارو شارۆچکەکانی یا بەکردنەوەی کۆمەڵەی کەلتوور دۆستان لە هەموو شارو شارۆچکەکان، ئەوا دەتوانرێت لە ماوەیەکی کورت کەلتوورێکی زۆری گەلەکەمان کۆبکەینەوەو لە لەناوچوون رزگاریان بکەین، هەڵبەتە ئەم کارەش سەرەڕای ئەوەی وەك بەڵگەنامەیەك دەبێتە پاڵپشت بۆ سەلماندنی ئەو ناوچە کوردییانەی کە بەعەرەب کراون ، دەبێتە سەرچاوەیەکی بایەخداریش کەدەتوانرێت لە بواری ئەدەب، فۆلکلۆر، مێژوو.. زمان..هتد سوودی لێ ببینرێت. جا هەڵمەتی کۆکردنەوەی کەلتووریش دەبێت بە زووترین کات ئەنجام بدرێت، ئەوا دەتوانرێت کەلتوری ئەم دووسەد ساڵەی دوایی کۆبکرێتەوەو تۆمار بکرێت ، بەتایبەتی ئەو ناوچانەی کەتا ئەمڕۆ کەس هەوڵی تۆمارکردنی نەداوە وەك قەزای شنگار، ناوچەی شەبەك ، ناوچەی گەرگەریان و ئەو گوندانەی کەکورد وتورکمان تێکەڵن لەدەوروبەری شارۆچکەی تەلەعفەر، جا ئەگەر ئەم هەڵمەتە ئەنجام نەدرێت و بەساڵاچووە هۆشیارەکانمان دەمرن و ئەو خەزینە گەورەیەش لە ناو دەچێت، واتە بە دەستی خۆمان کەلتووری خۆمان لەناو دەبەین ، دوژمنانیش ئەگەر بیانەوێت گەلێك لەناوبەرن و لەبۆتەی ڕەگەزی گەلی دەسەلات دار بیتوێننەوە، ئەوا هەول دەدەن کەلتوورەکەی لەناو بەرن و هەموو داب و نەریتێکی نەتەوایەتی لێ قەدەغە دەکەن پاشان بەخۆرتی و لە ڕێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەرە بەرە کەلتووری گەلی باڵا دەست دەخزێنێتەوە هزری گەلە ژێر دەستەکە.

نموونەشمان حکومەتانی بەعسی عێراق و سوریا و ئێران و تورکیایە و بە کاول کردنی گوندان ویستیان کەلتووری کوردان لە ناو بەرن.

ئەمڕۆکەش ئێمە کەوتوینەتە نێو دوو هزرەوە:

١-کەلتووری نەتەوایەتی کە ڕۆشنبیری ئەمڕۆمانە.

٢-شارستانی نوێ و بە جیهانی کردنە ، واتە کەوتوینەتە نێوان هزری تایبەتمەند بە گەلەکەمان و هزری بە جیهانی کردن کە کۆمپیتەرو ئەنتەرنێت و بیری نوێ دەگرێتەوە، جا بایەخدان بە کەلتوورو توێژینەوەی ئەرکی سەرشانی وەزارەتی ڕۆشنبیرییەو دەبێ بە پێی پێویستی سەردەم هەلس و کەوتی لەگەل بە جیهانی کردن و شارستانییەتی نوێ لە نێو هەموو گەلانی پێشکەوتووی جیهانی بنکەو کۆمەڵەی بایەخدان بە کەلتوور هەیەو بەردەوام پێشانگا دەکەنەوە و خولی تایبەت بە کەلتور دەکەنەوە وەك: دروستکردنی کەرەستە میللییەکان و سەرەڕای ئەوەی ئەرکی کۆکردنەوەو توێژینەوەی کەلتوریش دەخەنە ئەستۆی پسپۆران، لە هەریەك لەم دەزگایانەش کتێبخانەیەکی گەورە هەیە ڕۆژنامەو گۆڤاری هەمەجۆری دەگاتێ ، ئێمەش لە هەولێر ماڵی شەرەفخانمان هەیە، کە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی (هەرێمی کوردستان)یشی ناگاتێ، یەك لە هۆیە هەرە گرنگەکانی ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ساسانی نەبوونی ڕێنووس و زمانی ستانداربوو لە کۆمەڵگای سەردەمی ساسانییەکاندا خوێندن تەنیا لەدەست پیاوانی ئاینی (هێربەدو موغ و موبەدەکان) دابوو، بۆ نموونە لە کتێبێکی ئایینی زەردەشتیاندا بەناوی (سەد دەر)بە موبەدان و هێربەدانی زەردەشتی رادەسپێرێ(هەموو کەس شایەنی فێربوونی پەهلەوی نییە).

پیاوانی ئاینیش بێجگە لە کاروباری ئاینی و کتێبەکانی زەردەشتی کە بە ڕێنووسی ئاڤێستاو زمانێکی قورس نوسرابوونەوە، خۆیان بە هیچ بابەتێکی کەلتووری خەریك نەدەکرد کەسی دیکەش بێجگە لە موبەدو هێربەدان واتای کتێبەکانی زەردەشت تێ نەدەگەیشتن و سوودیان لێ نەدەبینی تا بەم دواییەش لە ناو ئێزیدیان خوێندەواری تەنها بۆ پیاوانی ئایینی بوو، ئەو کاتیش زمانی پەهلەوی کە تەنها (٢٥) پیتیان بۆ دانابوو و هەر پیتەی تەمسیلی چەند دەنگێکی دەکردو دەبووە هۆی ئاستەنگ بۆ خوێندنەوە ، بۆیە زیاتر ڕێنووسی ئارامیان بۆ زمانی پەهلەوی بەکاردەهێنا ، ئەویش بە تەواوی لەگەڵ دەنگەکانی زمانی پەهلەوی نەدەگونجا.

جا ئیمپراتۆریەتێك لە ئاستی خوێندەواری و ڕۆشنبیری ئاوا بێت چۆن دەتوانێت پێش بکەوێت هەر هەندەی زانی کەوتە بەر پەلاماری گەلێکی خاوەن ڕێنووس و زمانی ستاندارو لە ناکاو لە ناوی برد، ئەمڕۆش کورد هەلێکی زێرینی بۆ هەڵکەوتووە بۆدروستکردنی زمانی ستاندارو

ڕێنووسی سەردەم و کۆکردنەوەی کەلتووررو بایەخ پێدانی ، هەڵبەتە کەلتوور –یش زیاتر لە سنگی لادێ ییان پاراستوە، جا پێویستە بەزووترین کات بە ساڵاچووە هۆشیارەکان بەسەر بکەینەوە وهەرچی دەیزانن لە کەلتوور لێیان وەربگرین و تۆماریان بکەین، بەسەرکردنەوەی گوندەکانی کوردستان–یش سەرچاوەن بۆ کۆکردنەوەی کەلتوری ئەم دەشتە، کە تا ئەمرۆ کارێکی وای بۆ نەکراوە، ئێمەش لێرەدا تەنها لایەنی کۆکردنەوەی ئەو کەلتورەمان خستۆتە ئەستۆو بە پێی توانا هەر جارەی هەندێك بەساڵاچووی گوندەکانی کوردستان بەسەر دەکەینەوەو هۆی ناولێنانی گوندەکان و چەند وردە زانیارییێکی دیکەی کەلتوور تۆمار دەکەین بەو هیوایەی سوودی خۆی بگەیەنێت.

*کوردستان بەر لە هەموو ولاّتانی جیهان شۆڕشی کشتوکاڵی تیا ڕوودا وە بووەتە بناغەی پێشکەوتن لە مێژووی مرۆڤایەتی. لەم شۆڕشە بناغەی گەشەکردنی مرۆڤ و شارو دەوڵەت و پیشەو بازرگانی و وێژەو هونەرو کەلتوری دروست کرد ،هەروەها ڕێگای بۆ دانیشتوانی کوردستان خۆشکرد کە کۆمەڵگای سەرەتایی بە جێ بهێڵن و کۆمەڵگای چینایەتی پێك بهێنن و دەوڵەت هەزاران ساڵ پێش گەلانی دیکە دابمەزرێنن . بەلاّم دوای ئەوەی ئەم کۆمەڵگایە بە دەستی هۆزێکی قەرەجی هیندی، بەناوی ئەخمینی، لە نێو دەچێت (زمانی ئەم هۆزە لە نێو زمانی میدی دەتوێتەوە پاشانیش بە زمانی عەرەبی کاری تێکراو ئەمرۆش بە ناوی جوگرافی هەرێمەکە واتە پارس یا فارس ناسراون.

ئینجا گلۆرەی کورد بەرەو لێژی دەروات و پەیوەندی نێوان هۆزو تیرەکان هەڵدەوەشێتەوە ، دوای ئەخمینیەکانیش تا سەردەمی ئەمڕۆ بەردەوام کوردستان داگیر دەکرێ و کورد دەکوژرێ و زیندانی دەکرێ و دەر بە دەر دەکرێ هەندێکیش خۆ بە لای دوژمنان دا دەشکێنێتەوە، جا بە درێژایی مێژوو تیرەی کورد لێرەو لەوێ لە بۆتەی ڕەگەزی عەرەب، تورك، فارس، ئاشوری، ئەرمەن، خۆ دەتاوێننەوە لە ژێر سۆزی ئاین یا دەسەلاّت لە ڕەگەزی نەتەوەکەیان ئاوگەلەدەبن، نموونەشمان هۆزی (بەرزیجان)ە، دەبێتە بەرزنجی و شێخ بزێنی یە دەبێتە (شێخ زین)ی جبوری و سارەیی یە دەبێتە سالحی، و (خالدی - کالدی )یە دەبێتە خالیدی و خۆ بە نەوەی (خالدی کوڕی وەلید ) دەزانن .

مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی لە کتێبەکەی بە ناوی چوار دەوڵەتی کورد دەڵێت : نەخۆشی خۆهەڵواسین لە هەموو خۆرهەلاّتی ناوەندا درمێکی سەیر بووە، هەندێ خۆیان بردۆتەوە سەرکەیان، ساسان، قوڕەیشی، هاشمی، عەبباس، عومەری ،بەرمەکی .. تا دوایی ،

هەموویان ئەم کارەیان هەر بۆ ئەوە کردووە لەم نازناوانە سود وەرگرن و خۆیان بۆ خزمەتی خاوەن دەسەلاَت ببەنە پێشەوە .. هەیە بۆ خۆشەویستکردن لە لای شیعە ، ئەمڕۆ ملیۆنەها کەس پەڕۆیەکی کەسکی بەسەرەوە بەستووەو خۆی لێ کردووین بە ئەولادی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم).

ئیتر بەم جۆرە لە ئەنجامی داگیرکردنی کوردستان و نەمانی کیانی نەتەوە، زۆر ناوچەی کوردستان شێوەو روخساری نەتەوایەتی گۆراوەو زۆر تیرەو هۆزیشمان لێ دابراوە، جا بۆ دۆزینەوەی ڕیشەی هۆزو ناوی جوگرافی پێویستە پەنا بەرینە بەر مێژووی کۆن و لێکۆڵینەوەی زمانەوانی.

جا بەم جۆرە ژمارەیەکی زۆر لە هۆزو تیرەی کورد سۆزی ئاینی یا بەهۆی بەرژەوەندییەکانیان بەردەوام بووینە لە گێڕانەوەی رەگەزیان بۆ سەر رەگەزی گەلانی داگیرکاری کوردستان و بە کارێکی باش و پیرۆزیان زانیوە، دوور نەڕۆین ژمارەیەك لەدەستەی فەرمانڕەوای ئیمارەتەکان خۆیان بردۆتەوە سەر ڕەگەزی عەرەب و زمانی عەرەبیشیان کردۆتە زمانی ڕەسمی ئیماراتەکان، نموونەشمان بەدرخانیەکانە.

**شەمامك:**

مەرکەزی ئەم خاکە شارۆچکەی (گوێر)ە ، دەڵێن کاتی خۆی گوندەکانی ئەم دەشتە دەروێشێکی دەوڵەمەندو پیاو چاك خاوەنی بووە، کاتێ ژنی دەروێش کۆچی دوایی دەکات ، دەچێتە خوازبێنی کچێك بە ناوی (شەمام) ، دەروێش پێی دەڵێ ئەگەر شوم پێ بکەی ئەوا زەوی وزاری هەموو گوندەکانت لە قەبەل دەکەم واتە بە ناوی تۆیان تۆمار دەکەم، شەمامیش رازی دەبێت و کارەکە جێ بە جێ دەبێ، هەندێك لەو بڕوایەدان شەمامك لە شا مولك هاتووە، بەشێك لە بنەماڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ بوونە لەو ناوچەیە.

**هەوێرە:**

گوندی هەوێرە نزیك بە گوندی شەمشولەو گعێتل هەڵکەوتووە ئەو گوندەی هەوێرە لە دوو بڕگە پێکهاتووە : هەو(هەتاو) + ێر(جێگا، مەڵبەند) = مەڵبەندی هەتاو پەرستن، پیتی (ە) پاشگرە.

دووریش نییە لە هۆر هاتبێت، چونکە زەوی‌و زاری ئەم گوندە زەرامییە و ئاوی لێ کۆدەبێتەوە، هەواری کاولە گوندێکیش بە ناوی غەرابەی مەعروف لە نزیک ئەم گوندەیە، مێژووی ئاوەدان بوون و کاول بوونی ئەم غەرابەیە دیار نییە، زیاتر لە (٢٥) بیست ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، کەسایەتی شێخ بزێنی لەو ناوچەکە بەرێز(مام ابراهیم)ە.

**بنەسلاوە:**

ناوی گوندێکە نزیک شاری هەولێر دوای ساڵانی (١٩٨٧) رژێمی پێشوی عێراق کۆمەڵگایەکی زۆرە ملێی لێ دروست کرد بۆ ئەو کوردانەی کە لە کەرکوك و ناوچەکانی دەوروبەری و پاشماوەی ئەنفالەکان راپگواستن بۆ ئەو کۆمەڵگایە کە بەشی هەرە زۆری ئەم راگواستنە ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی گرتەوە لە کەرکوك و دەوروبەری. ناوی بنەسلاوە لە ناوی مەسیحیەك بە ناوی (بنی صلێوە)هاتووە.

دەڵێن کاتی خۆی ئیسلام و مەسیحی تیا نیشتەجێ بووە و هەریەکە پەرستگەی خۆیان هەبووە، لە بەرئەوەی ئیسلامەکان زۆرترو بە دەسەڵات تر بووینە کەنیسەی مەسیحیەکان دەڕووخێننوو، مە سیحیەکانیش لای (سولتان موزەفەرەدین) سکاڵای خۆیان دەردەبڕن و دوای ئەوەی (١٠٠) درهەمی ئەو کاتیش دەدەن بە کاربەدەستان، بڕیاری چاککردنەوەی کەنیسەکەیان وەردەگرن، بەڵام لەبەر ئەوەی بەردەوام کێشەو ناخۆشی لە نێوانیان زیاد دەبێ، بۆیە مەسیحیەکان بنەسلاوە بەجێ دەهێڵن، ئەم ناوچەیە لە سالی (١٩٩٧) بووە ناحیە پاشان بەهۆی فراوانبوونی ناوچەکە و زیادبوونی ژمارەی دانیشتووانی بە بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ژمارە(٣٧٢) لە رێکەوتی (٢٠٠٢/٤/٢) ناحیەی بنەسلاوە بووە قەزای دەشتی هەولێر کە هەرسێ ناحیەی قوشتەپە و کەسنەزان و دارەتوو و (٥٩) گوند لەخۆ دەگرێت.

**گردمڕەشەی گەورە:**

گوندێکی نزیك بە شاری هەولێرە لە سەر رێگای کەرکوك، گردێکی تیایەو، گۆڕی پیاوێکی بەناوی شێخ ڕەش تێدایە.

کاتێ خۆی بنەماڵەیەکی (سارەیی) لە دۆڵی سارەیی لە کەرکوك لەم گوندە نیشتەجێ دەبن، پاشان هۆزی کەڵهوڕ لەم گوندەیان دەردەکەن، ئەمڕۆکەش بەشی زۆری گوندەکە (کەڵهوڕ-ئۆمەربل)ن، چەند هۆزێکی تریشی تێدایە وەك سورچی، شێخ بزێنی، بۆلی.

**پۆڕیجە:**

کاتێ خۆی بەردەوام ئاوی پێدا دەهات و (پۆڕ)یش زۆر دەبینرا لە سەر ئەم ئاوە، بۆیە ئەم گوندە بە پۆڕیجە ناوی دەرکرد.

ئاوەکە ئەوەندە زۆربووە، هەموو خەڵکی گوندی برنجیان لەبەر کردیە، بەڵام ئاوەکە لە مێژە هیشکی کردیە .

کاتێ خۆی پیاوێکی جاف بەناوی نەبی لە گوندی (تەلان)ی سەر بە پارێزگای سلێمانی لەگەڵ حاجی یابەی (بابان) ئەم گوندە ئاوەدان دەکەنەوە .

ئەمڕۆکەش ئەم هۆزانەی تیایە: مامە سێنی، کەڵهوڕ، شوان، شێخ بزێنی، زراری، هورمزیار.

گوند و شارو شارۆچکەکانی کوردستان هەر لە دێر زەمانەوە خاوەنی کتێبخانە و دەستنووسی جۆراوجۆر بووینە، بۆیە لە هەر کێشەیەکی ئاینی یا سیاسی هەوڵدراوە پەرستگاکان وێران بکرێت و کتێب و دەستنووسەکانیش بسوتێنرێت یا دەستی بەسەردا بگیرێت، بۆئەوەی زمان و ئاینی تازە بەسەر گەلی کوردا دا بسەپێنرێت و ئاسەواری کوفر بە زووترین کات نەمێنێت..

نموونەشمان ئەسکەندەری مەکدۆنیە کە لە ساڵی (٣٣٠ پ.ز) کوردستانی داگیر کردو هەزاران گوندو هەزاران پەرستگای وێران کردو ژمارەیەکی ئێجگار زۆر کیتاب و دەست نووسی لە ناو بردو کە ئاڤێستا یەك لەم کتێبانە بوو.

دوای یۆنانییەکانیش، کوردستان دەکەوێتە بەر پەلاماری سوپای عەرەبی و ناوچەیەکی زۆر وێران دەکرێت، کتێبخانەکانیش دەستی بەسەردا دەگیرێت و دوای ئەوەی هەندێك لە کتێبەکان وەردەگێڕنە سەر زمانی عەرەبی یا سوودیان لێ دەبینرێت وەك: هەزارو یەك شەوەو کلیلەو دمنە، پاشان دەیان سووتێنن، جا تا ساڵانی پەنجای ئەم چاخەش لێرەو لەوێ دەستنووسی پەهلەوی دەدۆزرایەوە، بەڵام داگیرکەرانی کوردستان دەستیان بەسەردا دەگرت، بۆنموونە هەروەك دەڵێن لە سەرەتای پەنجاکان گوندێك لە گوندەکانی ناوچەی دوزخورماتو ژمارەیەك لە پێستەکە بەزمانی پەهلەوی نوسرابوون دۆزرایەوەو لەلایەن حکومەتی عێراقەوە دەستی بەسەردا گیرا .

جا بەم جۆرە لە هەموو پارچەکانی کوردستان، حکومەتانی تورکیاو سوریاو عێراق وئێران، کەهەریەك بەشێکی کوردستانی بەرکەوت، بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵی لەناوبردنی ئاسەوارو داب و نەریت و دەستنووسی کوردییان داوە، بۆ نموونە کتێبخانەی بەدلیس و بایەزید لە کتێبخانە بەناوبانگەکانی سەدەی نۆزدە بوون کە لەلایەن جەندرمەکانەوە وێران کران، لە داگیرکردنی شارۆچکەی (رواندز) یش لە ساڵی ١٩١٦ کتێبخانە گەورەکەی رواندز سوتێنرا.

**تەتەراوە:**

ئەم گوندە نزیك گوندی (دۆلە بەکرە)یە، سەر بە ناحیەی قوشتەپەیە سەر بە قەزای دەشتی هەولێر لە پارێزگای هەولێر، کاتی خۆی یەکێك بەناوی تەتەر ئەم گوندەی ئاوەدان کردۆتەوە، بەڵام نازاندرێ (تەتەر) لە چ هۆزێك بووەو کەی ئەم گوندەی ئاوەدان کردۆتەوە، تا ئەو کاتی ئەم گوندە حکومەتی عێراق خاپووری دەکات ، هۆزی (شێخ بزێنی)و (سیان) ی ،تێدابووە[1]، لە ئێستادا زیاتر لە (٤٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، بنەماڵەك بە ناوی (محمد رسول) لە هۆزی شێخ بزێنی دانیشتووی ئەم گوندە لەپێشووتردا لە گوندی قەرەناو ڕا هاتوونە بۆ تەتەراوە دواتر کورەکانی بە ناوی (حاجی مستەفا و حاجی یاسین) وەچەکانیان هەر لەو گوندە نیشتەجێ بوونە و ماون، بژێوی ژیانی دانیشتوانەکەی لەسەر کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و کاسبکارییە لەم گوندەدا .

-دوای ئەوەی گەلانی کۆنی کوردستان لە قۆناغی ڕاوکردن و چنینەوەی خۆراك بەرەو قۆناغی ماڵات بەخێوکردن و رەوەندی گۆڕان، هۆزایەتی هاتە کایەوەو دروست بوو و یەکێك لەناو هۆزەکە بەهۆی مێرخاسی و زیرەکییەوە جڵەوی هۆزەکەی دەگرتە دەست و دەبووە سەرداری هۆز. لەنێو زۆربەی هۆزەکانیش، هەموو بریارێك لەدەست سەرۆك هۆز یان ئاغا بوو، هۆزایەتیش سەرەتای دروست بوونی بریتی بوو لەو چەند خێزانەی کەبەیەکەوە بەدوای لەوەڕدا دەگەڕان و بریتی بوون لەبنەماڵەیەك و هەموویان خزم و کەس و کاری یەکتری بوون، واتە هۆزایەتی ئەوکات پەیوەندی خوێن بەیەکتری دەبەستنەوە، دوای ئەوەی ئەم بنەماڵانە هەواری زستانەو کوێستان بەدەست دێنن، ساڵی وادەبوو بەهۆی ناخۆشی و دژواری کەش و هەوا هەواریان نەدەگواستەوەو زیاتر بەرەو جێگیر بوون وگوند دروست کردن دەڕۆیشتن، بەم جۆرە،

[1]- عەباس سلێمان عەباس ، مێژووی دەشتی هەولێر ، بەرگی یەکەم ، هەولێر ، ٢٠٠٤.

تیرەو بنەماڵەی جیاجیا بەزۆری لەدەشتەکان کۆدەبوونەوەو گوندیان دروست دەکرد و گوندی وا هەبوو لە ژمارەیەك تیرەی جیاجیا، کە هەر تیرەیەك سەر بەهۆزێك بوو، دروست دەبوو و دەبوون بەخزمی یەکتری، واتە لەم قۆناغە خزمایەتی لەخوین بوو بە زەوی، چونکە خاکی هاوبەش چارەنووسیانی بەیەکتری دەبەستەوە، ئینجا بەدرێژایی مێژوو بنەماڵەو تیرە جیاجیاکانی ناوچەیەك، خشتبڕێکی شێوە زمان و داب و نەریتی خۆیان وەردەگرت و لەلایەن یەك لەم بنەمالآنە سەرکردایەتیان دەکرا .

سەرۆك هۆزەکانیش ڕۆڵی باڵایان لە شۆڕش هەڵگیرسان و کاروباری وولآت هەبووە جا زۆر سەرۆك هۆز هەبوون ڕۆشنبیرو نیشتمان پەروەر بوون وهەستیان بە چەوسانەوەی گەلی کورد کردووەو شۆڕشیان دژی داگیرکاران بەر پاکردووە و داوای مافی کوردیان کردووە، نمونەی زۆرمان هەیە لەم جۆرە بنەمالآنە وەك شاهینیەکان و بەدرخانیەکان .

بەم جۆرە بەدرێژایی مێژوو دوژمنان وویستویانە هۆزەکان چەکدار بکەن وشۆڕشەکانی پێ دامرکێننەوە، جارجاریش ئەگەر هۆزێك سەرکێشی بکردایە، ئەوا هۆزێکی دیکەیان دەکرد بەگژا، بۆ ئەوەی لەهێزو نرخ و پایەی بهێننە خوارەوە.

جا مانەوەو هێشتنەوەی هۆز لەو خشتبرەی خۆیداو هەمیشە داخستن و ڕێگەنەدان بە هۆشیار بوونەوەیان، چونکە لەنێوچوون لەو ئامانجانەی دەسەلآت بووینە کە هەوڵی بۆداون و هەمیشە هەوڵیان داوە خوێندەواری و ڕۆشنبیری لەنێو هۆزەکان بلآونەبێتەوە، بۆ ئەوەی هەمیشە بیانکەنە داردەستی خۆیان بۆ کپ کردنەوەی شۆڕشەکان و ڕێگا خۆش کردن بۆ بەعەرەب کردن و بەتورك کردن و بە فورسی کردن .

پێویستە ئەمرۆش ئاشتی و تەبایی لەنێو هۆزەکان قوولّ بکرێتەوەو هۆزانی نەیار ئاشت بکرێنەوە، کەلەئەنجامدا هەستی نەتەوایەتی زیاتر گەشە دەکات و نەخشە دادەڕێژرێت بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەو گوندانەی کە حکومەت دوای بەعەرەب کردنی ناوەکانی گۆڕیون و گوڕستان و مەزارەکانی تەخت کردوون، جا بوژاندنەوەی ئەم ناوە جوگرافیانە وەك بەڵگەنامەیەك لە دوارۆژدا رۆڵی خۆی دەبینێت لەکێشەو ململانیکاندا.

**توێژینەوەی مەیدانی بابەت بەهێزدەکات :**

بۆ هەر لێکۆڵینەوەیەکی کەلتووری وەك شوێنەوارو مەنەرو ریشەی ناوی جوگرافی و بەسەرهات، گەڕانێك و چاو خشانێکی پێویستە بۆ ناوچەی مەبەست توێژەر پێویستە خۆی

ناوچەی دیاریکراو ببینێ و گفتوگۆ لەگەڵ مرۆڤی شارەزای ناوچەکە بکات بەتایبەتی بەتەمەنەکان ، پاشان سەرنج لە ئاوو هەواکەو جۆرەکانی رووەکی خۆرسکی ناوچەکە بدات و باری ژیانی دانیشتوانەکە بدات بزانێ بە درێژایی مێژوو لەم ناوچەیە کێ حوکمی کردووەو چەند هۆزو بنەماڵەی تیا نیشتەجێ بووە، ئینجا بەهۆی زانستی زمانەوە توێژەر ریشەی ناوە جوگرافییەکەی بۆ دەردەکەوێ و قۆناغەکانی کە ئەو ناوەی پێیدا تێپەریوە هەر هەموویانی بۆروون دەبێتەوە. بۆ نموونە ناوی گوندی شاخۆران (شاخ)+ و+(لان= کانی)=ئەو شاخەی کانی لەژێرەوەی دەربووە هەر لە بەرانەتییەوە تا دەگەیە بەردەرەش لە زۆربەی گوندەکان کانی هەیەو بووەتە پاشگری ناوی گوندەکان بەشێوەی لان وەکو ئاغولان، مۆریلان، کانیلان، گەویلان.

هەروەها دەبینین برگەی (کوک= گەورە، مەزن) بووەتە پێشگر یا پاشگری ناوێکی جوگرافی زۆری ناوچەکانی نێوان موسڵ و سەر پێلی زەهاو وەك کەرکوك، داکۆك (داقوق)کوك جەلیل (گوبجەلیل)، حەسەن کوك.

**-ناوچەی بەرانەتی:**

ناوچەی بەرانەتی کەوتۆتە نێوان رێگای (هەولێر کەلەك) و(هەولێر- پیرمام) لە باکوریش بەستۆرەو لە رۆژئاواش رووباری بادینان.

ئەم ناوچەیە بە هۆی ئەوەی هەرگیز نەهاتی نەبینیوە ، سالآنە بەرهەمێکی باش لە دانەوێڵە بەرهەم هێناوەو لە وەرێکی باشیشی هەیە ، بۆیە بەردەوام هەر ساڵێکی نەهات بوایە مەردارانی قەراج و کەندێناوەو ملکیە بە مەرو مالآتەوە روویان لەم ناوچەیە کردووە، جار وەبووە مەرداری عەرەب مەری بردۆتە بەرانەتی، بەشێکی زۆر لە بنەماڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی لە ناوچەی بەرانەتی نیشتەجێ بوونە.

**-شیوەرەش:**

ناوی گوندێکە لە باشووری گوندی ئیفراز هەڵکەوتووە، سەر بە ناحیەی کەورگۆسکە لە قەزای خەبات سەر بە شاری هەولێر، ئاسەوارێکی تیایە بە ناوی ئاسەواری خەلیفە هارونە رەشید ناوی دەرکردووە یان بە دیوانی خەلیفە دەناسرێت.

گوایە هارونە ڕەشید لەم شوێنە دانیشتووە و خەڵکەکەش دەورەی لێداوەو گوێیان لە قسەکانی گرتووە، مەزارێکی تیایە بە ناوی شێرە سوار ، نزیك دیوانی خەلیفە چەقێك هەیە بەناوی کانی شیوە ڕەش ، گردێکی ئاسایشی لێیە بەناوی گرد میرالی، هەروەها فەقێ عەولا یەکێکە لەو کەسانەی کە لە زۆر بوار شارەزا بووە بەتایبەتی لە بواری قسەکردن ناوبانگی دەرکردووە لە گوندەکە، بەشێکی زۆر لە بنەماڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوونە.

**-گوندی مامەلۆك:**

ئەم گوندە بە مامەلۆکی حاجی عەباس ناسرابوو، چەند بنەماڵەیەك لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوون بەتایبەتی بنەماڵەی (حاجی عەباس)، ئەم گوندە کەوتبووە نێوان گوندی کەورگۆسك و شیوەڕەش و گاینج، لەئێستادا گوندەکە نەماوەو تێك چووە.

**- گوندی ئاغولان:**

ناوی گوندێکە نزیك بە گوندی شیوە ڕەش و کانییەکی تێدایە ، دوورنیە ناوی گوندەکە لە کانی ئاغان هاتبێت. ئەم گوندەش کاتی خۆی گوندی بنەماڵەی شێخی چۆڵی بووە زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنییە.

**- گوندی خرابەدراو:**

گوندێکە نزیك کەورگۆسك ئاقاری زەوییەکانی ئاسەواری زۆری تێدایە ، لە بەر ئەوەی دراوێکی زۆریان لەم کاولگەیە دۆزیوەتەوە بەر لەوەی دوبارە ئاوەدان بێتەوە ، بۆیە بەناوی خرابە دراو ناسرا. زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی لەك و شێخ بزێنی یە و چەند ماڵێك لە هۆزی شێخ مەموندی-ش ، لەم گوندە نیشتە جێن . چەند ئاقارێکی ئەم گوندە: ئاقاری ئەستەمبۆر، ئاقاری شالار، ئاقاری چراغ، زەوی هەمینۆك، قەرە قاج.

**- گوندی گردعازەبان:**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی هەولێر، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. گوندێکی کۆنە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی دۆغان- عەلیاوەی شێخان — ئاودەلۆك- یەدی قزلەر لەسەر یەکە، ئاقاری ئەوگوندە تەختایی و دەشتێکی پان و پۆڕو

ڕاستانه، کاتی خۆی بە موڵك هی چەند بنەماڵەیەك بووە ، پاشان کەوتۆتە بن دەستی (حەمۆك) کە دەکاتە باوکی عەلی بەگی دەستی بەسەر دا گرتووە ، ئەم پیاوەش یەکێك بووە لە بنەماڵەی (فارس ئاغا)، ئەو گوندە نزیکەی (۲۰۰) ماڵێك دەبوون، تیرەو بنەماڵەی جۆراوجۆری تێدا نیشتەجێ ببوون لەوانە بنەماڵەی حاجی قادری(۹-۱۰) ماڵێك دەبوون خۆشناوبوون ، کاتی خۆی لە(زێوەو هەرتەل) لە ناوچەی خۆشناوەتیەوە کەوتبوونە ئەوێ و (۳) پشت لە مەوبەر لێرەنە. بنەماڵەی (قادر وە سمان)ی ئەمانەش(۹-۱۰) ماڵێك دەبوون لە هۆزی لەك بوون، ئۆرمزیار ئەوانیش چەند ماڵێك دەبوون، بنەماڵەی حوسێن گوێ ڕەشی (۱۲-۱۳) ماڵێك بوون لە هۆزی شێخ بزێنی بوون کاتی خۆی لە دەو زێی بچووك لە ناوچەی شێخ بزێنی کەوتونەتە ئێرە، هەروەها چەند ماڵێکیش لە هۆزی شوانی تێدابوو، بنەماڵەی (سەیدەکان) بنەماڵەی سەید زەمان ئەو بنەماڵەیە لەدێرزەمانەوە لەو ناوە ژیاون، کاتی خۆی لە ناوچەی (هەمەدانەوە) کەوتونەتە (شاری شنۆ) لە کوردستانی ئەودیودا لە نەوەی بابا عەلی هەمەدانین، پاشان کەوتونەتە دەشتی هەولێر . ئەو بنەماڵەیە ڕۆڵێکی بەرچاوو مەزنیان لە نیشتمان پەروەریو کوردایەتیدا هەبووە ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆڵەکانیان بە کوردو کوردستان بەخشیوە، ژمارەی دانیشتوانی ئەم گوندەش بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی(۱۹۵۷ز)(٦٥٩) کەس بووە، ئەو گوندە گردێکی ئاسەواری تورەگە ڕێژی لێیە گردی گرد عازەبانی پێ دەڵێن گوندەکەش هەر بەو ناوە ناونراوە . (گرد عازەبان) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (گردی+ عازەب+ان) واتا لە (ناو+ ناو+ نیشانەی کۆکردنەوەی ان) پێك هاتووە. لەوانەشە ناوەکە لە (هازەبان) هەزبان بووبێتە (عازەبان) چونکە کاتی خۆی خێڵی هەزەبانی کوردی لەو ناوەو شاری هەولێردا ژیاون و فەرمانڕەوای شارەکەو ناوچەکەیان کردووە [1].

-دارەتوو:

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشت ڕێی ، لە هەشتاکان نیوەی گوندەکە سەر بە ناحیەی قوشتەپە بووە و نیوەکەی دیکەی سەر بە ناحیەی (عەنکاوە )بووە ، ئێستاش سەر بە ناحیەی (بنەسلاوە)یە و لە خوارووی ڕۆژهەلاتی شاری هەولێر هەلکەوتووە، ئاقاری ئەو گوندەش

[1]- هۆشیار عبدالله، لێکۆڵینەوەیەك لە ناوی جوگرافی و مێژووی گوندەکانی دەشتی هەولێر، گۆڤاری هەولێر، ژ:١٤، بەهاری ٢٠٠١، ل٩.

لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی کونە گورگ – گردەڕەشەی ئەفەندی و گردەڕەشەی ئەسعەد – باغەمرە فەندی – باغەمرەشەهاب- لەسەر یەکە، گوندێکی کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە(٢٢٠) ساڵێك لەمەوبەر وشەی (دارەتوو) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (ناو +ئامرازی ە+ناو) واتا(دار+ە+توو) پێك هاتووە ، هۆی ناولێنانی ئەو گوندەش بە ناوی (دارەتوو) دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی بیرێك کە کاتی خۆی هی بنەماڵەی (کامەلای برایمە ڕەشی) بووە ، ئەوان ئەو بیرەیان هەڵکەندووەو مەڕوماڵاتێکی زۆریان هەبووە، دوو داری توویان لە تەنیشت بیرەکە چاندبوو، کاتێ کە لێرە دامەزران و نیشتەجێبوون ناونرا (دارەتوو)، گوندی دارەتوو ئەمڕۆ بووەتە کۆمەڵگاو بەدەیان تیرەو بنەماڵەی تێدایە، بەڵام بەشێکی زۆر لە بنەماڵەی هۆزی شێخ بزێنی دەمێکە نیشتەجێ بوونە لەم کۆمەڵگایە[١].

**گوندی گردەڕەشە:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (ڕزگاری ) یەو سەربە قەزای (خەباتە)،لە سنووری پارێزگای هەولێر، ئەم گوندە ڕووبەری زەوی کشتوکاڵی (٥٤٣٤)دۆنم دەبێت، بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنینە، بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ کردن و ئاژەڵداریو بە خێوکردنی مەڕوماڵاتە.

**گوندی کانی لەلە(لالە):**

ئەم گوندە دەکەوێتە سنووری ناحیەی تەقتەق سەربەقەزای کۆیە لە سنووری شاری هەولێر، هەندێك لە دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە بژێوی ژیانیان لەسەر بە خێوکردنی مەڕومالاَت و ئاژەڵ و کشتوکاڵ و کاسبکاریە لە ناوچەکەدا.

**گوندی ساتوقەلا :**

ساتو قەلا گوندێکی سەر بەناحیەی تەقتەقە وە بەدوری (١٣) کیلۆمەتر لەسەرووی خۆرهەلاتیەوە ئەمرۆ (٤٥) خێزانی تێدا نیشتەجێیەو بە پیشەی گەشتیاری و ئاژەڵداریەوە

[١]- هۆشیار عبدالله، لێکۆڵینەوەیەك لە ناوی جوگرافی و مێژووی گوندەکانی دەشتی هەولێر، گۆڤاری هەولێر، ژ:١٤، بەهاری ٢٠٠١، ل٢٥.

خەریکن ساتوقەلا مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی کۆن و لەگەل پەیدابونی گوندی کشتوکالی یان لەگەل سەرهەڵدانی شۆڕشی کشتوکالی ( ٦) هەزار ساڵ لەمەوبەر دروست بووە ژیان و ئاوەدانی تێدا بووە، هەر بۆیە جێگەی خۆیەتی لە چەند ڕوویکەوە بەراورد بکرێت لەگەل چەرمووی چەمچەمال، دەزاندرێت لە ئەشکەوتەکانی کوردستان ژیانی ڕەوەندی و کۆچەری و کۆکردنەوەی سەرەتایی لە (٦٠) هەزار سال لەمەوبەر هەبووە دواتر هاتۆتە پێدەشتەکان وە بەهۆی ئاو هەوای گونجاو و خاکی بەپیت توانراوە شۆڕشی کشتوکالی لە خاکی کوردان پەیدابێت و بێتە یەکەم ناوچەی نیشتەنی لە دوای ڕەوەندی و گەڕۆکی، ئەوەی لێرەدا دەیخەمە ڕوو توێژینەوە نییە بەلکو سەردانی مەیدانییە بۆ گوندەکەو وێنەگرتنی هەندێك لەو پاشماوانەیە کە ئەمڕۆ بەهۆی کاری ڕۆژانەی هاولاتیان و جوتیارانی گوندەکە دۆزراوەتەوە و لێکدانەوە و هەلێنجانی تایبەتی خۆمە بۆ ئەو بەراوردە چونکە ئەوەی لە چەرمۆ تائیستا دۆزراوەتەوە لەو گوندەی ناحیەی تەقتەقیش بەدی دەکرێت کە بەشێك لە دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆرزی شێخ بزێنیە، بۆنمونە کەرەسەکانی چەرموو کەل وپەلی لە قوڕ دروست کراو بەردو مادەی قیر بوون بەهەمان شێوە لەنێو کاولە گۆڕەکانی ساتوقەلادا تەنیا گۆزەی قوڕ و بەردەجۆنی و کوتکی بەرد و قاپ و کەل وپەلی خشتی سورەوەکراو دەبیندرێت ، بەنمونە لەپشت سەری هەندێك لە روفاتەکاندا بەردەجۆنی کوتانی گەنم دەبیندرێت یان کوتەکی ساوار و گەنم کوتان یان گۆزە کە پڕاوپڕە لە مادەیەك کە بە خۆل و خاك ناچێت پێدەچێت هەندێك گەنم بێت بۆمردووەکان داندرابێت . هەموو ئەو شوێنەوارانە کە دەدۆزرێنەوە زیاتر لە ۱ بۆ ۳ مەتر لە پێدەشت و دەوروبەری قەلاکە لەژێر خۆل و خاکەوەن ، گرنگترین سیمای تر ئەوەیە کە مرۆڤ دوای نیشتە جێبوون پیشەی گۆزەکاری کردووە. لەگرنگترین ئەو شوێنەوارانە کە دۆزراوەتەوە گۆزەو قاپ و کەلوپەلی لە قوری سورەوەکراو بوون وەك مامۆستا حمید میرخان لەژمارەی (١٥) رۆژنامەی تاك لەبەرواری ئاداری ٢٠٠٦ لەبابەتی ( بەلگەنامەکان دەبێتە شایەت حالی راستیەکان ) باس لە کتێبی (العرق شمالی ) دکتۆر عبد الهادی دەکات و دەلێت : ئەو مێژوو نووسە عەرەبە باس لە دۆزینەوەی قوڕی سورەوەکراو دەکات لە (خەرابە )ەو ساتوقەلا بەتایبەت لە ساتوقەلا باسی خەتی بزماری دەکات کە هاوکێشەی بیرکاری لەخشتەکانی بەخەتی بزماری نوسراوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سۆمەریەکان . وە لە ژمارە(٣٦) رۆژنامەی تاك لە بەرواری کانونی یەکەمی شالی ٢٠٠٧ لەبابەتی ساتوقەلا بەر لە زاینەوە تائەمرۆ ، مجید سعید وەلی هاولاتی تەمەن ٦٨ ساڵی گوندەکە باس لە دۆزینەوەی

گۆزەیەك دەكات كە ٣٨ تەنەكە ئاوی گرتوە دواتر داویەتی بە مۆزەخانەی هەولێر و بینینەوەی كێلە قەبرێك كەوێنەی تیروشیری تیا كێشراوە ئەمە لەدوای راپەرین دۆزراوەتەوە هەروەها دۆزینەوەی ئاوەرۆی زێرابی دروستكراوی لولەیی لە شێوەی گۆزەیی و لاكێشەیی لە خشت دروستكراو، وە لە هەندێك گۆزەو بەردەكان وێنەی جۆراوجۆری ئاژەل دۆزراوەتەوە و ٣ خشتی سورەوەكراو دۆزراوەتەوە كە خەتی بزماری لەسەری نوسراوە لە ئاسەواری كۆیە دانراوە ، قاپی دروست كراو لە قوڕ بینراوەتەوە وەك قاپی شلەی فەخفوری ئەمرۆیە لەگەل دۆزینەوەی كوپەی ئاو كە یەك تەنەكە ئاوی گرتووە دراوە بە مۆزەخانەی شاری سلیمانی گۆزە هەیە تیرەكەی نزیكەی ١ مەتر دەبێت پریەتی لە گۆزەی بچوك بچوك ، وە سالی ١٩٩٢ وێنەی سەعاتیان لە گۆزەیەك بینیوە وە دەستاری بەرد ، جۆنی بەرد ، كوتەكی بەرد دۆزراوەتەوە ، بەدووری ٥٠٠ مەتر بەلای سەروی قەلاكە ئاسەواری كارخانەی دروست كردنی خشتی سورەوەكراو و گۆزە هەیە چونكە پاشماوەی سوتان و قیرو توانەوەی خۆل و خاك و مادە جۆر بە جۆرەكان هەیە .دۆزینەوەی چەندین بەردی گەورەی حەمام شۆر بەمادەیەكی جیا لە خشتی سورەوەكراو ،پێكهاتەی قەلاكە ، قەلاكە ئەمرۆ ١٨ مالی تێدایە كە مێژووی چونە سەر قەلاتیان دەگەرێتەوە بۆ نەمانی عوسمانیەكان ، بەلای زێوە ٥٠ مەتر بەرزە و بەلای دەشتەكەوە ٢٠ — ٢٥ مەتر دەبێت ، هەندێكی سروشتیە و دواتر تورەگە رێژكراوە ٦ هەزار بۆ ٧ هەزار دەبێت ڕوبەری سەر قەلا كونجی هەوایی لە ژێرەوەی قەلاكە هەیە كە بە كەرپوچ دروست كراوە — دۆزینەوەی چالێك لەسەر قەلا بۆماوەی ١ سال مالێك خۆل و خاشاكی تێدەكات ئینجا پر دەبێتەوە ، باس لەوەش دەكرێت ئەگەر بەردێك هەلبدرابوایە خوارەوە بۆماوەیەك دەرۆیشت ئینجا دەنگێگ دروست دەبوو وەك ئەوەی بەر ئاسن بكەوتایە ، بونی پێبلیكانە لەلای رۆژهەلاتی كەناری روبارەكە بەپانی ٥ خشتی سورەوەكراوی ٣٤ سم ×٣٤سم بەوقەبارە شوێن پێی ٣٤ سم بۆناو قەلاكە سەركەوتووە ، ئەو خشتە سورەوەكراوانە هەندێكیان چوارگۆشەین ٣٤ سم ×٣٤سم و هەندێكیان ٣٤ بە ١٧ سم كە شێوەی لاكێشەیە و بەرزییەكەشیان ٧ سم . ناوی ساتوقەلا ناوی قەلاكە لە ساتون ناوێك هاتووە كە میرێكی لۆلۆیی یان لۆلۆیەكان بووە لە قەلاكە ژیاوە لەسەرو بەندی نێوان سالانی ٢٢٩١ — ٢٢٥٥ پێش زایین لەگەل نەرام سینی ئەكەدی جەنگاوە و دۆراوە وەك نەرام سین سەركەوتنەكەی لە میلێكدا نوسیووە لە قەراغ و هەندێكیتر دەلێن ساتوقەلا توركیەو بەمانای قەلای دۆراو دێت. دۆزینەوەی ئەوەی لە ساتوقەلا دۆزراوەتەوە كەمێكی گەێندراوەتە مۆزەخانەكانی هەرێم وە

ئەگەر نا لە ڕێگەی قاچاغەوە فرۆشراون ئەوانەی خوارەوە هەندێك لەوشتانەیە : گۆڕەكانی ساتوقەلا لەسێ گۆڕستان بەرەو قیبلەی یەكەم (قدس) نێژراوە وە هەندێكیان بەرەو هیچ لایەك نیە ، باس لە دۆزینەوەی دراو دەكرێت كە لە مس دروست كراوە ، وێنەی سەری مرۆڤ لەلایەك كەپیاوەو لایەكەی تری ژنێكە بەپێ وەستاوە جلەكانی لە خۆ پێچراوە تانزیك چۆكیەوە ڕووتە وە لە شانێكی تیروكەوان هەیە و لە دەستێكی مەشغەل هەیە وێنەی الاسكندەری مەقدۆنی لەسەر بووە ، ٦ گۆر لە دامێنی قەلاكە لەگەل دروستكردنی قوتابخانەكە لە سالی ١٩٩٨ دا دۆزراوەتەوەە كەراستاو راست نێژراون ڕوو لە هیچ بیتێك قیبلەیەك نەبووە لەپشت سەریانەوە تیرو ڕم هەبوون تەنیا سەرە ڕمەكان ماون ئێسكەكانیان تەنیا بە شێوە هەبوون وە ئەگەر نا وەك خۆلە مێش بوون پەیكەری زەرد دۆزراوەتەوە وێنەی هەیكەلی مەلیك بووە لەزیو یان مس ، وە لەسالی ١٩٩٣ وابلاوكرایەوە تەوراتی دەستنوس دۆزرایەوە .

**ساتو قەلا لە مێژوودا :**

گوندی ساتو قەلا بە ١١ كیلۆ مەتر كەوتۆتە باكور و ڕۆژهەلاتی ناحیەی تەق تەق و لەرۆژگاری زوودا لەلێواری زێی بچوك بنیاد نراوە : لە ئیستا ٤٤ خێزانی لێ نیشتەجێیە كە ژمارەی تێكرای دەگاتە ٢١٩ كەس كە بەشێك لە دانیشتوانی لە هۆزی شێخ بزێنی بووە، لەڕووی كارگێریەوە سەربە ناوەندی ناحیەی تەق تەقە و بەرێژەی ١٠٠ ٪ دانیشتوانەكەی مسلمانن و لە نەتەوەی كوردن. قوتابخانەیێكی شەش پۆلی و مزگەوت و پرۆژەی ئاوی بۆكراوە لەگەل گەیاندنی تەزوی كارەبای حكومی .

**ناوی ساتوقەلا لە چیەوە هاتووە :** دكتۆر كەمال مەزهەر ڕای وایە ساتوقەلا بەناوی ئەو پاشایەوە ناوی نراوە كەسەردەمانێك حوكمی ناوچەكەی كردووە بەناوی (ساتو): ئاراس ئیلنجاغی پێی وایە وشەی ساتوقەلا بەمانای قەلای ستونی دێت كە ناوێكی كوردیە : لەزمانی ئەرمەنی وشەی ساتو بە مانای گەورە دێت بەمەش دەگەینە ئەوەی كەناوی ساتوقەلا لە قەلای گەورەوە هاتبێت .

**ساتو قەلا لەرۆژگاری بنیاتنانیدا :** هەموو بۆچونەكان لەسەر ئەوە كۆكن كە ساتوقەلا لە سەردەمی گۆتیەكان بنیات نراوە كە باپیرانی كوردن : وا پێ دەچێت ساتوقەلا پایتەختی هاوینەی گۆتیەكان بوو بێت كە لە وەرزی هاویندا پاشای گوتیەكان كاتەكانی خۆی بەسەر

بردبێت : هەڵبەتە پایتەختی دەولەتی گوتیەکان (ئارابخا) کەرکوکی ئیستا بووە کە بۆماوەی ۹۰ سال دەسەلاتیان بەسەر هەموو عیراقدا شکاوە .

هەلکۆلین و بەدواداچوون: بەرێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری هەرێم بۆگەیشتن بە مێژووی راستەقینەی ساتوقەلا و دەست گەیشتن بە نهێنیەکانی سێ گرێبەستی لەگەل کۆمپانیاکانی ولاتانی هۆلەند و فەرەنسا و ئەلمانیا واژوو کردووە تا بەشێوەیێکی زانستی هەلکۆلین بۆ قەلای ساتو قەلا ئەنجام بدەن کە هێشتا لە ناوەراستی کارەکانیاندان .

لە گوندی ساتووقەلا بەپیێ ی پەرتووکی هۆزەکانی کورد لە وەرگێرانی (حسین جاف) دەلێت: میرالی ئاغا کە یەکێك لە کەسایەتیە ناودارەکانی هۆزی شێخ بزێنی لە سەردەمی خۆی لە گوندی ساتووقەلا نیشتەجێ بووە.

ئەنجام : هەر چۆنێك بێت ساتو قەلا میژوویەکی پرشنگدار و روناکی حوکمرانێتی سەردەمێکی کورد نیشان دەدات و دەلیلێکی زۆر باشە تابزانین کورد ( گۆتیەکان ) سەردەمانێك ئەم ناوچەیەیان بەرێوە بردووە، تاکو ئیستاش چەند مالێك لە هۆزی شێخ بزێنی هەر لەم گوندە ماون ژیان بەسەر دەبەن .

## سێگردکان :

یەکەیەکی کارگێریە ،لە سالی (۲۰۰۵)ەوە، بە بریارێکی سیاسی دروستکراوە وەك بەرێوبەرایەتی ناحیە سەر بە قەزای کۆیەیە، جگە لە چەقی سێگردکان (۹)گوندی رۆژئاوای ناحیەی تەقتەقی خراوەتە سەر، ئەوانیش (ئۆمەرگومبەت، سێکانی، تازەدێ ، ئاومال، سارتك ، قەمبەر، بەردەسپی، کانی سلێمانە، جلبەسەر)ن[۱].

[۱] - هەرچەندە لە هەندێك ئامار و خزمەتگوزاری ناوی گوندی (نێرەگین) و ئاوایی(سەربەست)لەگەل گوندەکانی ناحیەی سێگردکان دێن ،بەلام گوندی نێرەگین سەر بە ناحیەی شۆرش (دێگەلە یە) و ئاقاری سەربەستیش سەر بە گوندی سارتکە و (ئەحداسیاتی) بۆنەکراوە.

تێکرای رووبەری ناحیە کە (١٩٨) کیلۆمەتر(٩٩٨) مەتر چوارگۆشەیە، ئۆمەرگومبەت گەورەترین ڕووبەری هەیە لەنێوان گوندەکانی نزیکەی(٥٠)کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و بچوکترین گوندیشی (تازەدێ)یە نزیکەی (٧)کیلۆمەتری چوارگوشەیە[1].

**شوێنی جوگرافیای ناحیەی سێگردکان:** بە دووری (٣٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە ئەوبەری باشوری خۆرئاوای قەزای کۆیە، وە بە دووری (٥٦)کیلۆمەتر لە باشووری خۆرهەڵاتی پایتەختی هەرێم (هەولێر) هەڵکەوتووە، دەورەدراوە بە یەکە کارگێریەکانی (تەقتەق) لە خۆرهەڵاتەوە (شۆرش) لە باکورەوە (قوشتەپە) لە خۆرئاواوە (شوان) لە باشوور، دووری لە ناوەندی یەکە کارگێریەکانەوە (سێگردکان _شۆرش=٣٠کم، سێگردکان-قوشتەپە=٤٥کم)[2].

هەروەها دیارترین دیاردە سروشتیەکانی سنوری ناحیەکە بریتین لە ڕووبارۆچکەی وەرزی (بەستی شەرغە)لەخۆرئاوا و ڕووبارۆچکەی (کۆیە و داربەسەر) لە خۆرهەڵات و رووباری (زێی بچوك)لەباشور، تێکرای باران بارینی ساڵانەی لەنێوان (٢٠٠-٥٠٠) ملیمەترە و کەوتۆتە ناوچەی بارانی نامسۆگەرەوە[3].

**دانیشتوانی ناحیەی سێگردکان:** ئاماری فەرمی و دروست بەشێوەیەکی گشتی لە عێراق کەم بەدەست دەکەوێت، بۆ ناحیەکی وەك سێگردکان –یش هەڵبەتە هەروایە، بەڵام ئەو داتاو ژمارانەی لەسەر دانیشتوانی سێگردکان لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکەوە دەست کەوتوون ئەگەر لە کەم وکوڕی بە دوور بونایە کەم نین.

لە مایسی ساڵی ٢٠٠١ وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێم بە هاوکاری ڕێکخراوی یونسێف ئامارێکیان ئەنجامداوە کە تا ڕادەیەکی باش ئامارەکە لە ڕووی ژمارەی

[1] - تۆمارە فەرمیەکانی هۆبەی کشتوکاڵی سێگردکان، بۆ ساڵی ٢٠١٣، کە رووبەرەکان لە دۆنمەوە کراون بە مەتر چوارگوشە.

[2] - بنچینەی نەخشەی پارێزگای هەولێر،سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران، وەزارەتی پلان دانان، دەستەی ئاماری هەرێم، بەرێوبەرایەتی زانیاری و نەخشەسازی هەولێر،دیزاین و ئامادەکردنی لەلایەن بەشی (GIS) تشرینی یەکەمی ٢٠١١.

[3] - ئاراس ئیلینجاغی، تەقتەق پەلکەزێرینەی کەنار زێی بچووك، چاپخانەی یاد، سلێمانی، مایسی ٢٠٠٧، ل: ٢٤٩.

دانیشتوانەوە دروستەو ئەو کات چەقی سێگردکان کە گوند بووە (١٢١٨)کەسی تێدا نیشتەجێ بووە[١].

هەروەها سالّی (٢٠٠٦)،سالّێك دوای ئەوەی سێگردکان بوو بەناحیە، ژمارەی خێزانەکانی سنوری ناحیەکە و گوندەکانی ناحیەکەو گوندەکانی (٥٧٧) خێزان بووە، وە چەقی ناحیەکەش (١٧٥) خێزانی تێدا نیشتەجێ بووە[٢]. وە لەسالی (٢٠٠٧) تێکرای دانیشتوانی ناحیەکە(٣٣٦٢) کەس بوە، ناوچەقی سێگردکان(٩٩٥) کەس و گوندەکانی بە نێرەگین – یشەوە (٢٣٦٨)کەس بووە[٣]، واتە ناوچەقی سێگردکان سەرەڕای بوونی بەناحیە بە بەراوردی سالّی (٢٠٠١) ژمارەی دانیشتوانەکەی (٢٢٣) کەس کەمیکردووە، ئەمەش بۆ هۆکاری جۆراوجۆر دەگەرێتەوە بەتایبەت فەرامۆشکردنی کەرتی کشتوکالّ و کەمی خزمەتگوزاری و بایەخدان بە وەزیفەی فەرمانبەرێتی لە وەزارەتەکانی حکومەتی هەرێم لە شارۆچکەکانی تر .

سالی (٢٠٠٩) ژمارەی دانیشتوان ناحیەکە (٣١٢٢) کەس بووە و ناو چەقی ناحیەکە (١١٤٥) کەس و هەموو گوندەکانی بە نێرەگین – یشەوە (١٩٧٧) کەس بوون ، لە (٣٠٠) خێزانی گوندەکان و (٢٥١) خێزانی نیشتەجێی ناحیەکە[٤] ، واتە تێکرای ناحیەکە لەو سالّەدا (٥٥١) خێزان بووە و بە بەراوردی سالی (٢٠٠٦) ژمارەی خێزانەکانی ناحیەکە لە (٥٧٧) خێزانەوە بووە (٥٥١) ئەمەش واتا (٢٦) خێزان لە ناحیەکە کەمیکردووە دوای(٣) سالّ، لە سالی (٢٠١٣) لە ئامارێکی ئامادەکراو لەلایەن بەرێوبەرایەتی ناحیەی سێگردکانەوە ، ژمارەی دانیشتوانی ناحیەکە (٣١٦٠) کەسیش لە گوندەکانیدان بەنێرەگین – یشەوە.[٥]

---

[١]- ناراس ئیلینجاغی ، سەرچاوەی پیشوو، ل: ٢٥١ .

[٢]- ناراس ئیلینجاغی، چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێوبەری ناحیەی سێگردکان، رۆژنامەی تاك، ژ:(٢٣)ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٦.

[٣]- توێژەران (شنە حەمەد سمیل و ئاوات رەحمان عەبباس) شیکردنەوەیەکی جوگرافی بۆ دابەشبوونی دانیشتوان ناحیەی سێگردکان، سالی (٢٠١٠-٢٠١١) پێشکەشکراوە بە بەشی جوگرافیای سکولّی زانستە کۆمەلایەتیەکانی فەکەڵتی زانستە کۆمەلایەتیەکان و یاسای زانکۆی کۆیە، بەسەرپەرشتی مامۆستا (هیوا ئەمین جەلال )وەك بەشێك لە بەدەست هێنانی پێداویستی بە کالۆریۆس لە جوگرافیا، ل: ٢٣.

[٤]- تۆمارە فەرمیەکانی فەرمانگەی ئاماری کۆیە ، بۆ سالی ٢٠٠٩.

[٥]- تۆمارە فەرمیەکانی بەرێوبەرایەتی ناحیەی سێگردکان ، بۆ سالی ٢٠١٣.

**ناوەندی ناحیەی سێگردکان (چەقی ناحیەکە)**

**ناوی سێگردکان لەچیوە هاتووە ؟**[1]

لەناوی ئەو سێ گردەوە هاتووە کەلەکۆندا دەکەوتنە خوار ئاوایی سێگردکان بەلای قیبلەوە،بەڵام ئەمرۆ خەریکە بەتەواوی بکەونە ناو ئاوەدانی ناحیەی سێگردکانیش بەم ناوانەن:

١-گردی خدر زندە

٢-گردی میرسێودین

٣-گردی هەوار تاعون

**سنوری سێگردکان لەگەڵ گوندەکانی دەوروبەری**

لەرۆژهەڵاتدا ئاقاری لەگوندەکانی (کانی لەلە و ئۆمەرگومبەت )دەگەرێتەوە و لەباشوریشدا لەگەڵ گوندەکانی (سماقە و میرکە و نێرەگین) هاوسنورە،لە رۆژئاوادا سنورەکەی تا گوندەکانی (قەمبەرو سێکانی )درێژدەبێتەوەو لەباشوریش زێی بچوك لەگوندەکانی (دەرماناو پەلکانە و عەمدۆن )ی ناحیەی شوانی جیادەکرێتەوە.

رووبەری گشتی کەرتی کشتوکاڵی سێگردکان(١٢١٠٠) دۆنمە،(٢٥٩١) دۆنمی شیاوی چاندنە و (٧٦٥) دۆنمی بەراو (١٨١٦) دۆنمی رەزی میری (٧٠٠٠) دۆنمی پاوان و لەوەرگایە، هەروەها (٢٣٤٨)دۆنمی تری بەراوی هەیە لەگەڵ(١٦١)دۆنمی حەرەمی گوند و (٧) کانی و (١) کارێزی هەیە

دیارترین پارچە زەویەکانی پشتاوەکانی سێگردکان بریتین لە (بانی خەرابە، دۆڵی توو ڕەش، عارەبەل، بان مامە، بەینەل، دۆڵی موردەل، قەڵا مۆرد، دۆڵی خوێ غەرەو، بان تەڕواڵ ، بان خوندی، سوێسکاو، بان خێرات، قازان شکیاو)، وە دیارترین بەراو حاوایەکانیان بریتین لە(ئاڵەبەو ،شێمحەمەو،بن گەر شێمحەمەو ،بن گەڕ دەورە، ئەحمەد دەروێش ، بن گەر

[1] - لە رێکەوتی (٢٠١٣/٦/١٠) چوومە ناحیەی سێگردکان،بەمەبەستی چاوپێکەوتن لەگەڵ دانیشتوانەکەی، دوای نوێژی عەسر لە مزگەوتی کۆنی سێگردکان چاوپێکەوتنم لەگەل چەند هاوڵاتیەك کرد سەبارەت بەو ناوچەیە .

قرقاجین ، سەرچەم، دورگەی سێگردکان، تێ تووك)، وە لە کانی کارێزەکانیش (کارێزی قرقاجین و کانی پاشا و کانی قوبادە و کانی توورەش) یان هەیە ،لەگەل کانیاوەکانی (سەراوسولك، سەراو پیاوان، سەراو ژنان، سەراو مام حاجی، کانی سمە ، کێنی ئاو عەلە ، کێنی سارد)ە، وە بەرزترین گردیش لە ئاقارەکەیان گردی (کەنگراوی) کورتەتەیە.

هەروەها لەسنوری سێگردکان چەندین شوێنەوار و خرابگە و کاولە هەواری هەیە لەوانە (قەلات یان بن قەلات و دۆلە خەزێنە و کەلکەل و هەوار تاعوون و باسك قرقاجین و بان خوندی ) وە چەندین گۆریچکە و گۆرستانی لێ یە، گۆرستانی گەورە ئەمرۆ مردووی لێ دەنێژن، جگە لەمانە لەسنورەکەیدا گۆرستانەکانی (خەنێیی تۆلکە و توورەش و دەروێش مردی و ئاوەزاو شیو عاربەل )ی هەیە لەگەل دوو چاك بەناوەکانی (شەخسی عەبدولعەزیز و شەخسی شێخ مەهدی).

**پێکهاتەی دانیشتوانی سێگردکان:** زۆربەی دانیشتوانی سێگردکان لە تیرەی (دەربەندی )ین کە تیرەیەکن لە هۆزی شێخ بزێنی ، جگە لە چەند تیرەیەکی تر کە لەنێو دەربەندیەکان تواونەتەوە و زۆربەی جاران خۆیان بە (دەربەندی )ناو دەبەن وەك تیرەکانی (پالانی و پیر یادی و ناو شوانی).

بەمەزەندە هاتنیان لە ئۆمەرگومبەتەوە بۆ سێگردکان بۆ نزیکەی (٢٠٠) سال پێش ئەمرۆ دەگەرێننەوە، دەربەندیەکانی سێگردکان کە بەشێکن لە هۆزی شێخ بزێنی کە ڕەچەلەکیان بۆ (جومعە دەربەندی ) باپیرەیان دەگەرێتەوە بوون بە (٦) بەرەباب و بنەمالەی سەرەکی لە سێگردکان وەك (کاکی ، خوندێتی، شەلەوەندی، لەرە، مامیل، کێخوا سێوە).

سێگردکانیەکان لەکۆنەوە بەپیشەی گەشتیاری و ئاژەلدارییەوە خەریکبوون و بە بەرووبومەکانی (خاس و تەماتە و خەیار)بەناو بانگ بوون، ئەم گوندە زیاتر لە (٢١) کەسی بەس لە هۆزی شێخ بزێنی بەر شالاوی ئەنفال کەوتووە.

**ڕووخان و کاولکارییەکانی سێگردکان:** سێگردکانیش وەك ناوچەکانی تر بەدەر نەبووە لەپەلاماردانی سەربازای و بۆردومانی فرۆکەکانی رژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عیراق،دیارترینی پەلامارو بۆردومانەکان :

یەکەم: سالی (١٩٦٥) بە بۆردومانی فرۆکەکانی بەعس سوتان وکاولکاری لێکەوتۆتەوە .

دووەم: لە هەمان سالدا(١٩٦٥) پەلاماری جەیش بۆ ئاوایی سێگردکان و چەندین پارچە چەکی جوتیاران و پارەیەکی زۆری خەلکی ئاواییان بەتالان برد.

سێیەم : ساڵی (١٩٧٤) بۆردومانی فرۆکەکانی بەعس ئەم ناوچەی گرتەوە.
چوارەم: ساڵی(١٩٨٣) بۆردومانی فرۆکەکانی بەعس ئەم ناوچەی گرتەوە.
پێنجەم: لە(١٩٨٧/١/٢٠) دیسان بۆردومانی فرۆکەکانی بەعس ئەم ناوچەی گرتەوە.
شەشەم: لەبەرواری (١٩٨٦/٧/١٠) هێزەکانی رژێمی بەعس پەلاماری سێگردکانیاندا و تێکرای خانووەکانی ئاوایی سێگردکانیش کاول و سوتێنران.
حەوتەم : لە(١٩٨٨/٤/٥) وەك تێکرای گوندەکانی کوردستان لە ئۆپەراسیۆنەکانی ئەنفال لەگەڵ خاك تەخت کراو خاپورکرا.

لە سنوری ناحیەی سێگردکان، سێگردکانیەکان زۆرترین شەهیدیان بەخشیووە، کە ژمارەی شەهیدەکانیان (٤٩)شەهیدە و(٢١) هاولاتیان ئەنفال کراوە و (٨) هاولاتیش بە شالاوی جەیش و بۆردومانی فرۆکە شەهید بوون، لەگەڵ (٢٠) شەهیدی سەنگەر ،جگە لەمانە چەندین شەهیدی تر لە و ئاواییە بەرێگای جۆراو جۆر شەهید بوون وەك کارەسات و بەزۆر بەسەربازکردن و لەبەرەکانی جەنگ نەهاتونەتەوە.

قەلای سێگردکان یان بان قەلات

دەمێك بوو گوێ بیستی( قەلای سێگردکان) بوو بووم، بۆیە بە ژووروی گوندەکە بەسەر دۆڵی (مێرەم کوژرای) رێگامان گرتە بەر و چوینە سەر گردی (سورکەل) و رێگای کاروانی گوندەکە لە ژووری رۆژئاوا، لارێی(ژەنگار، قەلاٚمۆرد)، کە خەلکی گوندەکە بەم رێگایە بۆ (بەلەبان و میرکە و نێرەگین و بەستی شەرغە) رۆیشتوون، لە رێگادا بەلای دەستە چەپ لای خواروو (موردەلی ئەحمەکلاو) و(موردەلی ئەحمەسیس)یش لە بەشی سەروویدایە، لەلای دەستە ڕاستی ڕێگاش (لوتکی ئیمام علی) یە، کە بە (٣٠) دەقیقە گەیشتنە لای بە پێ ڕۆیشتن لە ئاواییەوە، لای رۆژهەلاتی قەلاکە( تەلەمۆرد و دۆلەخەزێنە)یە، لە بەشی خوارووی قەلاکە (قەلاتەمۆرد یان شیوی قەلاتە مۆردە)، لە سەرووی رۆژهەلاتی (لوولە وشك)ە، لە رۆژئاواشی(بلباشەلە)یە ، لە ئاواییەوە تاسەر قەلاکە بەپێ رۆیشتن (٥٠) دەقیقە خەیاند، کەگەیشتینە سەر قەلاکە تێبینی ئەوەم کرد کە هەموو پێکهاتەکانی قەلاکە سروشتیە و لە گردێك پێکهاتووە بەشی خوارەوەی (سورکە) و بەشی سەرووی بە هەرچوار دەوری بە (ڕەوەزە شاخێك)دەورە دراوە، ئینجا سەر قەلاکە خاك و خۆڵە، تەنها دوو توولە رێ هەبوو بۆ سەرکەوتن یەکێکیان لە باشووری خۆرئاوا و ئەویتریان لە باشووری خۆرهەلاتیدا، بەلاٚم تا بلێ رێگایەکە ناخۆشە ئەگەر منداڵ و بەسالاچوو و پەککەوتە بێت ناتوانێت سەر بکەویتە سەر

قەلاكە، كە گەیشتینە سەر قەلاكە زەوەیەكی قیناجی(بەدگونیە)ی فرەوانمان بینی، نزیكەی یەك دۆنم (٢٥٠٠) مەتر دووجایە، بەلای رۆژهەلاتدا لێژایی هەبوو تا بەرەو رۆژئاوا بچوبایەی بەرزتر دەبوو، لە بەشی رۆژئاوای سەر قەلاكە (بیر)ێك هەبوو زۆر بە سروشتی دەچوو، بەلام دەستكار بوو بەپانی (٢)مەتر لە رووی سەرەوەی پان بوو تا بەرەو خوار و قولایی بیرەكە دەچووی فراوانتر دەبوو، قولیەكەی نەمابوو پڕبوو بۆوە ئەوەندەی كەمابوو تەنها (٥) مەتر قولایی مابوو ، لالە عومەری مام عەزیز ووتی "لە پەنجاكانی سەدەی رابردوو ئەم بیرەم بینیوە (١٠٠) مەتر قوڵ بووە "، بە دووری ئەم بیرە سێ بیری تر دەبینران لە سەر قەلاكە، بەلام ئەم بیرانە بەوە دەچوو وەك (بیرە گومانانە) خەلكی ئەم دواییانە سێگردكان لێیان دابنێت بەمەبەستی دۆزینەوەی پارچە شوێنەواری و زێر و زیوو، واش دەركەوت كە ئەمانیش لە بنەرەتدا بیر بوون بەلام رۆژگار پڕیكردۆتەوە، سەرم لەم بیرانە دەرنەچوو ، بۆ (٣-٤) بیر لەتەك یەكتری لێدراون ؟! تا ئەوەندە گەرانە لەسەر قەلاكە بە هیچ جۆرێك لە مێراب و قشراغی خانووم نەبینی تەنها كەرتە خشتی سوورەوەكراو نەبێت، بەلای لێژایی رۆژهەلاتی قەلاكە كەندرێك ناوی باران دریویەتی لەو كەندرەدا كۆنە مێراب و گۆزەی شكاو و ئێسك و پروسكم بینی، ئەو سێگردكانیانەی لەگەڵم بوون ووتیان " گۆر و قەبریشمان لێ بینیووە " بەلام من هیچ شتێكی لەم شێوەیەم نەبینی، كەندرەكە بە قولایی(١) مەتر زیاتر لە لێژایی رۆژهەلاتی قەلاكە ناو دریوویەتی، ئەو خشتە سوورەوەكراوانەی كە من بینیم پێوانەم كرد (١٦/١٦) سانتیمەتر بوون (پانی و درێژی)واتە خشتەكان چوارگۆشە بوون و بەرزیەكەیان (٥) سانتیمەتر بوو، ئەوە حەقیقەتی (قەلای سێگردكانە) ئەوەندەی چاو بیبینێ، بەلام دلنیام ئەگەر (كنەكاری و پشكنین)ی بۆ بكرێت مێژوویەكی كۆن وەدەردەكەوێت و یەكێكە لە گردە شوێنەوارییەكانی ناحیەی سێگردكان[1].

**یەكەم : دانیشتوانی ناحیەكە لە ٢٠١٣:** لە رووماڵكردنە مەیدانیەكەدا دەركەوت كە هەموو گوندەكانی ناحیەكە بە گوندنشینان ئاوەدانن، جگە لە گوندی (كانی سلێمانە ) كە چۆلە و

[1] - ئاراس ئیلنجاغی، سێگردكان و سێبەر نشینەكانی، ٢٠١٤، ل ٦٩-٧٢ . - ئاراس ئیلنجاغی، قەلای سێگردكان حەقیقەت و مێژوویەكی وون، رۆژنامەی (تاك)، ژمارە: ١، سالی یەكەمی كانوونی دووەمی ٢٠٠٥ .

ئاوەدانی تێدانییە، تێکرای دانیشتوانی ناحیەکە و دەورووبەری (٥٤٢) خێزانە و سەرخێزانەکانی (٣٣٥٦) کەسە، چڕی دانیشتوانەکەی بەستانداری جیهانی مام ناوەندی و لە یەك کیلۆمەتری چوار گۆشەدا (١٦ کەس) نیشتەجێیە، رێژەی دانیشتوانی شارنشینی (٣٧,٢٥٪)ە و (٢٥٥) خێزان لە چەقی ناحیەکەدان کەژمارەیان (١٢٥٠) کەسە، گوندنشینیشی (٦٢,٧٥٪)ە، و (٣١٧) خێزانە لە گوندەکانیدا نیشتەجێن و کە ژمارەی سەرخێزانەکانیان (٢١٠٦) کەسە، وەك لە خشتەکەی خوارەوە دەردەکەوێت.

| ژ | سەر خێزان | ژمارەی خێزان | ئاوەدانی |
|---|---|---|---|
| ١ | ١٢٥٠ | ٢٢٥ | سێگردکان |
| ٢ | ٢١٩ | ٤٨ | ئۆمەر گومبەت |
| ٣ | ٦٧٠ | ٨٤ | سێکانی |
| ٤ | ٢٩٠ | ٣٧ | تازەدێ |
| ٥ | ١٤٠ | ٢٠ | قەمبەر |
| ٦ | ٢٠٥ | ٣٥ | ئاوماڵ |
| ٧ | ٣٣٣ | ٤٨ | سارتك |
| ٨ | ١٦٠ | ٢٩ | جلبەسەر |
| ٩ | ٨٩ | ١٦ | بەردەسپی |
| ١٠ | - | چۆلە | کانی سلێمانە |
| | ٣٣٥٦ | ٥٤٢ | سەرجەم |

شێخ بزێنی لە گوندەکانی (تازەجێ و قەمبەر و ئاوماڵ و سارتك و بەردسپی و ئۆمەر گومبەت و سێگردکان و کانی سلێمانە) نیشتە جێن .

دووەم : **شوێنەوارو خرابگەکانی:** هەرچەندە کاری زانستیانە لە سنورەکەدا بۆ ناوچە شوێنەوارییەکان نەکراوە، بەڵام لە سنوری ناحیەکە و گوندەکانی دەرووبەری نزیکەی (٢٣) پارچە زەوی بنەماکانی شوێنەواری و خرابگەیان پێوە دیارە و لە هەندێکیشیان پارچەی شوێنەواری دۆزراوەتەوە و هەندێکیش بەئاشکرا دیارن کە شوێنەوارن وەك (قەلی سێگردکان و قەڵای سارتك و بانی باغەشێخانی جلبەسەر و مەزاری ئۆمەر گومبەت و دۆڵە خەزێنەی

سێگردکان)، ئەمەی خوارەوەش خشتەی ناوی ئەو پارچە زەوییانەیە کە لە رووماڵکردنە مەیدانیەکە دانیشتوانی گوندەکان بەخرابگە و شوێنەوار ناویان هێناون :

| ژ | ئاوەدانی | پارچە | ناوی پارچە زەوییە شوێنەوارییەکە |
|---|---|---|---|
| ١ | سێگردکان | ٦ | بان قەڵات، دۆڵە خەزێنە، کەلکەل، هەوارتاعون، باسك قرقاجین، بان خوندی |
| ٢ | ئۆمەرگومبەت | ٦ | چاکی ئۆمەرگومبەت، کەلەکین، بالە، قەبرستان، ئەحمە کلاو، شێمەحەو |
| ٣ | سێکانی | ٢ | کانی قورە، بان کەور |
| ٤ | تازەدێ | ٢ | قەرەشەیتان، کانی حەمرە |
| ٥ | قەمبەر | ٣ | کەرەکین، ئاوحەلە، کونەپشیلە |
| ٦ | ئاوماڵ | ١ | گردی پەرکێ |
| ٧ | سارتك | ١ | قەڵای سارتك |
| ٨ | جلبەسەر | ١ | بانی باغە شێخانی |
| ٩ | بەردەسپی | -- | -- |
| ١٠ | کانی سلێمانە | ١ | کاولە خانیان |
| | سەرجەم | ٢٣ | |

**سێیەم: شەهید و ئەنفالکراوەکان:** هەموو ئەوانەی دەگرێتەوە کە لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە بوون بەقوربانی هەر لە کۆتایی سەردەمی عوسمانیەکانەوە تا ساڵی (٢٠١٣)، چ هاولاتی و گوندنشین بووبن یان پێشمەرگەی سەنگەر، یان ئەوانەی بوون بە قوربانی لە شەرە نەخوازراوەکانی کورد بە کورد (براکوژی) لە حزب و پارتە سیاسیەکانی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردی لە سەدەی رابردوو و ئێستادا . هەموو بارودۆخە ناسەقامگیرەکانی هەرێمی کوردستان هەر لە کۆتایی دەسەلاتی عوسمانییەکانەوە و شۆرشی (١٤) تەمووزی (١٩٥٨)ی گەلانی عێراق و شۆرشی ئەیلولی ساڵی (١٩٦١) و پەلاماری بەناو(حەرەس قەومی)

بەعسیان و دوو کەرتبوونی پارتی دیموکراتی کوردستان لە شەستەکانی سەدەی رابردوو و نسکۆی سالی ١٩٧٥ و سەرهەلّدانی شۆرشی نوێ و براکوژی کۆتایی حەفتاکان و سەرەتاکانی هەشتاکانی سەدەی رابردوو و شالاّوی درندانەکانی ئۆپەراسیۆنی ئەنفال و راپەرینی بەهاری سالی (١٩٩١) و کۆرەوە مەزنە ملیۆنیەکەی کوردان و پرۆسەی ئازادکردنی عێراق لە سالّی (٢٠٠٣) و هەموو کارە تیرۆرستیەکان لە ناوچەی لێکۆلینەوەکەدا رەنگدانەوەیان هەبووە و قوربانی و شەهید و ئەنفالکراوی لێکەوتۆتەوە. لە سنووری سێگردکان و دەورووبەری (١٦٣) شەهید و ئەنفالکراو هەیە، کە (٣٦)ئەنفالکراوە و (١٢٧) شەهیدە، لە نێو شەهیدەکاندا (٤٨٪) یان هاولاتی و گوندنشین بوون کە ژمارەیان (٦١) شەهیدی هاولاتی بوون و (٥٢٪) یان پێشمەرگە و رێخراوی نێو ئۆرگانەکانی پارت و لایەنە سیاسیەکانی کورد بوون، کە ژمارەیان (٦٦) شەهیدی پێشمەرگە و سەنگەر بوون.

**چوارەم: ئاستی خوێندن:** لە ناوچەی لێکۆلینەوە خوێندن تا پەنجاکانی سەدەی رابردوو هەر لە حوجرەکاندا بووە وەك حوجرەکانی(جلبەسەر و سێکانی و ئۆمەر گومبەت و ئاومالّ) کە خوێندنی ئاینی بووە و زۆر درەنگ قوتابخانە لە تێکرای سنوورەکە کراوەتەوە، بۆ یەکەم جار لە چەقی ناحیەکەی ئەمرۆ (سێگردکان) لە سالی خوێندنی (١٩٥٩ – ١٩٦٠) قوتابخانە کراوەتەوە و دوای (١٢) سالّ ئینجا قوتابخانە لە گوندی (سارتك) کراوەتەوە و هەموو گوندەکانی تری ناحیەکە لە دوای نسکۆی شۆرشی کورد سالی ١٩٧٥ قوتابخانەیان لێکراوەتەوە، لە سالی خوێندنی (٢٠١٢ – ٢٠١٣) لە هەموو سنورەکەدا (١٢) قوتابخانە و خوێندنگەی بنەرەتی و دواناوەندی تێدایە کە (١٠٨٦) قوتابی هەبووە، لەگەلّ (١) باخچەی ساوایان لە چەقی ناحیەکەدا کە لەسالّی خوێندنی (٢٠١٣ – ٢٠١٤) کراوەتەوە .



**گوندی ئۆمەر گومبەت :**

ناوی ئەم گوندە لەناوی (چاکێك)ەوە هاتووە، کە سەعاتە رێیەك لەسەرووی خۆرئاوای گوندی ئۆمەر گومبەتەوە دوورە، ئەم چاکە پێی دەوترێت (ئۆمەر گومبەت) تا ئەم دواییانەی سەدەی رابردوو خەلکی ئۆمەر گومبەت مردوویان لە گۆرستانەکەی دەوروبەری ئەم مەزارە ناشتووە، بەبێ جیاوازی و بیروڕای جۆراوجۆر هەموو خەلکی ئۆمەر گومبەت ئەم بیروبۆچونەیان لەسەر ناوی گوندەکەیان هەیە[1] .

**سنووری گوندی ئۆمەرگومبەت:** ئەم گوندە بە دووری (٦) کیلۆمەتر لە رۆژهەلاتی ناحیەی سێگردکان هەلکەوتووە، گەورەترین رووبەری لەنێو گوندەکانی ناحیەکەدا هەیە و نزیکەی(٥٠) کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، کە دەگاتە (١٩٩٨٧) نۆزدە هەزارو نۆسەدو هەشتاو حەوت دۆنمی کشتوکالی، (٣٥٨٨) دۆنمی شیاوی چاندن و (٧١٨١) دۆنمیشی پاوان و لەوەرگایە، وە (٩٠٠٠) دۆنمی بەراوەو(٢١٨) دۆنمی حەرەمی گوندە و (٧) کانی و (٢) کارێزی هەیە، زۆربەی زەوی و زاراکانی خاوەندارێتیەکەی بۆ میری دەگەرێتەوە جگە لە (١٢٥) دۆنمی نەبێت تایبەتە و خاوەندارێتیەکەی بۆ جوتیارەکان دەگەرێتەوە[2]. لە رۆژهەلاتدا هاو سنوورە لەگەل گوندەکانی (گەرمکی تەقتەق و تالەبانی گەورە و کانی لەلە)، لە خۆرئاواشدا لەگەل گوندەکانی( میرەکە و قەمبەر و نێرەگێن و سێگردکان) ئاقاری دەگەرێتەوە، وە گوندەکانی (ئیلنجاغی گەورە و سماقە ) سنووری سەر روویان دەورداوە، لە باشوریشدا ئاقاری گوندی (کانی لەلە) ناهێلێت هیچ پارچە زەوییەکی ئۆمەر گومبەت بکاتە کەناری زێی بچووك .

لە سنووری ئەم گوندە چەندین خرابگە و شوێنی شوێنەواری تێدایە وەك (چاکی ئۆمەرگومبەت، کەلەکێن، بالە، قەبرستان، ئەحمەدکلاۆ. شێ محمدی ئەحمەدی کلاۆ، کاولە هەواری گوندی گۆرقەرەجی زێدی حاجی قادری گەورە شاعیری کورد) وە هەروەها چەندین گۆرستان و گۆریچکەی کۆن و لە مێژینانەی تێدایە وەك (گۆرستانی شێخ سمایل کە مردووی لێ دەنێژن، لەگەل قەبرستانی مەلا ئەحمەدی گەورە (شێخ مەلا ئەحمەدی کوێر ئۆمەر

[1] سەبارەت بە کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر گوندی ئۆمەر گومبەت چاو پێکەوتنم لەگەل چەند هاولاتیەك لەو ناوچەیە ئەنجامداوە.

[2] - پشت بەستن بە داتای تۆمارکراو لە فەرمانگەی هۆبەی کشتوکالی سێگردکان .

گومبەتی) ئەویش مردووی لێ دەنێژن، گۆرستانی عبدلعزیز، گۆرستانی سەید وەسمان گۆرستانی شێمحەمەد، گۆرستانی کاولە گۆڕقەرەجی زێدی حاجی، گۆرستانی بانەرەقە) جگە لە گۆرستانی چەند چاك و شەخسێك لە ئۆمەرگومبەتدا کە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەندێك لە خەڵکی زیارەتیان دەکەن وەك( چاکی ئۆمەر گومبەت،چاکی سەید وەسمان، ئەسحابەی گۆرقەرەج). چەند کارێز و کانیاوەك لە سنووری ئۆمەرگومبەتدا هەیە وەك (زەلین و دارەیی و باپیرە و جەژنی سوێر و رێ قڕی خەزایی و دەرماناو)وە چەند گردێك دەوری ئاواییەکەیان داوە وەك(لە رۆژهەلاتی گردی ئامینەو گردی مێرخانە و لە رۆژئاوا گردی بەردمێرکی و لە باکوردا گردی زالواو جگە لەمانە لە سنووری گوندەکەدا گردی تریش هەن و هەریەکە و ناوێکی هەیە وەك گردۆڵکەکانی(گۆرکەکە و کەلی چاوشین و گەرووی زالواو و گەرووی شیلانە و گردەل و قەلاتە سوور و گردی شەمشیرە و گەرووی ئاوازە) بەلاّم بەرزترین گردی سنوورەکەیان گردی (کۆرتەتە)یە کە سێگردکانیەکان هەندێك ساڵ بۆ گەشتیاری بەکاریان هێناوە ، چەندین پارچە زەوی پشتاو لە سنووری ئەو گوندە دا هەیە وەك (بان تاڵەبان و بانی چاکی ئۆمەر گومبەت و سەرخوندێتی و بان قەیتاز و بان ئەحمەد کلاّو و بانی هەنارە) هەروەها چەند ئەشکەوتۆکەیەکیش لە سنوورەکەیاندا هەیە وەك (ئەشکەوتی حەمە سمێل و ئەشکەوتی خدرمێرەم و ئەشکەوتی کەلەکین و ئەشکەوتی باپیرە و ئەشکەوتی قورمینگەوجویلەکە) بەلاّم تێکرای سنووری ئۆمەر گومبەت لە زەوی و بەراو هەژارە و تەنها پارچەیەکی بچووك نەبێت لە خوار شێروەزن لە نزیکی ئاقاری گوندی کانی لەلە .

**پێکهاتەی دانیشتوانی ئۆمەرگومبەت:** دانیشتوانی ئۆمەرگومبەت بنەچەیان دەگەرێتەوە بۆ ناوچەی دەربەندی شاهۆی کوردستانی رۆژهەلات واتا ولاتی ئێرانی ئێستا، باپیرە گەورەیان بەناوی(جومعە) هاتۆتە دەرووبەری سنوری ئەمرۆی گوندەکە سەرەتا لە (مەروانی سەرێ) لە نێوان ئاقاری گوندی (ئیلنجاغی گەورە و مەرزان) خۆی گرتۆتەوە و هەر لەو شوێنە لە گۆرستانی (کانی قەبران) لە مەرزانی سەرێ بەخاك سپێدراوە کە بە (جومعە دەربەندی) ناسراو بووە کە دەربەندی تیرەیەکە لە هۆزی شێخ بزێنی، ئەوانە ئەمرۆ کەخۆیان بۆ ئەو زاتە دەگەرێننەوە بە (٨-٩) پشت دەژمێرن تا دەگەنەوە جومعە دەربەندی .

دەربەندی زۆرینەی گوندەکەیە و ئەوانیتر لە ناویاندا تواونەتەوە، شەلەوەندی کە بەرەبابێکن لە نەوەی (مەلا هاشم) کە لەقەبی (مەلا شەلەیە) بۆیە پێیان دەلێن شەلەوەندی ئەم شەلەوەندیانە بەرەبابێکن لە تیرەی دەربەندی کە یەکێکن لە تیرەکانی هۆزی شێخ بزێنی،

هەروەها یەکێکە لە کەسایەتیە ناودارەکانی ئەم گوندە (حاجی فەقێ محمدی مەلا ئەحمەدی ڕەشی شەلەوەندییە کە ئەو شەلەوەندیانە بەرەبابێکن لە تیرەکانی هۆزی شێخ بزێنی، (شەلەوەندیەکان)یش لە رووی خزمەتکردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە زۆرترین مەلایان لێ هەلکەوتووە مەلا زادە بوون وەك (مەلا ئەحمەدە رەشی شەلەوەندی، مەلا عومەری خانەقای شەلەوەندی، مەلا سدیق شەلەوەندی، مەلای عبداللەی شەلەوەندی، مەلا حەمەدەمینی شەلەوەندی، باوکی مەلا عبدللە و مەلا نوری، مەلا محمدی ئۆمەر گومبەتی).

**چاکی ئۆمەرگومبەت(شەخسی ئۆمەرگومبەت):** ئەم چاکە لە سەررووی خۆرئاوای گوندی ئۆمەرگومبەت هەلکەوتووە، بە دووری یەك سعاتە ڕێ، دەکرێت یەکێك لە پیاوچاکان بوو بێت و پلەی خواناسی و لە خواترسانی بەرزبووە، بەلام بەداخەوە وەك ئەوەی ناوی تەواو و بنەچەی ئەم زاتە هەبێت نەمبیستووە و نەکەوتۆتە بەرچاویشم لە هیچ سەرچاوەیەك و کتێبێك تەنها لە ناوەکەی دەردەکەوێت ئەو چاکە (عومەر)ی ناو بووە، خەلکی ئۆمەرگومبەت و نەوەکانی جومعە دەربەندیش درەنگ بەو چاکەیان زانیووە، بەهۆی گاوانێکەوە کە گایەکی لێدەکەوێتە چالی مەرقەدەکەوە، ئەم ڕووداوە لەلای خەلکی ئۆمەرگومبەت بووە بەسەربووردە و گێرانەوە، هەر دوای ئەم ڕووداوەش گوندی ئۆمەرگومبەت ئەم ناوەی بەسەر دابڕاوەو بووە بە گوندی (ئۆمەرگومبەت) .

ناشزانرێت ئەم مەرقەدە دوای مردنی(عومەر)ی خواناس دروستکراوە یان خۆی بۆ خۆی دروستیکردووە ؟! چونکە گێرانەوەکان لە هەندێك حالەتدا دەبنە پێچەوانەی یەکتری، گومبەتەکە شێوەی بازنەیی یە و تیرەکەی (٣) مەترە و بەرزیەکەی (٢)مەترە، لە نێو خەندەقی بازنەی مەرقەد و گومبەتەکە بەلای ڕاستدا(٢)تونێل بەدیدەکرێت ناشزانرێت ئەم تونێلانە چەند دوورو درێژ و قوڵن و بۆچ مەبەستێك لێدراون، هەندێك دەلێن یەکێك لە تونێڵەکان دەچێتە سەر کانیاوێك لە دۆڵەکەی تەنیشتی مەرقەدەکەوە، سەری تونێڵەکان لە ناو گومبەتی مەرقەدەکەوە بەشێوەی دەرگا دەردەکەن و نیوە کەوانەیی (٥٠)سانتیمەترین . کەرەسەکانی کە گومبەت و مەرقەدەکەی پێ دروسکراوە بریتین لە بەرد و کەرپوچ و لمی قوڕینەی سەردەمانی زوو[١]، ئەمەش تێبینی کراوە ئەم مەزار و گومبەت و مەرقەدی

[١]- سوودم لە راپۆرتێکی دەستنوسی (داتا حەمەدەمین عبدللە محمد ئۆمەر مەولود قادر)، لەدایکبوی ١٩٨٨، دەرچووی کۆلێژی یاسای زانکۆی سەلاحەدین لە ٢٨-٦-٢٠١٣ کە بۆی ناردووم .

نۆمەرگومبەت تا ئەمرۆش بە مەزارگەیەکی ئاینی دادەنرێت و باوەردارانی بڕوایان بە پیاوچاکی ئەو چاکە هەیە، سالآنە لە سنووری پارێزگای هەولێر و گوندەکانی دەورووبەری لێرە و لەوێ سەردانی دەکەن، هەر لەکۆنەوە خەلکی ئاوایییەکانی میرەکە و نێرەگێن و سماقە و قەمبەر و ئیلنجاغی گەورە و سێگردکان سەردانیانکردووە.

شوێنەواری ئۆمەرگومبەت لە تابووك و خشتی سورەوەکراو لە شێوەیەکی گۆزەیی دروستکراوە و دوو دەرگای هەیە و جەنازەی ئۆمەر گومبەتی تێدایە ٣-٤ مەترە رووبەری مەرقەدەکە و دەرگایەکیان دەچێتەوە سەر شیوی (سەرقەل دووتوان) ئاوی خواردنەوەی هەیە و بۆ ژیان گوزەران و دەستنوێژهەلگرتن بەکارهێنراوە، بەلأم دەرگای دووەمی روو لە قیبلەیە شوێنی نوێژکردنەو کۆتایی دێت و دەرگای نیە، ووتیشی : لەدوای راپەرین پارەیان لێدۆزیوەتەوە و سەری مەرقەدەکەش لە سالی ١٩٧٩ چیمەنتۆکراوە.

**رووخان و کاولکارییەکانی گوندی ئۆمەر گومبەت لە شۆرشەکانی کورد:**

١- حکومەتی عێراق لەسەردەمی حەرەس قەومی(پاسەوانی نەتەوەیی یان گاردی نەتەوەیی) لە سالی ١٩٦٣ بەفرۆکە بۆردومانی گوندی ئۆمەر گومبەتی کردووە.

٢- جارێکی تر لەسالی ١٩٨٦ فرۆکە مەرگچێنەکانی رژێم بۆردوومانی گوندەکەیان کردووە .

٣- جارێکی تر هەلیکۆپتەرە مەرگچێنەکانی رژێم لە (١٩٨٨/٨/٢٦) بۆردومانی گوندەکەیان کردووە.

٤- دواجار لە پرۆسەی ئەنفالی چواردا (٣-٨) ی ئایاری ١٩٨٨ وەك تێکرای ئاوایییەکانی سنورەکە بەتەواوی وێرانکرا.

**شەهیدانی گوندی ئۆمەر گومبەت:** گوندی ئۆمەرگومبەت وەك هەموو گوندەکانی تری کوردستان لە شۆرشی ئەیلول و شۆرشی نوێ و راپەرین چەندین رۆلە بووە بەقوربانی، کە (١٣) هاولاتی جوتیار و ژن و منالّ و (٢) ئەنفالکراو و (٤) پێشمەرگەی شەهیدی داوە.

## گوندی سێکانی

### ناوی سێکانی لە چیەوە هاتووە؟

ناوەکە ناولێنانێکە پەیوەستە بەو کانیاوانەی کە گوندەکەی لەسەر بونیات نراوە، لەم رووەوە خەلکی گوندەکە سێ بیرو بۆچونیان هەبوو:

یەکەم/ بەهۆی هەبوونی هەرسێ کانی (کانی لولە کانی قوڕە و کانی سێکانی) ووتراوە سێکانی.

دووەم/ هەندێکیان پێیان وایە بەکانیەکانی (گەرماوە و تەلان و قوڵەتێنی مزگەوت ) بەهەرسێکیان وتراوە (سێکانی).

سێ یەم/ دەوترێت تەنها بەهۆی یەکیك لەکانیاوەکانەوە ناوی لێنراوە، ئەویش ناوی کانی (سێکانی) بووە .

هەر چۆن ئەو سێ بیرورایە وەربگرین لە راستی و دروستی ناو لێنانی گوندەکە دوور ناکەوینەوە، چونکە بەئاشکرا ناولێنانێکە پەیوەستە بە کانیاوەکانی، کە گوندەکە بەهۆیانەوە ئاوەدان بووە.

**سنووری گوندی سێکانی:** بەدووری (٤) کیلۆمەتر لە خۆرئاوای ناحیەی سێگردکانەوە هەڵکەوتووە، لە رۆژهەلاتدا چەقی سێگردکان و لە خۆرئاوادا گوندی (تازەدێ) و بەشێك لە گوندی (قەمبەر) دەوری داوە، لە باکەر سنوری دەگاتە گوندی (قەمبەر) و لەباشووریش (زێ ی بچووك لە گوندی شەوگێری) شێخ بزینی سەر بە ناحیەی شوانی جیادەکرێتەوە .

کەرتێکی کشتوکالی هۆبەی کشتوکالی سێگردکانەو رووبەری گشتی کەرتەکە (٣١٦٤)دۆنمە وەپشتاوپشتی (٧٧٣) دۆنمە، لەکەڵ (١٧) دۆنمی رەزگەری و (٨٠٠) دۆنمی پاوانە و (٣٥) دۆنمی حەرەمی گوندە، هەروەها (٩٢٥) دۆنم بەراوی تری هەیە .

لە دیارترین پارچە زەوییە پشتاوەکانی گوندی سێکانی بریتین لە (شێخ رەسول و کانی قورە و باریکە و سوراوە و باسك مانگا و بان تەلان)، وە لەحاویەکانیشی کە زەویە بەراوەکانین بریتین لە (زەوی قون چەم، زەوی ناو بەلێن (باڵەك)، زەوی ڕەمان مردی، زەوی بن گر، زەوی شێخ رەسول، زەوی دارەپەلك)، گردی (رەز هاجەر و گردە نەخشینە) لە بەرزایی بەرزەکانی گوندەکەن.

لە دوو پارچە زەویدا خرابگەی هەیە وەك (کانی قورە کە وێرانەیە بە قولی (١) مەتر لە ژێرخاکەوە جەرەو گۆزەی شکاوی لێدۆزراوەتەوە ) لەگەل ئاقاری (بان کەور)یش یەکێك لە خرابگەکانی گوندی سێکانی یە، جگە لە گۆرستانی (شێمحەمەد) کە ئەمرۆ خەلکی ئاوایی سێکانی مردووی لێ دەنێژن، چەند گۆرستانێکی تری لە سنووری گوندەکە هەیە وەك (کونە مەغار : ڕووی گۆڕەکانی ڕووە و رۆژهەلآت و ڕۆژئاوان) وە گۆرستانی شێخی رەسول بە چاك و شەخس دادەنرێت ئەگەر ژنی دوو گیان بەلایەوە تێپەرێت ئەوا منالەکەی سکی

نیشانەیەکی پێوە دەبێت، هەندێکیشیان دەڵێن پەیوەستە بە بیروڕای هەندێك خەلکەوە نەوەك تێکرای گوندەکە .

**پێکهاتەی دانیشتوانی گوندی سێکانی:** لە چەند تیرەیەکی سەرەکی پێك دێن لەوانە (بەگزادە و بابان و شێخ بزینی بەتایبەتی تیرەی چۆغەرەشی و سەیدەکان و دەلۆ) بەگزادە زۆرینەی گوندەکە پێك دەهێنن ، گوندی (قەمبەر)یش لە تیرەی (بەگزادە و شێخ بزینی)ن و لەگوندی (سێکانی)یەوە چوون گوندەکەیان ئاوەدان کردۆتەوە .

خەلکی ئەم گوندە جوتیارو مەر لەوەرین بوون، بە کۆنترین گوندی سنوورەکە هەژمار دەکرێت لەلایەن خەلکی ناوچەکەوە، کە (بابانیەکان) ئاوەدانیان کردۆتەوە، هەندێك بیروبۆچوون باس دەکەن بەر لەهاتنی دەربەندیەکانی تیرەی شێخ بزێنی گوندی سێگردکان لە دەستی (بەگزادەکان) بووە، وە یەکێك لەو سێ گردەی کەناوی (سێگردکان) یان لێ پێك هاتووە ناوی (گردی میرسێودین)ە، کە باپیرەی بەگزادەکانی سێکانی یە و هەر لە گۆڕستانی گەورەی سێگردکانیش نێژراوە، هەروەها بیروبۆچوونی تریش سەبارەت بە شوێنی سەرەتایان هەیە کە لێوەی هاتوون هەندێکیان دەڵێن لە (هەڵەدن)ەوە هاتوون و هەندێکیشیان دەڵێن لە شاری (مەریوان)ی ڕۆژهەلاتەوە هاتوون .

پیشەی سەرەکی دانیشتوانی سێکانی گەشتیاری و ئاژەڵداریە و لە کۆندا بەرهەمی (توتن) یان بەناوبانگ بووە، بەلام ئەمرۆ بە بەرووبومەکانی (تەماتە و خەیار و شووتی) بەناوبانگن .

**کەی قوتابخانە لە گوندی سێکانی کراوەتەوە:** لە سالی خوێندنی (١٩٧٦-١٩٧٧) قوتابخانەی لێکراوەتەوە .

**سێکانی لەسالی ( ٢٠١٣) دا:** ژمارەی دانیشتوانی سێکانی لە سالی (٢٠١٣) لە (٨٤) خێزان و (٦٧٠) کەس پێکهاتووە، گرنگترین خزمەتگوزاریەکانیشی بریتین لە (قوتابخانەی بنەرەتی و کارەبای نیشتیمانی و پرۆژەی ئاوی خواردنەوە و ڕێگای قیرتاو و کۆنکرێتی ڕێگای سەرەکی گوندەکە ) .

**رووخان و کاولکارییەکانی سێکانی:** وەك هەموو گوندەکانی سنورەکە چەند جارێك دووچاری سووتان و رووخان و پەلامار و ماڵ وێرانی هاتووە:

یەکەم: لە هەرای بەعسی سالی ( ١٩٦٣ -١٩٦٤) دووچاری پەلامارو تالانکاری هاتووە لە سەر دەستی جەیش، هەندێك لە ماڵەکانی گوندەکە سوتێنراوە و تالانکراوە و چەکی چەندین جوتیاریشیان بردووە.

دووەم : لە ساڵی (١٩٧٧) بۆردومانکراوە لەلایەن فرۆکەوە .
سێ یەم : لە ساڵی (١٩٨٧) فرۆکەکانی رژێمی بەعس بۆردومانی گوندی سێکانیان کردووە.
چوارەم: ساڵی (١٩٨٨) کەوتە بەر بۆردومانی فرۆکەی رژێم، دواتریش لە هەمان ساڵدا گوندەکە بەر شالاّوی ئەنفال کەوت .

**شەهیدانی گوندی سێکانی:** لە سەردەمی حکومەتی مەلیکیەوە تا ئەمرۆ ئەم گوندە (١٢)شەهیدی بەخشیوە لە (شۆرشی ئەیلول)ەوە تا دوا پرۆسەی ئازادکردنی عێراق کە (١) شەهیدی ئەنفالکراو و (٣) هاولاّتی و (٨)پێشمەرگە بوون.

**گوندی تازەدێ:**

تازەدێ بەر لەسالی ٢٠٠٥ ناوی (شەیتان ) بووە [٦٨]

سەبارەت بەناوی (تازەدێ) هیچ هەڵناگرێت بۆ بیروبۆچوون و راڤەکردن چونکە ئەو کاتە سەر بە شارۆچکەی تەق تەق بووە، واتە بەر لە سالی (٢٠٠٥) مامۆستا (کاکەخان نەسرەدین ئەمین) بەرێوبەری ناحیەی تەق تەق ووتی مام جەلال پێی ووتم ناوی( شەیتان) ناوێکی خۆش نییە، با بیکەین بە گوندێکی نوێ و ناوەکە بگۆرین بە (تازە دێ) واتە گوندێکی نوێ، بەلاّم زاراوەی کۆنی شەیتان سێ بیروبۆچوون لە سەری هەیە :

یەکەمیان: بەهۆی ئەوەی گوندەکان لەلاپاڵی گردێکی خرابکەوە بەناوی (قەرەشەیتان)ەوە بونیاتنراوە، دەڵێن دەکرێت ناوی گوندەکە لەمەوە هاتبێ .

دووەمیان: گوایە لە (شط)ی عەرەبییەوە هاتووە کە رووباری زێی بچووك لەو شوێنەوە بووە بە دوو لق و پێیان ووتووە (شطان) لە زمانی کوردیدا بووە بە (شەیتان )، خەلکی شێخ بزێنی-یش بەزێیەکە دەلێن ( شەتەکە یان دەم شەتەکە)، (قەرەشەیتان)ەکە خرابگەیەك بووە و هەر بە ناوی ئەو خرابگەوە ناوی ئاواییەکەش هاتووە بە نموونە ( ماڵمان لەلای گردی قەرەشەیتانە) بەمەش دواتر زاراوەی (شەیتان)ی بەسەرابراوەتەوە .

سێیەمیان: گردێك لەو گوندە هەیە پێی دەلێن گردی شەیتان کە گوایە گردی شێتان بووە کەوا لەو سەردەم شێتەکانی ناوچەکە لەو گردە کۆدەبوونەوە بۆیە ئەم ناوەی لێ نراوە لەلایەن خەلکی ناوچەکە دواتر لەسەر زاری خەلکەکە گردی شێتان بووەتە گردی شەیتان هەر لەوەوە ناوی گوندەکەش بووەتە شەیتان.

**سنوری گوندی تازەدێ:** لە ڕۆژهەڵاتدا گوندی (سێکانی) و لەرۆژئاوادا گوندی (ئاومالْ)، لەباکوردا گوندی (قەمبەر) و لە باشوریش (زێی بچوك) لە گوندەکانی(شەوگێر و کاولەسوار و تورکی) جیادەکاتەوە، نزیکەی (٧) کیلۆمەتر لە رۆژئاوای ناحیەی (سێگردەکان)ەوە دوورە، کەرتێکی کشتوکالیە بەرووبەری (٢٧٩٣)دۆنم، کە (١١٨٨)دۆنمی شیاوە بۆ چاندن و (٧٣٢)دۆنمی پاوان و لەوەڕگایەو (٦٠) دۆنمی بەراو و (٩٩٦) دۆنم پشتاو (٥) دۆنم ڕەزو (١٢٧) دۆنمی بەراو و(١٨) دۆنمی زەوی تایبەتی هەیە، وە (١٢) دۆنم ڕەزی میری و (٨٢٥) دۆنمی بەراو و (٤٨) دۆنمیش حەرەمی گوندەکەیە[1] .

گوندی تازەدێ چەندین زەوی بەراوی زێکردی هەیە لەوانە (چەم مەلا، چەم سووتا، پەرکێ، چەم رەسولْ) کە هەموویان بەیەکەوە پێیان دەوترێت (حاوی شەیتان)، هەروەها چەندین پارچە زەوی دێمە کاروپشتاوی هەیە لەوانە (بانە سوسکە، جۆنیلان، زەوی گەورە، بانی تۆێ کان، شیرناو، باسکە درێژ، دۆڵی عەلی شەل، بانی کانی رەش، کەرەکین، بەردەسۆران، بەراوەکان، کانی حەمرە، بەر کۆریتە)، هەروەها بەرزترین گردیش لە ئاقاری تازەدێ گردی (هەوێزە سوور ) و گردی (بانی کانی ڕەشە).

لە رووی شوێنەواریشەوە دوو ناوچەی شوێنەواری تێدایە، ئەوانیش (قەرەشەیتان و کانی حەمرە)ن، وە سێ گۆرستانیشی هەیە، گۆرستانی شێخ رەسول ئەمرۆ مردووی لێ دەنێژن، لەگەل گۆرستانی (شەخسەکە و قەبرە سەید)[2] .

**پێکهاتەی دانیشتوانی تازەدێ:** لەم گوندەدا چەند تیرەیەك بەیەکەوە دەژین و لە کۆندا ئاوەدانیان کردۆتەوە، کە سەرەکیترینیان تیرەکانی (بەگزادە و شێخان و شێخ بزێنی و دەربەندی کە تیرەیەکن لە هۆزی شێخ بزێنی)، شێخ بزێنی لە هەموو هۆزەکانی تر زیاتر لەم دێ یە، (بەگزادە) زۆرترین ژمارەی خێزانیان هەیە و لەدوای ئەوانیش تیرەی (شێخان)ەکان دێن، کێخوایەتی لەم دێیە بۆ ئاغەکانی شێخ بزێنی بووە واتە (ئاغا دێ) بووە، لە کوێخواکانیان(نادر ئاغای برای محمود ئاغای سارتك، فەقێ ئەحمەدی کوری محمود ئاغای

---

[1] - تۆمارە فەرمیەکانی هۆبەی کشتوکالی سێگردەکان .

[2] - گۆرستانی قەبرە سەید بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە، دەگێرنەوە سەیدێکی گوندی (ئیلاللە) ی دەشتی کۆیە، لە ناوی زێی بچووك خنکاوە و ئاوی رووبارەکە لەگەل خۆی هێناویەتی و لەگوندی شەیتان تەرمەکەی دەدۆزرێتەوە و هەر لەو شوێنەی ئەمرۆی گوندی شەیتان دەنێژرێ بۆیە ووتراوە (قەبرە سەید).

سارتك) دیاترینیان (کێخوا علی کوری محمود ئاغای سارتك، سمایل کوری محمود ئاغای سارتك) بووە، هەروەها وەکو کەسایەتی گوندەکەش (علی کوری محمود ئاغای سارتك، سمایل ئاغای کوری محمود ئاغای سارتك، فەقێ ئەحمەدی کوری محمود ئاغای سارتك) لە ئاواییەکە کەسی دیار بوون .

خەلکی گوندی تازەدێ بە پیشەی گەشتیاری و ئاژەڵدارییەوە خەریکن و شان بەشانی (ئاومالێ و سارتك) لە بەرووبومی هاوینەش بە (شفتی شەیتان) یان تازەدێ بەناوبانگن، بەم دواییانە بەرووبومی (خەیار) یان بە (ئارو)ی تازەدێش ناویان دەرکردووە .

**رووخان و کاولکارییەکانی تازەدێ :** ئەم گوندەش وەك هەموو گوندەکانی کوردستان بێ بەش نەبووە لە پەلامار و بۆردوومانی فرۆکەکانی رژێمی بەعس و حەرەس قەومی، سالی ١٩٦٣ زۆرترین زیانی ماددی و کاولکاری بەرکەوتووە، دواجار گوندی تازەدێ لە پرۆسەی ئەنفال لە سالی ١٩٨٨ تەختکراوە .

**گوندی تازەدێ :** ناحیەی سێگردکان — بناری بەستی شەرغە — دەشتی کۆیە- هەولێر

گوندی تازەدێ سەر بە ناحیەی (سێگردکان)ە، کە (٣٠کم) ی خۆرئاوای شاری تەقتەق و (٥٤کم) ی باشوری خۆرئاوای کۆیە و (٢٩کم) ی خۆرهەلاتی ناحیەی پردێ یە، (٢٣٠) سالێك بەر لە ئێستا بنەمالەیەك بە خۆو رەشمالێ و مێگەلەوە لە (قەرە سالم) ی شێخ بزێنی کەرکوکەوە لە زێ دەپەرنەوە و لە گوندی (ئاومالێ ) جێگیر دەبن و ئەوجا بە (١٤)لیرەی رەشادی گوندی (دووشاتان) (تازەدێ) ی ئێستا دەکرن و هانا دەبات بۆ حاجی مەلای سێگردکان تاکو مالێکی خزمی خۆی بۆ بنێرێتە (دووشاتان) و بەیەکەوە ئاوەدانی بکەونەوە چونکە ئەوەدەمی وولات چۆل دەبێت، (مام محمود)ی تازەدێ نەوەی ئەو پیاوەیە کەلە گوندی قەرەسالمی شێخ بزێنی یەوە هاتووە. بەستی شەرغە زستانان زێ بوو، بە هاوینانیش ئاوی زۆر بوو ئاشیان پێ دەگێرا، بەستی شەرغە دەبێتە سنووری پردێ و قوشتەپەو تەقتەق ،ئەوبەری زێی پردێ ناوچەی سالەیی و شوان و شێخ بزێنی یە، ئەم بەریش بەستی شەرغە دەیکاتە دوو ناوچە ئەویش ناوچەی ولاتی کۆیەو ناوچەیەکی تریش لە چیای دێدەوان هەلدەکشێ و بەرەو بێستانەی قوشتەپە .

کۆمەلێك ئاسەواری کۆنی لێ یە لەوانە (قەلا شەیتان) کە کەوتوتە رۆژهەلاتی گوندی تازەدێ لەسەر زێ ،ئاسن و کەرپوچ و کوپپەو شتی تری لێ دیتراوەتەوە هەورەها (گردی خانەبەگ) لە رۆژئاوای (قەلا شەیتان)ە .

ئەم گوندە ساڵی ١٩٧٨ قوتابخانەی لێ کراوەتەوە ، لە (١٩٨٨/٥/٣) ئەنفالی ئەم گوندە دەستی پێ کرد، ئەو گوندە سووتا ئەوکات کە نزیکەی (٣٠)ماڵی لێ بوو، دانیشتوانی گوندەکە بەرەو بنەسلاوەو دارەتوو کەورگۆسك ڕاگوێزران .

گوندی تازەدێ پێشتر ناوی (شەیتان) بووە لە ساڵی (٢٠٠٥)ەوە ناوەکەی گۆڕاوە بۆ (تازەدێ)، ئەم گوندە (١٥٠٠) دۆنم زەوی تاپۆی هەیە، ژمارەیەك حەوزی ماسی لەو گوندە هەیە کە نزیکەی (١٠)حەوز دەبێت، کەرتی کشتوکاڵی ژمارە (٩) یە، ئێستا ئەم گوندە زیاتر لە (٤٥) ماڵ تێیدا نیشتەجێن[١] .

## گوندی قەمبەر

### ناوی قەمبەر لەچییەوە هاتووە ؟

خزمانی گوندی قەمبەر دوو بۆچوونیان هەبوو : یەکەمیان: وشەیەکی تورکیە بە مانای شوێنی بڵند دێت.

دووەمیان: وشەیەکی کوردیە، لە (کەم بەر)ەوە هاتووە، چونکە زەوی زارەکانیان دێمە کارە و دانەوێڵە بەبرشت و بەهەرِمێن نەبووە، بۆیە وتراوە زەوی کەمبەر و دواتریش بووە بە (قەمبەر).

سەبارەت بە بۆچوونی یەکەم بەڵێ وشەکە وشەیەکی ڕەسەنی عوسمانیەکانە و لە زمانی تورکی سەردەمی عوسمانیەکان بەو کەسانە ووتراوە (قەمبەر) کە دلسۆز و بەوەفا بوون بۆ سەرکردە و نیشتمانەکەیان، زۆر کەسیش زاراوەی قەمبەری لەگەل بەکارهاتووە وەك والی بەغداد (قەمبەر علی) بەلام بۆچوونی دووەم بە وەرگێرانی پیتی لەقەلەم دەدەم چونکە تورك و کورد پیتی (کاف) وەك یەك بەکاردێنن بۆیە کردوویانە بەپیتی (قاف) ؟!

**سنووری گوندی قەمبەر:** گوندی قەمبەر بە دووری (٥) کیلۆمەتر دەکەوێتە رۆژئاوای ناحیەی سێگردکانەوە، سنووردراوە بە گوندەکانی (نێرەگین و بەشێك لە ئاقاری سێگردکان) لە باکوور و هەروەها لە رۆژهەلاتدا بەگوندەکانی (سێکانی وبەشێك لە ئاقاری سێگردکان) و لە

---

[١] - بەرنامەی ژیانەوەی کوردستان، دلشاد ئەحمەد،سەتەلایتی گەلی کوردستان، گوندی تازەدێ، بەرواری (٢٠١٣/٨/٢).

خۆرئاواش گوندی (بەردەسپی و بەستی شەرغە و بەشێك لە ئاقاری گوندی ئاومالێ) دەوریداوە و لە خوارووش ئاقاری قەمبەر دەگاتە گوندەکانی (تازەدێ و سێکانی).

کەرتێکی کشتوکالی هۆبەی کشتوکالی سێگردکانە و (٧٠٢٤)دۆنم لە زەوی و زارە ، تێکرای زەوی و زارەکانی خاوەندارێتیەکەی میریە و زەوی و زاری تایبەتی نیە، (٩٩٤) دۆنمی شیاوی چاندنی هەیە و (٣٩٠٤) دۆنمی پاوان و لەورگایە، تێکرای بەراوەکانی (٢١٠٢) دۆنمە و پشتاویشی (٨٩٠) دۆنمە، (١٢٥)دۆنمیشی حەرەمی گوندەکەیە ویەك کارێز و سێ کانی هەیە بە ناوەکانی (سەراوی ژنان و سەراوی خواروو و کانی حەمەی سوار) وە بەرزترین شوێنیش لە ئاقاری گوندەکە (چیای ناساز)ە واتە گردی نا ساز، گرنگترین پارچە زەوییە پشتاوەکانی (بانە شوانە و بانە سوسکە )یە، وە بەراوەکانیشی (قەبرستان و پشت بیر و مامە عەلە و ئاوحەلە و ئاوشامی)یە، هەروەها لە رووی شوێنەوارییەوە ناوچەی (کەرەکین) بە دووری (٥٠٠) مەتر لە خوار ئاواییەوە کۆنە جەرەو گۆزەی شکاوی لێدۆزراوەتەوە، لەگەڵ ناوچەی (ئاوحەلە)، وە لە (کونە پشیلە)ش کەورێك هەیە بە قەبارەی ژورێکی ئاسایی یە و لەکاتی تەنگانە خەلکی قەمبەر خۆیان لێ حەشارداوە، جگە لە چەندین گۆڕستان لە سنووری قەمبەردا بونیان هەیە وەك (گۆڕستانی شێمحەمەد کە مردووی لێدەنێژن، گۆڕستانی فەقێرەل، گۆڕستانی شەرغە، گۆڕستانی ئاشان، لەگەل شەخس و پاکی بان ناساز ).

**پێکهاتەی دانیشتوانی گوندی قەمبەر:** ئەم گوندە سێ تیرە تێدا نیشتەجێیە، ئەوانیش: بەگزادە و لەك و شێخ بزێنی) کە (شێخ بزێنی) تیرەی سەرەکین و ئەوانی تر ژمارەیان کەمە و قەمبەر گوندێکی (شێخەدێ )بووە. گوندنشینانی قەمبەر بەپیشەی گەشتیاری و ئاژەڵداریەوە خەریکن .

**قەمبەر کەی قوتابخانەی لێکراوەتەوە:** لەساڵی خوێندنی (١٩٧٨ -١٩٧٩) قوتابخانەی بنەرەتی لێکراوەتەوە[١].

**قەمبەر لەساڵی (٢٠١٣) دا:** لە ساڵی (٢٠١٣) ژمارەی خێزانەکانی گوندی قەمبەر (٢٠) خێزانە و ژمارەی دانیشتوانەکەی (١٤٠) کەسە، پرۆژەکانی (ئاوی خواردنەوە و کارەبای نیشتمانی و مزگەوت و قوتابخانەی بنەرەتی ) هەیە، رێگای هاتوچۆیان بۆ ناو گوندەکە قیرتاو

[١] - چاوپێکەوتن لەگەڵ (محمد عەزیز رەشید مەولود)، بەرێوبەری قوتابخانەی قەمبەری بنەرەتی تێکەڵاو، لە ٢٠١٣/٤/٢٠.

نیە، زۆرینەی خانووەکانیان قوڕەو کەمترین خانووی بلۆکی تێدا دروستکراوە بە بەراوردی گوندەکانی تری ناحیەکە.

**شەهیدانی گوندی قەمبەر:** قەمبەرییەکان (٨) شەهیدیان بە بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد بەخشیوە (٧) هاولاتی کە (٦) یان ئەنفالکراون و لەگەل (١) پێشمەرگە.

**گوندی ئاومالّ**

**ئاومالّ لەچییەوە هاتووە ؟**

زاراوەی ئاومالّ لێکدراوی (ئاو + مالّ)ە، واتا وشەیەکی لێکدراوە و کوردی پەتیە و مانای جیاجیا هەلّدەگرێت، کە ماناکەی بریتیە لە:

یەکەم: لەبەرئەوەی بەشێکی زۆری زەوی و زارەکانی ئەم گوندە کەناری و زێکردە بۆیە هەلّدەگرێت بووترێت (ئاومالّیویەتی)یان (ئاو رامالّیوە) لە زمانی ناوچەیشدا هەرشتێ ئینجا چ خاك و قورولیتە یان داروچیلکە کە ئاوی ڕووبار هەلّیبگرێت و لەشوێنێکدا بە هەر هۆکارێك بنیشێتەوە( نیشتەنی) بکات، بەشتە نیشتەنیکردووەکان دەوترێت (ئاومالّك یان ئاومالّ)، هەروەها ئەگەر ئاوی رووبار لە قۆناغی (مندالّی و گەنجی) نەبێت واتە لە قۆناغی پیری کە دەچێتە نزیك ڕێژگە یان تەختان ئاوەکەی (خوڕ)ی نامێنێت و لەو ناوچەیە بەو حالەتە دەوترێت (ئاوەکەی مالّ بووە ) واتە ئاوەکەی بەهێواشی گوزەر دەکات، هەروەها لە کاتی لافاوی رووبارەکە کەئاوی ڕووبار دێتە سەر هەر دوو کەنارەکەی لە کوردەواری دەوترێت (کۆلاوکۆل) ڕووبار هاتووە، واتە هەندە پرە لێی دەرژێت و ئاومالە، واتە لە هەموو حالەتەکان هەر تایبەتە بەناوی (ئاومالّ) :

أ- ئاومالّك : هەر شتێ ئاوی رووبار لەگەلّ خۆیدابهێنێت و بیکاتە نیشتەنی .

ب- ئاومالین: سالانە دۆلی رووبار بەهۆی لافاو ڕێچکەی ئاوەرۆکەی هەندێك لە ناوچە کەنارییەکانی ڕادەمالێت و دەیباتە شوێنێکی تر بەمەش دەوترێت (ئاومالّیویەتی) .

ج- ئاومالّە: واتە سەر ڕێژبوونی ئاوی رووبار لە کاتی لافاودا کە کۆلاوکۆل دەڕوات دەوترێت (ئاومالّە).

د- ئاوەکە مالّ بووە: هەر کاتێك ئاوی رووبار بگاتە پێدەشت و زەوییە تەختانەکان خێراییەکەی کەم دەبێتەوە و هێواش ڕێ دەکات بەمەش دەوترێت (ئاوەکە مالّ بووە ).

دووەم: هەندێك لە خەلكی گوندی ئاوماڵ پێیان وایە كە ووتراوە زەویەكانی ئەم گوندە ئەوەندە بە پیت و بەرەكەتن ئەگەر هەر كەسێك ئاوی ئاوداشتنی هەبێت ئەوا زوو دەولەمەند دەبێت و دەبێت بە ماڵ، وەكو چۆن ووتراوە (ئاو و ئاوەدانی) ئەوهاش ووتراوە(زەوی بەپیت و ئاو، دەتكات بە ماڵ)ئەم بیروبۆچونە دەلێت "لە ئاو دەتكات بەماڵەوە " هاتووە .

پێم وایە ئاوماڵ ناولێنانێكی سروشتیە و پەیوەندی بە ئاوی رووباری زێی بچووكەوە هەیە، چونكە زێی بچوك ئەم دەشتەی دروستكردووە واتە ئاوماڵ -كی رووبارەكەیە .

**سنووری گوندی ئاوماڵ:** بەدووری ٨كیلۆمەتر و٧٧٠مەتر دەكەوێتە ناحیەی سێگردكان، رووبەری گشتی گوندەكە(٥٧٥١) دۆنمی كشتوكالیە، خاوەندارییەتی زەوی و زارەكانی میریە و تەنها (٥١) دۆنمی تایبەتە، حەرەمەی گوندەكەشی ( ٨٣)دۆنمە[1] .

لە رۆژهەلاتی گوندی تازەدێ (شەیتان)، لە رۆژئاوادا گوندی (سارتك) و لە باكوور و باكوری رۆژئاوا گوندەكانی(قەمبەر و بەردەسپی و كانی سلێمانە) دەوری سنوور و ئاقاریان داوە، وە لە باشووریش (زێی بچووك) لە گوندەكانی (قەرەسالم و توركی "تولكی")جیادەكاتەوە .

لە سنوری ئاوماڵ دا چەندین كانیاوی وەك (كانی رەش و كانی پیاوان و كانی ژنان و كانی پەروەر و كانی بیرە علی و كانی بیرێ) هەیە، ئاوماڵیەكان پیشەی سەرەكییان وەك هەموو گوندەكانی سنوورەكە گەشتیاری و ئاژەڵداری بووە، لە دانەوێڵە بایەخیان بە (جۆ)داوە چونكە ئەركی تێچونی كەمتر بووە لە سەوزەواتیش بە (شوتی) بەناوبانگن، لە ئاژەڵداریش زیاتر (بزن) یان بەخێوكردووە، بە هۆی هەڵكەوتنیان لە سەر زێی بچووك، بەهۆی ئەوەی لە سەر زێی بچووك بوون هەندێك جار كاری (كەلكەوان)یان كردووە، بەتایبەت لە سەردەمی (كێخوا خورشید) كە خۆی كەلكەوان بووە و بەروبومەكانی ناوچەی خۆشناوەتی گەیاندۆتە شاری كەركوك لە رێگای ئاوی رووبارەكەوە. هەروەها گۆرستانی (پیرە باب) وەك چاك سەیری كراوە لەگەڵ چاكی (كورەمزیار) كە ئەمەیان وەك چاكێك سەردانیكراوە و ووتویانە" كورەمزیار بۆ كور هاتووم" بەتایبەت ئەو ژنانەی كە حەزیان لەوە بووە منالی كوریان ببێت، ناوچەیەكیش

[1]- تۆمارە فەرمیەكانی هۆبەی كشتوكالی سێگردكان

که له گوندی ئاوماڵ وەك خرابگه و کاولەو شوێنەوار بێت (گردی پەرکێ)یە، که چەندین کەرتە و پارچە گۆزەی شکاوی تێدادۆزراوەتەوە[1].

**ڕووخان و کاولکارییەکانی گوندی ئاوماڵ:** له دوای هاتنەسەر حوکمی بەعسیەکان زۆربەی گوندەکانی کوردستان دووچاری کاولکاری و بۆردومان و سوتان و ڕووخان هاتن گوندی ئاوماڵیش لەم شاڵاوە شۆڤێنیانه بێ بەری نه بووە و له ساڵی ١٩٦٧بەهۆی پەلاماری جەیشەوە له سنووری ئەم گوندە هاوڵاتیەك شەهید دەکرێت، هەروەها جگه له ڕووخانی گوندەکە له شاڵاوی بەدناوی به ناو ئەنفال(٦) هاوڵاتی و ڕۆڵەی ئەم گوندە ئەنفالکراو و بیسەروشوێنکران له ساڵی(١٩٨٨)، گوندی ئاوماڵ (١٨) شەهیدی بەخشیوە(٣) هاوڵاتی و(٦)ئەنفالکراو و (٩) پێشمەرگەیە.[2]

**ئاوماڵ کەی ؟ قوتابخانەی لێکراوەتەوە:** بۆ یەکەم جار قوتابخانە له گوندی ئاوماڵ له ساڵی خوێندنی ١٩٧٥ — ١٩٧٦ قوتابخانەی لێکراوەتەوە.

**ئاوماڵ لەساڵی ٢٠١٣ دا:** گوندی ئاوماڵ له ساڵی (٢٠١٣) نزیکەی (٣٥) خێزانی تێدا نیشتەجێیە، ژمارەی سەر خێزانەکانیش (٢٠٥) کەسە، لەرووی خزمەتگوزاریەکانیشەوە(بنکەی تەندروستی و قوتابخانەی بنەرەتی و مزگەوت و کارەبای نشتیمانی و پرۆژەی ئاوی خواردنەوەشی به تێکەڵی لەگەڵ گوندی تازەدێ هەیە ڕێگای گوندەکەش قیرتاوکراوە).

## گوندی سارتك

### ناوی سارتك له چییەوە هاتووە؟

دانیشتووانی ئەم گوندە دوو بیرو بۆچوونیان خستە ڕوو :

یەکەمیان : ووتیان بیستوومانە ووشەیەکی (تورکی)یە ، به مانای (دڕکە زەردە) دێت .

---

[1] - چاوپێکەوتن لەگەڵ (عوسمان کانەبی ئەحمەد) له دایکبوی١٩٧٥ی ئاوماڵ، ئەنجومەنی گوند له ٥-١٢-٢٠١٢.

[2] - چاوپێکەوتن لەگەڵ (مام ڕەسول محمد حەمەدەمین) لەدایکبووی ١٩٦١ی ئاوماڵ، گوند نشین له ٥-١٢-٢٠١٢.

دووەمیان: بە پشت بەستن بە جیاکردنەوەی بڕگەو پیتەکانی (سار + تکە) وەك عەرەب ووتەنی (ترجمەی حەرفی) ووتیان: پیاوێك ئاژەڵێکی کوشتووەو ئەو ڕۆژە گۆشتیان زۆر بووەو ناوەناوە بە (سارا)ی ژنی ووتوە (سارا تکەی لێ بدە)، هەر بۆیە لەو حاڵەتەوە بە شوێنەکە ووتراوە (ساراتکە) و دواتر بووە بە (سارتك).

بەلاّم هیچ کام لەو لێکدانانەوە بە دروست نابینم بۆ ناوی گوندی سارتك ، بەڕەوای دەزانم بڵێم ناوەکە لە (تکە ئاوی سارد)ەوە هاتووە، دەکرێت سەرەتا (سار+تکە) بوو بێت و دواتر بوو بێت بە (سارتك)، چونکە وشەی (سارا) لە زمانی کوردیدا پێچەوانەی (گەرما) یە، هەروەها (ساوداو، سارداوە، ساردك) شوێنێکە لە ژێر زەمین هەڵدەکەنرێت بۆ (ئاو ساردکردن)، ئینجا دڵۆپ دڵۆپ بکرێتە شوێنێکەوەو کۆبکرێتەوەو دواتر بۆ خواردنەوە بەکاربهێنرێت (بڕوانە هەمبانە بۆرینەی هەژار موکریانی چاپی پێنجەمی چاپخانەی سروشی تاران لە ساڵی ١٣٨١ ی هەتاوی لاپەرە ٤٠٦) لە کوردستانیشدا زۆر کانی لەو شێوەی سروشتی هەیە لە بنمیچی شاخەکانەوە چك چکە یان تك تکە یان دڵۆپ بڕژێتە خوارەوە ئاوەکەشی بەگوێرەی بارودۆخی ئاو و هەوا لە هاویندا (فێنك) و لە زستانانیشدا (شلەتێن) دەبێت،کەواتە (سارتك) لە (ساردە تکەی ئاو)ەوە هاتووەو دواتر ووتراوە (سارتك).



سمایل علی محمود ئاغا — رەحمان علی محمود ئاغا

**سنووری گوندی سارتك:** لە ڕۆژهەڵاتدا گوندی (ئاوماڵ) و لە ڕۆژئاوادا (بەستی شەرغە) و گوندی (خوڕخوڕ) سنووریانداوەو لە باکووردا گوندی (کانی سلێمانە) و لە باشووریشدا (زێ ی بچووك) لە گوندی (قەرەسالم) ی جیا دەکاتەوە، بە دووری (١٤) کیلۆمەتر لە باشووری

خۆرئاوای ناحیەی سێگردکان هەڵکەوتووە، ڕووبەری گشتی کەرتە کشتوکاڵیەکەی (٤٩٩٥) (چوار هەزاو نۆسەدو نەوەدو پێنج دۆنمە)، ٥٦٧ دۆنمی بەراو و ١٦٣ دۆنمی پشتاو ٤٨ دۆنمی ڕەزی میری و ٢١٧ دۆنمی بەراوی تایبەت و ١٠٩٥ دۆنمی پشتاو و ١٦ دۆنمی ڕەزی تایبەتی هەیە ، هەروەها (١٩٠٤) دۆنمیشی پاوان و لەوەڕگایە لەگەڵ (٩٠٠) دۆنمیتر لەبەراو حەرەمی گوندەکەش (٨٥) دۆنمە[1].

لە گرنگترین زەوییە بەراوەکانی کەنار زێی بچوکی گوندەکە کە دانیشتووانی گوندەکە پێ ی دەڵێن (حاوی) ئەوانیش حاوی (چەمی مەلا علی، چەمی سولێمانە)یە، پارچە زەوییە دێمەکارەکانیش (زەوی گەورەو ئەسحابەو بەراز کوژراو و باخچەو گردی گەورە)یە، دووکانی-یش لە سنووری گوندەکەدا هەیە (کانی پەرکێ کە زێلوی زۆر بووەو کانی زێلواوێ کە ئاوی کەمبووە) وە بەرزترین لوتکەو بەرزایی سنوری سارتك لوتکەی (گردی قەرەقاجین)ە، لە ڕووی بەرووبوونەکانی وەرزی هاوینە (شفتی سارتك) لە بەناوبانگیدا هاوشێوەی شفی ئاوماڵ و تازەدێ یە.

لە ڕووی شوێنەوارەوە (قەلای سارتك) لە نەخشەی شوێنەواری عێراق کە ساڵی١٩٧٠ لە بەڕێوبەرایەتی گشتی ڕووپێو چاپکراوە بە ژمارە (١٠٩) تۆمارکراوە، لە رۆژئاوای سارتك بە دەوری (١) کیلۆمەتر دۆزراوەتەوە، چەندین گۆزە شکاو و شوشە و شەربە و گۆسکەو گۆڕی تێدا دۆزراوەتەوە، کە هەڵکردن و دروستکردنی گۆڕەکان بە پانی (١,٥) مەترو بە درێژی (٢) مەترو بە بەرزی (١,٥) مەتر دەبێت و هەر چوار دەوری گۆڕەکان وەك چیلەو دیوار هەڵچنراون بە تابوکی سورەوە کراو، هەروەها چەند گۆڕستانێك لە سنووری گوندەکەدا هەیە وەك (گۆڕستانی شێخ ڕەسول) کە ئەمڕۆ مردووی لێدەنێژن، لەگەڵ گۆڕستانەکانی (خاتوون مەلەك و شێمحەمەد و کاولە سارتك و ئەسحابە).

**پێکهاتەی دانیشتووانی سارتك:** گوندی سارتك دوو پیاو بەناوەکانی (هەیب و تەییب) کە لە شێخ بزێنی-یەوە هاتون ئاوەدانیان کردۆتەوەو دواتر (چۆمە زەردەڵییەکان و چۆغە ڕەشییەکان کە تیرەیەکن لە هۆزی شێخ بزێنی) خاوەنی بوون تا هاتنی (محمود ئاغای سارتك) گوندەکەی وەرگرتووە ، چەندین تیرە لە گوندەکە نیشتەجێن لەوانە (شێخ بزێنی، شێخان، کەلهوری، بابان، لەك، دەربەندی-کە تیرەیەکن لە هۆزی شێخ بزێنی-سەیدەکانی بەرزنجی)، تیرەی (شێخ

[1]- تۆمارە فەرمیەکانی هۆبەی کشتوکاڵی سێگردکان.

بزێنی و شێخان) زۆرینەی گوندەکە پێك دێنن، ئاغادێ بووەو ئاغاکانی شێخ بزێنی خوارو و ئاغای گوندەکە بوون دیارترین ئاغا لە مێژووی سارتك (مەحمود ئاغای سارتك) بووە، دواتر (علی ئاغای)و (عباس ئاغای) کوڕی و دواتریش (سمایل ئاغا کوڕی علی ئاغا) و (ڕەحمان ئاغای کوڕی علی ئاغا) و (صابر ئاغای کوڕی عباس ئاغا) بوونە.

**سارتك کەی قوتابخانەی لێکراوەتەوە:** لە ساڵی خوێندنی (١٩٧٠ – ١٩٧١) قوتابخانەی سەرەتایی لێکراوەتەوە، لە یەك کردنەوەی قوتابخانەکە لە ١٩٧٢/٣/١٦ژمارەی قوتابیانی (٨٠) قوتابی بووە، کە (٥٥) قوتابیان خەڵکی سارتك و (٢٥) قوتابیان لە گوندی ئاومالّ-ەوە هاتوونە بۆ گوندی سارتك.

دوای ئاوەدان کردنەوەی لە ساڵی (٢٠٠١) بینای قوتابخانەی بۆ کراوەتەوەو، (٧٨) قوتابی و (٧) مامۆستاو (٢) کارگوزارو (٢) پاسەوانی هەیە .

**سارتك لە ٢٠١٣ دا:** دانیشتووانی ئەم گوندە لە ساڵی ٢٠١٣ دا (٤٨) خێزان و (٣٣٣) کەسە، خزمەتگوزارییەکانی وەك قوتابخانەی بنەڕەتی و پرۆژەی ئاوی خواردنەوەو کارەبای نیشتیمانی و ڕێگای قیرتاو و مزگەوتێکی هەیە، بە پیشەی کشتوکاڵیەوە خەریکن لە بەخێو کردنی ئاژەڵ و بەهەرمهێنانی بەرووبومە کشتوکاڵیەکان.

**ڕووخان و کاولکارییەکانی گوندی سارتك:** ئەم گوندە بەر شاڵاوی سەربازی و تالآن و سوتاندن بۆردوومانی ڕژێمە یەك لەدوا یەکەکانی عێراق کەوتووەو زۆرترین زیانی ماددی و شەڕی دەروونیان بەرکەوتوو لەوانە:

یەکەم : پەلاماری حەرەس قەومی (گاردی نەتەوەیی بەعس)

لە ساڵی ١٩٦٣ ئەم گوندە لەلایەن فڕۆکە مێکەکانی حکومەتی عێراقەوە بۆردوومانکراوە و جگە لە سوتان و کاولکردنی بەشێکی زۆری خانووەکانیان، قوربانیەکی زۆری مەڕو ماڵات و ڕەشە وڵاخی لێکەوتۆتەوە لەگەڵ زامداربوونی (٩) هاولاتی گوند نشینی سارتك کە زۆربەیان ژن و منداڵ بوون.

دووەم : پەلاماری جەیش لە ساڵی ١٩٨٥

ساڵی ١٩٨٥ جارێکیتر جەیش پەلاماری ئەم گوندەیان داوەتەوە و زۆربەی ماڵەکانیان سوتاندووە و دواجاریش لە پرۆسەی ئەنفالدا ساڵی ١٩٨٨ بە یەکجاری تەخت و کاولکراوە.

**شەهیدانی گوندی سارتك:** ئەم گوندە لە سەردانی مەیدانیدا دەرکەوت کە (٢١) شەهیدیان هەیە و (٨) پێشمەرگەو (١٣) هاولاتی، کە هەندێکیان بەهۆی بۆردومانی هەلیکۆپتەرو

پەلاماری جەیش و پاشماوەکانی هاوەن و گوللە تۆپ و بۆردومانی بەعس لە پردێ-وە شەهید بوون .

## گوندی کانی سلێمانە

### کانی سلێمانە لە چییەوە هاتووە ؟[٩٢]

خەلکی ئەم ئاواییە دەلێن گوندەکەمان ناوەکەی لەوەوە هاتووە کە (سولێمان) ناوێك ئەم گوندەی ئاوەدانکردۆتەوە و کانیەکی لێداوە، ئیتر هەر لەو کانیە و ناو سولێمانەوە ناوی گوندەکەمان بووە بە (کانی سلێمانە).

**سنوری گوندی کانی سلێمانە:** گوندی کانی سلێمانە بە دووری (١٤)کیلۆمەتر لە خۆرئاوای ناحیەی سێگردکانە و کەرتێکی گەشتیاری سەر بەهۆبەی کشتوکالی سێگردکانە و رووبەری گشتی (٦٥٢٠) دۆنمە، کە(١٠١٣) دۆنمی شیاوی چاندنەو (٤٠٧٠) دۆنمی پاوان و لەوەڕگایە، وە هەروەها (١٤٠٢) دۆنمی بەراوە و (٣٥) دۆنمیشی حەرەمی گوندەکەیە و هیچ دۆنمێکی تایبەت بە تاپۆی نیە و تێکرای زەوی و زارەکانی میرین .

سنوری لەگەل گوندەکانی دەورووبەریدا لە خۆرهەلات (ئاومال و سارتك) دەوری داوەو لە خۆرئاواشدا(پەلکانە و جلبەسەر) و لە باشوریدا گوندی (خوڕخوڕ) ناهێلێت بگاتە کە ناری زێی بچووك و لە باکوریش هاو سنوورە لەگەل گوندی (بەردەسپی).

لەگرنگترین کانیاوەکانی کانی سلێمانە (کانی فەرشە و کانی ڕەوشەن و کانی پیاوان و کانی ژنانە)، کە کانی ژنان باشترین سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی ئاوایی بووە لە سەدەی رابردوو، هەروەها چەندین پارچە زەوی پشتاوی هەیە وەك (باوەرە و مەنمی و ڕەز ئاغا و ئەسحابە و یەتیمە)، لەگەل چەندین بانۆکەی پشتاوی وەك (بانی ساخ سوار و بانی پەلە پەلە و بانی بەکیس مردی و بانی دڕکە)ی هەیە .

لە ڕووی شوێنەوارو خرابگە و گۆرستانەوە، کانی سلێمانە شوێنێکی هەیە پێی دەلێن (کاولەخانیان) ئەم شوێنە ژنانی تێدا بووە و ئەمرۆ وەك خرابگەیەك ماوەتەوە، گۆڕستانی کۆنی ئەم گوندە بەناوی ئەم کەسەیە کە ئاوەدانیکردۆتەوە کەناوی (سولێمان)بووە، دوای مردنی لە نزیك ئاواییەکە نێژراوە و ناوی گۆرستانەکەش لە دوای بەخاك سپاردنی بە گۆرستانی (مام سلێمان) ناونراوە، وە گۆرستانەکەی تریش ناوی گۆرستانی (مام سەیدە) بەر

لە چۆلکردنی ئەم گوندە خەلکی گوند مردویان لێ نیشتووە، بەرزترین گردیش لە ئاقاری (کانی سلێمانە)گردی (قەرەقاجین)ە، کە کەوتۆتە نێوان (سارتك و ئاومال و کانی سلێمانە) .

**پێکهاتەی دانیشتوانی کانی سلێمانە:** خزمانی کانی (سلێمانە) لە ڕووی تیرەگەرییەوە سەر بە تیرەی (لەك)ن، و وەك خۆیان دەڵێن بەشێك لە تیرەیەکی تر لە (کانی سلێمانە)هەبوو ئەویش (شێخ بزێنی)یە، ئاوایی کانی سلێمانە بە پیشەی گەشتیاری و ئاژەڵدارییەوە خەریکبوون .

**کوی قوتابخانەی لێکراوەتەوە:** لە خوێندنی ساڵی (١٩٧٥ -١٩٧٦) قوتابخانەی لێکراوەتەوە لە ساڵی خوێندنی (٢٠١٢ – ٢٠١٣) گوندی کانی سلێمانە چۆلە و ئاوەدان نییە .

**کانی سلێمانە لە ساڵی ٢٠١٣دا:** ئەم گوندە لە ساڵی ٢٠١٣دا گوندێکی وێرانەی بەستی شەرغەیە و تەنها تاکە ماڵێکیشی تێدا نیشتەجێ نیە، بەلاّم لە سنوور و ئاقاری گوندەکە تاکە ماڵێکی ئاژەڵداری تێدایە، دانیشتوانی ئەم گوندە زۆربەیان لە شارەکانی (هەولێر و کۆیە و بنەسلاّوە و قوشتەپە و دارەتوو)ن، بە شێوەیەکی گشتی ژمارەی خێزانەکانیان کەم بوون لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم تەنها (١٥) خێزان بوون و بەر لە ئەنفالیش (٢٥) خێزان بوون .

**ڕووخان و کاولکارییەکانی گوندی کانی سلێمانە:** بەشێوەی گوندەکانی سنوورەکە چەند جارێك دووچاری پەلامار و هێرشی ڕژێمە یەك لەدوا یەکەکانی عێراق هاتووە و لە ساڵی ١٩٦٢لەگەڵ سەرەتای هەڵگیرسانی شۆرشی ئەیلولی مەزن لەلایەن سوپای عێراقەوە سوتێنراوە و کاولکراوە، هەروەها لە ساڵی ١٩٨٢ ڕژێمی بەعس جارێکیتر پەلاماری داوە و سوتاندویەتی، تا دوا جار لە ساڵی ١٩٨٨ لەگەڵ تێکرای گوندەکانی کوردستان لەگەڵ خاك تەختکراوە .

**شەهیدەکانی گوندی کانی سلێمانە:** گوندی کانی سلێمانە لە سەدەی ڕابردوو دا (٧) پێشمەرگە شەهید بووە لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و (١) هاولاتیشی ئەنفالکراوە .

### قەزای کۆیە:

قەزای کۆیە یەکێك لە قەزاکانی پارێزگای هەولێرە کە دەکەوێتە ٧٠ کیلۆمەتری ڕۆژهەلاّتی شاری هەولێر. مێژووی دروستبوونی ئەم قەزایە بە ڕووبەری ٢٠٥٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە و بەرزایی ١٢٦٠ مەتر لە ئاستی زەریاوە بۆ ٢٥٠٠ ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە. ژمارەی دانیشتووانی ئەم قەزایە ٩٥٢٤٦ کەسە کە لە دوو نەتەوەی کورد و کلدان پێك

هاتووە[1].قەزای کۆیە خاوەن پێگەیەکی جوگرافی گرنگە لەسەر ئاستی عێراق و کوردستاندا. بە دوو چیای خنجیلانە دەوردراوە. ئەوانیش چیای باواجی کە بەرزییەکەی ١٢٦٠کم و چیای هەیبەت سوڵتان کە بەرزیەکەی ١٠٩٢ کم لە رووی ئاستی دەریاوە دەبێت، دەگوترێت کە مێژووی دروست بوونی شاری کۆیە، دەگەڕێتەوە بۆ گوندی ئاسکی کۆیە و پێی گوتراوە ئەسکی کۆ (بە تورکی بە واتای کۆنە گوند دێت)، بەلاّم دواتر خەلکەکە ڕوویان لە حەمامۆك کردووە کە خاوەنی سەرچاوەی ئاوی زۆرەو بەو ناوچەیەش گوتراوە کاولە کۆ. دواتریش لە شوێنی ئێستای کۆیە جێگیر بوون و دەولەتی عوسمانی لە پاش نەمانی میرنشینی بابان و سۆران ئیدارەیەکی ڕەسمی لێ دامەزراندووە و ناوی ناوە (کۆی سنجاق) سنجاقیش یەکەیەکی ئیداری بوو لە دەوڵەتی عوسمانی. کۆیە زیاتر لە ٨٠ شوێنواری هەیە لەوانە: خرابە، کلێسە، قەلای شیلە، ئەسکی کۆیە، گۆپتەپە، سکتای قەیسەری، باواجی، سماقولی میر سەید، چنارۆك و حەمامۆك. بۆ یەکەمین جاریش بە فەرمی لە ساڵی ١٨٨٥ قوتابخانە لەو شارە دامەزراوە. لە ساڵی ١٩١٨ کۆیە کراوە بە قەزا. لە ساڵی ١٩٨٨ وەك کاردانەوەیەك دژی بزاڤی بلاّوی پێشمەرگە، حکومەتی عێراق کۆیەی لە قەزا بچووك کردووەتەوەو کردی بە ناحیە، بەلاّم دوای ساڵی ١٩٩١ جارێکی تر حکومەتی هەرێمی کوردستان کۆیەی کردەوە بە قەزا.

**ناوی کۆیە:**

لە بارەی بنچینەی ناوی کۆیە بیرو بۆچوونی جیاواز هەیە[2]، کەریم شارەزا دەلێت ئەو ناوە لە بنەڕەتدا لە (کۆ)وە هاتووە بەبێ هیچ پاشکۆیەك کە بە واتای کۆمەڵە خەلکێك دێت لە ناوچەیەك دا کۆبوونەتەوە، شاری کۆیەش کە سەنتەری کارگێری قەزاکەیە لە دامێنی زنجیرە شاخەکانی هەیبەت سوڵتان و باواجی دا هەلکەوتووە[3]. هەندێکی تر پێیان وایە عوسمانییەکان (ئالاّ-سنجق)ی پێغەمبەریان(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ خۆیان هێناوەتە کۆیە و لەسەر

[1] - قەزای کۆیە، مالپەری پارێزگای هەولێر.

[2] - http://www.chnarok.se/darbaray%٢٠koya.htm

[3] -کریم شارزا،لمحة عن تأریخ کویسنجق و ا نحائها، مجلة زاکروس ، العدد(١)، وزارة الثقافة، مطبعة وزارة الثقافة، أربیل، ١٩٩٧، ص٣٣.

قەلای (قووچ پاشا) چەقاندوویانە لە پێشدا ناوی (کۆثار) بووە لەبەر بەیداغەکە ناویان ناوە کوێسنجق[1] ، بەلاّم وەك دیارە کە ئەو ناوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی عوسمانیەکان. بە بۆچوونی (مەسعود محەمەد)یش مێژووی ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەردەمی عوسمانیەکان بۆ پشت بەستن بە کتێبی (ئەزکاری) ئیمامی نەوەوی کە پێش هاتنی عوسمانیەکان بۆ ناوچەکە لەلایەن یەکێك بە ناوی (خضر بن عمر کویسنجقلی) کۆپی کراوە بۆیە بە دووری نازانێت ئەم ناوە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی دوور تر[2].

ناحیەکان و گوندەکان:

کۆیە لە سەرەتای پێکهاتە ئیداریەکانی دەولەتی عوسمانی قەزایەك بوو سەر بە سنجاقی شارەزوور (کە ناوەندەکەی کەرکوك بوو) و لە سالّی ١٨٩٣ و ١٨٩٥ز شەقلاوە ناحیەکی سەر بەو قەزایە بوو. لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم و دروستبوونی دەولەتی نویّ ی عێراق هەولێر لە کەرکوك جیاکراوە و کرا بە لیوایەکی تایبەت و کۆیە بوو بە قەزایەکی سەر بە هەولێر[3] . قەزای کۆیە لە پێنج ناحیەو ١٢٢ گوند پێکهاتووە[4].

- شۆرش: ٥١ گوند ، گرنگترینیان گوندی دێگەلّە.
- سکتان: ١٢ گوند، گرنگترینیان گوندی سکتان و نازەنین.
- ئاشتی: ٢٢گوند، گرنگترینیان گوندی خەرابەو کاولان و بۆگدو کورداوا.
- سێگردکان: ١١ گوند، کە بەشێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی لەو ناحیە نیشتەجێن.
- تەق تەق: ٢٦ گوند، کە بەشێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی لەو ناحیە نیشتەجێن.

**تەق تەق:**

یەکەم ناحیەی قەزای کۆیەیە، بە دووری (٢٣)کیلۆمەتر لە باشوری قەزاکە لە کەناری لای ڕاستی(زێی بچوك)هەلّکەوتووە، کە وەك دیاردەیەکی سروشتی لە ناحیەی (شوان)و ناحیەی (ئاغجەلەر)ی قەزای چەمچەمالی جیا دەکاتەوە، لەوپەڕی باشووری خۆرهەلاتی ناحیەی

[1] -تاهیر ئەحمەد حوێزی، مێژووی کۆیە،ب١، چاپخانەی وەفا، بەغدا، ١٩٦٢،ل٢٢.

[2] -جمال بابان، اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، مطبعة الاجيال ، بغداد ، ١٩٨٩، ص٢٦٧.

[3] - سالنامه دولت عليه عثمانية سنة ١٣٣٠ هـــ ، استانبول ، ص ٨٠٣.

[4] -قەزای کۆیە، مالپەڕی پارێزگای هەولێر.

پارێزگای هەولێرە بە دووری (٥٨)کیلۆمەتر لە باکوریدا ناحیەی (ناوەندی) قەزای کۆیە و لە خۆرهەلاتی ناحیەی (ئاشتی)و لە خۆرئاوای ناحیەی (سێگردکان)و لە باکوری خۆرئاوای ناحیەی (شۆرش) سنوری داوە، تەقتەق خاڵی بەیەکگەیاندنی هەرسێ پارێزگای کەرکوك و هەولێر و سلێمانی یە. تێکرای سنوری ناحیەکە لەمرۆدا ٤٧٤ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە و٢٢ گوندی بەسەرەوەیە، زۆر لە بنەماڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی لەو ناحیەیەدا نیشتەجێ بوونە.

**ناوی تەقتەق لە چیەوە هاتووە؟**

دوو بیرو بۆچوونی سەرەکی لەسەر ناوی تەقتەق هەیە:

یەکەم: دانیشتوانی ڕەسەنی شارۆچکەکە دەڵێن لە (تاك تاك) ماڵەوە هاتووە، واتە تاق تاق لێرەو لەوێ هاتوون و نیشتەجێ بوون.

دووەم: بیروڕای دووەم پێی وایە تەقتەق ناوێکی سروشتیەو پەیوەستە بە خاکی ناوچەکە، کە زەویەکی بن بەردو ڕەقە و وشەی تەقتەق لە زمانی کوردی واتە (زەوی بەردینە) هەریەك لە (جەمال بابان) لە کتێبی (ناوی شارەکانی عێراق)و(ئاراس ئیلنجاغی)لە کتێبی(تەقتەق، پەلکە زێڕینەی کەنار زێی بچووك)پەسەندی ئەم بیرو بۆچوونەیان کردووە.

**مێژووی تەقتەق و یەکە کارگێرییەکەی:** مێژووی شارۆچکەی تەقتەق وەك ئاوایی و ئاوەدانی مێژوێکی کۆنی هەیە بۆ سەرەتای سەدەی حەڤدەیەم (١٦٠٠) زاینی دەگەرێتەوە چونکە تەقتەقی ئەمرۆ بەسێ قۆناغی جیاجیا تێپەری کردووە یەکەم قۆناغی لە گوندی (کوچك نەخشینە) وە بووە ، دووەم قۆناغی لە گوندی (کەڵەکچن )ەو، ئینجا سێیەم قۆناغی (تەقتەق) ی ئەمرۆیە، سەرچاوە لەو ڕووەوە کەم دەست دەکەوێت تەنها گوتەو گێرانەوەی پشتاوپشتە ، سەبارەت بەمێژووی یەکەی کارگێری لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم (١٨٥٠ – ١٩٠٠ ) فەرمانگەی (ڕێژە) ی کۆکردنەوەی باج و سەرانەی عوسمانیەکان و بنکەی جەندرمەو زەفتیەی لێبووە ، چونکە لە کۆنەوە ناوچەیێکی ترانزێت بووە بۆ بەروبومەکانی ناوچەی پشدەرو بیتوێن و کۆیە و هەولێر لە رێگەی دوبەوقەیاغەوە، دوای هاتنی ئینگلیز سالی ١٩١٨ بایەخی (تەقتەق ) لە رووی کارگێریەوە زیادی کردووە بەتایبەت دوای ڕاپۆرتە کارگێریەکانی ناوچەکانی کەرکوك لەنێوان سالانی (١٩١٨ – ١٩١٩ )کە لەلایەن یارمەتیدەرانی ئەفسەرە سیاسیەکانەوە کە بەحاکمی مەدەنی ناسرابوون، تاوەکو ١٩٨٦/١٠/٢ وەك یەکەی کارگێری بەرێوەبەرایەتی ناحیە بوو وە لەو بەروارەوە بە بریارێکی

سیاسی پارێزگای هەولێر کراوەتەوە بە گوند بەناوی (گوندی عەزیزە ) تا دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ و دامەزراندنی حکومەتی هەرێم هەر بەگوندێکی ئیداری مایەوە تا بڕیاری ئەنجومەتی وەزیرانی حکومەتی هەرێم ژمارە (٤١٥/٣/١/١) ی ٢٠- ٦- ١٩٩٥ کرایەوە بە ناحیە .

**هەلکەوتەی جوگرافیایی تەقتەق :**

١- شوێنی گەردونی ئاوهەوای تەقتەق دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی(٣٥ - ٣٦) پلەی باکوری نیوەگۆی زەوی و نێوهێلی درێژی (٤٤ — ٤٥) ڕۆژهەلاتی زەوی هەر چەندە بەشێکە لە تێکرای ئاووهەوای ناوچەکە ، کە ئاووهەوای هەرێمی دەریای ناوەڕاستە، بەلام ئەو شوێنەی گەردونیەی تەقتەق لە هەرێمی کوردستاندا ئاووهەوایێکی ڕاگوێزراوی نێوان گەرمێن و کوێستانی پێ بەخشیوە، لەناوچەی بارانی نیمچە مسۆگەردایە باران بارینی سالانەی لەنێوان (٢٠٠ — ٥٠٠) ملم دایە، هاوینی گەرم و ووشکەو زستانیشی فێنك و باراناویە .

٢- تۆپۆگرافیای تەقتەق: پێکهاتەی ڕووی تەقتەق کەوتۆتە ناوچەی زۆرگەکانەوە،(٦٠٪) ی ڕووبەرەکەی گردۆلکە و زورگانە و ٣٨ ٪ دەشتی زێکردی کەناریە و ٢ ٪ شاخاوییە، سنوری ناحیەکە بەهێلی کانتۆری بەرزیەکەی (٣٥٠-٧٥٠) مەتر لە ئاستی دەریا بەرزە و بەرزترین لوتکە چیای (تەکەلتو)ە، کە ٨١٠ مەتر بەرزە دواتر چیای ( گۆرقەرەج )ی زێدی گەورە شاعیری کورد (حـــاجی قادری کۆیی)یە کە یەکێکە لە ڕۆلەکانی هۆزی شێخ بزێنی، بەدووری (٣)کیلۆمەتر لەخۆرئاوای تەقتەق بە بەرزی (٧١٠) مەتر لەئاستی رووی دەریاوە، هەروەها هەردوو بانۆکەی (تالەبانی گەورە وئیلنجاغی گەورە) لەباکوری خۆرئاوای تەقتەقە کەبەرزیان لەنێوان (٤٠٠—٥٠٠)مەترە لە رووی دەریاوە بەهەزاران دۆڵی دێمەکاری پشتاوەبن وە لە باکوری خۆرئاوادا هەردوو رووبارۆچکەی وەرزی (کۆیە) و (داربەسەر) پێدا گورزەر دەکات و لە نێوانی گوندی (کانی لەلە) و گوندی (ئۆمەرگومبەت )ی هۆزی شێخ بزێنی، دەرژێنە زێی بچووکەوە، جگە لە گوزەرکردنی زێی بچوك لەباشوردا و بەهۆشیەوە هەزاران دۆڵی دەشتی زێکردی دروست کردووە کە سەرچاوەی گەشتیاری و بژێوی دانیشتوانی سنورەکەیە کە بەشێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی دانیشتووی ئەو ناوچەیەن.

**باری ئابوری تەقتەق:** بەگوێرەی ئامارێکی فەرمی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و رێکخراوی یونسێف لە مایسی — ٢٠٠١ ژمارەی دانیشتوانی شارۆچکەی

تەقتەق و گوندەکانی دەوروبەری (٢٤٢٥٤)کەس بووە، بەداخەوە ئامارێکی تازە لەسەر ئەو شارۆچکەیە نییە سەبارەت بەتوانا مرۆڤایەتیەکانی شارۆچکەکە لە ئێستادا، بەلام لە بواری ئابوریەکانی تری وەك سامانی ئاژەلی و بەروبومی کشتوکالی نزیکەی ١٠ هەزار سەر مەڕو بزن و نزیکەی ٣ هەزار ڕەشەولاخی تێدا بەخێو دەکرێت و ٧٤ حەوزی بەخێوکردنی ماسی و ٣٤ پرۆژەی بەخێوکردنی پەلەوەری تێدایە، هەروەها لە کەرتی کشتوکالیەکاندا لە بەراوەکاندا سالانە زیاتر لە ١٠٠٠ تۆن سەوزەواتی زستانە و هاوینەی وەك تەماتەو خەیار و بامیە و بیبەر و شوتی کالەگ بەرهەم دەهێنرێت ، جگە لە بەرهەم هێنانی گەنم و جۆ لە زەویە پشتاوەکانی سنورەکە هەروەها میوەکانی هەنارو هەنجیر و قەیسی و ترێ و مزرەمەنی لە سنورەکە ڕەزو باخیان هەیە جگە لە دارستانە چنراوەکانی بەشی ڕەزگەری و دارستانی هۆبەی کشتوکالی تەقتەق ، سەبارەت بە ڕووەکی سروشتی بەهۆی زێی بچووکەوە هەزاران دۆنمی کەناراوی بووە بەلێرەوارو و بێشەلان و دارستانی چڕی دار بی و پەڕك و توتڕك و گەز ، وە لە ناوچە زۆرگان و چیایەکانی گۆرقەرەج و تەکەلتوو درەختیلەی وەك دار بەلالوك وگێوژ و مۆردو ترش ، هەروەها پوش و پەلاش و پاوانی پاوانەکانی سنورەکە گرنگترین درخت و پۆشاکی ڕووەکی سنورەکەن سامانە سروشتیەکانی تەقتەق ئەوەی تائیستا پەی پێ براوە بریتیە لە سامانی کانزایی و نەوت و گازی سرشتی و کەرەستەی خانووبەرەی غەسالەکانی کەنار زێی بچووك و ئاوی سەرزەوی و ژێرزەوی کەبنەمای سەرەکین بۆپیشەسازی و گەشەکردنی لە داهاتوودا .

**باری کۆمەلایەتی و ئاینی تەقتەق:** لە شارچکەی تەقتەق دانیشتوانەکەی هەموو موسلمانن و لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافعین و لە ٦ گەرەکی شارۆچکەکە ٨ مزگەوتی تێدایە، لەسالی ٢٠٠١ ژمارەی دانیشتوانەکەی (٢٤٢٥٤)کەس بوو ژمارەی نێر تەنها (٤)کەس لە ژمارەی مێ کەمتر بووە، ژمارەی نێر (١٢١٢٥)کەس بووە و ژمارەی مێ (١٢١٢٩)بووە ژمارەی دانیشتوانی شاریش زۆرتر بووە لە گوندنشینانی، چەقی تەقتەق (١٥٠٠١) کەس بووە گوندنشینانی (٩٢٥٣) کەس بووە .

**پرۆژە خزمەت گوزاریەکانی تەقتەق :** لەگەڕانەوەی بەرێوەبەرایەتی ناحیەی تەقتەق لەسالی ١٩٩٥وە تا ٢٠١٢ بەسەدان پرۆژەی جوراوجۆر خزمەتگوزاری لەناحیەکە بونیات نراوە، هەر لە ماوەی نێوان سالانی (٢٠٠٠ – ٢٠١٢ ) زیاتر لە ٨ فەرمانگەی نوێ لە شارۆچکەکە کراوەتەوە وەك (تاپۆ و بانك و دادگا و دارایی و گواستنەوە و کتێبخانە و چاودێری

کۆمەلایەتی و خانەی رۆشنبیری مندالان و هۆلی سیمینار و کۆبونەوەو بنکەکانی پۆلیس — هاتوچۆ و دارستان و بەرگری شارستانی و سەنتەری لاوان و رۆشنبیری و نەخۆشخانەی ٥٠ قەرویلەیی ....تاد )هەروەها لە بورای گەشت وگوزار گازینۆی گەشتیاری تەقتەق و کۆرنیشی کەنار زێی بچووك وە لە بورای دابەشکردنی کارەبا وێستگەیکی ٣٣/١١ کەی ڤی ٣٢ مێگاواتی تێدا دروست کراوە ١١ قوتابخانەی بنەرەتی و ٥ ئامادەیی و ٤ خوێندنگەی ئێواران ٢ باخچەی ساوایانی تێدایە و لەسالی خوێندنی ٢٠١١ — ٢٠١٢ نزیکەی ٧ هەزار قوتابی و ساوای تێدابووە .

روالەتە دیارەکانی شارۆچکەی تەقتەق :

١. کێلگەی نەوتی تەقتەق ١٩٥٩ — ٢٠١٣ .
٢. پردی تەقتەق ١٩٥٤ — ١٩٥٨ .
٣. گردی ساتوقەلای شوێنەوار ٣٢٠٠ پ.ز.
٤. چیای گۆرقەرەج زێدی حاجی قادر .
٥. زێی بچووك شادەماری ژیان و ئاوەدانی تەقتەق .
٦. گازینۆی گەشتیاری تەقتەق.
٧. پارکی سایەی گەشتیاری .

**گوندی گامێشتەپە:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (گوێر)ە سەر بە قەزای (مەخموور)، هەندێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە کە نزیکەی (٢٠) مال دەبن، کە خەریکی کشتوکالّ و بەخێوکردنی مەڕو مالاّت و کاسبکارین لە ناوچەکەدا.

**ناحیەی گوێر:**

ئەم ناحیە سەر بە قەزای مەخموورە لە پارێزگای هەولێر، هەندێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە کە نزیکەی (٢٥) مال دەبن، کە خەریکی کشتوکالّ و بەخێوکردنی مەڕو مالاّت و کاسبکارین لە ناوچەکەدا.

**گوندی چەمەدویز:**
ئەم گوندە سەر بە قەزای (خەبات)ە، سەر بە پارێزگای هەولێر، هەندێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە و خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵاّت و کاسبکارین لە ناوچەکەدا .

- **هۆزی شێخ بزێنی لە سنووری شاری دهۆك:**

**ناحیەی روڤیا:** رۆڤیا یەکێك لە گوندە گرنگەکانی بەردەرەش و دەکەوێتە سەنتەری دەڤەری (دەشتی ناوکور)، بۆیە لەگەڵ بە قەزابوونی بەردەرەش بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ناحیەی رۆڤیا دامەزرا پاش بوونی بە ناحیە پێشکەوتنێکی باشی بەخۆوە بینی لە ڕووی ئاوەدانی و خزمەتگوزاری جۆراو جۆر وەك دروستکردنی کۆمەڵگای کارگێری و فراوانکردنی پرۆژەی ئاوی ڕۆڤیاو کردنەوەی سەرۆکایەتی شارەوانی رۆڤیا. ژمارەی دانیشتوانی ناحیەی رۆڤیا لەگەڵ گوندەکانی سەر بە ناحیە (٢٨٧٩١) کەس دەبێت و جگە لە سەنتەری ناحیە، ئەم گوندانەی هۆزی شێخ بزێنی تێیدا نیشتەجێ بوونە: (شێخانۆك- جوجەری گەورە- جوجەری گچکە- یەکمالە- زێلکەی عبدالعزیز(عدکۆ)- حەسەنیە- چەمە- ئیسماوە- دەربیستانی گەورە- دەربێستانی گچکە-پیرچاوش-خرابەواش- قەرەناز- ئۆمەرسێنان). ئەم ناحیەیە سەر بە قەزای (بەردەرەشە)، سەر بەپارێزگای دهۆکە، زیاتر لە (٢٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەناو ناحیە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانەکەی بەشێکیان فەرمانبەری میرین و بەشێکیشیان خەریکی کاسبکارین لەو ناوچەیە .

**ناحیەی دارەتوو:**
دارهەتوو یەکێك لەگوندە گەورەکانی قەزای بەردەرەشە کە دەکەوێتە سەنتەری دەڤەری بەربنی، لە نزیکەی (٦٠٠) شەش سەد خێزان پێکهاتووەو ژمارەی دانیشتووانی لە (٣٥٠٠) سێ هەزارو پێنج سەد کەس زیاترەو لە کۆنەوە بنکەیەکی تەندروستی لێ هەیە، بۆیە لەگەڵ بەقەزابوونی بەردەرەش ناحیەی دارەتوو دامەزرا. ناحیەی دارەتوو جگە لە سەنتەری ناحیە لە (٢٨) گوند پێك هاتووە، ئەو گوندانەی کە هۆزی شێخ بزێنی تێیدا نیشتەجێ بوونە ئەمانەن: (خاروك-دوگوندان-گربدەو-بەنێنان).

ئەم ناحیە سەر بە قەزای بەردەڕەشە لە سنووری پارێزگای دهۆك، زیاتر لە (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لە سنووری ناحیەکەدا نیشتەجێ بوون، بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و ئاژەڵداری و کاسبکارییە لە ناوچەکەدا بەشێك لە دانیشتوانەکەی فەرمانبەری میرین لە ناوچەکەدا .

**گوندی دووگوندان:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی ( دارەتوو )، سەر بەقەزای (بەردەرەش) لە پارێزگای دهۆك، زیاتر لە (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانەکەی خەریکی کشتووکاڵ و بە خێوکردنی مەرو ماڵا ت و کاسبکارین لەم گوندەدا.

**ئۆمەرسێنان:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (ڕۆڤیا)یە، سەر بە قەزای (بەردەڕەش)ە، لەپارێزگای دهۆك، نزیکەی (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و کاسبکارین.

***ئەو گوندانەی ناوچەی بادینان کەهۆزی شێخ بزێنی تێیدا نیشتەجێ بوونە :**

**دەربێستانی گەورە:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (ڕۆڤیا)یە سەر بە قەزای (بەردەڕەش)ە، لە پارێزگای دهۆك، زیاتر لە (٧٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندەیە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕوماڵات و کاسبکارین، ریش سپی گوندەکە بەرێزان (کاك حاجی یحیا علی) و (کاك ناصح)ە .

**دەربێستانی بچووك:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (ڕۆڤیا)یە، سەر بە قەزای (بەردەڕەش)ە، لە پارێزگای دهۆك، زیاتر لە (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێو کردنی مەڕو ماڵات و کاسبکارین، ریش سپی گوندەکە بەرێزان (کاك حمید)و (کاك محی دین)ن .

**جوجەری گەورە:**

ناوی ئەم گوندە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەوا کاتی خۆی لەم گوندە جوو هەبووە بۆیە لەسەر زاری خەلکی ناوچەکە بۆتە (جوجەر)، ئەم گوندە زیاتر لە (٨٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی تێیدا نیشتە جێن، ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی (ڕۆڤیا) سەر بە قەزای (بەردەڕەش)ە، لە پارێزگای دهۆك، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێو کردنی مەڕو مالآت و کاسبکارین، هەروەها حاجی عبداللە یەکێکە لە کەسایەتییەکانی هۆزی شێخ بزێنی کە لەو گوندە نیشتەجێ بووە خزمایەتی لەگەل یوسف ئاغای سەرۆك هۆزی شێخ بزێنی هەبووە، کچێکی داوەتە ئەوڕەحمانی حاجی محمود ئاغای شێخ بزێنی کە دەکاتە برای یوسف ئاغای شێخ بزێنی، هەروەها کچێکی تری داوەتە سەید ئەحمەدی چەمە و کچێکی تری داوەتە زێبارییان کە دەکاتە دایکی محمد سلیمی شۆشێ ی زێباری و دوو کچی تری داوەتە ماڵی امین ئاغای دارەتوو، ئێستاش وەچەکانی حاجی عبداللە هەر لەو گوندە نیشتەجێن، ریش سپی گوندەکە(مامۆستا عسمەت اسماعیل) و (کاك جلال کازم) و (کاك یاسین رەمەزان) و (کاك محمود اسماعیل) و (کاك بیلال غازی) (کاك شکر علی عبدالله)یە .

**گوندی جوجەری بچووك:**

ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی (ڕۆڤیا) سەر بە قەزای (بەردەڕەش)ە، لە پارێزگای دهۆك، زیاتر لە (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو مالآت و کاسبکارین، ریش سپی گوندەکە بەرێز (کاك تحسین عزیز)ە .

**گوندی زێلکەی عدکۆ:**

ئەم گوندە هەموو دانیشتووانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە کە زیاتر لە (٨٠) ماڵ دەبن ناوی ئەم گوندە لەوە هاتووە کەوا کاتی خۆی زێیەکی بچووك یان ئاوەکی بچووکی پێدا تێپەڕیوە واتە گوندەکە بە زێیەکە لکاوە بۆیە پێیان ووتوە زێلکە واتە بە زێ لکاوە، هەرچی ناوی (عدکۆ)یە کاتی خۆی شێخ عبدالعزیز وەکیلی بنەماڵەی شێخ عبدالقادری گەیلانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەو گوندە بووە کە گوندەکە هی بنەماڵەی شیخ عبدالقادری گەیلانی بووە بۆیە بە شێوەیەکی فەرمی لە حکومەت گوندەکە بە ناوی (زێلکەی

عبدالعزیز)ە، بەلام دواتر (عدكۆ) كە دەكاتە باوكی (حاجی احمد عدكۆ) لەویَ نیشتەجیَ بووە بۆیە هەر بە ناوی ئەو كراوە، ئێستاش (كاك حاجی احمد عدكۆ) و (كاك صلاح سلام) و (كاك حاجی صباح) ڕیش سپی گوندەكەنە، هەروەها ئەم گوندانەی بادینان دانیشتوانەكەی زیاتر خەریكی كشتوكالّ و چاندنی گەنم و جۆو شینایی كردنن بەلاّم لە پێشودا لەم گوندانە مەرەزەی برنج دەكرا بەلاّم بەهۆی بیَ ناوی ئێستا برنج ناچێنرێت، ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (ڕۆڤیا ) یە سەر بە قەزای (بەردەڕەش)ە، سەر بە پارێزگای (دهۆك)ە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریكی كشتوكال و بە خێوكردنی مەڕو مالاّت و كاسبكارین .

**گوندی خالووك:**

ئەم گوندە زیاتر لە (٥٠ - ٧٠ ) مالّ هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتەجێن، ئەم گوندە دەكەوێتە ناحیەی (ڕۆڤیا) سەر بە قەزای ( بەردەڕەش)ە، سەر بە پارێزگای دهۆك، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریكی كشتوكالّ و بەخێوكردنی مەڕو مالاّت و كاسبكارین، ریش سپی گوندەكە (كاك فخردین صالح)ە .

**گوندی قەرەناج:**

ئەم گوندە دەكەوێتە ناحیەی (ڕۆڤیا) سەر بە قەزای ( بەردەڕەش)ە، لەپارێزگای دهۆك، نزیكەی (١٠) مالّ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتە جیَ بوونە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریكی كشتوكالّ و بە خێوكردنی مەڕو مالاّت و كاسبكارین، ریش سپی گوندەكە بەرێز(كاك مولود)ە .

**گوندی خرابە واش:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیە ی (ڕۆڤیا)یە سەر بە قەزای ( بەردەڕەشە )،سەر بە پارێزگای دهۆك، ئەم گوندە زیاتر لە ( ٢٥) مالّ لە هۆزی شێخ بزێنی تێدایە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریكی كشتوكالّ كردن و بەخیوكردنی مەڕو مالاّت و كاسبكارین، ریش سپی گوندەكە بەرێز ( كاك صبحی)یە .

**گوندی حەسەنیە:**

ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی (ڕۆڤیا ) لە قەزای ( بەردەرەش ) سەر بە پاریزگای دهۆك، زیاتر لە (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتە جێ بوونە، دانیشتوانەکەی خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕ و مالآت و کاسبکارین لە ناوچەکەدا .

**گوندی ئیسماوە:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (ڕۆڤیا) یە سەر بە قەزای بەردەڕەشە سەر بە پارێزگای دهۆك، ئەم گوندە زیاتر لە (٣٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی تێدایە، دانیشتوانەکەی بەشێکیان خەریکی کشتوکال و بەخێوکردنی مەڕو مالآتن بەشێکیشیان خەریکی کاسبکارین لەو ناوچەیە .

**گوندی شێخانۆك:**

زیاتر لە (٤٠) ماڵ دەبن ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی (ڕۆڤیا) سەر بە قەزای (بەردەڕەش)ە، لەپارێزگای دهۆك ، زیاتر لە (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو مالآتن.

**گوندی چەمە:**

ناسراوە بە چەمەی سەید ئەحمەد، زیاتر لە (١٠٠)ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندەدا هەن ئەم گوندە سەر بە قەزای ئاکرێ یە سەر بە پارێزگای دهۆك، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو مالآت و کاسبکارین، ریش سپی گوندەکە بەرێزان (کاك ابراهیم) (کاك عبداللە) و (کاك عبدالرحمن)یە.

**گوندی پیرچاوش:**

ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی (ڕۆڤیا) سەر بە قەزای (بەردەڕەش)ە، لە پارێزگای دهۆك، زیاتر لە (١٥) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، هەروەها دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕومالآت وکاسبکارین، ریش سپی گوندەکە بەرێزان (کاك تەها) و (کاك جعفر)ە .

**کۆمەڵگای کەلەکچی:**

ئەم کۆمەڵگایە سەر بە ناحیەی (قەسرۆکە)، سەر بە قەزای (شێخان)ە، لە پارێزگای (موصل)، هەندێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، دانیشتوانەکەی بەشێکیان فەرمانبەری میرین و بەشێکیشیان خەریکی کاسبکارین لە ناوچەکەدا .

**گوندی کانی لان (کانیلان):**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (بەعشیقە) سەر بەقەزای (حەمدانیە)یە سەر بە پارێزگای (موصل)ە، ئەم گوندە زیاتر لە (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی تێدایە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و کاسبکارین .

**گوندی کێلە سپی:**

ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی (ڕۆڤیا) سەر بە قەزای ( بەردەڕەش)ە، لە پارێزگای دهۆك، ئەم گوندە نزیکەی (٥٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزینی تێدا نیشتە جێ بوون، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵو بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و کاسبکارین .

**چرە:**

چرە کۆمەڵگایەکە سەر بە ناحیەی (قەسرۆك)ە، سەر بە قەزای (شێخان) لە پارێزگای (موصل)، زیاتر لە (٤٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم کۆمەڵگایە نیشتەجێ بوونە .

**گوندی بە نێنان:**

کە زیاتر لە (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ ی ئەم گوندەن، ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (کەلەك) کلك، سەر بە قەزای (بەردەڕەش)ە لە پارێزگای دهۆك، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێو کردنی مەڕو ماڵات و کاسبکارین، کەسایەتی ناسراوی ئەم گوندە بەڕێز (مام حەسەن)ە.

**گوندی تۆبزاوە:**

ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی (ڕۆڤیا) سەر بە قەزای (بەردەڕەش)ە، لە پارێزگای دهۆك، زیاتر لە (٢٥) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتە جێ بوونە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بە خێوکردنی مەڕومالآت و کاسبکارین .

**قەزای ئاکرێ:**

زیاتر لە (١٠٠) ماڵ دەبن لە هوزی شێخ بزێنی کە تێیدا نیشتەجێن لەو قەزایە، کەسەر بە پارێزگای دهۆکە، بەشێك لە دانیشتوانەکەی فەرمانبەری میرین و بە شێکیشیان خەریکی کاسبکارین لەو ناوچەیەدا .

**قەزای سێمێل:**

زیاتر لە (٢٥) ماڵ هوزی شێخ بزێنی تێیدا نیشتەجێن، ئەم قەزایە سەر بە پارێزگای (دهۆك)ە، بەشێك لە دانیشتوانەکەی فەرمانبەری میرین و بەشێکیشیان خەریکی کاسبکارین لەو ناوچەیەدا .

**گوندی بائەلقوس:**

زیاتر لە (١٥)ماڵ لە هوزی شێخ بزێنی کەتێیدا نیشەجێن ئەم گوندە سەر بە قەزای (سێمێل)ە لە پارێزگای دهۆك، دانیشتوانەکەی خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو مالآت و کاسبکارین لەو ناوچەیەدا .

**گوندی مسریریك:**

زیاتر لە (٢٠)ماڵ لە هوزی شێخ بزێنی تێیدا نیشتەجێن، ئەم گوندە سەربە قەزای(سێمێل)ە، لە پارێزگای دهۆك، دانیشتوانەکەی خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕومالآت و کاسبکارین لەو ناوچەیەدا .

**باخرنیڤ (باخورنیف):**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (مانگیشك)ە، سەر بە قەزای (زاخۆ)یە سەر بە پارێزگای (دهۆك)ە، زیاتر لە (٣٠)مال لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو مالآت وکاسبکارین.

**گوندی ناڤش کێ:**

ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی (مانگیشك)ی سەر بە قەزای (زخۆ)یە سەر بە پارێزگای (دهۆك)، زیاتر لە (١٠) مال لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕومالآت وکاسبکارین.

**گوندی یەك ماڵە(یەك مالآ):**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (مانگیشك)ە، سەر بە قەزای (زاخۆ)یە لە پارێزگای (دهۆك)، زیاتر لە (٣٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە،دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕومالآت وکاسبکارین.

**گوندی ئۆسمانە(ئۆسمانا):**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (مانگێشك)ە، سەر بە قەزای (زاخۆ)یە لە پارێزگای (دهۆك)، زیاتر لە (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕومالآت و کاسبکارین.

**گوندی کێستا:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (مانگێشك)ە، سەر بە قەزای (زاخۆ)یە لە پارێزگای (دهۆك)، بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕومالآت و کاسبکارین.

**گوندی گرێ سۆران:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (مانگێشك)ە، سەر بە قەزای (زاخۆ)یە لە پارێزگای (دهۆك)، بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕومالاَت و کاسبکارین.

**گوندی سەراڤکێ(سەراف کێ):**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (مانگێشك)ە، سەر بە قەزای (زاخۆ)یە لە پارێزگای (دهۆك)، زیاتر لە (٣٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانی ئەم گوندە خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕومالاَت و کاسبکارین.

**زاخۆ:**

قەزای زاخۆ یەکێکە لەو قەزایانەی کە سەر بە پارێزگای (دهۆك)ە، لەناو سەنتەری قەزای زاخۆ زیاتر لە (١٠٠)ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ بوونە لەم قەزایە، دانیشتوانەکەی بەشێکیان فەرمانبەری میرین و بەشێکیشیان خەریکی کاسبکارین لەو ناوچەیەدا.

هۆزی شێخ بزێنی نزیکەی (٥٠٠-٦٠٠)ماڵ دەبێت کەنیشتەجێن لە زاخۆ و سێمێل بە هەموو ناوچەو گوندەکانیەوە .

ئەم شارە کەوتۆتە لای باشووری خۆرهەلاَتی جەزیرەو نزیکەی (٩٠) میلێك لێی دوورە، دوورگەیەکی بەردینە لەسەر رووباری خابوور، ئەم رووبارە لە سەرووی شارەوە هاژە دەکا و دەڕژێتە دەشتێکی چەوینی بەربلاَوە، پردێکی بەردین بەشی خوارووی شار بەسەرروویەوە دەبەستێ، پردەکە لە وەرزی لافاودا ئاوی رووبار دایدەپۆشێ، هەوای شار خۆش و سازگارە، هەندێکیش دەلێن ناسازەو لەهەوای (جەزیرەی ئیبنوعومەر) سەخت و تووشترە، چونکە دێهاتی زۆر کەوتوونەتە بەشی سەرووی ئەم رووبارە، گەنم و جۆو برنج و جۆرەها میوە لەم شارەدا وەبەرهەم دێن، دەوروبەری شاریش بۆ ئاژەڵداری لەوەڕگایەکی باشە، بەشێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ بوونە لەو ناوچەیە .

**شاری دهۆك:**

لە چەند گەڕەکێك لەناو شاری دهۆك هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ بوونە بەتایبەتی لە گەڕەکی (حی الشرطة_مالتا_ زرکا.... هتد)، زیاتر لە (٣٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ بوونە لەم شارەدا، بەشێك لە دانیشتوانەکەی فەرمانبەری میرین و بەشێکیشیان خەریکی کاسبکارین لەناوچەکەدا.

**گوندی گریدەو:**

ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی (دارەتوو) سەر بە قەزای (بەردەڕەش)ە، لە پارێزگای دهۆك، زیاتر لە(١٥) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانەکەی خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو مالأت و کاسبکارین لە ناوچەکەدا .

**گوندی مەم و زین:**

ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی (دارەتوو) لە قەزای (بەردەڕەش) سەر بە پارێزگای دهۆك، زیاتر لە (٧) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، دانیشتوانەکەی خەریکی کشتوکاڵ و بە خێوکردنی مەڕو مالأت و کاسبکارین لە ناوچەکەدا .

**قەزای بەردەڕەش - مێژووی بەردەڕەش**

بەردەرەش شارێکی خنجیلانەی هەرێمی کوردستانە، لە تۆمارەکانی دەولەتی عوسمانی بەدیار دەکەوێت بەردەرەش بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٨٩٠) بوو بە ناحیە، ئەو کات بەردەرەش یەکەم ناحیە بووە لە دەڤەری ئاکرێ و سەر بە موصل بووە. بۆ ماوەیەك ئیدارەی ناحیەی هەلوەشایتەوەو لە ساڵی (١٩٣٠) دووبارە ئیدارەی ناحیەی بەردەرەش کەوتەوە کارو ناوەکەی هاتە گۆرین بۆ (ناحیە العشائر السبعە) تەعریب کراوە بە بیانووی هەبوونی حەوت خێل لە دەڤەرەکە کە یەکێك لەو خێلانە خێلی شێخ بزێنی یە، زۆر بۆچوون هەیە لەسەر ناوی بەردەرەش لەوانەیە لە خاکەکەی هاتبێت کە خاکێکی ڕەشە بۆ کشتوکاڵ زۆر بە پیت و بەرەکەتە، شوێنێك هەیە پێی دەلێن شاخی ڕەش و لە کۆنەوە شوێنی گوندی بەردەرەش بووە، پێش ئەوەی بێتە گواستنەوە بۆ شوێنی ئێستای، ڕای تر هەیە دەلێن ناوی بەردەرەش لە چیای بەردەرەش هاتووە، کە دەکەوێتە رۆژهەلاتی کوردستانی مەزن، لەبەرئەوەی خەلکی ئەوێ

بەهۆی هیشکە ساڵی و بێ بارانی و گرانی، لە دەڤەری گەرمیان و شەقلاوەو رانیەو رواندز روویان کردۆتە دەڤەری بەردەرەش و شێخان ئەو ناوەیان لەگەڵ خۆیان هێناوە، جگە لە هۆکاری سروشتی هۆکاری سیاسیش هەبووە بۆ ئەو کۆچ کردنە.

لەبەر شوێنی ستراتیجی ناحیەی بەردەرەش کە دەکەوێتە نێوان پارێزگای موصل و قەزای ئاکرێ و بەستنەوەی هەردوو پارێزگای دهۆك و هەولێری پایتەخت، هەروەها رووبەری دەڤەرەکە کە (٣٩٩,٢٠٠) دۆنم زەوی کشتوکالی بە پیت و بەرەکەتە، دوای (١١٦) ساڵ بڕیاری بە قەزابوونی بەردەرەش دەرچوو.

بە پێی بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ژمارە (١٠) لە بەرواری (٢٠٠٦/١٠/١٢)، بەردەرەش بوو بە قەزاو دوو ناحیەی نوێ هاتە دامەزراندن لەگەڵ بەستنەوەی ناحیەی کەلەك بە قەزای بەردەرەش، بەردەرەش لە سێ ناحیە پێك هاتووە کە ئەمانەن:

١- ناحیەی روڤیا ٢-ناحیەی دارەتوو ٣- ناحیەی کەلەك

جوگرافیای دەڤەری بەردەرەش: قەزای بەردەرەش دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەلاتی پارێزگای دهۆك و نێوان زێی گەورە لەلای رۆژهەلاتەوەو رووباری خازر لەلای رۆژئاوا، و سنورەکانی بەردەرەش بەو شێوەیە:

١. باکور : قەزای ئاکرێ و قەزای شێخان .
٢. رۆژهەلات : قەزای ئاکرێ و زێی گەورە .
٣. رۆژئاوا : قەزای شێخان و رووباری خازر و قەزای حمدانیە .
٤. باشور : پارێزگای هەولێر .

بە گشتی دەڤەری بەردەرەش لەسێ ناوچەی سەرەکی پێکهاتووە(دەشتی ناوکور، بەربنی، دەڤەری بۆتان).

بە شێوەیەکی گشتی دەڤەری بەردەرەش بەبێ بەرهەمی کشتوکالی نابێت چونکە خاوەنی ئەو سێ شوێنەیە کە خوای گەورە پێی بە خشیوە، و هەر دەڤەرەك تایبەت مەندی خۆی هەیە و رووبەری بەردەرەش (٣٩٩,٢٠٠ ) دۆنمە.

ناوی ئەو گوندانەی کە هۆزی شیخ بزێنی تیدا نیشتەجی بوونە : (مەم و زین- کانیلان).

-قەزای بەردەرەش سەر بە پارێزگای دهۆکە، سەنتەرەکەی شارۆچکەی (بەردەرەش)ە، و دەلێن لە سەرەتاذا سەنتەری ناحیە لە گوندی (بەرازی) بووە و پاشان گوندی (جووجەر کە زۆربەی

دانیشتوانەکەی لە هۆزی شیخ بزێنی یە) کراوەتە سەنتەری ناحیەو پاشان (پیش زیاتر لە سەد سال لەمەوبەر) لەگوندی بەردەرەشی گەورە جیگیر بووە، کە ئەوسا (بەردەرەش وەلەد)یشی پێ دەگوترا سالی ١٩٣٦ یەکەمین قوتابخانە لەو ناحییەیە کراوە تەوەو ژمارەی دانیشتوانی سەنتەری ناحیەی (بەردەڕەش)نزیکەی (١٠٠٠٠) کەسەو، دارەتوو و بەنێنان کە بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنینە و ئۆمەرسێنان و زەنگەنان لە گوندە گەورەکانی ئەو ناحیەیەن. ناحیەی بەردەڕەش دەکەوێتە باشووری قەزای ئاکرێ لە نێوان زێی گەورە لە ڕۆژهەلاتەوە و ڕووباری خازر لە رۆژئاواوە، هەروەها لەباشوورەوەش ناحیەی کەڵەك (کەڵەکی یاسین ئاغا کە زۆر لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە) و ناحیەی بەرتلە کە هەردووکیان سەر بەقەزای حەمدانیە (قەرەقوش)ن ،لەباکورەوەش ناحیەی گردەسێن و زێی گەورە لە ڕۆژهەلاتەوە ئەو ناحیەیە جیا دەکاتەوە لە ناحیەی سەلاحەدین و خەبات (سەر بە پارێزگای هەولێر) و لە ڕۆژئاواوە ڕووباری خازر جیای دەکاتەوە لە ناحیەی مرتبا (سەر بە قەزای شێخان کەبەشێك لە دانیشتوانی ئەوقەزایە لەهۆزی شێخ بزێنینە) ناحیەی بەردەڕەش ٣٢کم لەمووسڵەوە دوورە و ڕوو پێوی ناحیەکە ٨٩٣کم دەبێت (بەپێی دابەشکردنەکانی ساڵی١٩٩٠) ولە دوای ناحیەی دینارتە (نەهلە) لە ڕووی ڕووبەرەوە گەورەترین یەکەی کارگێرییە لە قەزاکەدا و، ژمارەی دانیشتوانی سەرجەمی ناحیەکە نزیکەی (٥٢٠٠٠) کەسە بەپێی سەر ژمێری سالی ١٩٩٨ کە لەلایەن بەرنامەی خۆراکی جیهانی (wfp) سەر بە (un ) ئەنجامدراوە. لەوەتەی چەسپاندنی دابەشکردنە ئیدارییەکان کە ساڵی ١٨٧٩ لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانییەوە ئەنجامدراوە، ناحیەی بەردەڕەش بە (عەشائر سبعە) ناوزەد کراوە، و وەکو یەکەیەکی ئیداری هەر هەیە. هەر لەو ساڵەشدا بوو واتە ساڵی (١٨٧٩)، کە ولایەتی مووسڵ سەر لە نوێ وەکو ولایەتێکی سەربەخۆ دامەزرایەوە و جگە لە سەنجەقی مووسڵ، هەریەکە لە سەنجەقەی سلێمانی و شارەزوور (کەرکوك)یشی گرتەوەو ئەم ناحیەیە (عەشائیر سەبعە) یەکێك بوو لەو دوو تاکە ناحیەیەی کە ئەو کات سەر بەقەزای مەرکەزی ولایەتی مووسڵ بوون، کەواتە بەردەڕەش یەکێکە لە کۆنترین ناحیەکانی کوردستان لەبەر ئەوەش پێی دەوترێت (عەشائیرسەبعە) چونکە (٧) عەشیرەتی کورد لە سنووری ئەو ناحیەدا نیشتەجێن و بەم شێوەیەی خوارەوە:

| ژمارە | ناوی عەشیرەت | رێژەی لە دانیشتووانی ناحیە |
|---|---|---|
| ١- | رەژووگەری | ٥٥٪ |
| ٢- | گێژ | ٢٣٪ |
| ٣- | بۆت | ١١٪ |
| ٤- | شێخ بزێنی | ٢٪ |
| ٥- | خدری | ١٪ |
| ٦- | زەنگەنە | ١٪ |
| ٧- | شارك | ١٪ |
| ٨- | عەشیرەتی دیکە | ٦٪ |
| | کۆی | ١٠٠٪ |

**شێخ بزێنی:** بنەچەیان دەگەرێتەوە بۆناوچەی شێخ بزێنی سەر لێواری زێی بچووك لە نێوان هەردوو پارێزگای هەولێر و کەرکوك و لەسەردەمی پێشتریشدا دەگەرێتەوە بۆ لەکستان لە کوردستانی ئێراندا و، لە(٤) گوند لە رۆژهەلاتی ناحیەدا نیشتەجێن و نزیکەی ٢٪ی دانیشتوان پێکدەهێنن[١] و بەناوبانگترین گوندیشیان ئەمانەیە: (جوجەری گەورە و گچکە-زێلکا-چەمە-دەربێستان).

**قەزای شێخان (ئیسفنێ):** سالی ١٨٩١ لە سالنامەی مووسل کەلەلایەن عوسمانییەکانەوە دەردەچوو، هاتووە،کە قەزای مووسل لە دوو ناحیە (عەشائر سەبعە وشێخان)پێکدێت کە هەندێك لەدانیشتووانی ئەم قەزایە لە هۆزی شێخ بزێنیە، بۆیە شێخان وەك ناو و وەك سەنتەری ئیداری بەلای کەمەوە تەمەنی لە سەدەیەك پترە .

ناوی شێخان زیاتر بۆ برا ئێزدییەکان و میرنشینەکەیان وشێخەکانیان وەك شێخ ئادی و شێخ حەسەن و شێخ مەحەمەد رەشان و ...هتد دەگەرێتەوە. مەزاری هەموو ئەو شێخانەش کە بۆ

[١] - عەشیرەتی شێخ بزێنی جگە لە کەرکوك و هەولێر و ناحیەی گۆرانەتی لەکوردستانی تورکیاو تورکیاش لە دەورووبەری ئەنقەرە و قونیە هەن .

ئێزیدییەکان گەلێك گرنگە دەکەونە دەوروبەری سەنتەری قەزای شێخان و برا ئێزیدییەکان زۆرینەی دانیشتوانی ئەم قەزایە پێك دەهێنێت، هەروەها لە ناوەندی قەزای شێخان چەند ماڵێك لە هۆزی شێخ بزێنی لەو قەزایە نیشتەجێ بوونە، کە هەموو ئەمانە بە شەرەفانی ناسراون لە نێوان خەڵکی ناوچەکەدا .

أ- ڕووی ناوچەکە:

سنووری شێخان لە باکوورەوە ئامێدی و لە باشوورە قەزای مووسڵ و لەرۆژهەلاتەوە ڕووباری خازر کە لە قەزای ئاکرێ دادەبڕێت و لە ڕۆژئاواوە قەزای تلکێفە، (قەزای تلکێف لە شەستەکانەوە پێك هێنراوە). بەپێی دابەشکردنە ئیداریەکانی ساڵی ١٩٩٠ ڕووپێوی قەزاکە ١٣٣١کم٢ دەبێت و ژمارەی دانیشتوانی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کە بریتییە لە هەر سێ ناحیەی ئەترۆش و قەسرۆك (مێربای) پێشان و باعەدرێ (تازە دامەزراوە) و هەردوو کۆمەڵگای چرە و کەلەکچی و (٩٦)گوند ، (٥٥٨٦٩) کەسە، بەپێی بەرنامەی خۆراکی جیهانی سەر بە (UN) کە لە ساڵی ١٩٩٧ ئەنجام دراوە. کورد لەم قەزایەدا نزیکەی ٨٦٪ دانیشتوان پێك دەهێنن و ٢/٣ ی قەزاکە (هەردوو ناحیەی مرێبا و ئەترووش و بەشێك لەگوندەکانی سەر بە مەڵبەندی قەزا ، کە شارۆچکەی باعەدرێ بەشێکە لەوە) لە ڕاپەڕیندا ئازاد کراوە. خاکی قەزاکەش لە (٣) ناوچەی بەرز و نزمی جیا جیا پێکدێت:

١-ناوچەی شاخاوی: ئەم ناوچەیە دەکەوێتە باکووری قەزاو هەموو ناوچەکانی ناحیەی مزووری (ئەترووش) دەگرێتەوە و نزیکەی ٣٠٪ی ڕووپێوی قەزاکە پێکدەهێنێت .

٢-ناوچەی دەشتایی : دەشتی ناوکوڕ ودەشتی پەپایێ و هەروەها دەشتی شەمکان دەگرێتەوە و دەکەوێتە ناوەراست و نزیکەی٦٠٪ ڕووپێوی قەزاکە پێکدەهێنێت

٣-ناوچەی گەوەك: دەکەوێتە باشوورو قەدپاڵی چیای مەقلوب (١٠٥٧ م) دەگرێتە خۆی و نزیکەی ١٠٪ ی ڕووپێوی قەزاکە پێکدەهێنێت

ب-دابەشکردنی کارگێڕیی قەزای شێخان: لەڕاستیدا قەزای شێخان و پێش ئەوەی بچووك بکرێتەوە مۆزەخانەی ئایینەکان و گەلان وزمان و تیرەکان بوو، چونکە ئیزدی و موسڵمان (بەسونە و شیعە) مەسیحییەکان بە کەنیسە جیا جیاکانەوە هەروەها چەندین دیالێکتی جیا جیای زمانی کوردی و عەرەبی و دیالێکتە ئارامییە جیاجیا کانی بەخۆوە گرتبوو.

لەراپەرینی شکۆمەندەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١ زۆربەی هەرە زۆری دێهاتەکانی قەزای شێخان بەمەرکەزی قەزاکەشەوە رزگار کرا ، بەلاَم ئێستا خودی مەڵبەندی قەزای شێخان

(ئیسفنیێ) لەگەڵ (٤٨) گوندی کوردان لە کۆی (٧٠) گوند و (مقاتع)ی سەر بەناحیەی سەنتەری قەزای شێخانە.

**ناحیەی کەلەك (ئەسکی کەلەك):**

کەلەك لە ساڵی ١٨٨٠ سەر بە دەڤەری شێخان بوو، لە ساڵی ١٩٣٠ بە قەزای ئاکرێ بەستراوە تاکو لە سالی ١٩٦٨ خرایە سەر قەزای (حمدانیە) و لە سالی ١٩٧٢ کەلەك بوو بە ناحیەو لە (٢٨) گوند پێك دەهات و سەر بە قەزای حەمدانیە بوو تاکو لە (١٩٨٧/٦/١١) بە پێی فەرمانی کۆماری (مرسوم جمهوری) ژمارە (٣٢١) ناحیەی کەلەك هاتە هەڵوەشاندن و لەگەل (٢٨) گوندەکە سەر بە قەزای حەمدانیە مانەوە، سەر بە قەزای ئاکرێ بوو، دوای بە قەزابوونی بەردەرەش لە ساڵی ٢٠٠٦ کەلەك لە قەزای ئاکرێ دابڕاو بە قەزای بەردەرەش لکێندرا. ناحیەی کەلەك ڕووبەری گشتی (٤٢٠٠٠) دۆنم دەبێت، کەلەك لەبەر ئەوەی دەکەوێتە سەر رێگای سەرەکی (هەولێر – موصل) و سەر رووباری زێی گەورە، شوێنەکەی زۆر گونجاوەبۆ ئەنجامدانی پرۆژەی گەشت و گوزاری .

ناحیەی کەلەك پێشتر گوندێکی ئاسایی کوردنیشینی سەر رووباری زێی گەورەی سەر رێگای سەرەکی نێوان موسڵ و هەولێر بوو، هەر لە دێر زەمانەوە ئەم شوێنە بەناو بانگ بووە بە (کەلەك) بۆ پەرینەوەی قافلە و سەرباز و خەڵك ،لەم (کەلەکانە) ش ناوی (کەلەك) وەرگیراوە ، لە ناوچەکەشدا بە (کەلەکی یاسین ئاغا ) بەناوبانگە ، لەنزیك ئەم گوندە تا سەرەتای سەدەی رابردوو گوندێك هەبوو و جێی نیشتە جێبوونی ئێزیدیە داسنیەکان بوو و پێ ی دەگوترا گوندی (عبدالعزیز)[1] بەلاّم لەبەر ئەوەی بەردەوام ئێزدیەکان تووشی چەوسانەوە دەبوون ، ئەوێیان جێهێشت و دواتر تیرەکانی شێخ بزێنی و بۆت و پالانی و رەژووکەری لێی نیشتەجێ بوون، ئەوسا ناوی بوو بە (کەلکی یاسین ئاغا ) . ناحیەی کەلەك دەکەوێتە رۆژهەلاّتی قەزای حەمدانیە و هەموو رووبەری نێوان رووباری زێی گەورە و خازری باشووری ناحیەی (بەردەرش)ی سەر بەقەزای ئاکرێ دەگرێتەوە . دانیشتوانی ئەم گوندە پێکهاتووە لە

[1] - بڕوانە: رحلە نیبور الی العراق فی القرن الثامن عشر، وەرگێڕانی: د . محمود حسین الامین ، ١٩٦٥ .

کوردی گۆرانی ڕەژووکەری و بۆت و شێخ بزێنی و پالانی، بەلام لەسەردەمی کابینەی سێیەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان سەر لە نوێ سالی ١٩٩٧وەك خۆی کرایەوە ناحیە[١].



نادر اغای شێخ بزێنی



عبدالله اغای شێخ بزێنی



سلێمان اغای شێخ بزێنی

ئەم ناحیە سەر بە قەزای (بەردەرەش)ە، لە پارێزگای دهۆك، زیاتر لە (١٠٠) مال لە وەچەی یاسین ئاغای شێخ بزێنی و چەند مالێکی تر لە هۆزی شێخ بزێنی لە پاش سالانی (١٨٠٠)ەوە، هاتوون نیشتەجێ بوونە لەم ناحیەیە، کە پێش هاتنیان بۆ ئەم ناحیە لە گوندی (کەورگۆسك) بوونە دواتر چووینە بۆ گوندی (چەمەی سەید ئەحمەد) پاشان جێگیر بوونە لە ناحیەی کەلەك، تاوەکو ئێستاش هەر لەو ناوچەیە نیشتەجێنە، دانیشتوانەکەی زۆرتر خەریکی کشتوکال و کاسبکارییە لەم ناوچەیەدا،کاتی خۆی شارۆچکەی کەلەك گوندێکی گچکە بووە بەناوی کەلەکی داسنیان و هەمووی ئێزدی بووینە و لەشوێنی ناحیەی کەلەکی ئەمڕۆش گوندێکی ئێزدیان بەناوی کەلەك هەبووە . برا گەورەی هەردوو گوندی ئەوبەرو ئەوبەری رووبار ناوی (کافتی ) بووە ،دوای ئەوەی پاشای کوڕە هێرشیان بۆ دێنێت بەبێ شەڕ ئەم ناوە بەجێدێلن و بەرەو شەنگارو شێخان ڕەو دەکەن و پاشان زۆربەی خاکی رۆژهەلاتی رووبار دەکەوێتە بەردەستی ئاغای دزەییان و هۆزی جۆراو جۆری تیا نیشتەجێ دەبێت و بەری رۆژئاواش دەبێتە مولکی یاسین ئاغای شێخ بزێنی و بەکەلەکی یاسین ئاغا دەناسرێت، ناوبراو کەسایەتیەکی ناسراو و خاوەن پێگەو دیوەخان بووە لە ناوچەکە.

[١] - خەسرۆ گۆران، کورد لە پارێزی مووسل، دەزگای چاپ و بلاگردنەوەی ئاراس، هەولێر،٢٠٠٢، ل١٢٠ .

**مەرکەزی شێخان :**

شارۆچکەی ئیسفنیێ (سەنتەری قەزا) دەکەوێتە لای باکووری دەشتی فراوانی ناو کورِ لە قەدپاڵی زنجیرە چیایەکی نزم، سنورەکەشی لە باکوورەوە ناحیەی مزووری ولە رۆژهەڵاتەوە رووباری گومل و ناحیەی مریبا و لە رۆژئاواوە قەزای تەلکێف و لە باشورەوە چیای مەقلوب و قەزای مووسڵە. سەنتەری قەزا لە سەنتەری پارێزگای مووسڵەوە (٤٥ کم )دووره و هەر لە زووەوەش سیمای تایفەی ئێزیدی بەسەر دانیشتوانی شارۆچکەکەدا دیاربووە. مەرکەزی قەزا نزیکەی (٧٠) گوند بەخۆوە دەگرێت، کورد لە ٦٦ گوندی ناحیەکەدانیشتەجێن، (٤) گوندەکەی دیکەش عەرەب تیایدا نیشتەجێن، لە (٢٧) گوندی کوردانیشیندا تیرەکانی ئێزیدی و، لە (٢٠)گوندا عەشیرەتی گۆران (لەوانە لە (٦)گوندا رۆژبەیانی و لە ٧ گوندا ئۆمەربلە و لە ٣ گوندیشیاندا داودە و لە (٢) گوندا موسەیی و لە گوندێکیاندا گێژ و لە گوندێکیشیاندا خدری ) و لە (١١)گوندا تیرەکانی کوچەر یان ئەتروشی (لەوانە زێدك لە ٩ گوندا و لە ٢ گوندا شەرەفان و لە (١٠) گوندیشدا عەشیرەتی مزووری نیشتەجێن. لەناو سەنتەری قەزاکە چەند ماڵێك لە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتەجێ بوونە و چەند گوندێکیش سەر بەو قەزایە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتەجێ بووە، کە لە نێو خەلکی ناوچەکە بە شەرەفانی ناسراون، هەروەها گوندی (جفتە) و (پیران) دانیشتووانەکەی هەموو لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

**قەزای شێخان:**

ئەم قەزایە سەر بە پارێزگای (موصل )ە، چەندین ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەویێ نیشتەجیێ بوونە هەروەها گوندی (پیران — چفتە — شیفکیێ — ئاشکە) سەر بەقەزای شێخان کەوا هۆزی شێخ بزێنی لیێ نیشتەجێنە، بەڕێز حازم عبدی حسن سلێمان برا گەورەی ئەم ناوچەیە هەروەها حاکم محمدامین هادی حسن و حاکم عبداللەکەسایەتی ناوداری ئەم ناوچەیەن.



## هۆزی شێخ بزێنی لە سنووری شاری مووسڵ:

[redacted]



**مەڵبەندی مووسڵ:**

ڕووبەری بەشی کوردی مەڵبەندی مووسڵ نزیکەی (٢٠٨ کم )ە، لەشاری مووسڵ (بەهەردوو بەری دەستە ڕاست و دەستە چەپ) دوو ملێون کەس دەژین و ڕووباری دیجلە شارەکە دەکاتە دوو بەش . بەری ڕاستی کۆنترە و شارەکە کۆنە و کۆڵان و گەڕەك و حەوت دەرگاکەی تێدایە (باب التوپ، باب الجسر و باب الجدید، باب لکش، باب سنجار، باب سەرای، باب ئەلبێز). ئەم بەشە لە٨٧ گەڕەك پێکدێت، هەرچی بەری چەپی شارەکەیە (کەناری دەستە چەپ) کەبابەتی لێدوانەکەمانە چونکە بەبەشێکی کوردستانی دەزانین، ئەم بەشە ئێستا گەورەترە و هەروەها پێی دەگوترێ نەینەوا، کە١٢٠ گەڕەك دەگرێتە خۆ. هەر لە ساڵی ١٩٦٨یشەوە شاری مووسڵ (تا ئەمرۆ ٢٠١٤) بەسێ کەڕەت گەورەتربووە، کەش و هەوای مووسڵیش بەفێنکی وەسف دەکرێ لەعێراقدا و لەوەرزی بەهار و پایزدا سەوز هەڵدەگەڕێ، بۆیە ناوی نراوە (أم الربیعین) واتە (خاوەن یان دایکی دوو بەهاران ). گرنگترین شوێنەواری کەناری دەستەچەپیش مزگەوتی مەرقەدی یونس پێغەمبەرە (النبی یونس) کە باوەڕ وایە یونس پێغەمبەر ( دروودی خوای لێ بێت) لەوێ شاردراوەتەوە، هەروەها لە شوێنەوارە گرنگەکانی تری ناو شاری مووسڵ شوێنەواری نەینەوای کۆنە .

شاری مووسڵ مێژوویەکی پڕ لە ڕووداو لە خۆدەگرێ و لە کۆندا پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری بووە، نەینەواش لە ناو ئەم شارەدایە کە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی فارس ناوی (میسلا) بووە، هەروەك مێژوونووسی یۆنان (کزینەفۆن) لەساڵی( ٤٠١ )پێش زاینی باسی لێوەدەکات، کوردیش هەر لە کۆنەوە لەوێ ژیاون، هەروەك لەساڵی ٦٣٧ ی زاینیدا هاتووە مووسڵ لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشێکیان مەجوسەکان (کورد )ی تێدا ژیاوە و بەشەکەی تریش مەسیحییەکان. گەشتناسی فەرەنسی (ئۆلیڤیە ) ساڵی( ١٧٩٤) زاینی دەڵێ لە مووسڵدا (١) هەزار جوولەکە و (٢٥) هەزار عەرەب و (١٦) هەزار کورد دەژین. هەروەها گەریدەی بەریتانی (جاکسون ) کە لە ساڵی (١٧٩٧) سەردانی مووسڵی کردووە دەڵێت: (شاری مووسڵ پڕە لە دانیشتووان و جۆرەها ئاینی لەخۆوە گرتووە، بەڵام زۆربەی دانیشتووانی کوردن کە عەرەبەکان پێیا دەڵێن (کرد)، شاری مووسڵ پێکدێنن، هەروەها کەمینەیەك لە برایانی نەتەوەی کورد لەم شارە جێگیرن)، ئەوەی دەشزانرێ ئەوەیە کە لە سەردەمی ئۆلیڤەردا (١٩٧٤ز) مووسڵ تەنیا دەکەوتە سەر ڕۆخی دەستە ڕاست، واتا بەری ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلە، بەڵام ئەمرۆ کۆمەڵگای مووسڵ پێکهاتەیەکی ئەسنۆگرافی تێکەڵ لە ڕووی نەژاد و

ڕەگ و ڕیشەوە پێك دێنێ، عەرەبەکان زۆرینە و دوای ئەوانیش کورد دێت، ئەگەرچی بەشێکی زۆریشی لە کوردەکان لە زووەوە لە شارەکەدا بەپێی گوزەرانیکردن و لەرێی ژنهێنان و ژنخواستن، تواونەتەوە و تێکەڵ بە عەرەبەکان بوون و توێژێکی کۆمەلایەتی تازەیان پێکهێناوە، کە دەتوانین ناوی (کوردە بەعەرەب بووەکانیان لێ بنێین، یا (مووسڵییەکان) هەروەك خۆیان دەیڵێن ،زۆربەی خێزانە مووسڵیە کۆنەکان نەژادیان کوردە ،وەك خێزانی (جەلیلی) کەبۆ ماوەی سەد ساڵ (١٧٠٠-١٨٠٠) فەرمانڕەوای ئەوێ بوون هەروەها (جادریەکان) کە دەوڵەمەنترین دەوڵەمەندی شاری مووسڵ بوون و، (ئاغەوات و چلمێران و ئالکەسۆ و قەدۆ و رەزوانی و ئال رەشان و مودەرس و هی تر ) تا ئەمرۆش ئەم خێزانانە لە دیارترین خانەوادەکانی مووسڵی کۆنن. ئەمرۆش کوردەکانی مووسڵ بەپلەی یەکەم لە عەشیرەتەکانی شەبەك و گۆران و کیکان و گۆیی و بەرواری و رێکانی وهەرکی و کۆچەر و شێخ بزێنی و گەرگەری وئێزیدی و هەندێ عەشیرەتی دی پێکهاتوون، ئەگەر ئێستا لە مووسڵدا سەرژمێریەکی راستەقینە بکرێ ئەوا بۆمان روون دەبێتەوە کە دانیشتوانی مووسڵ نزیکەی نیوەیان یان پتریان کوردن بۆیە زۆر لە بنەماڵەکان لە هۆزی شێخ بزێنی دانیشتووی شاری مووسڵن کە بەتایبەتی لە گەرەکی (رشیدی) و (حدباو)....هتد، چەندین ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم شارەیە نیشتەجێ بوونە کە زۆربەیان لە نەوەکانی (حسن ئاغا)ی کوڕی مەلا ئەحمەدی پاپیرە گەورەی شێخ بزێنی یە، ئەمە جگە لەوەی کە دەورووبەری شاری مووسڵ و گوندو ناوچەکانی تر ،هۆزی شێخ بزێنی لەو ناوچانە نیشتە جێ بوونە و بووەتە زادگایان و ژیانیان لەو ناوچانە بەسەردەبەن، هەروەها چەند گوندێکیش لە دەورووبەری شاری مووسڵ هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتەجێ بوونە لەوانە: گوندی عرێعر.

**-قەزای تەلەعفەر :**

**-شوێنی جوگرافی و سروشتی:** قەزای تەلەعفەر دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای پارێزگای مووسڵ، لە باکوور و باکوری رۆژئاوای ئەم قەزایە سنووری دەوڵەتی سوریا یە و، رۆژئاواشی قەزای شەنگارەو، رۆژهەلات و باکووری رۆژهەلاتی ڕووباری دیجلەیە کە لە پارێزگای دهۆك جیای دەکاتەوە و، لە ڕۆژهەلات قەزای تلکێف و قەزای مووسڵە و باشوریشی قەزای حەزەرە.

بەپێی دابەشکردنەکانی ساڵ (١٩٨٧) یش رووبەری قەزاکە (٤٢٩٧)کیلۆمەتری دووجایە و لەم ڕووبەرە (٣٤٧٣) کیلۆمەتر دووجای (واتە٨٠٪ )قەزاکەی خاکی کوردستانی عێراقە.

لەرووی سروشتیەوە قەزاکە بریتییەلە ناوچەیەکی دەشتایی پان و بەرینی بەپیت، کە لە باکوورەوە بەرزایەکانی (قەرەچوغ)ی کوردستانی سوریا دەوری داوە و لە ڕۆژهەلاتیشەوە شان بەشانی ڕووباری دیجلەیە. باشوری دەشتی تەلەعفەر درێژ دەبێتەوە تاکو دەگاتە ئەو تەپۆلکانەی بەچیای شەنگار دەور دراون، بەمانەش شێوەی سێگۆشەیەکی یەکلا پێکدێت کە سەری سێگۆشەکە خالّی بەیەکگەیشتنی سنووری عێراق و سوریایە لە نزیك دێی پیشخابوور و، ئاڤا مەزنیش لای ڕۆژهەلاتی سێگۆشەکە و سنوری سوریاش لاکەی دی و بنکەی سێگۆشەکەش بووە سنووری نێوان هەرێمی کوردستان و هەرێمەکانی تری عێراق لەرووی سروشتیەوە دەتوانین ڕووی قەزای تەلەعفەر بکەینە سێ ناوچەی سروشتی کە بریتین لە: ١- ناوچە شاخاویەکان: لەتەلەعفەرەوە دوو زنجیرە چیا درێژدەبێتەوە، زنجیرەیەکیان لە باکوورەوە شان بەشانی ڕووباری دیجلەیە و زنجیرەی دووەمیان لەباشورەوە لە چیای مەکحول دەست پێدەکات و، لەسنوری دێی شێخ ئیبراهیم سنووری قەزاکە دەبرێت و بەزنجیرە چیای شەنگار کۆتایی پێدێت و، چەند لووتکەیەکی وەکو لووتکەی شێخ ئیبراهیم (٥٣٦م) و ساسان (٥٩٨م) و ئەشکەفت (٦٢٤م)تێدا بەرز دەبێتەوە و، ئەوەی دەمینێتەوە بریتین لە کۆمەڵە تەپۆلکەیەك

٢-ناوچە دەشتاییەکان: دەکەوێتە بەشی باشوری تەلەعفەر و لە سنووری (حەزەر) دبڕێتەوە و پێی دەگوترێت (جەزیرە) کە لە ملیۆنەها دۆنم زەوی و زاری کشتو کاڵی بەپیت پێکهاتووە و هەمووشی دەکرێتە گەنم و جۆ[1]

٣-ناوچە بەرز و نەوییەکان: ئەم بەشەیان دەکەوێتە ناوچەی زومار و عیازییە (ئاڤگەنی) ی سەر بەقەزای تەلەعفەرە و جگە لە بەرزاییەکان و چەند دۆڵێکی نەبێت هەموویان شیاوی چاندنن.

**-دابەشکردنی کارگێی قەزای تەلەعفەر:** تەلەعفەر تاکو ساڵی ١٩١٧ ناحیەیەکی عوسمانی سەر بەقەزای شەنگار بوو. لە١٩١٨/١/١ بەرەسمی کرایە قەزا و لە ساڵی ١٩٨٧ (پێش هەڵوەشاندنەوەی سەنتەری ناحیەکان لەلایەن بەعسیەکانەوە) چوار ناحیەی بەسەرەوەبوو. لێکۆڵینەوەی پێکهاتەی دانیشتوانی قەزاکە، بەهۆی کەمبوونی سەرژمێری ڕاستەقینەوە، دوور لەدەستکاری و، تەعریبکردنە بەردەوامەکانی ناوچە کوردنیشینەکانەوە کارێکی ئاسان نییە ،بەلاّم دەتوانین بلّێین، کە ڕێژەی عەرەب لە پێش هەموواندایە، چونکە نزیکەی نیوەی

[1] - شاکر خصباك،العراق الشمالي، بغداد، ١٩٧٣ .

دانیشتوان پێکدەهێنن، ئینجا پاش ئەوان کورد و تورکمان دێن[1]. زۆربەی تورکمانەکان لە سەنتەری قەزاکە کۆبوونەتەوە و کوردانیش لە ناحیەی زومار و ئەلعەیازییە و هێندێکیشیان لە ناحیەی رەبیعە و ناو شاری تەلەعفەر بڵاوبوونەتەوە. کە بەشێکی زۆر لەو کوردانە لە هۆزی شێخ بزێنین بەڵام بە هۆکاری سیاسی هەر لەکۆندا لەوێ نیشتەجێ بوون کە نزیکەی (٢٠٠) ماڵ دەبێت ئەو شێخ بزێنیانەی تەلەعفەر لە بنەرەتدا لەگوندی خرابەدراو لە ساڵی ١٩٥٠ لەوێوە ڕۆیشتینە بۆ (زمار) دواتر لەساڵی ١٩٦٠ چوونەتە (تلعفر) کە تا ئێستاش هەر لەوێ ماون.

**تەلەعفەر:**

قەزای تەلەعفەر:دەکەوێتە ناوەراستی ئەو ڕێگە سەرەکییەی کە مووسڵ و شەنگار بەیەك دەگەیەنێت و (٦٥) کیلۆمەتر لە مووسڵ و (٥٥) کیلۆمەتر لە شنگارەوە دوورە و هەتاکو ١٩٧٥ یش پاش قەزای نەجەف، تەلەعفەر گەورەترین قەزا بوو لە عێراق لە ڕووی ژمارەی دانیشتوان و ڕووبەرەوە. ڕووبەری شار ٣٠ کیلۆمەتری دووجایە و شانزە گەڕەك و ٢٤ مزگەوتی تێدایە، حەسەن کۆی و سەرای و ئەلتەل و شەنگار و جولاق و سوو چەلەبی و گەرگەری و کورد عەلی و قەنبەردەرە لە گەرەکە ناودارەکانی شارەکەن،گەلێ شوێنەواری مێژوویی وەکو مزگەوتی قەلعە و گۆڕی ئیمام سەعد و مەشهەدی ئیمام عەلی و خدر ئەلیاسی تێدایە کە لەلای ئێزیدییەکان شوێنێکی پیرۆزە[2]. باکووری تەلەعفەر ناحیەی ئەلعیازییە (ناڤگەنی )یە و باشوریشی ناحیەی ئەلتەلی سەر بەقەزای ئەلحەزەرە، ناحیەی ئەلحومێدات و ناحیەی ئەلمحەلەبییە دەکەونە ڕۆژهەلاتی و، ڕۆژ ئاواشی مەڵبەندی شەنگال و ناحیەی قەیرەوانە، ( ٤٦ )دێش سەربە قەزاکەن ، کە زۆربەی دانیشتوانیان لەو عەشیرەتانەن کە پێیان دەوترێت ( تەلە عفەرییەکان ) کە لە گەلێ سەرچاوەدا باس لە رەگەزی ئەم تەلەعفرییانە کراوە، ئەوەتا (شاکر خصباك)لە سەرچاوەکەیدا دەڵێت: (ئەو عەشیرەتە کوردانەی بە تەلەعفرییەکان ناسراون گەورەترین ڕێژەی دانشتوانی تەلەعفەر پێکدێنن)[3]،

---

[1] - شاكر خصباك،العراق الشمالي، بغداد، ١٩٧٣ ، ص١٤٦.

[2] - محمد يونس السيد وهب ، تاريخ تلعفر قديما وحديثا ، الجزء الاول، الموصل ، ١٩٦٧ ل ١١٤ .

[3] - شاكر خصباك،العراق الشمالي، بغداد، ١٩٧٣ ، ص١٤٦.

کەچی (مەحمەد یونس ئەلسەید وەهب )[1] بەعەرەبیان لەقەڵەم دەدا و لە هێندێ سەرچاوەشدا بە تورکمان[2]، یاخود تورك و مەغۆل ناودەبرێن ! جا ئەگەر چاوێك بەناوی هۆز و تیرەکانی تەلە عفەردا بگێڕین ئەوا گەلێ ناوی کوردی وەکو (ئال حەمۆ ، ئال عەلۆ ، ئال حەربۆ ، ئال محۆ ، ئال شێخۆ ، ئال فەرهاد ، ئال میرزا ) مان بەرچاو دەکەوێت وناوی سەرۆك هۆز و تیرەکانیش مۆرکی کوردییان تێدا بەرجەستە دەکرێت ، نمونەی ئەو ناوانەش ( حەمزە سلۆو ، ئیبراهیم سمۆ،عەزیز ئاغا، ئیراهیم محۆ ، ساعد خدۆ ،قەدرۆ ، عەلی قاسۆ ، مەجید بلۆ ، سەعد عەزۆ محەمەد شێخۆ ،عەبدولکەریم ئاغا، عەباس ئاغا)ن[3]، سەرەڕای ئەمەش عەشیرەتەکانی ناو تەلەعفەر بەهۆی ژن و ژن خوازییەوە تێکەلاوی عەشیرەتی گەرگەری کوردی ناوچەی زومار و ئەلعیازییە و تەلەعفەر بوونە و ئاشنایی و خزمایەتیان لە نێواندا دروست بووە

(یاسین ئەلعومەری)ش لە کتێبی (منیة الادباء فی تاریخ الموصل الحدباء ) کە لە ساڵی (١٨٠٠)ی زایندا نووسراوەتەوە، وتوویەتی (خەلکی تەلەعفەر دوو تیپن، سارلیان (کاکەیی)و ماولیانن و یەکێکیان رافزین)و هەمان پەیوەندی کۆمەلایەتیش لە نێوان عەشیرەتی تەلەعفەرییەکان و کاکەییەکانی پاریزگای کەرکوکوکدا دروست بووە، هەروەها زیارتر لە (٢٠٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی دانیشتووی شارۆچکەی تەلەعفەرن لە ساڵی (١٩٦٠)ەوە، کارو گوزەرانیان هەر لەو شارۆچکەیە بەسەر دەبەن وتێکەلاوی خەلکی ناوچەکە بووینە ڕەنگدانەوەی داب و نەریتی شارۆچکەی تەلەعفەری بەسەریانەوە دیارە، چونکە زیاتر لەنیو سەدەیە لەو ناوچەیە نیشتەجێ بووینە[4].

-سەبارەت بە ناوچەی (عەشایر سبعە) ش بێگومان پێویست بەوە ناکات بیسەلمێنین کە ناوچەیەکی کورد نشینە ، چونکە تەنیا مەبەست لە ناوەکەی ( حەفت هۆزەکە – العشایر السبع ) ئەو حەفت هۆزە کوردەیە کە لەوێ نیشتەجێن و بە پێی زانیارییەکانی (عەزاوی)

---

[1] - محمد یونس السید وهب ، تاریخ تلعفر قدیما وحدیثا ، الجزءالاول، الموصل ، ١٩٦٧ ل٨٧-٨٨.

[2] - ادمونس، (کورد و ترك و عرب )، ترجمة: جرجیس فتح الله، بغداد، ١٩٧١ . هەروەها عبدالرزاق الحسینی لە کتێبی ( العراق قدیما وحدیثا )صیدا ١٩٥٨ .

[3] - محمد یونس السید وهب، (تاریخ تلعفر قدیما وحدیثا )، الجزء الاول، الموصل ، ١٩٦٧، ل ١٤٦.

[4] - هەمان سەرچاوە، ل ٢٠٤ .

ئەمانە دەگرێتەوە : ( کەپرە، زەرگی، شایلو، شێخ بزەینی[1]، لۆما، خەنت بەری، شارك)[2].
بەلاّم توێژەرێکی نوێ ناوی چەند هۆزێکی تر دەبات کە لەو ناوچەیە نیشتەجێن لە نێوانیاندا هۆزەکانی (بۆت و موسەیی و زەنگەنەو داودە )[3].

- تل موس:

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (زومار)ە، سەر بە قەزای تەلەعفەر لە پارێزگای موصل، نزیکەی (٨٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم ناوچە و دەوروبەری نیشتەجێ بوونە کە زیاتر لە نەوەکانی (حسن ئاغا)ی کوری مەلا ئەحمەدی پاپیرە گەورە شێخ بزێنی یە، دانیشتوانەکەی خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵاّت و کاسبکارین لە ناوچەکەدا.

پارێزگای موصل:

لەناو پارێزگای موصل لەو گەرەکانە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتەجێ بوونە لەوانە : گەرەکی ڕەشیدیە، گەڕەکی زهور، گەڕەکی کەفائە (حی الکفأە)، ناوچەی باب الجدید، گەڕەکی ڕەحمە ( حی الرحمە) لە هەموو ئەو گەڕەکانە هۆزی شێخ بزێنی نیشتە جێ بوونە، بەشێك لە دانیشتوانەکەی فەرمانبەری میرین و بەشێکیشیان خەریکی کاسبکارین لەم ناوچانەدا .

گوندی عرێعر:

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی وانی سەر بە قەزای (تلکیف)ە، لە پارێزگای موصل، بەشێك لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتە جێ بوونە، وە بنەماڵەی (حاجی عبدالرحمن عمر ) یش

[1] - د. سەعدی عوسمان هەروتی، سنووری خوارووی کوردستانی باشوور لە سەدەی نۆزدەهەمدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی (دهۆك)،٢٠٠٧، ل٢٧.

[2] - عباس العزاوی، عشائر العراق، ج٢ الکردیە، بغداد ١٩٤٧، ص١٩٤، ١٩٥.

[3] - خەسرۆ گۆران، بوونی کورد لە پارێزگای نەینەوا (موصل )دا، بەشی یەکەم، گۆڤاری (سەنتەری برایەتی ) ژ: (٨) تشرینی یەکەم ١٩٩٨ ، ل ١٤ .

هەر لەم گوندەن، دانیشتوانەکەی خەریکی کشتووکاڵ و بە خێوکردنی مەڕو ماڵات و کاسبکارین لەم گوندەدا .

**گوندی ئەسکوف:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی (بەعشیقە)یە سەر بە پارێزگای موصل، زیاتر لە (١٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە، کەپێیان دەڵێن ماڵی (احمد الکردی) کە باوکی ( خلیل الکردی )یە .

**گۆب جلیل:**

ئەم ناوچەیە سەر بە پارێزگای (موصل)ە، هەندێك لە بنەماڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ بوونە لەو ناوچەیە بە تایبەتی بنەماڵەی (مەلا شەریف) و کوڕەکەی بەناوی ( احمد مەلا شەریف) و وەچەکانیان کە نزیکەی (٣٠) ماڵ دەبن هەر لە کۆنەوە لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوونە، لە ساڵی (١٩٨٨) هەموو ئەو بنەماڵانەی هۆزی شێخ بزێنی لەو ناوچەیە ڕاگوێزران بۆ ناوچەی بازیان دواتر بۆ شاری حیللە دواتر جارێکی تر گەڕاینەوە بۆ زێدی خۆیان و خەریکی کاسبکارین لە ناوچەکە.



## هۆزی شێخ بزێنی له سنووری شاری سلێمانی:

### شاری سلێمانی:

لایەنی جوگرافیەکەی: سلێمانی شارێکی گەورەو گرنگی کوردستانی باشووره کەوتووەته خۆرئاوای دەشتی شارەزوورەو لەنێوان شاخی گۆیژەو گلەزەردە تا تاسلوجە بەرزیەکەی له ڕووی دەریاوە ٨٥٣م مەلبەندی پارێزگای سلێمانیە، شارێکی جوان و دلگیرەو شوێنی گەشت وگوزارە[١].

ناوچەی سلێمانی دەکەوێتە بەشی ژووروی عیراق بەلای رۆژهەلاتدا وەبەشی رۆژهەلاتی خوارووی ناوچە شاخاویەکانەوە لای ژووروی ناوچەی هەولێرەو لای خوارووی ناوچەی دیالی یەو لای رۆژهەلاتی ئێرانەو بەلای رۆژئاواشیدا ناوچەی کەرکوك و تکریتە[٢].

شوێنی سلێمانی بەگوێرەی هێلی درێژی دەکەوێتە نێوان هێلی درێژی (٤٤،٣٢، ٤٦،٢٠)پلەی خۆرهەڵاتی هێلی پانی(٣٦،٣١، ٤٤،٣٢)پلەی باکور له سەرچاوەیەکی تردا دەلێت سلێمانی دەکەوێتە نێوان هێلی درێژی (٤٥،٢١،٣٧)پلەو (٤٥،٨،٣٣)پلەی رۆژهەڵات و بازنەی پانی (٢٥،٣٢،١١) پلەو(٤،٣٥ ،٣٥) پلەی باکور[٣].

پانتایی ناوچەی سلێمانی (١٣٣٦٨)کم٢ کەواتە ٣،٦ لەگشت پانتایی عیراق پێك دەهێنێت کە هەمووی (٤٣٨٣١٧)کم٢[٤].

سلێمانی بەشێوەیەکی گشتی لێژاییەکی تارادەیەك زۆری هەیە لە نێوان باکوورو باشوور، رۆژهەلات بۆ رۆژئاوای بەرزایی و گردو گردۆلکە و شیوو دۆڵی زۆری تیادایە شوێنی شار دەڕوانێت بەسەر دەشتێك کە لەبەر دەم شاخی ئەزمەڕەوە کە(١٧٠٢)م بەرزە دەست پێ

---

١ - ئینسکلۆپیدیای گشتی: یاسین سابر سالح،سلێمانی، ٢٠٠٥،ل٦٠٤ .

٢ - سلێمانی شارەگەشاوەکەم، ل١٢ .

٣ - کتێبی سلێمانی: توێژینەوەی خوێندکارانی بەشی جوگرافیای زانکۆی سلێمانی، ل١٥ .

٤ - سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ل١٢ .

دەکات کە یارمەتیی داوە بۆ گەشت کردن وگرنگیی زیاتر کردووە لە ڕووی بازرگانیەوە[1].واتە دەکەوێتە بناری چیای (گۆیژەو ئەزمەڕ).[2]

**سلێمانی لە مێژوودا:**

مێژووی درووست کردنی سلێمانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٨٤ز کەوا لەو ساڵەدا بابانەکان پایتەختی میرنشینەکەیان لە قەڵاچۆالانەوە گواستەوە بۆ ئەم شارە تازەیە[3].

پێش درووست کردنی سلێمانی پایتەختی بابانەکان لە قەلاچۆلان بوو، کەئەمەش دەکەوێتە هەرێمی شارباژێر لە لای ڕۆژهەڵاتی چیای ئەزمەڕدا لە سەر یەکێك لە لقەکانی (زابی بچووك)٥، ئەم شوێنەش مێژوویەکی زۆر کۆنتری هەیە لە میرنشینی بابان، بەلام هیچ گرینگیەکی پێ نەدراوە لە ماوەی (١٦٦٩-١٧٨٤) بوو بە ناوەندێکی دەسەڵاتگێڕی بابانەکان[4].

**سەبارەت بەناوی سلێمانی چەندین بۆچوونی جیاواز هەیە :**

١ - یەك لە بۆچوونەکان دەڵێت: برایم پاشا شارەکەی بەناوی (بابا سلێمان)ەوە ناوناوە[5]، یان بەناوی سلێمان پاشای کوڕیەوە بووە[6].

٢ - یەك لەبۆچوونەکانی دیکە دەڵێت: بەناوی سلێمان پاشای گەورەی والیی بەغداوە ناوی ناوە کە هاوسەردەمی برایم پاشا بووە[7].

٣ - محمود پاشای مامی لە سەردەمی خۆیدا کۆشکێکی فەرمانڕەوایی لە نزیك دێ ی مەلکەندیەوە درووست کردووە لە ساڵی ١٧٨٢ز کە ئەمەش بە بڕیاری (سلێمان پاشای

---

[1] - کتێبی سلێمانی، ل١٥ .

[2] - کردستان جنوبیة في قرن السابع عشر والثامن عشر، ل٦٣ .

[3] - کتێبی سلێمانی، ل١١ .

[4] - کردستان جنوبیە، ل٦١ .

[5] - سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ل٣٣ .

[6] - گۆڤاری مێژوو، ل٥٧ .

[7] - مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ، ١٤٢ .

جلیلی) بووە کە فەرمانڕەوای موسل بووە لە نێوان سالآنی (١٧٧١-١٧٨٩)، بۆیە پێدەچێت برایم پاشا کە شارەکەی دروست کرد بەم ناوەوە ناوی نابێت[١].

٤- بۆچوونێکی تر دەلێ: کە لەکاتی بناغە دانانی شاردا کرێکارێك (ئەنگوستیلە)یەك دەدۆزێتەوە کە مۆرێکی لە سەربووە کە ناوی(سلێمان)ی لێ هەلکەندرا بوو، کە گوایە ئەوە ناوی سلێمان پێغەمبەر بووبێت (دروودی خوای لێ بێت) هەر کە ئەم ئەنگوستیلەیە دەگاتە لای برایم پاشا ئەویش لەبەر پیرۆزی پێغەمبەر ناوی شارەکەی نا (سلێمان)ی[٢].

٥- لەسەردەمی محمود پاشا کاتێ کە کۆشکەکەی دروست کرد لەوکاتەدا (شا فتح علی شا) کە حاکمی وولآتی فارس بوو کورێکی دەبێ ناوی سلێمان دەبێ پێ دەچێت کە محمود پاشا ئەم کۆشکەی بە ناوی ئەم سلێمانەوە کردبێت[٣].

٦- لەوانەیە سلێمان پاشای کوڕی خالید پاشای کوڕی تەیموری بابانی بناغەی ئەم شارەی دانابێ و هەر بە ناوی خۆیشیەوە ناوی نابێ ،بەلآم توێژەروان بۆچوونی پێنجەم زیاتر بە ڕاست دەزانن، چونکە لەو کاتەدا میرەکانی بابان زیاتر پشتیان بە ئێران بەستووە و ئەوانیش پشتگیریان لێ کردوون وە زۆربەی ئەو میرانەی کە ویستوویانە حوکمی سلێمانی وەربگرن پشتیان بە فارس دەبەست ،هەروەها محمود پاشاش لە فارسەکانەوە نزیك بووەو خۆشەویستیی بۆیان هەبووە[٤].

٧- ئەم بۆچوونەیان دەلێ: ناوی سلێمانی لە (سیلۆنا)وە هاتووە کە ناوی شارێکی مێژوویی کۆنی کوردستانەو سلێمانیش بۆ بەرز ڕاگرتنی ئەم شارە ناو نراوە[٥].

وەبە دروست کردنی ئەم شارە وای کرد کەوا خەلکی بابان بە ئاسوودەیی بژین و وەتوانیشی حوکمی بەبە بەبێ شەڕ بگەینێتە (خانەقین و قەسر شیرین و زەهاو) وە ئیش و کاری

---

[١] - تاریخ الامارە البابانیە،عبد ربە ابراهیم الوائیلی،ل١٤٢ .

[٢] - کتێبی سلێمانی:ل١٢،١٣ .

[٣] - تاریخ الامارە البابانیە،عبد ربە ابراهیم الوائیلی،ل١٤٢ .

[٤] - ه.س.پ.ل١٤٣ .

[٥] - کتێبی سلێمانی، ل١٣ .

وولاتیشی بە شێوازێکی باش و مەدەنی ڕێکخست و خەلك حەسایەوە و ئاوەدانی کەوتە وولاتەوە و کشتوکالّ پێش کەوت و شەڕو هەرا کەم بووەوە [1].

**هۆزی شێخ بزێنی لە سنووری شاری کەرکووك:**




**قەزای دوبز:**

هەبوونی ئەم قەزایە دەگەڕێتەوە بۆ سالانی سەرتای (۱۷۷۰)کان، بەشێك لەشێخ بزێنیەکان دانیشتووی ئەم شارۆچکەیەن.

دەکەوێتە ڕۆژئاوای شاری کەرکوك و(٤٠)کم لێیەوە دوورە سنووری قەزاکە، زێی بچوك و ناحیەی کەندێناوە لەڕۆژئاوا، باکور: ناحیەی پردێ، ڕۆژهەلات: قەزای مەرکەزی کەرکوك وناحیەی یایچی ،باشور: قەزای حەویجە.

روبەرەکەی (١٣٥٤) کم٢

[1] - تاریخی سلێمانی وە وولاتی، ل٦٨ .

دوبز لەناونووسی ساڵی (١٩٥٧) دا گوندێکە لەناحیەی پردێ و سەربەقەزای مەرکەزی کەرکوکە . ژمارەی دانیشتوانی (١٠٤٥)کەسە(٥٥٣)یان نێرو (٤٩٢)مێن) لەسەرژمێرە سەرنەکوتووەکەی ساڵی (١٩٦٥)دا، دوبز ناحیەیەکە لەقەزای مەرکەز ژمارەی دانیشتوانی (١٢٣٧)کەسە و (٤٨) دێی بەسەردوەیە، ژماەی دانیشتوانی گوندەکانی (١١٠٢٠) کەسە، لە ئاماری ساڵی (١٩٧٧)دا (٤١)گوندو موقاتەعەی فەزای مەخموور- پارێزگای هەولێر- خراوەتە سەر دوبز، لەوانە(٣٠)ئاوایی ناحیەی کەندێناوەو(١١)گوندی ناحیەی قەراج.
قەزای دوبز کەلەساڵی ١٩٧٤دا دروستکرا،لە٨٪ی کۆی دانیشتوانی پارێزگای کەرکوکی گرتبووە خۆ، بەلاّم دواتر ژمارەی دانیشتوانی لەساڵی ١٩٨٧دا دابەزی بۆ ٥٪ی کۆ گشتی دانیشتوانی پارێزگای کەرکوك، بەشێك لەدانیشتوانی شارۆچکەی دوبز لە هۆزی شیخ بزێنین، هەر لەساڵی ١٩٦٣ەوە گوندو ئاواییەکانی قەزای دەبز بەر هێرشێکی بەر بلاّوی پرۆسەی ڕاگواستن و کۆچ پێکردن کوتووە ، لەسەرەتادا (٣١) ئاوایی گرتەوە لەناحیەی ناوەندی قەزادا، لەگەڵ (٣٥)گوندی ناحیەی پردێ...هەتا ساڵی ١٩٨٨(٤٣٠٥)خێزانی کورد ڕاگوێزران بۆدەرەوەی پارێزگای کەرکوك،کەبەشێك لەو ڕاگواستن و کۆچ پێکردنە لەدانیشتوانی شارۆچکەی دوبز بەر هۆزی شێخ بزێنی کەوت.
خێزانی عەشایەری عەرەب لەجێگایاندا نیشتەجێکران،بەتایبەت هۆزی جبور ،بۆ ئەم مەبەستە حکومەت پرۆژەی ئاودێری (ڕێی کەرکوك)ی جێبەجێکرد بۆ ئاودانی زەوی وزاری کشتوکاڵی لەدەشتەکانی ناوچەکەدا...لەلایەکی دیکەوە لەهەمان ڕۆژگاردا،حکومەتی عێراق چەند دێیەکی ناحیەی پردێی سەر بە قەزای دوبزی خستە سەر پارێزگای هەولێر، بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد لە کەرکوك .لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی کورد لەبەر ڕۆشنایی ئاماری گشتی ساڵی ١٩٧٧دا،لە٥٢٪ی کۆی دانیشتوانی قەزار دوبز بوو،لەبەر ئەوە حکومەت بڕیاریدا لەساڵی ١٩٨٩،ناحیەی ئاڵتون کۆپری بەتەواوەتی بخرێتە سەر پارێزگای هەولێر...بەلاّم دواتر ئەو بڕیارە هەڵوەشێنرایەوەو ناحیەی پردێ خرایەوە سەر پارێزگای کەرکوك هەڵبەتە دوای تەخت و وێرانکردنی (٣٥)گوندو ئاوارەو دەربەدەرکردنی دانیشتوانە کوردەکەی کەزۆربەیان لە هۆزی شێخ بزێنی بوون کەئەم وێرانکارییەیان بەرکوت و دەربەدەر بوون لەم شارۆچکەیە.

**بەنداوی دوبز:**

دەکەوێتە باکوری شارۆچکەی دوبزەوە لەسەر بەرزاییەکانی کونە کۆتر دروست کراوە، بەنداوی دوبز (١٣٠)کم لەبەنداوی دوکانی شارۆچکەی دوکانەوە دوورە و(١٤٠)کم لەزێی (دیجلە)ەوە دوورە، لەوشوێنەی زێی بچوك دەرژێتە ناو زێی دیجلەوە ،ئەم بەنداوە دەورێکی گرنگ وبەرچاوی هەیە بۆکۆکردنەوەی ئاوی باران و ئاوی ڕووباری زێی بچوك بەمەبەستی هەڵگرتنی ئاو بۆ بەکارهێنانی بۆئاودێری و پێویستەکانی دیکەی کشتوکاڵی و خزمەتی مرۆڤایەتی .پانی بەنداوەکە (٣٧٦) مەترە وە بەرزیەکەی (٢٣،٥٢) مەترە (٨٧فوت)،هەروەها شوێنی بەنداوەکە بریتیە لە (٣٠٠٠٠٠) هەکتارو توانای ڕەوانەکردنی (٤٠٠٠) مەتر سێ جای ئاوی هەیە لەچرکەیەکدا .

لەسەرەتای سالاَنی چلەکانی سەدەی پێشوو، پاشای ئەوکاتەی عێراق مەلیك غازی بەردی بناغەی بەنداوی دوبزی داناوە (بەگوێرەی قسەکانی لیوای پۆلیس عارف محمد تەها ،کەلەکاتی دانانی بەردی بناغەی بەنداوەکە مولازمی پۆلیس بووەو بەرپرسی پاراستنی مەلیك بووە )،کۆمپانیایەکی ئینگلیزی بەناوی (کۆپتس) لەگەڵ کۆمپانیایەکی دیکەی ئیستیشاری ئەڵمانی بەشداربوون لە دامەزراندن و دروست کردنی بەنداوەکە، پڕۆژەی دروستکردنی بەنداوەکە لەساڵی (١٩٦٠) دەستی پێکردو لەساڵی (١٩٦٥) کۆتایی پێهات، بەگوێرەی قسەکانی ناوبراو کەلەسالاَنی ئاشتیدا جێگری پارێزگای سلێمانی بوو، دەبوایە پڕۆژەکە لەیەك جۆگە (کەناڵ)ی ئاو دروستبکرایە کە ئاو لە بەنداوەکەوە بەرەو (قەرەدەرە) و لەوێوە بە دێی شوراوەو تێپەڕبوایە بۆئاو شاری کەرکوك و لەوێوە کەناڵەکان شۆڕبوایەنەوە بەرەو ناوچەکانی خوارووی کرکوك. هەردوو ناوچەی ناوبراو لەهەورازو نشێوی گونجاو پێکهاتووە کە جێگای بایەخە بۆ پڕۆژەی ئاو و ئاودێری .بەلام داخەکەم ئەم پلانە پاشتر گۆڕا ،ئاراستەی کەناڵە ئاویەکە گۆڕرا بەرەو خوارووی دوبز بۆ ناوچەی حەویجە و ریاز . ئەم پلانەش بەشێك بوو لە درێژەپێدانی یەکەم سیاسەتی تەعریبی پارێزگای کەرکوك کە دارێژرابوو لەساڵی (١٩٣٠)دا.

ئەوەی شایانی باسە ناوچەی حەویجە لەساڵی ١٩٣٤ دامەزراوە بەهێنانی هۆزە عەرەبەکانی خوارووی چیای حەمرین لە هۆزەکانی (العبید والجبور)بەشێك لە هۆزی شێخ بزێنی لە تیرەی جۆغەرەشی نیشتەجێ ی شارۆچکەی حەویجەن، بەگوێرەی البرزنجي لەکتێبەکەی (تشکیل الحویجە) لعام ١٩٣٤، پڕۆژەی بەنداوی دووبز بەشێکە لە پڕۆژەی ئاودێری کەرکوك.

**پردی دوویز/مەلحەوالی:**

لە سەرەتای سالآنی پەنجاکانەوە بیری دروست کردنی پردێ هەبوو لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، بۆ بەستنەوەی دوویز بەناوچەی ئەوبەری زێی بچوکەوە (ناوچەی مەلحەوالی). ئەمەش زیاتر لەبەر هۆی بوونی نەوت بوو لەناوچەکەداو بێگومان سودبەخشە لە ڕووی ئابووری و کۆمەلآیەتیەوە. ئەوەبوو لەسالّی ١٩٥٢دا بڕیاری دروستکردنی پردەکە دراو دەست بەکارکردن کرا، لە سالّی (١٩٥٧) کارەکە کۆتایی هات و پردەکە کرایەوە، واتە دروست کردنی پردەکە پێنج سالّی خایاند، پردەکە دیمەنێکی جوان و مێژوویی داوە بەدوویز .

لەکاتی دروستکردنی پردەکە ئینگلیزەکان لە نمرە هەشت جێنشین بوون. نمرە هەشت سەرچاوە نەوتییەکانی لێیە. هەروەها دووبزی کۆن/ ئاوایی هەر هەبووە، کەئێستا بوّتە ناوەندی شارۆچکەکەو بەماوەی نێزیکەی ٢کم لەپردەکە دوورە. ئەم پردە بەشێوەیەکی بەردەوام لەلایەن پۆلیس و ئاسایشەوە دەپارێزرێ. لەلایەکەوە بۆ ڕێکخستنی هاتووچۆی ئوتۆمبیل لەسەر پردەکەو لەلایەکی دیکەوە لەبەر هۆی ئەمنی. بەلآم جێگای داخە پردەکە بێ خزمەتە لەڕووی ئیدامەوە. پردێکی نوێ بە تەریبی لەژێر پرۆسەی دروستکردنە لە حالّی حازردا، کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ڕێگاوبانی کەرکووکەوە سەرپەرشتی دەکرێت .

لە سالآنی پێش دروستبوونی پردی دوویز / مەلحەوالی ئینگلیزەکان (کەلّەك)یان بەکار دەهێنا بۆ پەڕینەوە لە دووبزەوە بۆ ئەوبەری ئاو، ئێستاش شوێنەواری (پاشماوەی) ئەو کەلّەکە ماوە لەتەنیشت پردەکە.

- **نمرە هەشت:**

ناوچەیەکی گرنگی دووبزە کە ئیدارەی سەرچاوە نەوتییەکانی ناوچەکەی لێ دەکرێت. ناوەکەی لەلایەن ئینگلیزەوە لەسالآنی بیستەکاندا دانراوە. هەشتەمین ناوچەی نەوتی کەرکووکە. هەروەها شوێنێکی گەشتیاریە و کەنالّی ئاوی پرۆژەی ئاودێری دووبزی پیا تێپەر دەبێت. ناوچەیەکی قەدەغەکراو(موحەڕەمە) بوو لەسەردەمی ڕژێمی بەعس، بەلآم لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراق، ناوچەکە ئازادە بۆ خەلّکانی ئاسایی دووبزو گەشتیاران. لەسالآنی سیەکاندا ئینگلیزەکان هەشت ڤێللای گورەیان لێ دروست کرد[1] .

[1] - ئازاد مەعروف، یادێك بۆ دووبز، چ١، چاپخانەی منارە، هەولێر،٢٠١٣، ل٧٧ .

**ناحیەی پردێ( ئاڵتون کۆپری):**

شارۆچکەی پردێ نزیکەی (٤٤) کم لە شاری کەرکوك دوورە. کەوتووەتە سەر رێگای گشتی نێوان کەرکوك و هەولێر لەسەر زێی بچووك.. ئەم زێیە کردوویەتیە دووبەشەوە ناوەندی ناحیەکە تێکەڵە لە کوردو تورکمان، دێهاتەکانی هەمووی کوردن.

سنوور: لە رۆژهەلاَت ناحیەی شوان، رۆژئاوای ناحیەی کەندێناوە لە باکوور ناحیەی مەرکەزی هەولێر(قوشتەپە)، باشوور ناحیەی مەلحە(حەویجە)یە.

رووبەر: (٧٢٨)کم ی چوارگۆشەیە بەرامبەر نزیکەی (٢٩١,٢٠٠) (دۆنم.. مشارە) ئەمە بەگوێرەی ئاماری ساڵی (١٩٥٧) کە بەشێك لە دێیەکانی دوبزیش دەگرێتەوە ئەو کاتە(٦٢) گوند سەر بە ناحیەی پردێ بووە ، چونکە دوبز ئەوێ رۆژێ گوندێك بوو سەر بەم ناحیەبوو و هێشتا نەکرابوو بە ناحیە .. ژمارەی دانیشتوانی ناحیەی پردێ (١٩١١٩)کەسە بە(٦٢) دێیەکەشیەوە. کە بەشێکی هەرە زۆری دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنین.

بەلاَم لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧دا پردێ ناحیەیەکە لە قەزای دوبز هەردوو گوندی موقاتەعە ژمارە ١٨٢- ساری چەمی بچووك (چۆمە زەردی گچکە) موقاتەعەی ژمارە ١٨٣ ساری چەمی گەورە (چۆمە زەردی گەورە) لە ناونووسی ساڵی ١٩٥٧ لەگەڵ ناحیەی قوشتەپە تۆمارکراوە. کە زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی ئەم دوو گوندە شێخ بزێنین لە تیرەی جوغەڕەشین، دواتر بەفەرمانی کۆماری ژمارە ٣٣ کەلە ١٩٧٦/١/٢٥دا بە ئیمزای سەرۆك کۆماری ئەوسای عێراق دەرچووە، خراونەتە سەر ناحیەی پردێ.. هەردوو مەقاتەعەی ٤٠-٥١ شارنشینە... رۆژگاری خۆی پردێ کەرکوك و هەولێری بەیەکەوە دەبەستەوە بەڕێگای هێڵی ئاسنینی شەمەندەفەر.

ناحیەی پردێ، وەکو گشت شوێنەکانی دیکەی کوردستان و عێراق لە ساڵی ١٩٦٣ کەوتە بەر هێرش و شالاَوی (حەرەس قەومیەکان)...دێهات و ئاواییەکانی سوتێنرا، تالاَن و وێران کرا، پاکتاوی نەژادی کرا کە بەشێکی زۆری ئەم وێرانکاریە بەر هۆزی شێخ بزێنی و ساڵەیی کەوت، بەلاَم لەرۆژگاری سەرۆکی ئەوسای کۆماری عێراق عەبدولرەحمان عارف ساڵی ١٩٦٧ هەموو دێهاتیەکان گەڕاندرانەوە سەر زێدی باو باپیرانیان.

خەڵکەکەش رەشبگیرکرا لەساڵی ١٩٨٧دا، گوندو ئاواییەکانی ناوچەی ساڵەیی و شێخ بزێنی ودۆڵی بیبانی بەیەکجاری خاپوورو پاکتاوی رەگەزی کرا، دانیشتوانەکەشی ئاوارەو دەربەدەری ئۆردوگا زۆرە ملێکان کران لە هەولێرو، دارەتوو، بنەسلاَوە، جدیدە، کەورگۆسك،

تۆبزاوه، تەنانەت پارچە زەویەکیان لە ناوچەکانی خۆیاندا پیٚ ڕەوا نەبینین کە بۆیان بکەنە ئۆردوگاو تێیدا نیشتەجیٚ بکرێن ... بۆئەوەی لە هەوارو جێگەی خۆیان نزیك نەبن... بەڵکو (کەرکوك) بەدەریان کردن، ناوچەکەش بە گشتی کرایە ئۆردوگای سەربازی و بە عەرەب کرا... ناحیەی پردیٚ، حکومەتی عێراق هەر لە ساڵەکانی ۱۹٦۳- ۱۹٦۹- ۱۹۸٦- ۱۹۸۸ دا گشت دێهات و ئاواییەکانی خاپوورو تەختکرد کە دانیشتوانەکەی بەشێکی هەرە زۆریان لە هۆزی شێخ بزێنی و ساڵەیین.

دوای ئەوەی گشت گوندو ئاواییەکانی کە ژمارەیان (۳٥) ە وێرانکران ئەم سەربازگە گەورانە لەناو زەوی و زاری بە پیت و بەرەکەتی کشتوکاڵی جووتیارانی کورد دروستکران کە پتر لە (۲۰۹۲) خێزانی جووتیارە، گەلێك لە دێهاتیەکان بەر عەمەلیاتی بەدناوی ئەنفال کەوتن و لەناو چوون کەبەشێکی زۆریان لە هۆزی شێخ بزێنی و ساڵەیی بوون.

عەشیرەتەکانی ناوچەکە: شێخ بزێنی بەتایبەتی تیرەی خۆڵەزەرد و جۆغە ڕەش لە هۆزی شێخ بزێنی، ساڵەیی، بیبانی، لەك[1].

**پارێزگا : کەرکوك قەزا: دوبز ناحیە : پردیٚ ژمارەی موقاتەعەکان**

| ژمارەو ناوی موقاتەعەی گوندەکان | کۆی دانیشتوان ساڵی ۱۹٥۷ | کۆی دانیشتوان ساڵی ۱۹٥۷ |
|---|---|---|
| ۲٤- قزلقایە | ٥۸ | ۸۷ |
| ۳۲- یارمجە | ۲٥۱ | ۲۸٤ |
| ۳۸- قەرغە تو | ۲٦۰ | ۲۷ |
| ٤۳- گەڵۆزی | ٥۰۰ | ۹۲٤ |
| ٤٤- قەرەبەگ | ۳۷٥ | ۳۹۱ |
| ٤٥- چیاچەرمك/گەورە | ۲۹۰ | ۱۸۰ |

[1]- سەرچاوە: محمد هادی الدفتر، عبداللة حسن، العراق الشمالی، بغداد، ۱۹٥٥، ص۲٤٥- ۲٤۸- د. نوری طالبانی، منطقة کرکوك، لندن، ۱۹۹٥، ل۷٥- ۷٦- د. خلیل اسماعیل محمد، البعد القومی للتغیرات فی الحدود الاداریة لمحافظة کرکوك، اربیل، ۱۹۷۷، ل۷٥- ۷٦- هەردوو سەرژمێری ساڵی ۱۹٥۷-۱۹۷۷ ، بغداد.

| | | |
|---|---|---|
| ٤٦-چیاچەرمك بچووك/شێخەیی | ١١٦ | ١٢٥ |
| ٤٧- دەرماناو/گەورە | ٣٣٣ | ٣١٥ |
| ٤٨- دەرماناو/گچكە | ١٦٨ | ٢٣٨ |
| ٥٠- قەیە باشی | ٢٣٨ | ٦٦١ |
| مەركەزی ناحیەی ئاڵتون كۆپری | ٣٨٥٥ | ٤٩٠٨ |
| ١٨٢-چۆمەزەردەی گچكە | ١٤٥ | ٤١١ |
| ١٨٣-چۆمەزەردەی گەورە | ٢٥١ | ٣٧٢ |
| كۆی دانیشتوانی (٣٥) دێ | ٨٤٧٦ | ١٠٥٥٥ |
| كۆی مەركەزی ناحیەی پردێ و ئاواییەكانی | ١٢٣٣١ | ١٥٤٦٣ |
| كۆی خێزانەكانی ناوەندی ناحیەی پردێ | | ٨٣٦ |
| كۆی خێزانی دێیەكانی ناحیەی پردێ | | ١٨٧١ |
| كۆی خوێندنگا/ناوەندی ناحیەی پردێ | | ٦ |
| كۆی بنكەی تەندروستی/ ناوەندی ناحیە | | ٢ |
| كۆی خوێندنگای دێیەكانی ناحیە | | ١٧ |
| كۆی بنكەی تەندروستی دێیەكانی ناحیە | | ٣ |




## ناحیەی شوان سەربە پارێزگای کەرکوك

### ناساندنی ناحیەی توێژینەوە:

دەکەوێتە سەر ڕێگای گشتی نێوان شاری کەرکوك و کۆیە ، سەر بە قەزای ناوەندی (کەرکوك)ە، (٣٤)کم لەشاری کەرکوکەوە دوورە کەوتوتە باکووری ڕۆژئاوای کەرکوك، بە ناوی عەشیرەتی شوانەوە ناونراوە[١]، بەلاّم زۆر لە گوندو ناوچەکانی سەر بەو ناحیەیە لە هۆزی شێخ بزێنینە، لەسەرەتاوە بنکەی ناحیەی شوان بە گوند (تۆمار) بووە لە سالّی ١٩١٨ز، دواتر هاتۆتە گوندی حاجی بەیخانی خواروو، دواجار لەسالّی (١٩٢٣ز) ناحیەکە هاتۆتە گوندی (ڕێدار)[٢].

ئەم ناحیەیە لە ناو نووسینی سالّی (١٩٥٧)دا(٧٦)دێ و لەسەرژمێری سالّی (١٩٦٥)دا (٧٥) ئاوایی لەسەر ئامار کراوە، هەروەها لەسەرژمێری سالّی (١٩٧٧) هەرسێ گوندی

---

[١]- محەمەد سەعید سۆفی، کەرکوك لەناو پاکتاوی کردنی ڕەگەزیدا، چاپخانەی بەرهەم ، هەولێر،٢٠٠٣، ل١٣٥.

[٢]- چاوپێکەوتن لەگەلّ بەڕێز جبار حسێن قادر، سەرۆکی ئەنجومەنی ناحیەی شوان، ٢٠١٢/١٢/٤.

(گۆڕان (شوان)، یەختەکان ، عەلی میکایل)ی لیٚ دا بڕێندراوە لەگەڵ چەمچەماڵ مەرکەزی قەزا تۆمارکراون .

پاشان بە هۆی سیاسەتی پاکتاوکردنی ڕەگەزی کورد لەسەر دەستی ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق بە هەموو شێوەیەك هەوڵی بۆ داوە بۆیە دەبینین زۆربەی ناوچەکانی کوردستان لەسەردەمی دەسەلاتی حەرەس قەومیەکاندا بەر هێرش و پەلاماری سوپاو چەکدارانی حەرەس قەومی کەوت، دێیەکانی ناوچەی شێخ بزێنی و شوانیش لەساڵی (١٩٦٣)دا ، دوای سوتاندن و تالاٌنکردنی ماڵ و حاڵ و خەل و خەرمان و خانووبەرە و ڕەشبگیری ، خەڵکێکی زۆریان لیٚ شەهیدکردن[1] .

لەساڵی ١٩٨٧دا دوای تێکدانی ناوچەکە نزیکەی (٤٠) گوندی لیٚ دروستکرایەوە، بەلاٌم لە ئەنفالی ساڵی (١٩٨٨)سەرجەم گوندەکانی وێرانکراو زیاتر لە (٣٥٨) کەسیش لەو شالاٌوە بێسەرو شوێنکران[2] .

لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق لەلایەن هێزی هاوپەیمانان، لەساڵی (٢٠٠٣ز) لەلایەن حکومەتی هەرێم ئاوەدان کرایەوە، ئێستا کۆمەڵگایەك دروست کراوە بەناوی سمایل بەگی، کە پێکهاتووە لە چوار گوند، گوندەکانیش بریتین لە گوندی (حاجی بەیخانی سەروو، حاجی بەیخانی خواروو، سمایل بەگی، خدر شیرین ) .

لە دوای گەڕانەوەی بەشێك لە خەڵکی ناوچەکە چەندین خزمەت گوزاری بۆ ئەم ناحییەیە کراوە وەك (قیرتاوکردن و کۆنکرێتکردنی کۆلاٌنەکان، دابینکردن تۆڕی ئاوو کارەبا، دروست کردنی دوو قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی ، هەروەها دامەزراندنی چەندین فەرمانگەی حکومی، وەك (پۆستەو گەیاندن، شارەوانی، کارەبا، پۆلیس، کشتوکاڵ، ڕەگەزنامە، بنکەی تەندروستی، ئاو، پۆلیسی فریاکەوتن، بەرگری شارستانی، سەنتەری لاوان، فەرهەنگخانەی شوان).

---

[1] - محەمەد سەعید سۆفی ، سەرچاوە پێشوو،ل ١٣٥ _ ١٣٦.

[2] - مەلاشاخی، ئەنفالی ڕەش، سلێمانی ، ٢٠٠١، ل ٢٢٠.

**کورتەیەك لە مێژووی ناوچەکە:** سەبارەت بە ناوی شوان ڕاو بۆچونی جیاواز هەیە، بۆیە لەم بارەیەوە نووسەری ڕوسی (فێلجێفیسکی) دەڵێ: - ( لە سەرووی کەرکوك لەو شوێنەی مەڕومالاًت بە خێوکردنی کۆچەری لە زۆزانەکاندا باوە هەر لە کۆنەوە خێلێکی کورد یان ڕاستر گروپە خێلێکی کوردی دەژی ، ناوێکی زۆر تایبەتی هەیە، (شوان)واتە شوانی مەڕومالاًت ی ورد، هاوسێی خێلێکی نیشتەجێن بەناوی شێخ بزێنی) .

هەروەها ئاماژەیەکی زۆر هەیە دەڵێن : شوان لە بنەڕەتدا ناوی هۆزێکەو پاشماوەی هۆزی گەورەی شوانکارەیە، کە نیشتەجێ ی لوڕستانن، لە ئەنجامی ڕووخاندنی دەسەلاًتی شوانکارەکە لە ساڵی (٤٢١ _ ٧٥٦)ی کۆچی دەسەلاًت داربوون و میرنشینان هەبووە واتا لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا لەلایەن دەسەلاًتداری ئێران(شا ئیسماعیل سەفەوی ) کۆتایی بە دەسەلاًتیان هاتووە ئەم هۆزە شوانەی باکوور و باکووری ڕۆژهەلاًتی کەرکوك پاشماوەی ئەوانن و لەم شوێنانەی پارێزگای کەرکوك نیشتەجێ بووە لە لوڕستان، لەبنەڕەتدا (دارەمان)ی شوان لە (دار الامان)ی پایتەختی لوڕستانی هوزی شوانکارەوە هاتووە، شێوەزاری بەشێك لە دانیشتوانی ناوچەی شوان زۆر بە ئاشکرا دیارە لە زاری لوڕی و سنەیی و کرمانشایی ە خانەقینیەوە، نەك هەر نزیکە بەڵکو ڕادەی جیاوازییەکی کەمترە وەك لە لایەنی لیکچونیان، هەروەها شێوەزاری لەکی و کرمانشاهی، کە دەکەوێتە باکووری لوڕستان لە شێوەزاری شوان نزیکن. ڕاستیەکی تر هەیە ئەویش ئەوەیە کە تاکو ئێستا (لەنێو فەیلیەکانی لوڕستانی بچوکدا گەلی خێلی پەراگەندەی کوردی وەك : مەهێکی ، هێلان، شوان، هەن، بۆیە ناوهێنانی بنەڕەتی ناحیەی شوان لە هەڵگری بنەڕەتی شوێن و جێگای عەشیرەتی شوانەوە هاتووە و بۆیە ناوی ناوچەکە بە ناویانەوەیە[1].

**پێکهاتەی کارگێری ناوچەی توێژینەوە:** ناحیەی شوان لە ڕووی کارگێڕیەوە سەر بە پارێزگای کەرکوکە ، بەلاًم لەکاتی ئێستادا بە هوی جێ بەجێ نەکردنی مادەی(١٤٠) دەستووری عێراق بۆ گەڕانەوەی ناوچە دابڕێنراوەکانی کوردستانی باشوور ئەم ناحییەیەش وەك بەشێك لە ناوچە دابڕێنراوەکان بە شێوەیەکی فەرمی نەگەڕاوەتەوە سەر خاکی هەرێمی کوردستان بەلاًم چەندین فەرمانگەی حکومی سەربە حکومەتی هەرێمی کوردستانە وەك(شارەوانی، کارەبا،

[1] - گۆڤاری کەرکوك، ژمارە: ٣، ساڵی سێیەم، زستانی ٢٠٠٢، سلێمانی، ل٥٤.

پۆستەو گەیاندن، ئاو، پۆلیسی دارستان ، پۆلیسی فریاکەوتن، بەرگری شارستانی ، سەنتەری لاوان، فەرهەنگخانەی شوان)[١].

لە ئێستادا سەنتەری ناحیەکە پێکهاتووە لە چوار گوند ، ئەوانیش گوندی (حاجی بەیخانی سەروو، حاجی بەیخانی خواروو ، سمایل بەگی ، خدر شێرین) ئەو گوندانەی ترکە دەمێننەوە ژمارەیان (٦٥) گوندە ئەوانیش ، تەنها ناوی ئەو گوندانە دەنوسین کە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتەجێ بووە.

ناوی گوندی ناحیەی شوان کە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتەجێ بووە:

| ژ | ناوی گوند | ژ | ناوی گوند |
|---|---|---|---|
| ١ | تولکی | ١٣ | جەلەمۆرد |
| ٢ | عمر مندان (ئۆمەر مەندان) | ١٤ | تورکە |
| ٣ | شیوە سور | ١٥ | قەمبەر |
| ٤ | ئیلنجاخ | ١٦ | مەرزیخەی خواروو |
| ٥ | تەرەقە | ١٧ | کانی ڕەش |
| ٦ | کاولە سور | ١٨ | جگیلە |
| ٧ | شەگیری سەروو | ١٩ | قەرەناو |
| ٨ | شەگیری خواروو | ٢٠ | کەبەنك |
| ٩ | پەلکانە | ٢١ | سماقە |
| ١٠ | دەرماناو | ٢٢ | دار اختیار |
| ١١ | عمدون | ٢٣ | قزل قایە |
| ١٢ | مەرزیخەی سەروو | ٢٤ | |

بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی ناحیەی شوان، ژووری پلان و بەدواداچوون.

زیاتر لە (٢٠)گوندی سەر بە ناحیەی شوان دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنییەو زادگای شێخ بزێنییەکانە.

[١]- چاوپێکەوتن لەگەل بەرێز نجات نجم، ئەندامی ئەنجوومەنی ناحیەی شوان، ٢٠١٢/١٢/٤.

**شوێنی جوگرافی :-**

هەرچی تایبەتە بە شوێنی جوگرافی ناحیەی شوان دەکەوێتە باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە هاوسنورە لەگەڵ شارۆچکەی چەمچەماڵ و لە باکوری ڕۆژهەلاتی ناوچەی ئاغجەلەرە، لە باکوور سنورێکی ئاوی جیای دەکاتەوە لە شارۆچکەی تەق تەق کە ئەویش (زێی بچووکە ) ڕۆژئاواش شارۆچکەی پردێ یەو لەبەشی باشووریش قەزای ناوەندی کەرکوک و سنووری ڕووباری خاسەیە[1] .

**ژمارە دانیشتوان :** لەبەر گەلێك هۆکاری ڕامیاری و کارگێڕی و نەبوونی ئەمن و ئاسایش و نەبوونی کەرەستەو ئامێری زانستی بۆ ئامار و سەرژمێری، کەمی خەڵکی شارەزاو دڵسۆز، زۆربەی سەرژمێریەکانی عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی جێگای بڕواو متمانە نین دانیشتوانی ناوچەکان زۆرجار پێچەوانەی یاساکانی گەشەی دانیشتوانن. ناحیەی شوانیش بەدەر نیە لەم کەم و کوڕیانە هەربۆیە لەکاتی توێژینەوە لە جوگرافیای دانیشتوان گەلێك ئاستەنگ و گیرو گرفت دێنە پێش لەوانە کەمی ژمارەو بەیاناتی سەرژمێری کە پەیوەندیان بە دانیشتوانەوە هەبێت، هەروەها ئەوەی هەشە متمانەی پێ ناکرێت ، ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر نەبوونی سنورێکی سیاسی یان کارگێڕی کە بەشێوەیەکی ڕەسمی هەرێمی کوردستان دیاری بکات[2].

کە ئەویش لە هەموو ئەو ئامارانە دەردەکەوێت کە لە عێراق لە ساڵانی (١٩٤٧ ، ١٩٥٧ ،١٩٦٥ ،١٩٧٧) ئەنجام دراوە و لەبەر دەستمان دان بۆمان دەردەکەوێت ناحیەی شوان لەسەر ژمێری ساڵی (١٩٤٧ز) ژمارەی دانیشتوانی (١١٢٠٠)کەس بووە(٥٢٦٠)کەس نێرو (٥٩٤٠)کەس مێ، بەڵام بەپێی سەر ژمێری ساڵی (١٩٥٧) بریتی بووە لە (١٣٣٠٢)کەس، لەوانە (٦٨١٤)کەسیان نێرو (٦٤٨٨)کەسیان مێ بووە، بەڵام لە سەرژمێری ساڵی (١٩٦٥)دا (١٦٢٨٢)کەس بووە، لە ئاماری ساڵی (١٩٧٧)کۆی گشتی ژمارەی دانیشتوان (١٦١٦٤)کەس بووە[3] .

[1] - گۆڤاری کەرکوك، ژمارە:٣، ساڵی سێیەم، زستانی ٢٠٠٢، سلێمانی ،ل٥٣.

[2] - خلیل ئیسماعیل محەمەد،جوگرافیای هەرێمی کوردستان، چ١ ، هەولێر،١٩٩٨، ل ١٧٨.

[3] - سکۆ بەهرۆز محەمەد(نەژی)، مێژووی سەردەمە کارگێڕی و بەڕێوەبەرییەکانی پارێزگای کەرکوك، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، چ١، کەرکوك،٢٠٠٥،ل٨٤_ ٢٨٩ _ ٢٩٢.

**ڕێگاوبان:** سەبارەت بەناحیەی شوان ئەوە لە کۆنەوە ڕێگای هاتوو چووی بایەخی پێدراوە، لەسەرەتادا لە ساڵی ١٩٥٢(سعید قەزاز) وەزیری ناوخۆی عێراق سەردانی ناحیەی شوانی کردووە خەڵکی ناحیەکە داوای ڕێگەو بانیان لێ کردووە، هەر لەو ساڵدا ڕێگای کەرکوك شوان چەو ڕێژ کراوە، لە ساڵی ١٩٥٦ بڕیاری قیرتاوکردنی بۆ دەرچوو لە ساڵی ١٩٥٧ئەو ڕێگایە قیرتاو کراوە[1] .ئەم ڕێگایە جگە لەوەی کە ناحیەی شوان بە شاری کەرکوك دەبەستێتەوە لە باشور، هەروەها لە بەشی باکورناحیەی شوان دەبەستێتەوە بە شارۆچکە تەق تەق ، ئەمەش جگە لە چەند ڕێگایەکی تر لەسەنتەری ناحیەکەو بەشێك لە گوندەکان بە سەنتەری ناحیەکە دەبەستێتەوە لەگەڵ ئەمەش هاتوو چووی شوان بێ گرفت نیەچونکە تاکو ئێستا ڕێگای سەرەکی شوان کەرکوك یەك سایدە و بەشێك لە گوندەکانیش بێ بەشن لە ڕێگەوبانی قیرتاوکراو.

**دەرئەنجام:** ناحیەی شوان یەکێکە لە ناحیەکانی سەر بە پارێزی  کەرکوك لە ڕووی کارگێڕیەو(٦٥) گوند لەخۆ دەگرێت لەساڵی ١٩١٨ کراوە بە ناحیە، کە زیاتر لە (٢٠) گوندی دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، هەروەها وەکو زۆربەی  ناوچەکانی تری کوردستان بەر کارەساتی ئەنفال و ڕەشبگیری و پاکتاوی ڕەگەزی و کاول کردن بوتەوە، کەبەشێکی هەرەزۆری ئەم کاولکاریە بەر ڕۆڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی کەوت، هەروەها مێژووی ناوچەکە کوردستانی ناوچەکە دەسەلمێنێت بۆ یەکەم جار کورد ئەو ناوچەیەی ئاوەدان کرۆدتەوەو بەشێك لە هۆزی شێخ بزێنیش لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوونە، هەروەها لەڕووی جوگرافیای دانیشتوان بە پێی سەرژمێریەکانی عێراق هەڵبەزو دابەزی زۆر هەیە لە ژمارەی دانیشتوان ئەمەش بە هۆی هەموو ئەو کارەساتە مرۆیی و ڕامیاریانەی بەسەر ناوچەکەدا هاتووە وەك (ئەنفال و وێرانکردن)، هەموو ئەو کارەساتانەش ڕەنگدانەوەی و کاریگەری زۆری هەبووە  لە سەر هۆزی شێخ بزێنی کە لەم ناوچەیەدا نیشتەجێ بوونە.

[1] - چاو پێکەوتن لەگەڵ بەڕێز ، یاسین میر عەزیز، دانیشتوی ناوچەکە ،٢٠١٣/٥/٢٥.

**ناحیەی شوان (ڕێدار):**

دەکەوێتە سەر ڕێگای گشتی نێوان شاری کەرکوك و کۆیە ، سەر بە قەزای ناوەندە (کەرکوك)ە، (٣٤)کم لەشاری کەرکوکەوە دوورە، کەوتۆتە باکووری ڕۆژئاوای کەرکوك ، بە ناوی عەشیرەتی شوانەوە ناونراوە کە زۆر لە دانیشتوانی ئەم ناوچەیە لە هۆزی شێخ بزێنینە.

سنوور: لە ڕۆژهەڵات قەزای چەمچەماڵ ، ڕۆژئاوا ناحیەی پردێ ، باکوور بە سێ زێی بچووك، باشور

شاری کەرکوك.

ڕووبەر: (١٠٩٠)کم٢ یە بەرامبەر (٤٣٦,٠٠٠) دۆنم، مشارەیە... زۆربەی ناوچەکانی کوردستان لە سەردەمی دەسەڵاتی حەرەس قەومییەکاندا بەر هێرش و پەلاماری سوپاو چەکدارانی حەرەسی قەومی کەوت دێیەکانی ناوچەی شوانیش لە ساڵی (١٩٦٣)دا..دوای سووتاندن و تاڵانکردنی ماڵ و حاڵ و خەلەو خەرمان و خانوبەرەو ڕەشبگیری خەڵکێکی زۆریان لێ شەهید کردن کە بەشێکی هەرە زۆریان لە هۆزی شێخ بزێنی بوون.

حکومەتی ئێستای بەغدا گشت گوندو دێهاتەکانی کاول و تەخت کرد بە ناوەندی ناحیەکەشەوە، لە ساڵی ١٩٨٧ دا ناوچەکە بەتەواوی پاکتاوی ڕەگەزی کرا.

خەڵکەکە بە ناچاری دەربەدەرو ئاوارەی ئۆردوگا زۆرە ملێکان بوون، لە هەولێرو، بنەسلاوەو، دارەتوو، تۆبزاوە و، کەورگۆسك و جدیدە، کە ئێستاشی لەگەڵدا بێت بە شی هەرەزۆری دانیشتوانی ئەم ناوچانە لە هۆزی شێخ بزێنین، خەڵکێکی زۆریشی بەر عەمەلیاتی ئەنفال کەوتن.

ئەو دێیانەی دوای ڕاپەڕین کەوتوونەتە ژێردەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ناحیەی شوان و شێخ بزێنی دا، ئاوایی (قەرەناو) یان بۆکراوەتە ناوەندی ناحیە کە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنین...لەوانە: ئۆمەرمەندان، کاریزەی خاڵخاڵان. پەلکە ڕەش، دار ئەختیار، جگیلەی خواروو سەرو، تورکمان باغ، کانی ڕەش، دووشیوان، تەرەقە، گوڵمکەوە، ئۆمەرمەندانی خواروو، مەرزیخەی خواروو، شەوگێڕ، عەمدونی خواروو سەروو، ناسرومیسر، مەرزیخەی سەروو، کلاوقوت (قەلاتوت)، قەرەسالم، دەرماناو، ئیلینجاغ، پەلکانە، سماقە، داربەسەرە، تولکی، قودرەتە، کاولەسوار، تەپەکوڕە، خدر شیرین، نەیبەسەرە، ناروجەی ئەحمەد ڕەجەب... ئەم گوندانە هەیانە تەنیا یەك ماڵ یا دوو خێزان یا پتر سەر لەنوێ

ئاوەدانیان کردۆتەوەو تێیدا نیشتەجێن کە هەموو ئەو گوندانەی سەرەوە بەشی هەرە زۆری دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنینە.
ئەم ناحیەیە لە ناونووسی ساڵی(١٩٥٧)دا (٧٦) دێ و لە سەرژمێری ساڵی (١٩٦٥)دا (٧٥) ئاوایی لەسەر ئامارکراوە.
عەشیرەتەکان: شێخ بزێنی- شوان- بیبانی[١]
پارێزگا:- کەرکوک قەزا: کەرکوک ناحیە:- شوان
ناوچە:- ژمارەی موقاتەعەکان:٦٦

| ژمارەو ناوی موقاتەعە و گوندەکان | کۆی دانیشتوانی ساڵی١٩٥٧ | کۆی دانیشتوانی ساڵی١٩٧٧ |
|---|---|---|
| ناوەندی ناحیە(ڕێدار) | ٤٢٣ | ٦٧٥ |
| قەرەسالمی خواروو | ١٣٦ | ٢١٩ |
| قەرە سالمی سەروو | ٢٥٧ | ٤٧٣ |
| تولکی | ٤٦٨ | ٦٢٧ |
| دووبزنی | ٨١ | ١٦٢ |
| قەمەر(قەمبەر) | ١١٤ | ١٢٠ |
| شەوگێڕ | ١٩٠ | ٢٩٢ |
| کاولە سوار | ٨٩ | ١٣٠ |
| پەلکانە | ١٧٩ | ٣٠٤ |
| دەرماناو | ١٤٦ | ٢٥٥ |
| حەمدون(عەمدۆن) | ٣١٠ | ٣١٣ |
| مەرزیخەی ژێری | ٣٠٩ | ٣١٥ |
| مەرزیخەی ژوورو | ٢٦١ | ٢٧١ |
| کانی ڕەش | ١٠٨ | ١٧٤ |

[١]- سەرچاوە: محمد هادی الدفتر، عبداللة حسن، العراق الشمالی، بغداد، ١٩٥٥، ص٢٥٢- ٢٥٥- د. نوری طالبانی، منطقة کرکوك، لندن ، ١٩٩٥، ل٧٧- هەردوو سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧-١٩٧٧ ، بغداد.

| | | |
|---|---|---|
| جگیله | ١٥٨ | ١٧٩ |
| ئیلنجاغ | ٢٥١ | ٢٣٠ |
| قەرەناو | ٥٩٢ | ٥٨٥ |
| کەپەنەك | ٢٠١ | ٢٧١ |
| سماقە | ٢٢٣ | ٢٨٣ |
| دارئەختیار | ٢٣٥ | ٢٥٠ |
| ئۆمەرمەندانی خواروو | ٢٠٤ | ١١١ |
| ئۆمەرمەندانی سەروو | | ٣٨٩ |
| تەرەقە | ٦٦ | ٢٧٤ |
| کارێزە- خاڵخالان | ٤٠٥ | ٣٥٧ |
| کۆی ناحیەی شوان و دێیەکانی | ١٣٣٠٢ | ١٦٨٨٤ |
| ژمارەی خێزانەکانی ناحیەی شوان | | ١٠٨ |
| ژمارەی خێزانی دێیەکانی ناحیەی شوان | | ٢٨٢١ |
| ژمارەی قوتابخانەکانی ناحیەی شوان | | ٢ |
| ژمارەی بنکەی تەندروستی ناحیەی شوان | | ١ |
| ژمارەی قوتابخانەکانی دێیەکانی ناحیە | | ١٨ |
| ژمارەیبنکەی تەندروستی دێیەکانی ناحیە | | ١ |



پارێزگای کەرکوک/قەزای ناوەندی کەرکوک



عطاء خیرالله
کەرکوک

لەناو نووسی ساڵی (١٩٥٧)دا پارێزگای کەرکوك لە (٤) قەزا پێکهاتبوو، چەمچەماڵ و قەزای مەرکەزو دوزخورماتوو کفری، قەزای ناوەندی کەرکوك، ڕووبەرەکەی (٥٧٣٨)کم٢ بووە،(١٥٥) دێی لەسەرتۆمارکراوە، کۆی دانیشتوانی ئەم ئاواییانە (٢٨٢٣٧)کەسە، هەر لەم ئامارەدا، تازەخورماتوو یایچی دووئاوایی ئەم قەزای ناوەندەن، دواتر کراونەتە ناحیە. لە سەرژمێری ساڵی (١٩٦٥)دا قەزای ناوەندی کەرکوك (٣٧) دێی بۆ ماوەتەوە، کۆی دانیشتوانی(٦٨٨٠)کەسە ئەم موقاتەعانەشی ناوەدان نییە: ژمارە، ٩، ٣٩، ٥٠، ٥٢، ٥٣، ٦٣، لە ناونووسی ساڵی (١٩٥٧- ١٩٦٥) دا ئەم دێیانە هەبوون و ناونووس کراون، لەوانە (تالبەندەلی، عەلیاوە، تالآوە، سێکانیان، سۆنەگۆلی، کوردە میر، شۆراوی سەدیق بەگ، گورگە چاڵ، کودلیە، عومەرلی غافل، جدیدەی حوسێن بەگ، جدیدەی مایل، عەلە غێر، حەساری حاجی عەوڵلاّ، حەساری بەکر ئەفەندی، توبێلعە)و چەندانی تر. بەڵام لە ئاماری ساڵی(١٩٧٧)دا لابراون و نەماون! کەچی بەدەیان ناوی ئۆردوگای عەرەبی تازە لە ئەدەبیاتی حکومەتی ئێستای بە غدا زیادی کردووە، کە پێشتر نەبوون. هەروەها بەشێکی هەرە زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ ی شاری کەرکوکن بە هەموو قەزاو ناحیەکانەوە.

**قەزای چەمچەماڵ:**

دەکەوێتە لای رۆژهەلاَت و باکوری رۆژهەلاَتی پارێزگای کەرکوکەوە، یەکێکە لە قەزا کۆنە بنەڕەتییە گرنگەکان، لەسەردەمی عوسمانییەکانەوە، سەر بە پارێزگای کەرکوکە، شارۆچکەی چەمچەماڵ ناوەندی قەزاکەی، کەوتۆتە سەر رێگای گشتی نێوان کەرکوك و سلێمانییەوە.

سنووری قەزاکە: لەباکوورەوە: ناحیەی ئاغجەلەرە، لە باشوری رۆژهەلاَتەوە ناحیەی پێبازە، لە خوارووی رۆژئاواوە ناحیەی قادرکەرەمە، لە رۆژئاواو باشووری رۆژئاواوە: ناحیەی قەرە حەسەنە، لە باکوری رۆژئاواوە ناحیەی شوانە، لەرۆژهەلاَتەوە: پارێزگای سلێمانی و ناحیەی بازیانە.. رووبەرەکەی: لەسەر ژمێری ساڵی ١٩٤٧دا (٢٤٥٥)کم٢ یە، لە ساڵی ١٩٥٥دا ناوچەی ناوەندیقەزاکە (٩٣٤کم٢) بەرامبەر (٣٧٣٦٠٠) دۆنم مشارەیە، رووبەری هەموو قەزاکە بە هەردوو ناحیەکەیەوە، ئاغجەلەرو سەنگاو (٣٣٧٦)کم٢یە بەرامبەر (٩٥٠٤٠٠)دۆنم، بەپێی ناو نووسی ساڵی(١٩٥٧)دا (٢٣٩٥کم٢)یە، کۆی دانیشتوانی قەزای چەمچەماڵ بە ناحیەکانیەوە، (٣٤٢٩٩) کەسە و (٢٢٠) ئاوایی بەسەرەوەیە...لە هەردوو ئاماری ساڵی ١٩٥٧- ١٩٦٥دا، ناوەندی قەزاکە (٧١) دێی لەسەر تۆمارکراوە، قەزای چەمچەماڵ لەرووی نەتەوەییەوە یەك ڕەنگ بوو، گشت دانیشتوانەکەی تا سەرەتای شەستەکان کورد بوون، ئەوجا بەرەبەرە داو وتەنی بەعەرەبکردنی بۆدرێژکرایەوە... لەئەنجامی سەرژمێری دانیشتوانی ساڵی ١٩٦٥دا، رێژەی بە عەرەبکردن گەیشتە لە (٣٠٪) لە کۆی دانیشتوانی قەزاکەدا .. لەگەڵ ئەوەی ئەم رێژەیە جێگای باوەرو متمانە نییە، چونکە سەرژمێری ناوبراو لەبارو دۆخێکی نائاسایی دا کراوە، زۆربەی عەرەبە نیشتەجێکراوەکان نامۆبوون بەقەزاکە، حکومەتی عێراق لەسالاَنی شەست و حەفتاکاندا بەکاری هێناون لە پرۆسەکانی دامرکاندنەوەی شۆرشی کورد کەلە ئەیلولی ساڵی ١٩٦١دا هەلگیرسابوو.

بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٦٠٨) لە ١٩٧٥/١١/٦ قەزای چەمچەماڵ خراوەتە سەر پارێزگای سلێمانی، لە نێوان ١٩٨٦- ١٩٨٧- ١٩٨٨دا، گشت گوندو شارۆچکەکانی وێرانکراون و سووتێنراون پتر لە (٩٨٦٦) خێزانی کورد ڕاگوێزراون بۆ ئۆردوگای دوور لە زێدو هەواری ئەسڵی خۆیان .. کەبەشی هەرە زۆری ئەم ڕاگواستن و وێرانکاریە بەر هۆزی شێخ بزێنی کەوت. هەروەها هەموو خوێندنگاو مزگەوت و بنکە تەندروستیەکانیش خاپوورو تەخت کران.. لەبەر ئەوە ئەنجامی ئامارەکانی دانیشتوان لە نێوان ساڵی ١٩٧٠- ١٩٨٧ ئاماژە بەدابەزینی ژمارەی لادێ نشینەکانی ئەم قەزایە دەکەن ساڵانە بەرێژەی لە ٢,٤٪ دوای ئەوەی

گشت هەوڵەكانی بەعەرەبكردنی قەزاكە بێ سوود بوو، حكومەتی عێراق بڕیاری دا لە پاریزگای كەركوكی دابڕێت و بیخاتە سەر پاریزگای سلێمانی ...لەدوای ڕاپەڕینەوە ناوچەیەكی ئازادكراوە، دێیەكانی ئاوەدان كراونەتەوە، تا ئەو شوێنەی لەژێر دەسەڵاتی حكومەتی هەرێمی كوردستاندایە .

لەناونووسی ساڵی (١٩٥٧) دا ئەم دێیانەش لەسەر قەزای چەمچەماڵ تۆماركرابوون، قەرەوەیس- گورگەیی سەرخاسە- گورگەیی خاسە- گورگەیی بەرزان، ساتی- سەیدانی خواروو سەروو- بنكەی خواروو سەروو ناوەراست-خان گەشە- هەزاركانی، بەڵام لەئاماری ساڵی (١٩٧٧) دا زۆربەیان لەسەر ناحیەی قەرە حەسەن (لەیلان) ناونووس كراون، جگە لە هەرسێ ئاوایی: گورگەیی خاسە- هەزار كانی—خانە گەشە- ناویان نەماوە... هەروا هەردوو دێی نورە-بە نورەی سۆفی وەن و نورەی سەیدەكان (گەورە) ناسراون لەسەر زاری خەڵكی كوردەواری، دێی سەعدوناوەش دواتر ئاوەدان كراوە...

*ناوی بەشێك لە عەشیرەتەكانی:

شێخ بزێنی، هەمەوەند، سۆفی وەند، لوڕ، لەك، هەمەیل، جاف، كەڵوڕ، شێخ، سەید، شوان، زەنگەنە، كوردی بەئایین كاكەیی[١].

**ئاغجەلەر لە گوندێكی وێرانەوە بۆ شارۆچكەیەكی ئاوەدان**

ناحیەی ئاغجەلەر كۆنترین ناحیەیە لە سنووری چەمچەماڵداو مێژووی دروست بوونی ناحیەكە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٣٢، چەند جارێك لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا تووشی وێرانكاری بۆتەوە، دواجاریش لە ساڵی ١٩٨٨دا بەیەكجاری وێرانكراو دانیشتووانەكەشی ڕاگوێزرا بۆ ئۆردوگا زۆرەملێیەكان، لە دوای ساڵی ١٩٩١ دووبارە دانیشتووانی ئەم ناوچەیە گەڕانەوە ناحیەكە.

---

[١]- سەرچاوە: محمد هادی الدفتر، عبداللة حسن، العراق الشمالی، بغداد، ١٩٥٥، ص٢٦٠- ٢٦٤- د. نوری طالبانی، منطقة كركوك، لندن، ١٩٩٥، ل٨٤- د. خلیل اسماعیل محمد، البعد القومی للتغیرات فی الحدود الاداریة لمحافظة كركوك، اربیل، ١٩٧٧ ل٣١- ٣٢- هەردوو سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧-١٩٧٧-١٩٦٥ ، بغداد.

سنووری ناحیەی ئاغجەلەر (٥٧) گوند لەخۆ دەگرێت، زۆربەی دانیشتووانی ئەو سنوورەش لە گوندەکاندا نیشتەجێن.

ژمارەی دانیشتووانی ئاغجەلەر بە گوندەکانی چوار دەورییەوە زیاتر لە ١٥٠٠ خێزانە، ئامارەکانیش ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە زیاتر لە ٥٠ گوندی ئەو سنوورە ئاوەدانی تێدایە کە بەشێك لەو گوندانە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتەجێیە.

**ناحیەی ئاغجەلەر:** ناحیەکی کۆنە دەکەوێتە لای باکوری رۆژهەلاتی پارێزگای کەرکوك، سنووری ناحیەکە لە باکوورەوە: زێی بچووك سنووری نێوان ناحیەکەو پارێزگای هەولێرە، لە رۆژهەلاتەوە: ناحیەی سورداش، لە باشووری رۆژهەلاتەوە: ناحیەی بازیانە، لە باشوورەوە: ناوەندی قەزای چەمچەماڵە ، لە رۆژئاواوە : ناحیەی شوانە.

رووبەری ناحیەکە: (٦١٩)کم٢ بەرامبەر نزیکەی (٢٤٧,٦٠٠) دۆنم. (٣٨) کم لە شارۆچکەی چەمچەماڵەوە دوورە.

لەناو نووسی ساڵی (١٩٥٧)دا(٦٢)دێی لەسەر ئامار کراوە، لەسەرژمێری ساڵی( ١٩٦٥) دا(٦١) ئاوایی..گوندو دێهاتەکانی بەناوەندی ناحیەکەشەوە چەندان جار کاول و وێران کراوەو سووتاوە خەڵکەکەی دەربەدەر کراوە ، لەمانگی مایسی ساڵی ١٩٨٨دا چەندان ئاوایی ئەم ناحیەیە کیمیا باران کراوە لەوانە :دێی عەسکەر ،گۆپتەپە ،مۆتلیجە... هەروەها بەشی هەرەزۆری ئەم زەرەرو زیانە بەر هۆزی شێخ بزێنی کەوت کەوا نیشتەجێی ئەم شارۆچکەیە بوون ، بووە هۆی شەهید کردن و بریندار کردنی سەدان ژن و منداڵ و پیرو لاو... دەستی رەشی ئەنفال گەیشتە چەندان خێزانی بێ تاوانی ئەم ناحیەیە ... لەنێوان ساڵی ١٩٨٧-١٩٨٨دا دوای خاپوورو تەختکردنی زۆربەی ئاوایی و دێهات و چەندان ناوەندی ناحیە و شارۆچکەی کوردستان و بەتایبەتی هی پارێزگای کەرکوك. بە خانوو ماڵ و شوێنی خواپەرستی لەمزگەوت و خوێندنگاو ئەو بنکە تەندروستیە کەمانەی کە هەبوون، جگە لە سوتانی رەزو باغ و خەلە و خەرمان و دارو درەخت و دەوەن و تەقاندنەوەی کانیاوەکان و کوێرکردنەوەی شوێنەواریان و کوشتن و برین و تالان و بێ سەر و شوێن کردن و ئاوارەکردنی سەدان خەڵکی مەدەنی، دانیشتوانی ناحیەی ئاغجەلەر و دێیەکانیشی بە ناچاری و بە زۆرداری لە ئۆردوگاکانی سەر ریگای گشتی نێوان کەرکوك- سلێمانی لە تەکیەی بەردەربەند بازیان و شۆرش نیشتەجێ کران ، بێ کارو کاسبی و بژێوی، دوور لەهەوارو زێدو زەوی و

زارەکانیان کە بەشی هەرە گەورەی ئەم وێرانکارییە هۆزی شێخ بزێنی گرتەوە کە بووە هۆی ئەوەی کەوا ئەنفال و وێران بکرێت کە تاکو ئێستاش ڕەنگدانەوەی ئەم کارەساتە لەسەر وەچە و نەوەکانی ئەم هۆزە گەورەیە هەر ماوە. هەندێ دێی ناوچەکانی شێخ بزێنی لەناحیەی ئاغجەلەر بۆ نموونە گوندی (گردخەبەر)، لە ناوچەکانی قەلاسێوەکە لە ئاوایی (هەیدەر بەگ) ئامارکراون[1] .

**-ناوی عەشیرەت و بنەماڵەکانی ناوچەکە :**

١-شیخ بزێنی سەروو

٢-شوانی سەرخاسە.

٣-شێخەدێیەکانی ناوچەی قەلا سێوکە .

٤-سەید.

٥-جاف.

٦-کافرۆشی ،بەزۆری کۆچەرن.

٧-کەلوڕ .

٨-هەقە/حەمەسووری[2].

ناحیە :ئاغجەلەر - قەزا:چەمچەماڵ - پارێزگا:کەرکوک -ژمارەی موقاتەعەکان:٥٩

| ژمارەی ناوی موقاتەعەو گوندەکان | کۆی دانیشتوان ساڵی ١٩٥٧ | کۆی دانیشتوان ساڵی ١٩٧٧ |
|---|---|---|
| عەسکەر | ٤١٣ | ٤٤٧ |
| شۆریجە | ١٣٦ | ٣٦ |
| هەیدەر بەگ | ٢٥٣ | ٣٦٤ |
| گرد خەبەر | ١٩٦ | ٢٧١ |
| چۆخلیجە | ١١٦ | ٨٧ |

[1] - محەمەد سەعید سۆفی، کەرکوک لەناو پاکتاوکردنی رەگەزیدا، چاپخانەی بەرهەم، ل ٢٨١.

[2] - سەرچاوە: محمد هادي الدفتر، عبداللة حسن، العراق الشمالي، بغداد، ١٩٥٥، ص٢٦٥- ٢٦٨- د. نوري طالباني، منطقة كركوك، لندن، ١٩٩٥، ل٨٤-٨٥ - هەردوو سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧-١٩٧٧ ، بغداد.

| | | |
|---|---|---|
| توتەقەل | ١٥٨ | ٢١٢ |
| گلناغاج | ٢٥٩ | ٢٤٠ |
| کانی هەنجیر شێخ بزێنی | ٣٠٦ | ٣٣١ |
| ئەسکەندەر بەگی | ٢٤٦ | ٣١٧ |
| مامەلێسی | ١١٢ | ١٩٩ |
| شێخان شێخ بزێنی | ١٢٠ | ١٨٦ |
| سەرچنار | ١٦٤ | ١٧٩ |
| جەلەمۆرد | ٣١٣ | ٣٩٧ |
| ئاوبارە | ١٤٨ | ١٤٤ |
| تەق تەق | ٤٦ | ٨٦ |
| گۆپتەپە (کوکتەپە) | ٤٥٢ | ٧٢٧ |
| پولڵامیش | ١٢١ | ٢١١ |
| قەسرۆك | ٢٢٩ | ٣٤٩ |
| قودرەتە | ١٣٢ | ٩٦ |
| کانی بی | ١٤٤ | ٢٠٦ |
| قامیشە | ١٦٧ | ٢٢٣ |
| کۆی دانیشتوانی(٦٧) دێ | | ١٣٦٤٦ |
| مەرکەزی ناعیەی ئاغجەلەر | ٦٨٣ | ١١٧٨ |
| کۆی ناحیەی ئاغجەلەر و دێیەکانی | ١١٣٥٥ | ١٤٨٢٤ |
| کۆی خێزانەکانی ناحیەی ئاغجەلەر | | ١٩٥ |
| کۆی خێزانی دێیەکانی ناحیە | | ٢٦٦٠ |
| کۆی قوتابخانە /ناوەندی ناحیە | | ٢ |
| کۆی بنکەی تەندروستی | | ١ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | ناحیە |
| ١٠ | | | کۆی خوێندنگای دێیەکانی ناحیە |
| ١ | | | بنکەی تەندروستی دێیەکانی ناحیە |

**_ گوندی قرغەتوو:**

ئەم گوندە دەکەوێتە باکووری دبس و باشووری ناحیەی پردێ (التون کۆپری)، بەشێك لە بنەماڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی دانیشتوانی ئەم گوندەن، بژێوی ژیانیان لەسەر بە خێوکردنی مەڕومالاَت و دەغڵ و دان و کشتوکاڵ کردنە، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە (حاجی عبداللە – حسن مەرجان – حەسەن حەلەکە) بوون.

**_ گوندی شێخان:**

ئەم گوندە دەکەوێتە سنووری ناحیەی ئاغجەلەر سەر بە قەزای چەمچەماڵ لە پارێزگای سلێمانی، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لەهۆزی شێخ بزێنی یە بژێوی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ وبە خێوکردنی مەڕومالاَت وکاسبکاریە لەو گوندەدا، کە زیاتر لە (٩٥) نۆوەد و پێنج کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاَوی ئەنفال کەوتن.



امراللە-ارهان-حاجی عبدالرحمن-د.رشید-فارس-سلیم اغا-فاروق اغا شێخ بزێنی-عزیزاغا

**_ گوندی قەرەسالی خواروو:**

ناوی ئەم گوندە لەوەوە هاتووە کە لە دوو سەرچاوە وە باسی لێوە دەکرێ یەکەم دەڵێن (قریە سالم) بووە لەکاتی قسەکردن لەسەر زار بۆتە قەرەسالم دووەمیش دەڵێن تورك ئەم ناوەی لەم گوندە ناوە ، ئەم گوندە سەر بە ناحیەی پردێ سەر بە پارێزگای کەرکوکە، گوندی قەرەسالم لە ئێستادا نزیکەی (٢٥)ماڵێك دەبن بەلاّم لە پێشوودا نزیکەی (٨٥) ماڵ دەبوون ، ناوی(قەرەسالم) لە زمانی تورکی بە واتای (سالمی رەش)، ئەم گوندە چەند تایفەی تری تێدایە لەوانە هەمەوەند و شێخان، بژێوی ژیانی ئەم گوندە لەسەر بەخێوکردنی مەڕوماڵات و چاندنی دەغل و دان و کشتوکاڵ کردنە کە زیاتر لە (٢٩) بیست و نۆ کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاّوی ئەنفال کەوتن.



اسعد حمد اغا شێخ بزێنی

**_گوندی قەرەسالی سەروو:**

ناوی ئەم گوندە لەوەوە هاتووە کە لە دوو سەرچاوەوە باسی لێوە دەکرێ یەکەم دەڵێن (قریە سالم) بوو، لەکاتی قسەکردن لەسەر زار بووەتە (قەرە سالم) ، دووەمیش دەڵێن تورك ئەم ناوەی لەم گوندە ناوە ، ئەم گوندە لەئێستادا نزیکەی (٣٠)ماڵێك دەبن بەلاّم لەپێشوتردا زۆر زیاتر بوون ، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕوماڵات و کاسبکاری بووە، پیاو ماقوڵ و ناوداری ئەم گوندە قادر ئاغای کوڕی عبداللە ئاغای کوڕی حاجی همزەی کوڕی ملا ئەحمەدی باپیرە گەورەی شێخ بزێنی بوو دوای ئەویش حمد ئاغای

کوڕی شوێنی باوکی گرتۆتەوە، دواتریش صالح ئاغا و کاك ئەسعەد شێخ بزێنی شوێنی باوکیان گرتۆتەوە، دواتریش حاجی عبدالله.

ناوی قەرە سالم لە زمانی تورکی بەواتای (سالمی ڕەش) دێت، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، کە زیاتر لە (٢٩) بیست و نۆ کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاوی ئەنفال کەوتن.



نوسەر-حاجی عبدالله قرەسالم

**_ گوندی چیاچەرموك:**

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی پردێ (ئالتوون کۆپری )یەو ماوەی (٦) کم لە پردێ دوورە، سەربە پارێزگای کەرکوکە ،دەکەوێتە بەرامبەر گوندی چۆمەزەردەلەی گەورە ، تەنها زێی بچوك لە نێوانیاندایە بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندی لەسەر کشتوکالکردن و دەغلّ ودان و بەخێوکردنی مەڕومالاتە، لە پێشوو دانیشتوانی ئەم گوندە نزیکەی (٥٠ _ ٦٠)مالّ دەبوون بەلام ئێستا نزیکەی (١٠)مالێك ژیانی تێدا بەسەر دەبەن ،ئەم گوندە پاش سالّی (١٩٧٠)ەوە قوتابخانەی سەرەتایی بۆ هاتووە پیاو ماقول و ناودارانی ئەم گوندە مستەفا ئاغای کوڕی قرە محمد ی کوڕی اسماعیل ئاغای کوڕی حاجی همزە کوڕی ملا احمدی باپیرە گەورەی شێخ بزێنی یە لە دوای ئەویش (وەهاب ئاغا) ناوداری ئەم گوندە بووە دواتریش (کاك صباح کوڕی وهاب ئاغا)، کە زیاتر لە (١٢) دوانزە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاوی ئەنفال کەوتن.

ئەم گوندە دەکەوێتە باکوری ناحیەی پردێ (التون کۆپریّ) سەربە پارێزگای کەرکوکە، کۆتاییەکەشی بە گوندی (کانی هەنجیر) دێت، سەر بەناحیەی ئاغجەلەرە سەر بە قەزای چەمچەمالّ سەربە پارێزگای کەرکووکە .



وهاب مصطفى قره محمد اسماعیل اغا شێخ بزێنی ناسراوە بە وهاب اغا

## _ گوندی ئەسکەندەریەگی:

ئەم گوندە سەربە ناحیەی ئاغجەلەری سەر بە قەزای چەمچەماڵی سەر بە پارێزگای کەرکووکە، ئەم گوندە دانیشتوانەکەی لە ئێستادا زیاتر لە (٥) ماڵ دەبن بەلاّم لە پێشووتردا (١٠٠)ماڵ دەبوون ، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و دەغڵ ودان و بەخێو کردنی مەڕوماڵاتە ، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنینە، کە زیاتر لە (٣٦) سی و شەش کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاّوی ئەنفال کەوتن، کەسایەتی ناوداری گوندەکە خورشید ئاغا کوڕی رشید ئاغا بووە.

## _ گوندی مامە لێسی :

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی ئاغجەلەری سەربە قەزای چەمچەماڵی سەر بە پارێزگای کەرکووکە، ئەم گوندە دانیشتوانەکەی لە ئێستادا (٣٠) ماڵ دەبێت لە پێشوتریشدا نزیکەی (٩٠)ماڵ دەبوون بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندی لەسەر کشتوکاڵ و دەغڵ و دان و بە خێوکردنی مەڕوماڵاتە ،زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، کەسایەتی ناوداری گوندەکە صابر ئاغا و کریم اغا کوڕی رشید ئاغا کوری عبدالوهاب ئاغا کوری تۆفیق ئاغای شێخ بزێنی بوونە.



حاجی همزه پەلکانه- فاروق اغا شێخ بزێنی

_ گوندی پەلکانە:

ناوی ئەم گوندە لەوەوە هاتووە کەوا دۆڵێکی لێ بووە هەمووی چەم بووە ، زۆر پەلکی لێ بووە ، بۆیە ناوی گوندەکە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە ، هەروەها بۆچوونێکی تریش هەیە دەڵێ ناوی ئەم گوندە لە پڕکانی یەوە هاتووە واتە ئەم گوندە کانی زۆری لێ بووە بۆیە ناوەکەی لەوەوە هاتووە ، ئەم گوندە سەربە ناحیەی شوانی سەر بە پارێزگای کەرکوکە، دانیشتوانی ئەم گوندە لە ئێستادا (١٠)ماڵ دەبێت ،لە پێشوودا زیاتر لە (٤٠)ماڵ بووە،بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و دەغڵ و دان و بەخێوکردنی مەڕومالآت بووە، پیاوی ناوداری ئەم گوندە لە کۆندا کاك هەمزەی کوڕی قرە محمد و براکانی بوونە، دواتریش کاك صابر فارس ئاغا و حاجی هەمزە کوڕی حمد کوڕی هەمزەی قرە محمد بووە، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، کە زیاتر لە (١٠) دە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالآوی ئەنفال کەوتن، هەروەها لە گوندی پەلکانەی بچووك ئحمەد قادر ئاغا کەسایەتی ناسراوی ئەم گوندە بووە .



علی عبید حمە اغا   گوندی شەو گێر

_ گوندی شەوگێر:

دەگێڕنەوە ناوی ئەم گوندە لەوەوە هاتووە کەوا ئاشێکی لێ بووە، بەشەو کاری پێ دەکرا، بەڕۆژ ئاویان بۆی خەزن دەکرد بەمەبەستی ئەوەی کە لە شەو ئیشی پێ بکەن بۆیە ناوی گوندەکەش هەر لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندی لەسەر کشتوکاڵ و دەغلّ و دان و بەخێوکردنی مەڕومالاّت بووە، دانیشتوانی ئەم گوندە لە ئێستادا نزیکەی (٢٥)ماڵێك دەبن لە پێشوودا زیاتر لە (٦٠)ماڵ دەبوون ئەم گوندە دەکەوێتە سەر زێی بچوك سەر بەناحیەی (شوان)ی پارێزگای کەرکوك پیاوی ناودارو قۆتاغ لەم گوندە لە کۆن عبداللە ئاغای کوڕی مستەفا ئاغا و عوبێد ئاغای شەوگێر و حاجی عەلی بووە دواتر کورەکانی عبێد ئاغایە، کە زیاتر لە (١٣) سیانزە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاّوی ئەنفال کەوتن .


کاکل عبداللە احمد اسماعیل اغا/دەرماناو

**_گوندی دەرماناو:**

وا دەگێڕنەوە کەوا دەڵێن شێخێکی لێ بووە لەم گوندە پێیان دەگوت (پیرخاڵ)، دیارە لەم گوندە کانی تیابووە خەڵکی ئاوی ئەم کانیەیان دەخوارد و دەیان گوت دەرمانە بۆ نەخۆشی بۆیە لەوەوە ناوی ئەم گوندە هاتووە هەروەها بۆچوونێکی تریش هەیە دەڵێ ئەم گوندە کاتی خۆی ئاوی کەم بووە وەکو دەرمان بووە بۆ خەلکەکە کە بەدەست نەکەوتووە، بۆیە لە بێ ئاوی ئەم گوندە ئاو وەکو دەرمان بووە لەم گوندە بۆیە ناولێنانی ئەم گوندە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کەسایەتی ناوداری گوندەکە محمود قادر ئاغا و احمد قادر ئاغا بووە، هەروەها کیخوا حمید صالح عزیز کەسایەتی ناسراو بووە لەو گوندە.

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی شوانی سەر بە پارێزگای کەرکوکە، لە ئێستادا دانیشتوانی ئەم گوندە (٢٥)ماڵ دەبێت، لە پێشوو تریش دا زیاتر لە (٥٠)ماڵ دەبوون، کە زیاتر لە (١٢) دوانزە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاَوی ئەنفال کەوتن .



محمد كريم عمر رحمان اسماعيل اغا
كهونهى مەرزێخی خوارو



شريف علي عمر اغا
مه رزیخه ی خوارووو

## _ گوندی مەرزیخەی خواروو:

ئەم گوندە سەر بەناحیەی شوانی سەر بە پارێزگای کەرکوکە، ڕێژەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە ئێستادا (١٠) ماڵ دەبێت، بەلاّم لە پێشوو تردا زیاتر لە (٦٠)ماڵ دەبوون، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ کردن و دەغڵ و دان و بەخێوکردنی مەڕومالاّتە، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شیخ بزێنی یە، کەریم ئاغای کوری عومەر ئاغای کوری رحمان کوری سمایل کوری حاجی همزە دواتر علی ئاغای برای کریم ئاغا لەم گوندە بووە دواتریش محمد کوری کریم ئاغا بووە، کە زیاتر لە (١٠) دە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاّوی ئەنفال کەوتن.



محمد امین اسماعیل یوسف اغا
گوندی مرزیخەی ژوروو

ـ گوندی مەرزیخەی ژووروو:

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی شوانی پارێزگای کەرکوکە، ئەم گوندە بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و دەغڵ و دان کردن و بەخێوکردنی مەڕوماڵاتە.سمایل ئاغا لەم گوندە بووە کە کوڕی وسوئاغای کوڕی مستەفا ئاغای کوڕی ملاعباسی کوڕی ملا ئەحمەدی گەورەیە، دواتریش محمود ئاغا بووە دواتریش رەسول کوڕی محمود ئاغا کەسایەتی ناسراو بوونە لەو گوندە، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزینی یە کە زیاتر لە (٩) نۆ کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاّوی ئەنفال کەوتن.





عبدالمعین احمد مصطفى احمد یوسف لغا
گوندی کانی رەش

## _ گوندی کانی ڕەش:

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی شوانی سەر بە پارێزگای کەرکوکە بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر بەخێوکردنی مەڕومالاَت و کشتوکاڵ و دەغلّ و دان کردنە ، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە کە زیاتر لە (١٠) دە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاَوی ئەنفال کەوتن، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە ئەحمەد ئاغای کوڕی وسو ئاغای کوڕی مستەفا ئاغای کوری مەلا عباس بووە دواتریش مستەفا ئاغای کوڕی و دواتریش علی ئاغای کوڕی .









**_ گوندی جگیله :**

**ئەم گوندە سەر بەناحیەی شوانی پارێزگای کەرکوکە ، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر بەخێوکردنی مەڕو مالاٌت وکشتوکاڵ و دەغڵ و دان کردنە، ئەم گوندە ئێستا (٥) ماڵ دەبن بەلاٌم جاران زیاتر لە(٥٠) ماڵ دەبوون، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، کە زیاتر لە (١٠) دە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاٌوی ئەنفال کەوتن، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە سعید ئاغا و عبداللە ئاغا بوونە کوڕی وسو ئاغا کوڕی مستەفا ئاغا دواتریش محمد کوری سعید ئاغا ناسراو بە کاکە حەمە بووە .**





جمال قرەناو-اغالە جوامیراغا-فاروق اغا شێخ بزێنی-سوارە قادراغا-اسعد کرکوك

جلیل اغای شێخ بزێنی

**_ گوندی قەرەناو:**

ئەم گوندە سەر بەناحیەی شوانی سەربە پارێزگای کەرکوکە، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و دەغڵ و دان و بەخێوکردنی مەڕومالاتە، دانیشتووانی ئەم گوندە لەئێستادا نزیکەی (٣٠٠)ماڵ دەبێت وەلە پێشوتردا دانیشتوانەکەی (١٠٠٠)ماڵ دەبوون، وسوئاغا کوڕی مستەفا ئاغا کوڕی مەلاعەباسی کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە لەم گوندە بووە، دواتر حسن ئاغا و حسین ئاغا و دواتر جمیل ئاغا و نەجیم ئاغا و فارس ئاغا و عومەر ئاغا لەم گوندە بوونە دواتر جلیل ئاغای کوڕی حسن ئاغا کە پیاوێکی ناسراو و خاوەن پێگەو دیوەخان بووە لەنێو هۆزی شێخ بزێنی، دواتر ئەحمەد ئاغای برای لەم گوندە بووە دواتریش (ڕەزا وسو) و (عزیز فتاح) و (سلام فتح الله) لەم گوندە ناسراو بوونە، زۆربەی دانیشتونی ئەم گوندە لەهۆزی شێخ بزێنی یە، کە زیاتر لە (٧٧) حەفتاو حەوت کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاَوی ئەنفال کەوتن.



ئەحمەد حسن یوسف اغا کەتخدای قەرەناو ناسراوە ئەحمەد اغا

**_ گوندی سماقە:**

ناوی ئەم گوندە لەوەوە هاتووە کەوا ناوەکەی لە (دار ترش)ەوە، بەواتای (دار سماق) هاتووە، کە دار سماقی زۆری لێ بووە بۆیە بوتە سماقە، ئەم گوندە سەر بە ناحیەی شوانی سەر بە پارێزگای کەرکوکە، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و دەغڵ و دان کردن و بە خێوکردنی مەڕومالاتە، دانیشتوانەکەی ئێستا نزیکەی (٥)ماڵ دەبن ،لە پێشووتریش

زیاتر لە (٧٠)ماڵ دەبون، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، کە زیاتر لە (٦٢) شەست و دوو کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاَوی ئەنفال کەوتن، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە کێخوا نەجیم بووە دواتر کورەکەی بەناوی (کێخوا احمد) بووە.

## ـ گوندی قەمیشە:

ناوەکەی لەوەوە هاتووە ئەم گوندە شوێنێکی دۆلاَوی بوو، قەمیشی زۆری لێ بوو، هەروەها شوێنێکی زۆر قایم بوو بۆیە ناوەکەی لەوەوە هاتووە، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و دەغلّ و دان و بەخێوکردنی مەڕومالاَتە، دانیشتوانەکەی ئێستا نزیکەی (١٠)ماڵ دەبن لەپێشوتریشدا زیاتر لە (٧٠)ماڵ دەبوون، ئەم گوندە سەر بە ناحیەی ئاغجەلەرە سەر بەقەزای چەمچەماڵ سەر بە پارێزگای سلێمانی یە، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لەهۆزی شێخ بزێنی یە، کە زیاتر لە (٣٤) سی و چوار کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاَوی ئەنفال کەوتن، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە یاسین ئاغا بووە.





قادر علی توفیق اغا
کوندی قصرۆک



## ـ گوندی قەسرۆك:

سەر بە ناحیەی ئاغجەلەری سەر بە قەزای چەمچەماڵی سەر بە پارێزگای کەرکووکە، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و دەغلّ و دان و بەخێوکردنی مەڕومالاَتە، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، کاتی خۆی توٚفیق ئاغای شێخ بزێنی

لەم گوندە دانیشتووە دواتر محمود ئاغای کوڕی، کە زیاتر لە (٢١١) دووسەد و یانزە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاَوی ئەنفال کەوتن.



ابوزید تۆفیق اغا شێخ بزێنی

_ گوندی قودرەتە:

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی ئاغجەلەری سەر بە قەزای چەمچەماڵی سەر بە پارێزگای کەرکووکە، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و دەغلّ و دان و بەخێوکردنی مەڕوماڵاتە، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، ئەم گوندە لەپێشوتر دانیشتوانەکەی زیاتر لە (٣٠)ماڵ دەبوون، کە زیاتر لە (١٣) سیانزە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاَوی ئەنفال کەوتن، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە علی ئاغای کوڕی تۆفیق ئاغا بووە دواتر صابر ئاغای کوڕی و قادر ئاغای کوری.



مام حسن-حویز رحمان اغا-فاروق اغا-عباس گلناغاج-مام اغا

_ گوندی گردخەبەر :

ئەم گوندە سەربەناحیەی ئاغجەلەری سەر بە قەزای چەمچەماڵی سەر بە پارێزگای کەرکووکە، دانیشتوانەکەی لە ئێستادا بریتیە لە (٤٥) ماڵ وە لە پێشوتریش زیاتر لە (٩٠)ماڵ دەبوون، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە بەزۆری لەسەر کشتوکاڵ کردن و دەغڵ ودان و بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتە وە کەمێکیشیان مووچەخۆری حکومەتن ناوی ئەم گوندە گوایە لەوە هاتووە ئەم گوندە گردێکی تێدایە بە هۆی ئەم گردەوە بەشەوقی ئاوێنە ئاگاداری یەکتریان دەکرد لە پێشهاتەکان بۆیە ناوی نراوە گردخەبەر، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، کەسایەتی دیارو ناوداری ناوچەکە شریف ئاغای برای تۆفیق ئاغا و دواتر مامەند شریف ئاغا و مودیر کوری شەریف ئاغا دواتر میرزا ئاغا و دواتر مام حەسەن مەمەند ئاغا و مام انور میرزا ئاغایە کە هەموو خزم و کەس و کارەکانیان بەر شالاوی ئەنفال کەوتن، کە زیاتر لە (٢٠١) دوو سەد و یەك کەس لە خزمانی شێخ بزێنی هەر لەو گوندە بەر شالاّوی ئەنفال کەوتن.

_ گوندی توتەقەل:

ئەم گوندە سەر بە ناحیەی ئاغجەلەری سەر بە قەزای چەمچەماڵی سەر بە پارێزگای کەرکووکە، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە بەزۆری لەسەر کشتوکاڵ کردن و دەغڵ ودان و بەخێوکردنی مەڕوماڵاتە، ئەم گوندە لە پێشوتردا دانیشتوانی زیاتر لە (٤٠)ماڵ دەبوون بەلاّم لە ئێستادا نزیکەی (١٥)ماڵ دەبێت ، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، کە زیاتر لە (١٣٤) سەدو سی و چوار کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەر شالاّوی ئەنفال کەوتن، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە سمایل ئاغا و شەریف ئاغای برای تۆفیق ئاغا بوونە دواتریش خەشمان اغا و عبدالوهاب کوری شەریف ئاغا بووە دواتر کاکەجوان و عبدالرحمن کوری قادر کوری خەشمان بووە.

تێبینی// ئێستا قەزای چەمچەماڵ سەر بە پارێزگای سلێمانیە بەلاّم لە پێشو تردا سەر بە پارێزگای کەرکووك بووە.

**گوندی تووته قەل: ناوچەی شێخ بزێنی _ لەبناری شاخی خاڵخاڵان _ ناحیەی ئاغجەلەر _ کەرکوك**

لەسەردەمی عوسمانیە داگیرکەرەکان لە دەربەندی بازیانەوە زێ بە زێ هەتا پردێ ی ئێستاو چەمچەماڵ و قەرەهەنجیریش بە تەنها یەك ناحیەی هەبووە ئەویش ناحیەی (بازیان) بووە، لەو سەردەمانە بنەماڵیەك لەگەڵ هۆزێك بەگژ جەندرمە داگیرکەرەکانەوە دەچنەوەو سەریان بۆ ئەوی ناکەن ئەوانیش لە بروسکەکانە بۆ ئەستانە دەنوسن ئەوانە شێخ بزێنین لە کاتێکدا شێخی بازیان بوون لە (سارتك) و(ئاوماڵ)ەوە بنەماڵەی (مەلا ئەحمەدی شێخ بزێنی) هەتا (بازیان) ڕاپەڕینی خۆیان دەکەن واتە بەشێکی زۆریان دوور دەخرێتەوە بۆ ناوچەی هەیانەی خۆرئاوای ئەنقەرەی تورك کە لە ئێستادا (٧٢)حەفتاو دوو گوندو چوار ناحیەو قەزایەك بەناوی شێخ بزێنی یەوە هەیە لە باکوری خۆرئاوای کەرکوکیش لە دەم زێ ی بچوك شێخ بزێنی خواروو شێخ بزێنی سەروو هەیە هەتا بناری خاڵخاڵان و شیوە سوور، ئاوایی تووتەقەڵ یان (تووی تاقەیاڵ) کە (٣٠٠)ساڵێك بەر لە ئێستا بنەماڵیەك لە گوندی (هەڵەدنی) دوڵی جافایەتی و بنەماڵەیەکیش لەسەر زێی بادینانەوە هاتونەتە ئێرەو ئاوەدانیان کردوتەوە سەرەتا لە (کەیلان) بووە دواتر هاتووەتە (چەمی خانوان) و لەساڵی (١٩١٧ز)گواستراونەتەوە بۆ شوێنی ئێستای، شاخی خاڵخاڵانیش کە نزیکەی (١١٠٠)مەتر لە ئاستی رووی دەریاوە بەرزە لە گوندی سماقەوە هەتا (ناسرو میسر) درێژبوتەوە ئەفسانەکەی لەو مەملەکەتە دەگێڕنەوە ژنێك ناوی خاڵخاڵان دەبێ و خوشکی پیرە مەگرونە و دەست ڕۆیشتوو بووە بە داد وقەڵەم ڕەوی هەتا کەرکوك غەلەکەی (مەزارەکەی ) جەلە مۆرد و کارێزەوموڵ خواردەیە.

شێخ بزێنی جوگرافیایەو ناوچەیە هەم دیسان عەشیرەتە، ئاوایی تووتەقەڵ کەرتی کشتوکاڵی ژمارە (٥) ە، ئەم گوندە (١٣٤)سەدو سی وچوار ئەنفالی داوە لەگەڵ(١٠) دە شەهید، ئەم ئاواییە سێ جار وێران و کاول کراوە، جاری یەکەم لەسیەکانی سەدەی ڕابردوو بوو کە لە (سەرچنار) پۆلیسێکیان کوشت و بەڕێوەبەری ناحیەش ڕای کرد بۆیە ئەم گوندە کەوتە بەر بۆردوومانی فڕۆکەو وێران کرا هەروەها جاری دووەم لەساڵی (١٩٦٣ز) لەسەردەمی حەرەسی قەومیەکاندا جاری دووەم کاوڵ و وێران کرایەوە ئەم گوندە بۆجاری سێ یەم لەساڵی (١٩٨٨) دیسان کەوتەوە بەر شالاوی ئەنفال کردن، ئەم گوندە لەساڵی (١٩٨٥ز)دا بۆیەکەم

جار  قوتابخانە لەم ئاواییە کراوەتەوە ، لەپێش ئەنفالەکە دانیشتوانی ئەم گوندە نزیکەی (٥٠)ماڵ بووە[١] .





: رحمان فارس رشید اغا  کوندی سەرچنار

**- گوندی سەرچنار:**

ناوی ئەم گوندە لەوەوە هاتووە کەوا دار چناری زۆری لێ بووە، وە ئەم گوندە لە بەرزیش دا بووە واتەشوێنەکەی بەرز بووە و پڕ لە دارچنار بووە بۆیە ئەم ناوەی لێ نراوە، ئەم گوندە سەر بە ناحیەی ئاغجەلەری سەر بە قەزای چەمچەماڵی سەر بە پارێزگای کەرکووکە، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و دەغڵ و دان و بەخێوکردنی مەڕوماڵاتە، ئەم گوندە لە ئێستادا نزیکەی (١٢)ماڵ دەبن بەڵام لە پێشوتردا زیاتر لە (١٠٠)ماڵ دەبوون، ئەم گوندە لە ساڵانی پێشووتردا ناحیە بوو، هەروەها هەموو دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنینە، براگەورەو پیاوی ناوداری ئەم گوندە لە پێشوودا فارس ئاغای سەرچنار بووە دواتر کورەکانی بەناوی تاهیر ئاغا و عەبدوللا ئاغاو ڕەحمان ئاغای سەرچنار کە زیاتر لە حەوت کوڕی ئەنفال بووە دواتریش حویز رەحمان ئاغا، چونکە ئەم گوندە یەکێکە لەو گوندانەی هۆزی شێخ بزێنی کەبەر شاڵاوی ئەنفال و کاولکاری و وێرانکاری رژێمی بەعس کەوتووە، بۆیە تاکو ئێستاش کاریگەری ئەم ئەنفال و وێرانکاریە لەسەر تاکەکانی ئەم گوندە هەرماوە، حوێز ئاغا

[١] - بەرنامەی ژیانەوەی کوردستان ، دلشاد ئەحمەد، سەتەلایتی کوردستان ،گوندی تووتە قەڵ، بەرواری ٢٠١٤/٦/٢٧.

کوڕی ڕەحمان ئاغا کەسایەتی ناوداری ناوچەکەیە، ئەم گوندە لەساڵی ١٩٦٣ حەرەس قەومی تالانی کردووە ، هەروەها لەساڵی ١٩٨٨ حکومەتی بەعس ئەمانەی خوارەوەی لە نەوەی ڕەحمان ئاغای سەرچنار و چەندی تر لە خەڵکی ئەم گوندەی ئەنفال کرد بەو ناوانە: (١-کاوێز عبدالرحمن فارس ٢-جواد عبدالرحمن فارس ٣-لقمان عبدالرحمن فارس ٤-نامیق عبدالرحمن فارس ٥-صباح عبدالرحمن فارس ٦-باقی عبدالرحمن فارس ٧-محسن عبدالرحمن فارس ٨-زارا عبدالرحمن فارس ٩-شوشە عبدالرحمن فارس١٠-سعاد عبدالرحمن فارس ١١- ڕوناك کاوێز عبدالرحمن ١٢- ئاراس کاوێز عبدالرحمن ١٣- بورهان کاوێز عبدالرحمن ١٤- فەرمان کاوێز عبدالرحمن ١٥- پەیمان کاوێز عبدالرحمن ١٦- سۆزان کاوێز عبدالرحمن ١٧- ڕەیحان کاوێز عبدالرحمن ١٨- چەتۆ جواد عبدالرحمن ١٩-عیرفان جواد عبدالرحمن ٢٠- سار جواد عبدالرحمن ٢١- سەنگەر صباح عبدالرحمن ٢٢- سەروەر صباح عبدالرحمن ).
کە زیاتر لە (١٤١) سەدو چل و یەك کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاوی ئەنفال کەوتن.

**-گوندی جۆغلیجە:**

ئەم گوندە ئێستا نزیکەی (٥) ماڵێك دەبن لە پێشوتردا زیاتر لە (٣٠)ماڵ دەبوون، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و دەغڵ و دان و بەخێوکردنی مەڕوماڵاتە، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، کە زیاتر لە (١١٤) سەدو چواردە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاوی ئەنفال کەوتن، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە یاسین ئاغا کوری تۆفیق ئاغا بووە دواتریش (کیخوا محمد) بووە .

**-گوندی مەلحەوالی:**

ناوی گوندێکە نزیك شارۆچکەی دوبز لە سەر رووباری هەڵکەوتەوە، ئەم گوندە نزیکەی (٣کم) لە دووبزەوە دوورە، دەکەوێتە باشووری ناحیەی پردێ (التون کۆپری) و باکوری دبسەوە لەسەر زێی بچووك بەرامبەر بەنداوی(کونە کۆتر) یان (نمرە هەشتیشی )پێ دەڵێن، ئەم گوندە قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لێ بووە، هەروەها نەخۆشخانەو مزگەوتیشی لێ دروست کراوە، ئەم گوندە دانیشتوانەکەی نزیکەی (٩٠) ماڵێك دەبوون، ناوی ئەم گوندە بەزمانی کوردی بە واتای (چێڵی شیردەر) دێت، هەروەها هەندێ جار (أم ملحوالی)یش پێ دەڵێن،

زۆرجار بە (دایکی حۆریان)یش ناوی دەنێن، هەروەها زۆرجار ناوی ئەم گوندە دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی کەوا خوێ (ملح) لەو گوندە بەدی دەکرێت و هەردەم هەبووە بۆیە پێی دەڵێن (أم ملحوالی) کە سەرچاوەی لە (ملح) خوێ هاتبێت بە هۆی ئەوەی کە هەردەم خوێ (ملح) لەم گوندەیە هەبووە وئێستاش هەر بەدی دەکرێت و بەرچاو دەکەوێت خوێ لەم گوندەدا، هەروەها ئەم گوندە بەهۆی ئەوەی کەوا حوشتری لێ بووە و بەخێوکراوە بۆیە شوێنێك هەیە لەم گوندە ، پێی دەڵێن کەندی حوشتر، جگە لەمانە چاکەك لەم گوندە هەیە کە گوایە ئافرەتیشە هەر لە کۆنەوە لەم گوندە هەبووە ئەم چاکەیە، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە (مەلاقادر و حاجی شکر و حاجی حسن وحاجی معروف) بوون.

**_گوندی قەیەباشی:**

ئەم گوندە نزیکەی (١کم)لە پردێ دوورە دەکەوێتە باشووری ناحیەی پردێ (التون کۆپری)، دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە هەندێك لە نەتەوەی عەرەبیش لەم گوندە نیشتەجێن، دانیشتوانەکەی نزیکەی (١٠٠)ماڵێك دەبن، ئەم گوندە کەوتۆتە سەرجادەی سەرەکی پردێ _دوبز، خوار ناحیەی پردێ لەسەر زێ کەوتووە، زۆربەی شێخ بزێنیەکانی دانیشتووی ئەم گوندە لە تیرەی چۆغەڕەشین، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە مام عوسمان مەندان بووە.

**-گوندی چۆمە زەرد دەرە:**

ئەم گوندە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی ناحیەی (پردێ) ئاڵتون کۆپری،دوا گوندی ناوچەی دزەییایەتییە سەر بە ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرە ، دووگوند بەو ناوە هەیە ئاقاریان لەسەر یەکە چۆمە زەردەرەی سەروو و خواروو لەتۆمارگاکانی میری بە (صاری چم الکبیر)و(صاری چم الصغیر) تۆمارکراون. واتا چۆمەزەردەرەی گەورەو گچکە.

چەمە زەردەری سەروو( گەورە)، کاتی خۆی ئەو ناوە چەم و چەم دەوچەولکی پردێ دەکرا بە گەنمە شامی (دەرە) ئەو ناوە سەرتاپا زەرد هەڵدەگەڕا، خەڵکەکە ناویان لێنا چەمە زەرد دەرە، جا لەرووی زمانەوانییەوە ئەگەر وشەی (چەمەزەرددەرە) شی بکەینەوە دەبینین ناوێکی لێکدراوی کوردیە لەوشەی (چەم+ ە+ زەرد+ دەرە)پێك هاتووە واتا(ناو+ ئامرازی ە+ئاوڵناو).

دانیشتوانەکەی لە تیرەی (چۆغەر ڕەشی) ین کەتیرەیەکن لە هۆزی شێخ بزێنی.
گوندەکە زۆربەیان خزمی یەکن ، ئەو گوندە دەکەوێتە سەر زێی بچووك. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی چەمەزەردەرەی سەروو- سێقرچان- تۆبزاوە- شێراوە- لەسەریەکە. خەڵکەکە (چەمە زەردەرە)ی پێ دەڵێن لە وشەی (زەرد) پیتی (د) دەقرتێنن دەیکەن بە( زەر) هەروەکو لە شێوەی کرمانجی سەروودا[1].

## ـ گوندی چۆمە زەردەڵەی بچووك :

ئەم گوندە دەکەوێتە باکوری ناحیەی پردێ (ألتون کۆپری) بەرامبەر گوندی قەرەبەگە، دانیشتوانەکەی نزیکەی (١٠٠)ماڵێك دەبن ، ئەم گوندە دەکەوێتە سەر زێی بچووك (٥کم) لە ناحیەی (پردێ ) وە دوورە ، ئاوو هەوایەکی خۆشی هەیە بەهۆی ئەوەی دەکەوێتە سەر کەناری زێ یەکەوە لە ساڵی ١٩٧٠ قوتابخانەی لێ دروست کراوە ، لەساڵی ١٩٧٦ شەقامی قیرتاوی بۆدروست کراوە ، ئەم گوندە پێشتر سەربە ناحیەی قوشتەپەی سەر بە پارێزگای هەولێر بوو، بەلاّم دوای ئازاد کردنی عێراق لە رووی ئیدارییەوە کەوتە سەر ناحیەی پردێ سەر بە قەزای دووبزی سەر بە پارێزگای کەرکوك ، هەروەها (مەلا خورشید) کەسایەتی دیار بوو لەو ناوچە کە مامی (علی مولود حسن)کوێخای ئەم گوندە بووە، بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی ئەم گوندە لە هوزی شێخ بزێنی یە.

## ـ گوندی چۆمە زەردەڵەی گەورە:

ئەم گوندە دەکەوێتە باکوری ناحیەی پردێ (التون کۆپری) بەرامبەر گوندی چیاچەرموکە، ئەم گوندە دانیشتوانەکەی نزیکەی (٨٠) ماڵێك دەبوون، خەڵکەکەی بژێوی ژیانیان لەسەر بەخێوکردنی مەڕو مالاّت و کشتوکاڵ کردن و شینایی و چاندنی گەنم و جۆ بوو، لەبەر ئەوەی ئەو کات ئوتومبیل کەم بوو دانیشتوانی ئەم گوندە بە دەوار هاتووچۆی پردێ یان دەکرد، ئەم گوندە لە پێشوودا سەر بە ناحیەی قوشتەپە بوو سەر بە پارێزگای هەولێر، بەلاّم پاش ئازادکردنی عێراق لە رووی ئیداریەوە کەوتە سەر ناحیەی پردێ سەر بە قەزای دوبز سەر بە

[1] - هۆشیار عبدالله،جوگرافیاو مێژوو ریشەی ناوی هەندێك لە گوندەکانی دەشتی هەولێر، گ: هەولێر، ژ: ١١، هاوینی ٢٠٠١، ل١١٢ .

پارێزگای کەرکوك، هەروەها ناوداری ئەم گوندە (کێخوا مولود عومەر سەفەرسوار) بووە دواتر کورەکانی (حاجی عومەر)و (حاجی رشید ) بوون .

زۆربەی شێخ بزێنییەکانی دانیشتوانی ئەم گوندە لە تیرەی چۆغە ڕەشین، تیرەی چۆغە ڕەش یەکێکە لە تیرەکانی هۆزی شێخ بزێنی، هۆی ناولێنانی بە چۆغەڕەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەوا هۆزی شێخ بزێنی تووشی شەڕ دەبێت لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی لە (قەلاسێوکە) یەکێك لەو جەنگاوەرانەی هۆزی شێخ بزێنی زۆر بە فیداکاری جەنگ دەکات لەگەڵ عوسمانیەکان زۆر ئازایانەو دلێرانە بەرەنگاریان دەبێتەوە کەوا دەردەکەوێت ئەو کەسە جل وبەرگی چۆغەلێکی ڕەشی لە بەر بووە ناوی دەرکردووە لەو جەنگەدا بۆیە لە نێو خۆیان ئەو سەردەم هەر گوتویتیان چۆغەڕەشەکە دواتر بۆتە چۆغەڕەشی کە نەوەو وەچەی زۆری لێ پەیا بووە، هەر بۆیە بە وەچەکانیان دەڵێن چۆغە ڕەشی کە یەکێك بووە لە پیاوە ئازاکانی هۆزی شێخ بزێنی و دواتر بۆتە یەکێك لە تیرەکانی هۆزی شێخ بزێنی، بۆیە سەرچاوەی ناولێنانی چۆغەڕەشیەکانی هۆزی شێخ بزێنی لەوەدا هاتووە کە لە سەرەوە باسمان کرد .

**گوندی قەرەبەگ:**

ئەم گوندە دەکەوێتە باکوری ناحیەی پردێ (ئاڵتوون کۆپری) ئەو بەری زێی بچووك بەرامبەر گوندی چۆمەزەردەلەی بچووك، دانیشتوانی ئەم گوندە پێکهاتووە لە عە شیرەتی شێخ بزێنی و ساڵەیی، ئەم گوندە لەسەردەمی جکومەتی پێشوودا پردێکی قتاری لێ بوو لەسەر زێی بچووك دروستکرابوو لە کەرکوك قتار دەهات بۆ هەلێر لە گوندی قەرەبەگ لەسەر پردەکە مەرکەزی پۆلیسی لێ بوو لای گوندی چەمەزەردەلەی بچووك، ئەم گوندە دەکەوێتە بەرامبەر گوندی چەمە زەردەلەی بچووك لەو بەری زێ، هەروەها نزیکەی (٣) کم لە ناحیەی پردێ دوورە، ئەم گوندە قوتابخانەی ناوەندی لێ بوو، دانیشتوانەکەی زیاتر لە (١٠٠)ماڵ دەبوون، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە (حاجی خالند و کاك رەشید عەلی و کاك سمایل) بوون.

(قەرە بەگ) بە زمانی تورکی واتە (بەگی ڕەش )، بەشێك لەدانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە .

**-گوندی کاوله سوار :**
ئەم گوندە دەکەوێتە ناحیەی شوان (ڕێدار) سەر بە پارێزگای کەرکوکە، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، بژێوی ژیانی دانیشتوانەکەی لەسەر کشتوکاڵ و بە خێوکردنی مەڕو مالاَت و کاسبکاریە لە گوندەکەدا، کە زیاتر لە (١٣) سیانزە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاَوی ئەنفال کەوتن، کەسایەتی ناسراو لەو گوندە (کێخوا بابە) بووە .

**-گوندی تورکی:**
دەکەوێتە ناحیەی (شوان) ڕێدار سەر بە پارێزگای کەرکوکە، زۆربەی دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، بژێوی ژیانی دانیشتوانی ناوچەکە لەسەر کشتوکاڵ و بە خێوکردنی مەڕو مالاَت و کاسبکاریە، کە زیاتر لە (١٢) دوانزە کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالاَوی ئەنفال کەوتن، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە بەرێز (کێخوا تۆفیق) دواتر (کێخوا محمود) دواتر کوڕەکانیان (کێخوا ونس) و (کێخوا ڕەشید) بووە.

**-گوندی عەمدون:**
ئەم گوندە دەکەوێتە سنووری ناحیەی (شوان) سەر بە پارێزگای کەرکوك، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، بژێوی ژیانی دانیشتوانەکەی لەسەر کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو مالاَت و کاسبکاریە لە ناوچەکەدا، هەروەها کەسایەتی ناسراو لەو گوندە (کیخوا تۆفیق) و(کێخوا عبدالرحمن) بووە دواتریش کێخوا مستەفای کوری کیخوا عبدالرحمن و کێخوا کمال احمد محمود) بوونە .
-گوندی (عەسکەر، حەیدەر بەگ،گۆێتەپە) لە پێشوودا گوندی شێخ بزێنییان بووە بەلاَم دواتر زۆر لە خەڵکەکەی باریان کردووە لەم گوندانە، شێخ بزێنی تێدا نەماوە .

**گوندی کەپەنگ:**
دەکەوێتە ناحیەی ناغجەلەر سەر بە قەزای چەمچەماڵ سەر بە پارێزگای کەرکوك بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و بە خێو کردنی

مەڕو ماڵات و کاسبکارییە لە ناوچەکەدا، کەسایەتی ناسراوی گوندەکە (عبدالرحمن کوری فەقێ عزیز) لەگەل (حاجی حویز) بوونە.

**-گوندی گەڵناغاج گەورە :**

سەر بە ناحیەی ئاغجەلەری سەر بە قەزای چەمچەماڵی سەر بە پارێزگای کەرکوکە، زۆربەی دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، بژێوی ژیانیان لەسەر بەخێو کردنی مەڕوماڵات و کشتوکاڵ و کاسبکاریە لە ناوچەکەدا، کەسایەتی ناسراو لەو گوندە (رسول ئاغای قادر ئاغا) و (محمد کوڕی مستەفا کوڕی همزە کوڕی یوسف ئاغا) ناسراو بە (حەمە ئاغا) بووە دواتریش ( عارف عزیز محمد همزە ئاغا)و(حاجی جلال عزیز محمد همزە ئاغا) (عباس حمە ئاغا) و (رشید حمە ئاغا) بوونە .

**-گوندی گەڵناغاج بچووك :**

ئەم گوندە دەکەوێتە سنووری ناحیەی ئاغجەلەر سەر بە قەزای چەمچەماڵ لە پارێزگای کەرکوك، زۆربەی دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، بژێوی ژیانیان لە سەر کشتوکاڵ و بە خێوکردنی مەڕو ماڵا ت و کاسبکارییە لە ناوچەکەدا .



ابراهیم همزە یوسف اغا
گوندی گلناغاج

**گوندی گەڵناغاج : بناری چیای خاڵخالآن – ناوچەی شێخ بزێنی – ناحیەی ئاغجەلەر – کەرکوك .**

**-گوندی گەڵناغاج :**

ناوچەی شێخ بزێنی بە شێکی لە سنووری ناحیەی شوان و بەشێکی تری لە سنووری ناحیەی ئاغجەلەرە و لە باکوری کەرکوکی کورستانە، شێخ بزێنی سەروو لە شیوە سووری دەم (کانی هەنجیر)ەوە بنارەو بناری (شاخی خاڵخالآن) دەست پێ دەکات هەتا ئاوایی (قەمیشە) لە (سماقە) و (قەرەناو) و (شەوگێر) و (جگیلە) و (کانی ڕەش) ەوە خوار دەبێتەوە هەتا (قەرە سالم) ئەم شێخ بزێنی خواروە، شێخ بزێنی ناوی هۆزێکی کوردەو ناوچەکەشی هەر بەو ناوەوە کراوە لە ساڵی (١٦١٥) بەو لاوە عوسمانی یە داگیرکەرەکان زوڵم و زۆریان لەسەر کورد زۆر دەبێ بۆیە دوو هۆز لە ناوچەی کەرکوك ڕادەگوێزن شێخ بزێنی و هەمەوەند، شێخ بزێنییەکان بەرەو ئورفەی کوردستانی باکورو شارێك بەناوی هەیمانەی نزیك ئەنقەرەوە لەو ناوچەیەوە ڕادەگوێزن و زیاتر لە (١٠٠) گوندی شێخ بزێنی لەو ناوچانە ئاوەدان دەکەنەوە، گوندی گەڵناغاج یان (کەندی ئاغاجە) یەکێکە لە گوندەکانی شێخ بزێنی (٧٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا (گەڵناغاج)ە کۆن ئاوەدان دەکەنەوە دواتر لەوێ هەڵدەکەن دێن بەرەو خوار لە دیوی خانوان نیشتەجێ دەبن ئەوجا پاش چەند ساڵێکی تر دێنە (گەڵناغاج) ی ئێستاو دەبن بەدوو گوند، (گەڵناغاج) شوێنەوارێکی دێرین و مێژوویيە و (گرد خەبەر)یش گوندی خوار ئەو شارستانی تێدابووە، (گردە گەج ) مەملەکەتێکی فراوان بووە، پاشاو مەملەکەت بوو، دوو چاڵە زیندانیان هەبووە شوێنەواری ئەوان ماون هەتا ئێستاش، کاك (عباس)ی گەڵناغاجی بچووك و (لالۆ حەمەی ) گەڵناغاجی گەورە زانیاری مێژوویيان لابوو.

بە هۆی ئەوەی کەوا هۆزی شێخ بزەینی و هۆزی هەمەوەند زۆر چاو نەترس و ئازاو دڕ بوونە هەردەم لەگەڵ عوسمانییەکان ناکۆك بوونە بۆیە لە ساڵی (١٦١٢) بەولاوە عوسمانی یەکان ئەم دوو هۆزەیان لە دەورووبەری کەرکوك ڕاگواستووە بۆ تورکیاو لیبیا، هۆزی شێخ بزێنی ڕاگواستووە بۆ تورکیا دەورووبەری شاری دیار بەکر و ئەنقەرەو هەیمانەو لە چەندین ناوچەی تر نیشتەجێ ی کردوون، هەروەها هەمەوەندەکانیش بۆ ولآتی لیبیا ڕاگواستووە .



محمد مصطفی فرزە یوسف ئاغا   گوندی گەڵناغاج   ئەنفالکراوە بە حەمە ئاغا

**ناوی گوندی گەڵناغاج دوو بۆچوون لە بارەیەوە :**

یەکێکیان دەڵێن لە چەمێکی خۆشەویستەوە هاتووە پێی دەڵێن گەڵناغاج، ئەوی تر دەڵێن (کەندا غاج) کە ئەمە کەندی(غاج) بووە یان شیوی (غاج) بووە هەر بە ناوی ئەویشەوە وتراوە کە ئەم چەمە چەمی گەڵناغاجە کۆنەی پێی دەڵێن بە ناوی ئەوەوە هاتووە بۆیە ناوەکەی بۆتە (گەڵناغاج) پێشتر گوندەکە لە چەمی گەڵناغاجە کۆنەکە بووە دواتر هاتۆتە بۆ دیوی خانوان دوایی سەر کەوتۆتە سەر ئەم بانە دواتر ئێستا بۆتە دوو دێ گەڵناغاجی گەورەو گەڵناغاجی بچووك کە لەساڵی (١٩٣٥- ١٩٣٦) بەهۆی ئەوەی کە مەرو ماڵاتی زۆریان هەبووە بۆیە گەڵناغاج بۆتە دوو دێ ئەویش گەڵناغاجی گەورەو بچووك بۆیە ئەم گوندە لەو بەری یەوە دێ یەکی تریان لێ درووست کردووە هەروەها دووکانی لێ بووە بەناوی کانی شێخ بزێنی و کانی کوتلە ، هەروەها ئێستا گوندی گەڵناغاج گەورە نزیکەی (٢٥) ماڵی لێ یە و گەڵناغاجی بچووکیش نزیکەی (٢٥) ماڵ دەبێت .

لە گوندی گەڵناغاجی بچووك پێنج برای کاك عباسی گەڵناغاج ئەنفال کراوە بەو ناوانە : (١-صالح محمد مستەفا، ٢-احمد محمد مستەفا، ٣-خورشید محمد مستەفا، ٤-علی محمد مستەفا، ٥-یوسف محمد مستەفا) لەگەڵ سێ خوشکیشی ئەنفالکراوە لەم گوندەدا، لەم گوندە چەندین شوێنەواری تێدایە لەوانە(گردەگەج) و (رەشبیرە)ەو (قەلاتگەیە)ەو (زیندان)ە، (گردەگەچەکە) هەمووی خانوو بووە بە خشتی سوورەوەکراو بە گەج کراوە پاشای لێ دانیشتووەو شارێکی گەورە بووە، هەروەها (چاڵە زیندانیش) خەڵکیان تێدا زیندانی کردووە

هەروەها ئاویشیان بە بۆری هێناوە لە بەستەکەوە بۆ ناو زیندانەکە. هەروەها ئەشکەوتێکی لێیە بەناوی زرێبار یان زێبار، هەروەها (ڕەشبیر) یش کۆنە خەرابگە بووە کە ئاوی لێیە، هەروەها لە ساڵی (١٩١٦) لە ڕەشبگیری عوسمانییەکان کە (سەفەر بەرلەك) یان پێ ووتوە دێنە ئەو ناوچەیە کە ڕەشبگیری دەکەن و تالانی ئەو ولاغانەی ئەو ناوچەیان کردووە لێرەوە بردوویانەتە کۆیە لە کۆیەش بردوویانەتە کەرکوك لە وێشەوە بردوویانەتە حەوت تەغار لە وێش ماونەتەوە مانگێك تا (٤٠) شەو دواتر شەڕیان لەگەل عوسمانی یەکان کردووە وولاغەکانیان لێ ساندوونەتەوەو داگیر کارانی کوردستان کەوتنە دابەشکردنی کوردستانەوە لە ساڵی (١٥١٤) ز شەری نێوان عوسمانی یەکان و سەفەویەکان بە درێژایی مێژوو کاریان لەسەر لەناوبردنی کوردو داگیرکردنی کوردستان کردووە و بردنی داهات و سامانی بەزۆر ئەمە درێژەی هەبووە تا ساڵی ١٩٢٧ کە نەوت لە کەرکوکی کوردستان دۆزرایەوە ئیتر داگیر کەرانی کوردستان بە تەعریب تەتریك دەستیان پێ کرد گوندی گەڵناغاجیش لە (سەفەر بەرلەك)ی عوسمانی ساڵی (١٩١٦) دا گەنجی ئەو گوندەیان بردووە بۆ شەر بە ناوی غەزا ئەوانیان هەڵخەڵەتاندووەو دواتر لە شەڕی ساڵی ١٩٤٨ سێ کەسی ئەو گوندەیان بردووە بۆ فەڵەستین بۆ شەر، دواتر لە ساڵی ١٩٦٣ بە دواوە بە دەست جەندرمە تاوانبارەکانی حەرەس قەومی یەوە گوندەکە لە سووتان و تالان و کوشتن بێ بەش نەکراوە ئەمە درێژەی هەبووە تا ساڵی ١٩٨٨ کەوتە بەر شالاوی ئەنفال کە چەندین کەس لەم گوندە بەر شالاوی ئەنفال کەوتن .

گوندی گەڵناغاج گوندێکی مێژوویی دێرینەو شارستانییەتی تێدابووە، هەندێ پیاو چاکی هاتیە (بەبە خان و دەرماناو وشێخ محمد ) لە سەرەتای ئاوەدان کردنەوەیەوە لە حوجرەو لە ژێر فەرمانی مەلاکاندا ژیانیان تێپەڕاندووە لە ساڵی ١٩٦٧ بۆ یەکەمین جار قوتابخانەی لێ کراوەتەوە، ئەم گوندە کەرتی کشتوکاڵی ژمارە (٦)ە، ئەم گوندە بە کۆی گشتی (٣٦٠) دۆنم زەوی هەیە، ئەم گوندە لە پێش ئەنفالکردن بە هەردوو بەرییەوە نزیکەی (١٠٠) ماڵی لێ بووە، هەروەها کۆی گشتی ئەنفالکراوانی ئەم گوندە (١١٠) کەس بووە لە خزمانی شێخ بزێنی. لەگەڵ (٢٠) کەسیش شەهید بووە[١] .

[١] - بەرنامەی ژیانەوەی کوردستان،دڵشاد ئەحمەد، سەتەلایتی گەلی کوردستان، گوندی گەڵناغاج، ٢٠١٣/٨/٩ .

**گوندی پۆرقەمیش (بۆڵ قەمیش) :**

ئەم گوندە دەەوێتە سنووری ناحیەی ئاغجەلەر سەربە قەزای چەمچەماڵ سەربە پارێزگای کەرکوك، بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕومالآت و کاسبکاریە لە ناوچەکەدا .

**گوندی شێراوە:**

ئەم گوندە دەکەوێتە سنووری ناحیەی قوشتەپە سەر بە قەزای دەشتی هەولێر لە پارێزگای هەولێر، خەڵکی گوندەکە وا باس لە ئاوی ئەو گوندە دەکەن کەوا ئەم گوندە کاتی خۆی ئاوی لێ بوو کەوا باس دەکرێت هەرکەسێ هاتبێت ئاوی ئەم گوندەی خواردبێتەوە ئەوا وەك شێر ئازا دەبێت، هەروەها گومان دەکرێت کەوا کاتی خۆی کەسێکی ئازاو دلێری لێ بووە کە شێر ئاسا شەڕی کردووە بۆیە وا ناونراوە، ئەمە جگە لەوەی کەوا ناوی (شێراوە )پێك هاتووە لە (شێر +ئاو) دواتر لەسەر زمان بووەتە (شێراوە) بۆیە دەکرێت کەوا ئاوێك لەم گوندە هەبێت ئەوەی ئەو ئاوەی خواردبێتەوە وەك شێر ئازابێت و دلێر بێت بۆیە ئەم ناوەی لێ نراوە، هەروەها زیاتر لە (٢٥-٣٠)ماڵ لەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و بە خێوکردنی مەڕومالآت وکاسبکارین لەم ناوچەیە، کەسایەتی ناوداری ئەم گوندە بەرێزان (عوسمان عەلی) و (عمر عەلی) بوونە.

**گوندی کانی بی:**

ئەم گوندە دەکەوێتە سنووری ئاغجەلەر سەر بە قەزای چەمچەماڵ لە پارێزگای کەرکوك، بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە، بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و بە خێوکردنی مەڕومالآت و کاسبکاریە لە ناوچەکەدا.



محمد ابراهيم توفيق اغا / ناسراوە بە حمە سور
گوندی کانی هەنجیر

**گوندی کانی هەنجیر:**

ئەم گوندە دەکەوێتە سنووری ناحیەی ئاغجەلەر سەربە قەزای چەمچەماڵ لە پارێزگای کەرکوك، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنی یە، بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕوماڵات و کاسبکاریە لە ناوچەکەدا، هەووەها برا گەورەو ناوداری ئەم گوندە برایم ئاغای کانی هەنجیر بووە کە کوری تۆفیق ئاغای قەسرۆك بووە، کە زیاتر لە (٩٥) نۆوەد و پێنج کەس لە خزمانی شێخ بزێنی بەس لەو گوندە بەر شالآوی ئەنفال کەوتن.

**گوندی جەڵە مۆرد:**

بناری چیای خاڵخالآن– ناوچەی شێخ بزێنی– ناخیەی ئاغجەلەر– کەرکوك

باکوری خۆر هەلآتی شاری کەرکوك ناوچەی ئاغجەلەر ، کە لە شێخ بزێنی سەروو و قەلآسێوکەو بەشێك لەشوان لە خۆدەگرێت و سەرزەمینەکەی چیاو بەندەلآن و رووباری بەرزایی یە، چیای خاڵخالآن کە بە قەولی ناوایییەکانی بنار خاڵ خاس بووە لە سەردەمی زەردەشتیەکان لەگەڵ پیرەمەگرونی برای دا ئاینی زەردەشتیان بلآوکردوتەوە و مەزارەکەشی لەسەر دوندی چیایەکەیە کە بەسەر کەرکوك و دەشتی کۆیە و قەلآسێوکەو ناو شوان و شێخ بزێنی و زێ دا

دەڕوانێ، هاپە ڕۆستەم ناوێ لەناو شوانی کێشکەوە ئاودیوی چیا دەبێ و کە تەڕایی لەتەك درەختی مۆردا دەبینێ بنە دادەنێ و لەساڵی (١٨٠٠ز) جەلەمۆرد ئاوەدان دەکاتەوە پێش تریش لە پێش زایین مەملەکەتی کوردان بووە ، قەڵاتە سپیەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئارانجا، چاڵە مۆردیان چلەمۆرد یان جولەی مۆرد دەبێتە جلەمۆرد بەڵام خەڵکی ئاوایی دەیبەنەوە بۆ سەردەمی عوسمانیەکان دەکەوێتە خۆرهەڵاتی خاڵخالان لە نێوان دوو بەرزایی ئەو چیایە کەندەشین و بابڕوشام دەکەوێتە نێوان دوو چەم لە سلێمانیەوە (١٠٢کم) دوورەو لە کەرکوکەوە (٩٥کم) دوورە.

ناوی جەلەمۆرد لەوەوە هاتووە کەوا ئەم گوندە (مۆرد)ی گەلێك زۆرە (مۆرد)یش بە جۆرە دارێك دەگوترێت کەلەم گوندە زۆر بەدی دەکرێ ، دووشوێنەواری تێدایە لەشێوەی قەڵات دایە بەناوی قەڵاسپیلکەو قەڵاتەکە کە گۆزەو خشتی کۆنی لێ دیتراوەتەوە .(جەلە)ش وشەیەکی تورکی یە بە واتای (ڕیزە) بۆیە بۆتە (ڕیزە مۆرد) کە بەڕزە مۆردی لێ هەیە ئەم گوندە بۆیە ناوەکەی وا لێنراوە.

ئاوایی جەلەمۆرد کەرتی کشتوکاڵی (١٢)یە ، چەند کارێزێکی تێدایە بەوناوانە: حەمایش و مامە یاسەو کانەبی و پورە زاراو دووتووەو ژاڵەو کارێزی سەروچاوەو کارێزی سەروکانی و کارێزی بەرامێرکە .

ئەم گوندە بەر لە ئەنفالەکە (١٣٠)ماڵ بووە بەڵام ئێستا نزیکەی (٣٠)ماڵی تێدایە ، قوتابخانەو بنکەی تەندروستی و پرۆژەی ئاوی خواردنەوەو کاەربای نیشتمانیان هەیە، ئەم گوندە چەندین جار وێران وکاول کراوە لە ساڵەکانی (١٩٦٣) و (١٩٦٥)و(١٩٦٩)و (١٩٨٨)دا کە (٤٠١)کەسی ئەنفال کراوەو (١٦)شەهیدی داوە ئەم گوندە[١].

[١]- بەرنامەی ژیانەوەی کوردستان ،دڵشاد ئەحمەد، سەتەلایتی گەلی کوردستان ، گوندی جەلەمۆرد، بەرواری ٢٠١٣/٦/١٤.





فاروق اغا شێخ بزێنی- عبدالكريم اوزقان- نووسەر/جزيره

**هۆزی شێخ بزێنی لە توركیا:**

جیلی نویّ دەلێن: (شێخ بزێنییەكان) سەرەتا لە باكوری عێراق ژیاون لە شاری سلێمانی جا هەندێك دەلێن: لە ناوەوەی شار هەندێكیش دەلێن: لە دەوروبەری شاری سلێمانی ژیاون، هەندێك دەلێن: لە نێوان شاری موسلّ و شاری سلێمانی ژیاون لە دووری ٣٠كم لە باكوری شاری سلێمانی لە گوندێكی نزیك ڕووباری دیجلە لەسەر ڕێگای ئالتوون كۆپری و سلێمانی و پردیّ نزیكەی ٣٠٠٠ نفوسی هەیە لە ناوەڕاست و باكوری شاری سلێمانی تاكو نزیك سنووری ئێران، ناحیەی سێوكە هەمووی (١٥٩) گوندە لە (٧) عەشیرەت پێك دێن (١٠٠٠) نفوسن و موسولمانن و زۆربەیان كوردن، زۆربەی ناوچەكەیان چیایی و بەردین و بە كەلك نایەت زەوییەكەیان.

بە هۆكارێكی نەزانراو شێخ بزێنییەكان چوون بۆ یەمەن، وە ماوەیەك لەویّ ماونەتەوە.

**كۆچ كردن بەرەو هەیمانە:**

لە ڕۆژهەلات و باكوری ڕۆژهەلاتی ئەنادۆل هۆزی شێخ بزێنی لە كاتی سولتان (یاوز سولتان سەلیم) دەسەلاتی عوسمانیان ناسی تا لە سالّی (١٨٠٠)ەكان، داب و نەریتەكانی بیّ لایەنی ژیان لە سالّی (١٧٨٩) شۆڕشی فەرەنسا دەستی پیّ كرد ئەم شۆڕشە لە جیهانی كۆمەلایەتی و سیاسی كاریگەرییەكی باشی هەبوو. ئەو سەردەمە دەولەتی نەتەوەیی نەبوو، تا سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەولەتێكی نەتەوەیی نەبوو، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی حوكمی سیّ كیشوەری دەكرد، لەو سیّ كیشوەرەدا میللەتی جۆراو جۆری كەمینە (اقليه) هەبوو، هەریەك لەوانە لە ناوەخۆی دا سەربەست بوو، شۆڕشی فەرەنسی كاریگەری لەسەر ئیمپراتۆریەتی

عوسمانی هەبوو، بەهۆی ئەو بارە کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دروستی کردبوو ئەوا نەتەوەی کەمینە لەنێو میللەتاندا نارەحەتی دروست کرد، بۆیە ڕاپەڕین و سەرهەڵدان دەستی پێ کرد، سوڵتان سەلیمی سێ یەم لە دوای چکسازییەکانساڵی (١٨٠٣) لە ناوچەی ڕۆژهەلات و باکوری ڕۆژهەلاّت لەنێو هۆزەکاندا ڕاپەڕین بە ژمارەیەکی زۆر دەستی پێ کرد، لە ساڵەکانی (١٨٠٣)، (١٨٠٦)، (١٨١٢)، (١٨٢٨) هەلگەڕانەوە دژی دەسەلاّت دەستی پێ کرد، هەندێك هۆز کە لە بنەماڵەی یاوز سولتان سەلیم بوون بەشداری ئەو هەڵگەڕانەوە لە دژی دەسەلاّتیان نەکردو پابەندبوونیان بۆ دەولەتی عوسمانی دوویات کردەوە، بۆیە بەهۆی حکومەتی عوسمانی کۆچکردنی هۆزی شێخ بزێنی بۆ ناوچەی هەیمانە، جیهان بەیلی، یوناك، کولو، پۆلاتلی، بالاّ، شەرەفلی( کۆچ حەسار) دەستی پێ کرد کە هەموو ئەو ناوچانە ئەو سەردەم تابعی ناوچەی هەیمانە بوون، ئەو سەردەم ناوچەی هەیمانە زۆرینەی ئەرمەنی و رۆمانی و گوندی لێ بوو، ئەرمەنی و رۆمەکان لە ناوچەی ڕۆژهەلات و باکوری ڕۆژهەلاتی ئەنادۆل لەگەڵ هاتنی هۆزی شێخ بزێنی و هۆزەکانی ترو ئەو بیرۆکە نەتەوەییەی کە شۆرشی فەرەنسی هێنایە کایەوە لە ئەنجامدا بە تێپەڕبوونی کات گوندەکانی خۆیان بەجێ هێشت لە هەیمانە بەرەو شارە گەورەکان و قەزاو ناحیەکان کۆچیان کرد.

هۆزی شێخ بزێنی و هۆزە کوردییەکانی تر دوای بەجێ هێشتنی گوندەکانیان، وە مانەوەیان لە چادردا لە هایمانا کۆچیان کرد بەرەو ناوەندی شارەکانی رۆم و ئەرمەنی.

دەوترێت کەوا لەژێر ناوی (گۆز گۆز) قەزایەکی گەورە هەبوو کە ئەرمەنی بوو لە شوێنی ئێستای یەنیجەی ئەمڕۆ بوو. یەکەم ناوی شاری یەنیجە سەرچاوەکەی لە (گۆز گۆز)ەوە، هاتووە. تا ئێستا گوندەکانی دەوروبەری یەنیجە بە یەنیجە دەڵێن (گۆز گۆز). هەروەها (علی دەلە) کە دانیشتووی شاری یەنیجەیە دەڵێت: یەکێك لە خزمەکانی کە ناوی (ناسر)ە، کۆچ دەکات لە پالۆ بۆ هەیمانە لەبەر ئەم هۆیە برای (ناسر) کە ناوی (پەکۆ)یە دەڵێت: بەگوێرەی قسەکانی (علی دەلە) هۆزی شێخ بزێنی کۆچیان کردبوو بۆ هەیمانە.

هۆزی شێخ بزێنی ئەو کاتەی کە لە ڕۆژهەلات و باکوری ڕۆژهەلات کۆچیان کرد لە هایمانەدا کۆ بوونەوە. بەلاّم نەختێك لە خەلکی هۆزی شێخ بزێنی لەوێ دەمێننەوە ئەوانی تر کۆچ دەکەن بۆ ناوچە جیاوازەکانی ئەنادۆل، لە ناوچە جۆراو جۆرەکەی وولاّت هۆزی شێخ بزێنی لە هەیمانە بۆ ئەم ناوچەیە هاتوون، ئەمڕۆ شێخ بزێنی لە هەیمانا، ئەنقەرە، بەنی دۆغان، کرك کالە، کالەجیك، ئەلماداغ، بۆیابات، ئیسکلیپ، کوجا عەلی، ئاکیازی، چانکری، مەرزیفۆن،

کارابوك، ئەرزەرۆم، ئۆلتو، نارمان، قونیا (کولو)، پۆلاتلی، بافرا، دوزجە، گەرەدە، شیران، شام (سوریا)، رەقە (سوریا)، باشوری عێراق و ئێران دەژین.
لە سالنامە کۆنەکانی شاری ئەنقەرە (١٣٠٠هـ/١٨٨٢) وە (قاموس العام)دا (١٨٨٨) بۆ دەستەواژەی قەزای هایانا ناحیەی شێخ بزێنی بەکاردێت.
عەشیرەتی شێخ بزێنی لە سنووری هایانەدا بەتایبەتی لە شارۆچکەی یەنیجە ناوەندی هایانا دابەش بووینە سەر (٢٩) گوند بەو ناوانە:

| ژمارە | ناوەکە بە تورکی | ناوەکە بە کوردی |
|---|---|---|
| ١- | شارۆچکەی یەنیجە | گۆز گۆز |
| ٢- | شارۆچکەی بالك چ هیسار | بازار حیسار |
| ٣- | یورت بەیلی هیسار | عەڤدالَلی |
| ٤- | ئالتن پنار | تورن |
| ٥- | بۆستان هۆیوك | بۆستانیۆك |
| ٦- | پنار باشە | بارتەلین |
| ٧- | سەزە غاسی | سازە |
| ٨- | سەبیلی بالاَ | شەولۆ |
| ٩- | یەرگۆمۆ | یەرگوم |
| ١٠- | یەشیل کۆی | تیقولاغ |
| ١١- | سینانلی | کوسەف دەللی |
| ١٢- | تاباکلی | خێوەند |
| ١٣- | گەدیك | خێوەند |
| ١٤- | گەدیکلی | خێوەند |
| ١٥- | ئێقجی | خێوەند |

| | | |
|---|---|---|
| -١٦ | سۆغوت تەپە | خورِ خورِ |
| -١٧ | ئینجیرلی | نینجیر |
| -١٨ | باهچەجیك | ئالآجیك |
| -١٩ | ئاكتەپە | قالتّاغ لی |
| -٢٠ | ئاتاكۆی | ئاتاكۆی |
| -٢١ | كاراپنار | قەرەپنار |
| -٢٢ | كارا ئۆمەرلی | ماندرا |
| -٢٣ | دەرەكۆی | دەرەكۆیی |
| -٢٤ | كاڤاك | قاواغ |
| -٢٥ | ساری گول | ساری گول |
| -٢٦ | ئەسكی كشلا | دۆغان |
| -٢٧ | دوروتلار | دورِوت لەر |
| -٢٨ | ئەڤلیافاكە | ئەولیا فەقێ |
| -٢٩ | یاپراك بایری | خێوەند |

گوندەكانی چایراز و یاماك لەگەڵ گوندەكانی شەهبازو عەشیرەتەكانی تر تێكەڵن لەناو لیستەكەی سەرەوە هەن. گوندەكانی شەهباز بەسترابوونەوە بە هایمانا دواتر جیاواز بوونەوە. گوندەكانی شێخ بزێنی لە هەیمانا بە ناوی (جانمانا)، (دیپ دەدە)، (كاراجادەرە)، (سوغوك كویو) سەر بە قونیایە بەلآم گوندی قایاباشی سەر بە پۆلاتلیایە لە نزیك گوندی باهچەجیك.

شەهبازی قانلی گول لە سالآنی ١٩٦٢-١٩٦٣ لە رووی برا كوژی تێك چوو بوو.

ئەو كەسایەتیانەی خوارەوە لە توركیا لە هۆزی شێخ بزێنی بوونە: سەرۆك وەزیرانی كۆن بولەنت ئولوصوی (Bulent ULUSU)، وەزیری پەروەردەی كۆن عونی ئاكیۆل ( Avni AKYOL)، سەرۆك بەلەدییەی كۆنی شاری بویوك شەهیر(Buyuk Sehir) لە

ئەستەنبۆل بدرالدین دالان (Bedrettin DALAN)، پرۆفیسۆر دکتۆر اورهان چەکەر (Prof.Dr. Orhan CEKER)، ئەندامی فێرکردنی کۆلیژی ئاینی لە زانکۆی سەلجوق، رۆژنامەنووس صلاح الدین دومان (Selahattin DUMAN)، بازرگان اوزدەمیر تورگوت (Ozdemir TURGUT)، دکتۆری خانەنشین دەرویش تانسو ( Dr. Dervis TANSU)، سەرۆکی کۆنی بەلەدییەی ئەنقەرە التنداغ موزەفەر ئاتالگان (Muzaffer ATILGAN)، ئەندامی پەرلەمانی بۆرصەی عبدالله الپ (Abdullah ALP)[1].

**جزیرەی بوّتان:** زیاتر لە (١٠٠٠) هەزار ماڵ لە هوّزی شێخ بزێنی نیشتەجێی جزیرەی بوّتانە نێوان زاخۆو جزیرەی بوّتان (٥)کم٢، کەسایەتی دیارو ناسراو لە جزیرەی بوّتان ناوی (عبدالکریم ئۆزقان)ە، ناوی گوندەکانی جزیرەی بوّتان کەهوّزی شێخ بزێنی تێیدا نیشتەجێن:

١. برکێ .... عبدالکریم ئۆزقان لەم گوندە نیشتەجێ یە، زیاتر لە (٥٠)ماڵ دەبن
٢. فێرسیێ.... زیاتر لە (٢٠)ماڵ دەبن
٣. کاروّخ... زیاتر لە (١٠)ماڵ دەبن
٤. ئاڤگا چووکا
٥. خراپ بالیس
٦. بێن داروٚکا
٧. سەراڤ
٨. ملا زویرا

ئەم گوندانە هەمووی حکومەتی تورك لە ساڵی ١٩٩١ تا١٩٩٢ تەختی کردو وێرانی کرد بەهوّی شەری نێوان حکومەتی تورك و پەکەکە .

دانیشتوانی هەموو ئەم گوندانە خەریکی کشتوکاڵکردن و مەڕوماڵات بەخێوکردنن، دانیشتوانەکەی زۆربەیان زەنگینن، خەریکی بازرگانی (نەفت)ن، بۆیە لە ڕووی ئابووریەوە

---

[1] yazarlar: Enver YURTDAS- Hamdi CEKER- Faik COSKUN, BUGUNE YENICE VE SEYHBIZINLAR, DUNDEN GOZGOZ SEYHBIZINLI NAHIYESI SINDIRAN, Haymana, ٢٠٠٣, p:٥,٧,٨,٩.

زۆربەیان دەوڵەمەندن، لەڕووی مەزهەبەوە دانیشتوانەکەی هەموویان لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافعینە.

(زاخۆ) --٥کم٢--(سلۆپی)-- ٥کم٢-- (جزیرەی بۆتان) .

جزیرەی بۆتان ئێستا سەر بە پارێزگای (شەرناخە) ، بەلاّم لە پێشوودا سەر بە پارێزگای (ماردین) بوو، ئەم جزیرەیە قەزایەکە سەر بە پارێزگای شەرناخ کە نزیکەی (١٥٠٠٠٠) کەس دانیشتوانەکەیەتی، هەروەها مەرقەدی حەزرەتی (نوح) (سەلامی خوای لەسەر بێت) هەر لەو جزیرەیە نێژراوە.

لەبەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی tv(Roj) ڕۆژ کە دەڵێت زیاتر لە (٢٤٠٠٠) کەس لە هۆزی شێخ بزێنی لەدەوروبەری جزیرە هەیە لە (دیار بەکر+ ئورفا+ أدیامان) هەر لە کۆنەوە ئەم جزیرە شوێنی بازرگانی کردن بووە ، بازارێکی زۆرکۆنی لێیە .

**تورکیا :-**

**گوندەکانی:**

- باوەڕت
- موشارمری
- خانك و خانك
- کاڤلێ سۆران
- شێحادل

لە نێوان جزیرەی بۆتان لەسەر سنووری تورکیاو سوریادا نیشتەجێ بوونە کە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە . هەروەها لە قۆنیاو دیاربەکر هۆزی شێخ بزێنی هەیە، هەروەها لەم ناوچانەش هۆزی شێخ بزێنی هەیە :

قۆچ حەسار — تۆرتاوین — ئەرزەرۆم — هەیمانە — ئەنقەرە — کوتاهیە — جوروم — ماردین — الرقە — کوجا عەلی — قارمان — کنغری — بوزوك — قسطمونی، قەزای هیمانە زیاتر لە (٤٠) گوند شێخ بزێنین .



- **گوندی (زێڤیا) :**

**لە پشت سنووری تورکیا نزیکەی (٤٠٠) ماڵ دەبێت شێخ بزێنینە لە سنوری تورکیا.**

- **ئەم گوندانەش شیخ بزێنین :(سامسون – هاوزا – سینۆپ – ڕاستە مۆلو – بۆیابون)**

- **شێخ بزێنی قۆنیا و گوندەکان :**

**١- قەرە کلیس ٢- جان و مانۆ ٣- دیب دەرە ٤- پۆلات لی ٥- قەیە باشی**

- **هەندێ گوندی تری شێخ بزێنی**

| ناوی گوندەکە بە کوردی | ناوی گوندەکە بە تورکی |
|---|---|
| گوز گوز | یەنیجە |
| بارتەلی | ئالتی پەنار |
| باژارێ حیسار | بالکی حیسار |
| بۆستانیوك | بۆستا نیوك |
| تورن | یەنیجیك |
| سازا | سازا ئاغاسی |
| شەولو | سێبیلی بالاٚ |
| یەرگوم | یەرگوم |
| سغرجك | سغرجك |
| تی قولاغ | یەشیر یورت |

لە قەزای هەیمانە لە شاری ئەنقەرە نزیکەی (٧٠) گوند هۆزی شێخ بزێنی لیّ یە بەم ناوانە :

١- یەنیجا ،گوزگوز ،سندران
٢- باجك أسر
٣- بارتلین
٤- بۆستان هویك
٥- تورن
٦- سۆزا
٧- شولو
٨- تیقلاخ
٩- قەرە کلێسە
١٠- جانم مان
١١- دیپ تەرە
١٢- سینان لی
١٣- کوستاف دیی – یورپێلیّ
١٤- قالتاخ لی
١٥- باغ چەچك
١٦- خورخورِ
١٧- قەیاباشی
١٨- گەدك
١٩- گەدکلی
٢٠- ییراغ بایر
٢١- دۆغان
٢٢- تەباغ لی
٢٣- أوجی
٢٤- أولیا فەقش
٢٥- قەرە پنار
٢٦- ساری گول

٢٧- دەرکوی

٢٨- مەندرا

٢٩- سخرجخ

**هۆزی شێخ بزێنی بە شێوەیەکی گشتی لەم شارو ناوچانەی وولاتی تورکیادا هەیە :**

ئەنقەرە( هایانا) – دیاربەکر – جوروم – کوتاهیە – تورتاویل – قارەمان – قووجەعەلی – ئەرزەڕۆم – رقە – ماردین – قووچ حەسار ، قەستەمونی – بوزوك – کنغری[1] .

* هۆزی شێخ بزێنی لە ڕۆژهەلاتی ئەرزەڕۆم و باکوری ئاکریێ هەنە ، هەروەها ئەم هۆزە هۆزەکی زۆر گەورەیە لە هەولێر بۆ کەرکوك ، لە کوردستانی ئێران هۆزی شێخ بزێنی هەنە بە تایبەتی تیرەی چۆغەڕەش لە هۆزی شێخ بزێنی[2].

* خدر ئەلیاس لای شێخ بزێنییەکانی تورکیا زۆر پیرۆزو گرنگە وەکو نەورۆ کە بەهاران کاتەکەی دێ، کە خەلکی ئەو ناوچانەی شێخ بزێنی دەچن بۆ سەر گۆڕی خۆشەویستەکانیان لە باوك و دایك و خوشك و براو .....هتد، دوعاو نزای خێر لە خوای گەورە بۆیان دەخوازن و واتە خدرو ئەلیاس وەکو نەورۆز جێی بایەخە بۆیان .

* هۆی پەرتەوازە بوونی شێخ بزێنی ئەوەبوو کەوا قبولیان نەکردووە ئەم هۆزە بە ژێردەستەیی و زەلیلی لە ناوچەی عوسمانی بێننەوە بۆیە پەرتەوازە بوونە ، سولتان سلیم گووتوویتی دەبێ ئێوە شێخ بزێنی چەك بۆمە هەلگرن بچنە شەڕ بۆ ئێمە ئەوانیش قبوولیان نەکردووە .

* لە شەڕی چالدێران (١٥١٤) شا ئیسماعیلی سەفەوی ئەو عەشیرەتە کۆچبەر کردووە ، زۆر لە عەشیرەتەکانی سەر بە مەزهەبی سوننی لەوانە هۆزی شێخ بزێنی لەسەر زەخت و کاریگەری شا ئیسماعیل سەفەوی کۆچیان پێکردوون لەو شەڕەدا کۆچبەرەیەکی مەزن روویدا لە ژێر زەختی شا ئیسماعیلی سەفەوی بۆ سەر سوننییەکان کە لە نێوانیاندا هۆزی شێخ بزێنی بوون کە کۆچیان پێ کردوون لە ڕۆژهەلات و باشووری ڕۆژهەلاتی کوردستان بۆ ناوچەی

---

[1] - ئیبراهیم داقووقی، کوردی تورکیا، وەرگێران : هیممەت عزیز کاکەیی، پێداچوونەوە: جلیل کاکە وەیس، چ١، دەزگای موکریانی، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٢ ، ل٨٥ .

[2] - د. احمد عثمان ابو بکر، صدیق الدملوجی، د. ابراهیم الداقوقی، مهرداد ازادی، عشائر کردستان، الطبعة الاولی، رابطة کاوا للثقافة الکردیة، کردستان، اربیل، ٢٠٠١، ل٥٤ ،٢١٧، ٢٢٧، ٢٣٢.

سلێمانی بەناوی (بازیان) ی ئێستا – ئامەد – سیواس – مووش – ئەلعزیز – پالۆ (گوندی شێخ سعیدی پیرانە لە تورکیا ) کۆچ پێ کردینە ، سولتان سلیم کەیف خۆش بووە ، بەو کۆچ کردنەش لە هەیانە نیشتەجێ بوونە، لەو ناوچانە: بالا – گولباشی – گولو– جیهان بەیلی
* پۆلات لێ – قۆچ حەسار – یوناغی – نیشتەجێ بوونە . کە لە دەوروبەری هەیانە سەر بە شاری ئەنقەرە کەنزیکەی (٤٠) گوند دەبن .
* نوێنەرێکی ئینگلیز دەڵێت: زیاتر لە (٣٥٠) ساڵ لەمەو بەر (٦٠٠٠٠) ڕەشماڵ – لە دەوروبەری شاری ماردین نیشتەجێ بوونە هۆزی شێخ بزێنی لە کوردستانی تورکیا بلاوبوونە لەوانە لە (قصر شیرین) لە نێوان خانەقین و کرکوك کوردستانی عێراق و شاری (کرمانشاه )ی ئێران هاتوون بۆ تورکیا کە نزیکەی (٤٠٠) ساڵ لەمەو بەر هاتوون لە ئێرانەوە لە ناوچەی (قصر شیرین) بۆ کوردستانی تورکیا لەو شوێنانە نیشتە جێ بوونە : ئەرزەرۆم- دیار بەکر – ماردین – قەرەس – (کەرەس) نیشتەجێ بوونە هەروەها هەیانە زمانی خۆی تایبەت بە شێخ بزێنی لە بیر نەکردووە بەلام شارەکانی تری تورکیا کە نیشتەجێ ی شێخ بزێنیینە زمانی دایکی خۆیان کە تایبەت بە هۆزی شێخ بزێنی لە بیریان کردووە .
* لە ئەرشیفی عوسمانی لە ساڵی (١٥١٤) بە دواوە لە باسی کوردان کە لە هەیانە نیشتەجێ بوونە لە بەڵگەیەك لە ساڵی (١٦٠٦) لە باسی عەشیرەتی شێخ بزێنی و میکائیلی و عوتمانکی والی عوسمانی بەناوی (حاجی علی ) کە والی ئەنقەرە بووە ، سەرۆکی عەشیرەتی شێخ بزێنی و میکائیلی و عوتمانکێ هۆشیار دەکات کە هاریکاری حوکمەتی عوسمانی بکەن. لەبەرئەوە شێخ بزێنی لە هەیانە نیشتەجێ بوونە، لەبەر ئەو بەڵگەیە کەلە ئەرشیفی عوسمانی لە ساڵی (١٨٤٩) هاتیە نوسین ، لەلایەن والی ئەنقەرە ناحیەك بەناوی شێخ بزێنی هاتیە سازکردن، لەبەر ئەوە دوو قەراریان دەرکردووە لەو سەردەم لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی کەوا هۆزی شێخ بزێنی مەعفو بکرێت لە هەموو زەریبەو باجێك
* هەندێك بنەماڵە لە هۆزی شێخ بزێنی کۆچیان کردووە بۆ ئەرزەرۆم – ئامەد –ساسون – بافرا – چوارشەم – ئەبدیش – ئەماسیاب ئەماسیا - سینۆب – سەکاریا – دوزجە – قەرە بووك – ئادیامان – بای بورد – ڕەحابوود .
شێخ بەیزانی – شێخ بازانی – شێخ و زانی -
لە هەیانە نزیکەی (٧٠) گوند شێخ بزێنی هەیە .

* لێکۆلەری مارك سایکس (١٩١٩) گوتوویەتی لە بەلگەنامەی عوسمانی هەیە دەلێ : شێخ بزێنی مرۆڤی شەرکەرو سوارچاکن سواری ژیرن و زۆر زیرەکن و تفەنگی مارتینیان دروست کردووە

* هۆزی شێخ بزێنی لە هەردوو شۆرش شێخ محمودو مەلامستەفا فەرماندەو پێشمەرگە بوون واتە ئەم هۆزە بەشداری هەردوو شۆرشەکەیان کردووە بۆ رزگاری خاکی کوردستان .

* شێخ بزێنی لەسالّی ١٨٠٠ لە مووی بزنی ڕەشمالّی ڕەشیان دروست دەکرد لە هەیمانە، مەڕومالاّتیان دەبردە زۆزان هەتا پایز دواتر دەهاتنەوە مالّ .

* سولّتان سلیم یەکەم ٤٠٠ مالّ لە هۆزی شێخ بزێنی لە شاری وان گواستەوە بۆ شاری کرکوك.

## -سەنجەق:

لەسەردەمی عوسمانیدا بەشە بەڕێوەبەرایەتییەکی لەنێوان قەزاو ویلایەتدا بووە کە لەلایەن کەسێکەوە بەناوی (موتەسەرریف) ەوە بەڕێوەبراوە . سەنجەقێکی ئەوسەردەمە، ئەوەندەی ویلایەتێکی ئێستا گەورەبووە ، تەنانەت سەنجەق هەبووە لەهەندێك ویلایەتی ئەمڕۆ گەورەتربووە ، بۆنموونە ماردین کە ئەمڕۆ ویلایەتە ، ئەوساکە سەنجەقێکی سەر بە دیاربەکر بووە ، سەنجەق لیواو موتەسەریفێتیشی پێ گوتراوە .

-سەنجەق وشەیەکی تورکیە ، واتە : (ئالاّ) کەبە عەرەبی (لیواو عەلەم و ڕایە ) و هی دیکەی پێ دەلێن و دوای سەردەمی عوسمانی لە عێراقدا ، تا شەستەکانی سەدەی ڕابردووش (لیوا) یان بۆ موتەسەریفێتی بەکارهێناوە ، کە دوای پایتەخت گەورەترین یەکەی بەڕێوەبەرایەتی بووە لە عێراقدا ، کە ئەمڕۆ پارێزگای پێ دەلێن و لە ناحیەو قەزا گەورەتر بووە .

## -ئادیەمان:

(ناوی دیکەی حصنی مەنصور — ە ) شارێکە لە ویلایەتی دیاربەکردا، ١٢٠ کیلۆمەتر لە باشووری خۆرئاوای شاری دیاربەکرەوەیە ، لە ٣٧,٤٥° ی پانی باکورو ٣٦,١٢° ی درێژی خۆرهەلاّتدا جێی گرتووە ، دانیشتوانی ١١٠٠ کەسن ، زەوییەکانی دەوروبەری تەخت و بەراوە ، هەندێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە .

-ئەرجیش :

شارۆچکەیەکەو ناوەندی قەزایە ، لە ڕۆخی باکووری گۆلی وان — ی ویلایەتی واندا لە شوێنێکی زۆنگاویدایە ، ئەو شارۆچکەیە زۆر کۆنەو لە مێژووە کۆنە یۆنانییەکاندا بەناوی (ئەرسیس)ەوە ناسراوە ، بەلاّم شوێنە کۆنەکەی وەکو ئەوەی ئێستا لەڕۆخی گۆلّدا نەبووە ،وادەزانرێ کەلەسەر گردێکی دووسەعاتە ڕێ لە سەرووتردا بووە ، لەلایەن (مسیۆسۆلج!) ەوە لە ١٨٢٩ دا، لەو هەلّکۆلینەوانەدا کەلە شوێنی ناوبراودا ئەنجامی داون ، ئەو شوێنەوارە کۆنانەی دەرکەوتوون ، بوونی شارێکی گەورەی لەوشوێنەدا سەلماندووە ، ئەو بۆچوونە بەهێزتر دەکات ، شارە کۆنەکە لە ١٢٠٩دا ، لە پێکدادانێکی نێوانی ئەرمەنیان و گورجییاندا سووتاوە ، لەسەردەمی کۆندا گۆلەکەش بەناوی (ئەرسیس)ی شارەکەوە ناونراوە ، هەروەها بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنینە .

-پالۆ:

شارۆچکەیەکە، ناوەندی قەزایە لەلیوای ئەرغەنیمەعدەنی —ی ویلایەتی دیاربەکر ٥٠٠ کیلۆمەتر لە باکووری خۆرهەلاّتی ئەرغەنیمەعدەنی و ٩٥ کیلۆ مەتری باکووری خۆرئاوای دیاربەکر ، لە رۆخی لایڕاستی زێی مورادا ،٨٠٠ مەتری بەرزاییی لەڕووی دەریاوەیە و لە شوێنێکی جواندایە ، دانیشتوانی ٧,٥٠٠ کەسە ، پردێکی جوان و پتەو لەسەر زێدا ، لەلای سەرەوەیدا لەسەر کەڤرێکی یەکپارچەدا قەلاّیەکی پتەو و لەناویدا کلێسەیەکی کۆن و قوتابخانەو هەندێك شوێنەواری کۆنی ، کە نوسینی مێخی —ی لەسەرە تێدایە ، قوتابخانەیەکی ناوەندی و لەدەوروبەریدا باغ و باخچەو گەلێك شوێنی گەرانی لێیە . قەزای پالۆ، یەك لەوچوار لیوایەیە کە ئەرغەنیمەعدەنی پێکدێنن و لەو پەری باکووریدایە ، لەباکوورەوە بەقەزای کیغی — ی ویلایەتی ئەرزەڕۆم و لیوای دەرسیمی ویلایەتی مەعموورەتولعەزیز و لە خوارەوە بەلیوای خەرپووتی هەر ئەو ویلایەتە و لەباشوورەوە بەخودی قەزای ئەرغەنی ، لەباشووری خۆرهەلاّتەوە قەزای لیجەی لیوای دیاربەکر . لە باکووری خۆرهەلاّتەوەش بەلیوای گەنج —ی ویلایەتی بەتلیس-ەوە دەورەدراوەو سنووردارە ، خاکەکەی چیاییە ، ڕووەك ڕوێن و جوان و لێژو شیویشی هەن. زێی موراد کەلە خۆرهەلاّتەوە بەرەو خۆرئاوا دەروا قەزاکە دەکاتە دووبەش ، چیاکانی سیوان و تەیموور قاپی کە بە بەشی باشووردا درێژبوونەتەوە ، نشێوی فورات لە نشێوی دیجلە جودا دەکەنەوە بەرو بومیان لە دانەوێلەی

جۆراو جۆرو میوەجات پێکدێ ، دارستانیشی زۆرن ، لەناحیەی هووشەن —دا کانێکی مس دۆزراوەتەوە و دەردەهێنرێ .
قەزا لە ٣١٦ گوند پێکهاتووە ، ئەگەرچی وادادەنرێ کە ٨ ناحیەشی هەیە ، ئەم ناحیانە هیچیان بەرێوەبەریان نیە . دانیشتوانی قەزا بەنزیکی و بەمەزەندە ٣٥,٠٠٠ کەسێکە ، بەشی زۆری موسلمان و لەتورك و کورد پێکهاتووە خرستیانەکانیشیان ئەرمەنین ، بەشێك لە دانیشتوانەکەی لەهۆزی شێخ بزێنی یە ، هەروەها زادگای شێخ سعیدی پیرانەو هۆزی شێخ بزێنیش یەکێکە لەو هۆزانەی کە پشتگیری تەواوی شێخ سەعیدیان کردووە لە شۆرشەکەیدا .

**-ساسۆن:**

قەزایەکە لەلیوای مووش-ی ویلایەتی بتلیس . بریتیە لە بەشی باشووری ئەو لیوایە ، لە باکوورەوە بە قەزای مووش و لە خۆرهەلآت و باشوورەوە بەبتلیس و لە خۆرئاواوە بەلیوای گەنج سنوور دارو دەورەدراوە ، شارۆچکەی خوتۆ کەناوەندیەتی ، سەردەمانێك شارێك بووە نزیکەی ٦٠,٠٠٠ کەسی دانیشتوان بووە ، ئێستا شارۆچکەیەکی گچکەیە ، لە دووری ٢٤ سەعاتەرێ لە ناوەندی لیواوە و ١٥٠ سەعاتە رێ لەناوەندی ویلایەتەوە دوورە، خاکەکەی چیایی و بەردەلآنە ، چیای ساسۆنی بەشی خۆرئاوای ٢٦٠٠ مەترو چیای ئۆتاغ —ی لای باشووریشی ١,٤٣٠ مەتر بەرزن ، زۆربەی چیاکانی سەخت و بەردەلآن و دیمەن گەلێکی سەیریان هەیە ، تەنیا لەبەشی خۆرهەلآتیدا ئاوێك لەلای بتلیسەوە دێ و قەزا دەکاتە دووبەشەوە و دەچێتە قەزای مووشەوەو دەرژێنە زێی مورادەوە ، ئاوەکانی دیکەی لە جۆگەی گچکەو بەست پێکهاتووە ، خاکەکەی زۆر کەم پیتە.
قەزا لە ١١٩گوند پێکهاتووە ، ٢٠,١٠١ کەس دانیشتوانی هەیە ، ئەم برە ١٠,٣٧٩ ی موسلمان و ٨,٣٨٦ی ئەرمەنی و ٣٧٢ ی قیبتی و ٩٧٠ شی یەزیدین ، بەشی زۆری خەلکە موسلمانەکە کوردن ، بەسەر عەشیرەتی جیاجیادا دابەش کراون ، یەکێك لەو عەشیرەتانەی کە لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوونە عەشیرەتی شێخ بزێنی یە ، کە بەشێك لە بنەمالآکانی ئەم عەشیرەتە لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوونە .



احمد تورك - فاروق ئاغای شێخ بزێنی

**-ماردین :**

شارۆچکەیەکە ناوەندی لیوایە ، لەداوێنی باشووری قەرەداغ –دا هەلکەوتووە ، لە ٩٠ کیلۆمەتری باشووری خۆرهەلاتی دیاربەکرو لەلای باکووری جەزیرەدا بە ویلایەتی دیار بەکرەوە پەیوەستە دانیشتوانی ٢٥,٠٠٠ کەسن ، لە سەرویدا قەلایەکی پتەو و شوورە و پتر لە ٢٠ مزگەوتی پیرۆزو ٤٥ نوێژگەو ٣ مەدرەسە ، ٩کلێسەو ٣ مەناسترو ٨گەرماو و ١ خان و ٧٠٠ دووکان و دەزگای کالاّ و مافور و دەزگای چنینی دیکەی هەیە .

بەشی گەورەی شارەکە، لەسەر کاڤرێکی گەورەدا رۆنراوە ، بەرەو باشوور بەسەر دەشتێکی تا چاو پردەکا فراوان و بەرین و بەپیتدا دەنوارێ، بەشێکیش لەژێر ئەم تەپۆلکەیەدایە . ئاوی رەوانیشیان زۆر زۆرە ، هەرچەندەش زستانی پتر ساردەو هاوینی گەرمە ، هەواکەی زۆر سازگارە ، لەدەرەوەی شارۆچکەکەدا شوێنەوارە کۆنەکانی شار دیارە، خەلکەکەی بری ١٦,٠٠٠ی موسلمانن ، ئەوەی ماویشەتەوە لەسەر هەرسێ رێبازەکە ئەرمەنی و کلدانی و سوریانی و جولەکەن ، بەشێك لە دانیشتوانی ئەم ناوچەیە لە هۆزی شێخ بزێنی یە ، قەزای ماردین ، لەبەشی گۆشەی باشووری خۆرئاوای لیواکە پێکهاتووە، لە خۆرهەلاتەوە بە نوسەیبین ، لە باکوورەوە بە قەزاکانی میدیات و عەونییە ، لە خۆر ئاواوە بە لیوای ناوەندی دیاربەکرو لە باشووریشەوە بەلیوای سەربەخۆیی زۆر سنووردارە ، پێکەوە لەگەلّ ناحیەکانی قوچ حیسارو عاموودە لە ٢٣٠ گوند پێکهاتووە و ٥٧,٢٧٤ کەس دانیشتوانی هەیە ، لەمانە ٤٠,٥٠٠ یان تورك و کوردو عەرەب و چەرکەسن کە موسلمانن، ١٥,٧٠٠ یان ئەرمەنی و رۆم و کلدانی و سوریانی –ی خرستیانن ، ٥٨٠ش جولەکەن ، ئەوی مایەوەش

یەزیدی و قەرەج( چنگەنە ) و هی دیکەن ، خاکەکەی بەپیتە ، هەروەها هەندێك لەدانیشتوانی ئەم ناوچەیە لە هۆزی شێخ بزێنی یە .

ماردین (لیوای ماردین ) یەکێکە لە سێ لیوا کە ویلایەتی دیاربەکر پێکدەهێنن و ئەوەیانە کەلەوپەری باشووری خۆرهەلاتیدایە ، لەخۆراواو باکووری خۆراواوە بە خودی لیوای دیار بەکرو لە باکوورەوە بە بتلیس و لە باکووری خۆرهەلاتەوە بەوان ، لە باشووری خۆرهەلاتەوە بەویلایەتی مووصلّ و لە باشووریشەوە بە لیوای زۆری سەربەخۆوە دەورەدراو وسنووردارە ، لەناوەراستی لیوادا لە خۆراواوە بەرەو خۆرهەلات یەك ریزە تەپۆلکەیەك دەکشێ و کەوشەنی هێلّی ئاو دابەشکردن پێکدەهێنن ، ئەو ئاوانەی لە لێژایی باکووری ئەم بەرزاییانەوە دێنە خوار، دەرژێنە ناو زێی خابووری پەیوەست بە فورات ، ئەگەرچی راستەوخۆش دێنە خواریّ ، تەنیا لەوەرزی باراناندا دەگەنە خابوور ، هۆزی شێخ بزێنی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە خەریکی کشتوکالکردن و بەخێوکردنی مەرومالاتن .

بەشێك لە هۆزی شێخ بزێنی کە دانیشتوانی ئەم ناوچەیەن خەریکی پیشەسازین لەوناوچەیە . لیوای ماردین پێنج قەزای بەناوی ماردین ، نوسەیبین ،جزرەو میدیات و عەونییە — وە١٣ ناحیەو ١,٠٣٢ گوندی هەیە . سەرژمێری ١٩٣,٠٢٢ کەسە دوو لەسەر سێی موسلّمان و سێیەکی ئەرمەنی و رۆم و سوریانی و کلدانین و خرستیانن کە لە هەرسێ رێبازەکەیان تێدایە ٣٨٠شی جولەکەن ، لەناو لیوادا ١ قوتابخانەی ناوەندی و ٣ مەدرەسە ، ٦٢٥ قوتابخانەی مندالانی موسلّمان و ٥٩ قوتابخانەی تایبەت بە کۆمەلّە جیاجیاکانی خرستان (دیانان)ی لێیە، لەبەر ئەوەی ئەم لیوایە لەسەدەکانی ناوەراستدا بووەتە شانۆی رووداوێکی زۆر زۆری مێژوویی ، لەلایەنی مێژووەوە چەند قەلایەکی بە بایەخی رووخاو و شوێنی بەناوبانگی دیکە هەیە .



م.سەعد شێخ بزێنی- احمد تورك

**- ئیمارەتی جزیرە:**

ئیمارەتی جزیرە و بۆتان لە سەردەمی ئەمەویەکان بۆیەکەم جار بەدەرکەوت کە ئەمیر عبدولعزیز لە کوردی بۆتان بوو ڕابەرایەتی دەکرد جا لەم بنەماڵەیە بەهۆی سۆزی ئیسلامی خۆیان بە نەوەی خالدی کوری وەلید دەزانی ، (محەمەد ئەمین زەکی بەگ) یش دەڵێت : خالدی کوری وەلید لە شاری (حومس)لە سوریا لە شەڕی سەفین کوژرا وە ، خاوەنی پەرتووکی (اسد الغابە) ش دەڵێت هیچ کەسێك لە نەوەی خالیدی کوری وەلید نەمایەو هەموویان بە نەخۆشی (تاعون) مردوون و سامان و زەوی و زاریشیان لە شاری مەدینە بوو.

دواین میری جزیرەو بۆتانیش میر بەدرخان پاشابوو کە لە ساڵی ١٨٤٣ تا ساڵی ١٨٤٧ میراتی جزیرەو بۆتانی کردووە ، دوای رووخانی عوسمانیەکان تەنها بنەماڵەی بەدرخان دەگوازنەوە بۆ دەرەوەی کوردستان. هەروەها لە جزیرەی بوتان و دەوروبەری کە سەر بە پارێزگای شەرناخە تەنها لە شاری جزیرە نزیکەی (١٠٠٠) ماڵ لە هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ بوونە لەو ناوچەیە.

**-دیاربەکر:**

ئەم ناوە کە ئەمڕۆ شارێك و ویلایەتێکی پێ ناونراوە، لەبنەڕەتدا تایبەتە بە بەشی باکووری ناوچەی فراوانی جەزیرەی نێوانی فورات و دیجلە ، عەرەب بەر لە ئیسلامەتیش چوونەتە جەزیرەو نیشتەجێ بوونە و هەندێك حکومەتی گچکەیان دامەزراندووە. لەو دەمانەدا هۆزی بەکری کوڕی وائیل لەبەشی باکووری ئەو بەشەی جەزیرەدا کە چیایی و بەرزاییەو نیشتەجێ بوون. بەم هۆیەوە ناوچەی ناوبراو ناوی (دیاربەکر)ی لێ نراوە . ناوەندەکەی شاری (ئامەد)بووە کە ئەمڕۆ (دیاربەکر)ی پێ دەڵێین، کەبەشێك لەدانیشتوانی ئەم شارۆچکەیە لە هۆزی شێخ بزێنییە.

بەشی باشووری خۆرهەڵاتی جەزیرەش ، بەناوی خێڵی ڕەبیعەی دانیشتوانییەوە، ناوی (دیاری ڕەبیعە)ی لێ نراوە. ئەم ناوە کە بڵاوتر بووە، جارجار دیاربەکریشی گرتووەتەوە، لەناو هەموو بەشی خۆرهەڵات و بەشی باکوری جەزیرەدا بەکاردەهێنرا. لەکاتێکدا بەشی باشوری خۆرئاوای ناوچەی باس لێوەکراو، لەبەر ئەوەی هۆزی مودەر (موضر)ی عەرەب کۆچیان بۆ ئەو ناوە کردووە بە ناوی (دیار مودەر)ەوە ناونراوە.




عوسمان بایدەمیر – فاروق ئاغای شێخ بزێنی

**دیاربەکر(شاری دیاربەکر):**

لەبەری باکوری ناوچەی جەزیرەی ئاسیای عوسمانیدا شارێکە لە ڕۆخی دەستە ڕاستی خۆرئاوای دیجلەدا، ناوەندی ویلایەتێکی هەر بەو ناوەوەیە، لەسەر هێڵی ٣٧٢٥٢٠ی پانی باکورو ٣٨٢ی درێژی خۆرهەڵاتدایەو لەبەرزایی ٦٢٦مەتر لەڕووی دەریاوەیە. شارێکی زۆر کۆن و بەناوبانگە ، ناوە ڕەسەنەکەی (ئامەد)ەو لەبەر ئەوەی بیناکانی لەبەردی ڕەش دروست کراوەو دیمەنێکی ڕەش دەنوێنی . بە( قەرەئامەد_ ئامەدەڕەش ) ناوبانگی بووە . دانیشتوانی لەدەوروبەری ٣٥٠٠٠کەسێکە ، پتر لە ٢٠٠٠٠ی موسڵمانە ، نزیکەی ٨٥٠٠یشی ئەرمەنی و ٣٠٠ێکیشی جوولەکەن ، ئەوەی دیکەی سوریانی (سریانی) و کلدانی و یەعقووبی و هی دیکەن. بەشی گەورەی دانیشتوانی موسڵمانی تورکن،٥٠٠٠کەسێکیشی کورد وعەرەبن. زمانی بلاّو تورکییە، کوردی و عەرەبیش قسەیان پێ دەکرێت، بەشێکیش لە هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ بوونە لەم شارۆچکەیە.

ئەم شارە لەدووری نیوسەعاتە ڕێی ڕۆخی خۆرئاوای دیجلەدایە ، باخچەی جوانیان لەنێوان دایە . بە دوو شوورەی بەرز دەورەدراوە، چواردەرگاو کەلوویەکی زۆرو قەڵایەکی ناوەوەشی هەیە، درێژی دەوری دەرەوەی شوورەکە هەشت کیلۆمەترە . دیمەنی لەدەرەوە زۆر جوانە . ئەگەرچی شارەکە هەندێك شوێنی شێوە جوانیشی هەبێت .لەناوەوە کۆڵانەکانی تەنگەبەرو لەبەرئەوەی خانووەکانی لەبەردی ڕەش بنیات نراوە، گەلێك تەسك و تروسکن. بارەگای کۆنی حکومەت لەسەر تاوێرە بەردێکی ١٠٠مەتر لەدۆڵی دیجلە بەرزتردایە. لەلایەن شوێنەکەیەوە

بێ یان لەلایەن دیمەنییەوە ، یانیش لەلایەن ڕازاندنەوەی بیناسازییەوەبێ ، ئەگەر بەیەکەمی بیناکانی دیاربەکریش بژمێردرێت ، لەبارێکی زۆر ڕمیاو وپشتگوێ خراودایە . لەناوقەڵای ناوەوەدا دووپەرستگای پاشماوەی سەردەمی ڕۆمایی و ڕۆمەکانی لێ ماوەتەوە .یەکیان کراوەتە کۆگای چەك و ئەوی دیکەش کراوەتە مزگەوتێکی پیرۆز.

لە ناو شاردا ،٢٨مزگەوتی پیرۆز و ٣٢نوێژگەو ٩ مەدرەسەو دواناوەندییەکی سڤیل و یەکێکی سەربازی و ناوندییەکی سڤیل و قوتابخانەیەکی سەرەتایی و نزیکەی ٢٠قوتابخانەی منداڵان و ٧کتێبخانەو ٥تەکییە و ١١کلێسەو ١٩قوتابخانەی سەرەتایی خرستیانان ،١٩خان و قەیسەری (بازاڕی سەر داپۆشراو)یکی گەورەو ٨ گەرماو و (١٣٠)چەشمەی گشتی بۆ خەڵك و لەماڵانیشدا ٤٣٠چەشمەی هەیە. ئاوی ئەم چەشمانە زۆر چاکە ، بەرێی ئاوڕاکێشانێکی ٢٥٠٠ماسوورە ییەوە دەهێنرێتە ناوشار .نیوسەعاتە ڕێ لە خوارەوەی شارداو لەسەر دیجلەدا، پردێکی لەبەرد دروستکراوی پتەو وگەورەی هەیە کەلەسەر ١١کەمەرەدا دروست کراوە ،لەناوشارو لەدەرەوەیدا ، گۆڕگەلی گەلێك لە یاوەران و شوێنکەوتووان (سەحابەو تابعین) و چاکان و ناودارە موسڵمانەکانی دیکە و زاتێکی زۆرو نزرگەکانیانی لێیە کە زیارەت دەکرێن.

هاوینان کەش و هەوای پتر گەرمەو زستانانیش بەپێچەوانەوە زۆر ساردە ، وەك ئەوەی بەرزایی شوورەکە ڕێ لە گۆڕانی هەواکە دەگرێ ، لەبەرئەوەی تۆزو خۆڵێکی زۆریش لە ناو شارەکەدا هەیە و بایەخ بە پاککردنەوەی نادرێ ، هەواکەی خاوێن نییە، هەروەها بەشێك لە هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ بوونە لەو شارۆچکەیە کە تاکو ئێستاش هەر لەو شارەیە ماون و ژیان بەسەر دەبەن و بوّتە زادگایان بۆ نەوەو وەچەکانیان.

وادەزانرێ شاری دیاربەکر لەلایەن شایەکانی ئەشکانییانەوە بنات نرابێ ، کە لەو ناوەدا فەرمانڕەواییان کردووە . هەندێك شوێنەواری بە مێخ نووسراویشی لێیە ، دواتریش کەوتووەتە دەستی ساسانییانەوە، سەردەمێکی زۆریش بووەتە مەیدانی شەڕو پێکدادانی نێوان ئێرانییان و حوومەکان چەند جارێکیش کەوتووەتە دەستی ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم و کۆنستانتینی دووەمی یەك لە ئیمپراتۆرەکانی قوستەنتینییە شوورەکەی بنیات ناوە، دواتر لەلایەن شاپوورەوە بەدەست خراوە ، دووبارە کە کەوتووەتەوە ژێردەستی ڕۆمەکان لەلایەن جوستنیانوس ەوە شوورەو قایمکارییەکانی تەواوکراوە. لەسەردەمی حەزرەتی فاروق دا لەلایەن حەزرەتی عییازی کوڕی غەنەمی داگیرکەری جەزیرەوە گەمارۆدراوە، لەبەر درێژەکێشانی گەمارووەکە خالیدی کوڕی وەلید کە خەریکی گرتنی شام بووە ، بە هێز

یارمەتی داوە ، لەساڵی ١١ی هیجری (٦٣٢ی زایین) دا داگیرکراوە و خراوەتەسەر وڵاتە ئیسلامیەکانەوە، سولەیمانی کوڕی حەزرەتی خالید، لەدەمی گرتنیدا شەهید بووە و لەپاڵ مزگەوتی پیرۆزی ناو قەڵای ناوەوەدا نێژراوە.

دیاربەکر لەسەردەمی عەبباسییاندا ، دەمێکی زۆر بووەتە مەیدانی ئەو پێکدانانەی لە نێوانی حکومدارانی بووەیهییەکاندا پەیدابوە . ماوەیەك دوای ئەوەی بووەتە ناوەندی حەمدانییان لە ٣٨٠ی هیجری (٩٩٠ی زایینی )دابووەتە ناوەندی دەوڵەتێکی گچکەی کوردی بەناوی مەڕوانییان ەوە ، دواتریش ناوەندی لقێکی دەوڵەتی ئەرتوقییەکان بووە.

ئەو دیاربەکرەی کە دوای داگیرکاری مەغوڵەکان ، ئاقوێنلۆ و قەرەقوێنلۆ وەوە یەك و ماوەیەك حکومیان تێدا کردووە. دواتر لەلایەن شا ئیسماعیلی سەفەوییەوە بەدەست خراوە ، لەسەر تێکشکانی شەڕی چالدێران، بەگزادە کوردەکان چوونەتە پاڵ حەزرەتی سوڵتان سەلیم خانی (یاوز) و شاریان داوەتە دەستی و لەو سەردەمەوە لە ژێر بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتی پایە بەرزی عوسمانیدایە، دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر ، ناوەندی ئیالەت بووە، کە ویلایەتەکان دامەزراوە، کراوەتە ناوەندی ئەو ویلایەتەی بەناوی دیاربەکرەوە دامەزراوە.

دیاربەکر(ویلایەتی دیاربەکر): یەکێکە لەو ویلایەتە عوسمانییانەی لە کیشوەری ئاسیادان . بەشی باکوری خۆرهەلات و خۆرئاوای ، کەبە ڕەسەن دیاربەکری پێ دەگوترێ لەگەڵ ناوچەیەکی زۆری ناوچەکانی کوردستان ، کەلەڕاستیدا دیجلەو فورات کە سنووری جەزیرەیە ، ئەگەر سنوورەکانی لیواکەش پێکدەهێنی ، لەلای باکوری خۆرهەلاتەوە ، وەکو دیجلە ڕەت دەکا،کە تا ئاوی باتمان درێژەی هەیە، لە باکووریشەوە کە ڕێڕەوی ڕۆیشتنی فوڕات ڕەت دەکا، تا ڕێڕەوی پرێ سویو( ئاوی پرێ) کەلقێکی فوراتە، بەرینە.

ویلایەتی دیاربەکر لە باشووری خۆرئاواوە بە حەلەب و لە باکوری خۆرئاواوە بە مەعموورەتولعەزیز، لە باکوورەوە بە ئەرزەڕۆم، لە باکووری خۆرهەلاتەوە بە بتلیس و وان، لە باشووری خۆرهەلاتەوە بە ویلایەتی مووسڵ و لە باشوورەوەش بە لیوای زۆر کە سەربەخۆ بەڕێوە دەبرێ، دەروەدراوەو سنووردارە، ڕووپێوی ٤٦٨٠٠کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، دانیشتوانیشی لە ٤٧١٤٦٢کەس پێکهاتووە.

بەیەکگەیشتنی دوو ڕێی گەورەی ئێران_ عێراق و سووریا_ ئەنادۆڵ و سامسۆن و ئەسکەندەروون دایە. سێ چارەکی دانیشتووانی کە بەگشتی ٤٧١٠٠٠کەسە، موسڵمانن، ١٣٢٥٤٩ یان دیان و ١٢٦٩یان ئیسرائیلی (جوو)ن و لەگەڵ چەند هەزار یەزیدییەك و قەرەج

و هی دیکەی لێیە ، بەشی گەورەی موسڵمانەکانی تورك و ئەوی دیکە کوردو عەرەبن، نزیکەی ۱۰۰۰۰یش چەرکەسی لێیە. موسڵمانەکان هەر هەموو سوننین، تەنیا ۱۰۰۰ _ ۲۰۰۰یان قزڵباشن. نیوەی خرستیانەکان ئەرمەنین و ئەوی دیکەش نیوەی کاتۆلیك و پروستانت و سوریانی و کلدانی و هی دیکە پێکهاتوون، کەبەشێك لە دانیشتوانی ئەم ناوچەیە لە هۆزی شێخ بزێنینە.

زێی دیجلەش ، لە نێوانی دیاربەکرو مووسڵدا وەك ڕێگەی لێ هاتووە و ئەگەر بەکەڵك هاتووچۆش بێت ، لەبەر بەخوڕ ڕۆیشتن و لێژاییی زۆرەوە، ئەم ڕێیە زۆر زەحمەت و پڕ مەترسییە.

ویلایەتی دیاربەکر، لە ۳ لیوا (سەنجەق) و ۱۳قەزا پێکهاتووە و۸۸ ناحیەو ۳۲۰۱ گوندی بە خۆوە گرتووە کەبەشێك لە هۆزی شێخ بزێنی لەو ناوچانە نیشتەجێ بوونە.

دیاربەکر(لیوای دیاربەکر) : یەکێکە لەسێ لیوا، کە ئەو ویلایەتە هاوناوەی خۆی پێکدەهێنن، واتە لیوای ناوەندییە، لەلای باکووری خۆرئاواوە بە ئەرغەنی و لەلای باشووری خۆرهەڵاتەوە بە لیوای ماردین و لەلایەکانی دیکەشەوە بە سنوورەکانی ویلایەتەوە سنووردارە . بەشی زۆری لەناو نشێوی دیجلەدایە، تەنیا بەشی باشووری خۆراوای لە نشێوی فوراتدایە، ڕووپێوەکەی ۱۷۵۲۰کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، ۱۳٦۹۲کیلۆمەتری چوارگۆشەی بۆکشتوکاڵ دەست دەدات، ۳۲۸٦کیلۆمەتری چوارگۆشەی چیایی و ۵۵۲کیلۆمەتری چوارگۆشەی دارستانە . دانیشتوانی بریتین لە ۱٤۲۹۳۲کەس، ۹۹٦۹۰ی ئەم برە، تورك و کوردو عەرەب، لەگەڵ چەرکەس ن، موسڵمانن و ٤۰۹٤۲ی لەڕەسەنی ئەرمەنی و کلدانی و سوریانین و بەسەر ڕێبازەکانی :ئەرتۆکس و کاتۆلیك و پرۆتستانتی خرستیانی دا دابەش بوون، ۲۰۰۰ی ئێزیدی و قەرەج ۲۸٤یشیان ئیسرائیلی جوون[١]، هەروەها بەشێك لە دانیشتوانی ئەم شارۆچکەیە لە هۆزی سێخ بزێنی یە، هەروەها لەساڵی ۲۰۱۳ سەردانی (دیاربەکر)مان کرد لەگەڵ باوکی خۆشەویستم بەڕێز (فاروق یوسف ئاغا شێخ بزێنی) بۆ دیدەنی خزمانی شێخ بزێنی لەو شارۆچکەیە کە سەرۆکی شارەوانی ئەوکاتی دیاربەکر عوسمان بایدمیر بوو کە خۆی

[١] - کوردو کوردستان لەیەکەم ئەنسیکلۆپیدیای تورکی لە مێژوودا ، قاموسولئەعلام ی شەمسەدین سامی، م.ئەمین بۆز ئەرسەلان لە عوسمانییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تورکی نوێ و پێشەکی بۆ نووسیوەو پەراوێزی بۆکردووە ،ئەحمەد تاقانە کردوویەتی بەکوردی چ١،هەولێر ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە ئاراس،۲۰۰۸.

بە خوارزای هۆزی شێخ بزێنی دەزانی  و دەیگوت من دایکم لە هۆزی شێخ بزێنییە بۆیە بەشێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی لە ناوچەی جەزیرەی بۆتان و دیاربەکر یاوەری ئەم سەفەرەیان دەکردین لە خزمانی شێخ بزێنی تورکیا.



عوسمان ئۆجەلان- فاروق ئاغای شێخ بزێنی

**- ئەرزەرۆم:**

لە بنچینەدا (ئەرزەنوڕرووم)ە، چونکە بەناوی (ئەرزەن)ەوە شارێکی دیکە لەو ناوچەیەدا هەبووەو چونکە ئەرزەرۆم لەو سەردەمانەدا نزیکی ولاتی ڕۆمەکان بووە، پێیان گوتووە (ئەرزەنوڕرووم)، لە کتێبە جوگرافیایی و مێژووییەکانی عەرەباندا بەم شێوەیە تۆمارکراوە، دواتریش ئەم ناوە بە ناوێکی لێکدراوی عەرەبی زانراوە و ئیدی بەشێوەی (ئەرزی ڕووم) نووسراوە .

شارێکی گەورەیە، ناوەندی ویلایەتێکی هەر بەو ناوەی لای باکووری خۆرهەلاتی ئەنادۆلە، بە پێی شوێنی هەلکەوتنی، وەکو ئەوەی بایەخی سەربازی پترەو لەبەر ئەوەی وەك کۆگا (عەمبار) ێکی گەورەی لێ هاتووە بۆ ئەو بازرگانییەی لە نێوان ئێران و ولاتە خۆرهەلاتییەکانی دیکە لەگەل ئەستەمبوول و ئەوروپادا ئەنجام دەدرێ، بایەخی بازرگانیشی هەیە لەسەر پلەی(٣٩٥٥١٦)ی باکوری پانی لەگەل ( ٣٨٥٨٨ )ی درێژی و لە ڕۆخی دەشتێکی (١,٩٥٠) مەتر بەرزیداو لە داوێنی چیایەکی بەرزدا جێی کردووەتەوە کە ناوی (شغوەلەر)ە تەنیا لای باکووری خۆرئاوای دەشتی باسکراو کراوەیە، لایەکانی دیکەی بەچیا دەورەدراوە. سەرچاوەکانی قەرەسووی یەك لە لقەکانی فورات لەو ناوەدایەو یەك لە لقەکانیشی بەناو شاردا دەڕوا.

ئەگەرچی شاری ئەرزەڕۆم سەردەمانێك زۆر ئاوەدان بووە. دانیشتووانی گەیشتووەتە (١٣٠,٠٠٠) كەس ، لەبەر نزیکی لە سنوورو شوێنی پەیوەست بەجەنگەوەی، لەجەنگی ساڵی (١٢٤٥)ی هیجری (١٨٣٠ ی زایین)دا تووشی وێرانی بووەو دانیشتوانی بۆ (١٥,٠٠٠) كەس كەم بوونەتەوە، ئەگەرچی لەو شەڕەدا كە هاتووە و بەسەر چووە زیانی دیوە، لەم سەردەمە دواییانەدا ڕووی لە ئاوەدانی كردووەتەوە و دانیشتوانی گەیشتوونەتە (٣٨,٩٠٠) كەس. ئەمانە (٢٦,٥٥٤) یان موسڵمان و (٩,٤٢١)یان ئەرمەنی و ئەوانی دیكەش كاتۆلیك و هی دیكەن. شار بەگشتی دەكرێتە سێ بەشەوە، یەكەمیان قەڵاكەیەتی كەلە بەرزترین شوێنیدایە، دووەمیان شارۆچكەكەیەتی كەلە دەوروبەری قەڵادایەو بەشووره دەوره دراوە، سێیەمیشیان ئەو بەشەی دەرەوەی شوورەكەیەتی كەلە چوار گەڕەك پێكهاتووە.(٣٠) مزگەوتی پیرۆزی هەیە كە (٨) هەشتیان گەورەن، لەمانە یەكێكیان جووتێك منارەی هەیە و بەشێوەیكی زۆر هونەری نەقش كراون و مەدرەسەیەكی زۆریشی لێیە ، سێ بازارو دائیرەیەكی ڕێكوپێكی سەربازی لێیە.

لەشارەوە تا ترابزۆن كە ئەسكەلە (بەندەر)یەتی، شۆستەیەكی ڕێكوپێك دروست كراوەو عەرەبانە (گالیسكە)ی بەسەردا دەڕوا: كەش وهەوای زستانان زۆر سارد وسوتەمەنی زۆر قاتە(كەمە). دوای ئەم شەڕی دواییە ، تابەتەندییەتی بوونە ناوەندی لەشكری لەدەست داوە . شاری ئەرزنجان كراوەتە ناوەندی لەشكری چوارەمی شاهانە.

خەڵكی ئەرزەڕۆم زۆر زیرەك ولێهاتوون، كەسایەتییەكی زۆری بەناوبانگیان لێ هەڵكەوتوون، لەدەرەوەی شاردا، لەداوێنی چیای شیغوەلەر دا وەكو ئەوەی گۆڕی پیرۆزی (عەبدولڕەحمان غازی)ی یەك لەیاوەرانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ی لێیە، لە شێخ و زانا ناودارەكانیش زاتی وەكو (ئەبو ئیسحاقی كارزوونی و سەدرەددینی قوَنەوی)یش لەم شارەدا نێژراون، بەشێكی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی لەم ناوچەیە نیشتەجێن.

لەسەرەوە باسمان لەوە كرد كەناوی ئەرزەڕۆم بەهەڵە لە(ئەرزەنورڕووم)وەرگیراوە، بەپێی بۆچوونێكی دیكە ناوی كۆنی ئەم شارە لە ناو ئەرمەنییاندا (گارین)ە. مێژووە كۆنەكەی یۆنانییەكان ئەم ناوەیان بەشێوەی (كارانیتیس) وەرگێڕاوەو گۆڕیوە. لەبەر ئەوەی ئەرمەنیە كۆنەكان ناوی (كارنوكاشاك) یشیان بەكارهێناوە كە واتای (شاری كانی) دەگەیەنێ، ئەوناوەی (قالیقلا—كالیكلا) یەی هەندێك لە جوگرافیا ناسانی عەرەب بەكاریان هێناوە، شێوە گۆڕاوەكەی ئەم ناوەیە. لە (٤١٥)ی زاییندا، (تیۆدوسیۆس)ی گەنج یەك لە ئیمپراتۆرەكانی

ڕۆم بووە، قەڵایەکی لەم شارەدا بنیات ناوە، شارەکەش سەردەمێکی زۆر لەناو ڕۆمەکاندا بەناو (تیۆدۆسیۆپۆلیس) ەوە ناسراوە.

بەپێی ڕوانگەی هەندێك مێژوو، لەسەردەمە دواییینەکاندا ئەوشاری (ئەرزەن)ەی لەو ناوەدا بووە، لەلایەن سەلجوقییانەوە گیراوەو ڕووخێنراوە، دانیشتوانی هەڵاتوون ،چوونەتە ئەرزەڕۆم کە تا ئەوسا بە گارین یان کالیلا، یان تیۆدۆسیۆپۆلیس ناوبراوە، بۆیە ئەم شارەش ناوی (ئەرزەن )ی لێ نراوە و بۆئەوەی لەلایەن عەرەبەکانەوە لە (ئەرزەن)ەکانی دیکە جیا بکرێتەوە، بە (ئەرزەنورڕووم) ناونراوە. ئەڵبەتە هەر ئەو شارە بەتەواوی نەسەلمێنراوە کە هەر گارین و تیۆدۆسیۆپۆلیس و (ئەرزەڕۆم)ی ئێستا بووبێ و گومانی تێدایە.

هەرچۆنێك بێ . شاری ئەرزەڕۆم و دەوروبەرەکەی ، لەسەردەمی خەلیفایەتی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب دا ئەرکی گرتنی ئەم شارە خرابووە سەر ئەستۆی ئەبو عوبەیدە، یەك لەو ئازایانەی لەگەڵیدا بوون(عیاز ی کوڕی غەنەم ) بووە، لەسەردەستی ئەمەی دواییان ئاشتیانە شارەکە گیراوەو خراوەتە سەر وڵاتی ئیسلام — لە (٨٨٦ ك)( ١٤٨١یزایین)دا لەلایەن شائیسماعیلی سەفەوییەوە گیراوە وتێکەڵی ئیمپراتۆریەتی ئێران کراوە ، لە (٩٢٠ك)( ١٥١٤ی زایین)دا سوڵتان سەلیم خان — ی یاوز — لەدەمی سەرکەوتنە بەناوبانگەکەی (چالدیران )دا گرتویەتی و خستوویەتییە — سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

دوای ئەوە لەسەرمای چەند ساڵێکی یەك بەدوای یەکدا و لە بوومەلەرزەی زوو زوو ڕوودواودا هەمووو ڕووخاوە و دانیشتوانی پەرت بووە. زاتێك بەناوی حاجی عەلی بەگ لە سەرکردە کوردەکان بووە و لە دەوروبەریدا لە ناو ڕەشماڵاندا دەژیا،عەشیرەتەکەی خۆی تێدا نیشتەجێ کردووە و شارەکەی سەر لە نوێ ئاوەدان کردووەتەوە، هەرلەو سەردەمانەوە بەشێك لە شێخ بزێنییەکان بە هۆی شەری نێوان سوڵتان سەلیم و شا ئیسماعیل سەفەوی کەوتونەتە ئەم ناوچەیە و تاکو ئیستاش هەر لەوێ ماون.

ویلایەتی ئەرزەڕۆم: یەکێکە لە ویلایەتەکانی ئەنادۆڵی دەوڵەتی بەرزی عوسمانی، لە بەری باکووری خۆرهەڵاتی ناوچەی ناوبراودا هەڵکەوتووە. لە سنووری ویلایەتی ترابزۆن — ەوە کەلە ڕۆخی دەریای ڕەشەوە(٢٥)کیلۆ مەترێك لە ژوورەوەیە، تا سنورەکانی ئێران ، بە درێژایی سنووری ڕووسیادایە، بەمەزەندەو نزیکەی (١٠٦,٠٠٠) کیلۆمەتری وشکانی فراوانییەتی، لە لای باکووری خۆرئاواوە لەگەڵ ویلایەتی ترابزۆن، لەلای باکووری خۆرهەڵاتەوە لەگەڵ سنووری روسیا ، لە خۆرهەڵاتەوە لەگەڵ سنووری ئێران، لە خۆرهەڵاتدا لەگەڵ ویلایەتەکانی وان،

بتلیس، دیاربەكرو مەعموورە تولعەزیز، لە خۆرئاواوە لەگەڵ ویلایەتی سیواس سنووردارە و دەورەدراوە، دانیشتوانی (٧٥٣ ،٥٨١)، كەسە لەمانە (٤٦٤,١٢٩) یان موسلمان و (١٠٩,٨٣٥) یشیان ئەرمەنی و ئەوانی دیكەش سەربە میللەتانی دیكەن.

ئەو سەردەمە ویلایەتێكی زۆر گەورەی نزیكەی(١,٢٢٠,٠٠٠) كەس دانیشتوانی بووە ، لە كاتێكدا لە بارودۆخی ئێستایدا وەك لە خوارەوە دیارە كراوەتە (٤) لیواو (٢١) قەزا و (٣) ناحیە:

ویلایەتی ئەرزەڕۆم لەگەڵ ویلایەتەكانی وان و بتلیس پێكەوە واتە لەدۆخی بەر لە ئەنجامدانی ئەوگۆڕانكاریانەی دوایی، لەسەردەمە كۆنەكاندا نیوەی ناوچەی (ئەرمەنستان)ی، یان ئەوەی بەناوی (ئەرمەنییەوە)وە دەناسرا پێكدەهێنا، نیوەی دیكەی ئەم ناوچەیە لەناو ولاّتی ڕووسیاو ئێراندایە، لەسەردەمە كۆنەكاندا ئەم ناوچەیە تەنیا ئەرمەنی لێ دانیشتوە، دوای ئەوەی دەمێكی زۆر سەربەخۆ بووە، لەلایەن كەی خوسرەوی یەك لە جیهانگیرە ئێرانییەكانەوە بەردەست خراوەو تێكەڵ بە ئیمپراتۆریەتی ئێران كراوە دوای ئەوە كەوتووەتە ژێردەستی ئەسكەندەرو دواتر ژێردەستی ڕۆمانییەكان. لەسەردەمی خەلیفایەتی حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) دا خراوەتە سەر ولاّتانی موسوڵمانەوە ، كە ئەرمەنیان لەوە پێشتر دەستیان بەپەرت و بلاّوبوون كردووە، هەر لەو ساوە لەم هەرێمەدا بەرەو كەمبوونەوە چوون، لەسەردەمی عەبباسیان و سەلجوقییان و دواتر ئاققۆینلّووەكان و حكوومەتی دیكەدا عەشیرەت و تیرەی تورك و توركمانێكی زۆر هاتوون و لێی نیشتەجێ بوون، هەروەها بەشێكی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوون.

لیوا (سەنجەقی ) ئەرزەڕۆم: ناوەندی ئەو ویلایەتەیە كە هەر بەو ناوەوە ناونراوە و لەناوەراستی ویلایەتەكەدایەو لە خۆرئاواوە، بەلیواكانی بایبوردو ئەرزنجان و لە خۆرهەلاّتەوە بەلیوای بایەزید و لە باكووری خۆرهەلاّتەوە بە سنوورەكانی ڕووسیاو لە باشوورەوە بەویلایەتەكانی بتلیس و دیاربەكر سنووردار و دەورەدراوە. لیوایەكی زۆر فراوانە ،نزیكەی نیوەی خاكی ویلایەت پێكدەهێنێ و وەك لە بابەتی لەمەو پێشتردا ڕوون كراوەتەوە ، كراوەتە ( ٨) قەزای گەورە.

ویلایەتی ئەرزەڕۆم بۆ ئەو نشێو (حەوز) انەی لێی جودا دەبنەوە سوودی بۆ هەمووان هەیە، بەشی خۆرهەلاّتی پەسین- ە كە لێژایی بەرەو دەریای خەزەرە، لەبەشی باكووری دا چۆروقسو كەلە لێژایی بەرەو دەریای ڕەشە، لە بەشی خۆرئاوایدا قەرەسو، كەلەلێژایی بەرەو كەنداوی

بەسرەدایە، لای باشووریشی واتە قەزای کیفی ، دیسانەوە لە نشێوی زێی موراد پێکهاتووە کە پەیوەستە بە کەنداوی بەسرە. بەم جۆرە، بەرزترین شوێنی ویلایەتی ئەرزەرۆمە، ئەگەرچی بەرزترین چیاکانیشی لەم لیوایەدابێ، جوانترینی دۆڵەکان و خاکی ڕووەکرۆین و بەپیتیش لەناو ئەم لیوایەدایە. خەڵکی لیوای ئەرزەرۆم لە (٣٠٥,٦٥٠) کەس پێکهاتوون، لەمانە (٢١٥,٢٣٣) یان موسڵمان و (٥٠,٨٣٩) یان ئەرمەنی و ئەوانی دیکەش سەر بە میللەتانی دیکەن . بەرهەمیان بەشێوەیەکی سەرەکی لە نزیکەی (٨,٧٢٥,٠٠٠) شینیك گەنم و (٦,٩٦٠,٠٠٠ ) شینیك جۆو (٥٠,٠٠٠) ئۆقە برنج و دانەوێڵەی دیکە لەگەڵ جۆرەها میوە پێکهاتووە .

قەزای ئەرزەرۆم ناوەندی ئەو ویلایەت و قەزایەیە کەهەر بەو ناوەوە ناونراون . لەباکوورەوە بە کەسکیم، لەباکووری خۆرهەڵاتەوە بە تۆرتوم، لە خۆرهەڵاتەوە بە پاسینلەر، لە باشووری خۆرهەڵاتەوە بەخنس، لە باکووری خۆرئاواوە بە تەرجان، لە خۆرئاواشەوە بە قەزای ئۆڤا سنووردارو دەورەدراوە، بەم شێوەیە تەواوێك لە ناوەراستی سەنجەقدا جێی گرتووەتەوە، بەشێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی لە ئەرزەرۆم نیشتەجی بوونە .

- جەزیرە:

ئەمە ناوێکی تایبەتە بەناوچەیەکی فراوانی نێوان شام و عێراق و کوردستان. هۆی ناونانەکەشی ئەوەیە، کە دەکەوێتە نێو دوو ڕووباری دیجلەو فوراتەوە، ناوچە باس لێوەکراوەکەی لە دوو لاوە لەیەك نزیکبوونەوەی ئەم دوو ڕووبارەیە. جوگرافیا ناسە کۆنەکانی یۆنان، ناوی (میسۆپۆتامیا)یان لێ ناوە کە واتای (نێوانی دوو ڕووبار ) دەگەیەنێ، کە ئەمڕۆ لە زمانە بیانییەکاندا بەم ناوە دەناسرێ.

شوێن و سنوورەکانی و ڕووپێوەکەی : دەڤەری جەزیرە ، لای دیاربەکری ئاستی شاری ئامەد-ەوە دەست پێ دەکا، کە فوورات و دیجلە لە ڕێڕەویاندا زۆرترین لەیەك نزیکبوونەوەیان لە وێیە، بەرەو باشووری خۆرهەڵات، تا دەڕوا تەسکتر دەبێتەوە، لە سەرووی بەغدادا و دیسانەوە لەو شوێنەدا کە ڕێڕەوی دیجلەو فورات زۆرتر لەیەك نزیك دەبنەوە کۆتایی دێ ، کە لەم شوێنەدا لەنێوانی هەردوو ڕووباردا بوونی تاقمە کەناڵێك ، بەڕاستی شێوی دوورگە ، یانیش نیمچە دوورگە بەم ناوچەیە دەدا،

بەم جۆرە ، ناوچەی جەزیرە کەلە هەرهەموو لایەکییەوە بەو دوو ڕووبارەوە دەورەدراون ، لە خۆرهەلاتەوە بە کوردستان و لەباشوورەوە بە عێراقی عەرەب و لە باشووری خۆرئاواوە بەدەشتی شام- ەوە لە خۆرئاواوە سووریای ژوورووە واتە بەناوچەی حەلەب، لەباکوورەوەش بەئەنادۆڵ و لەکۆندا بەو ناوچەیەی کە لە کۆندا ئەرمینیای پێ گوتراوە، ناوچەی ئەرزەڕۆم و وان. دەورەدراوەو سنووردارە.

زێی خابوور گەورەترین زێی جەزیرە ، کە گەورەترین لقی فوراتە ، ڕێڕەوەکەی نزیکەی (٣٥٠) کیلۆمەترە، ئەو جۆگە و جۆبارانەی بەشێوەیەکی سەرەکی کە پێکدەهێنن زێیەکانی : جرجۆب و زەرقان و چاخچاخ و زێی سنجار-ن ، زێی سنجاری باس لێوەکراو هەرکە لە بنارەکانی باشووری خۆرئاوای چیای سنجارەوە هەڵدەقوڵێ و لەداوێنەکانی ڕۆژهەلاتیشەوە ئەگەرچی دوو بەستی بەناوی دۆڵی سوورو دۆڵی سەرسەر —ەوە ڕێدەکەن. ئەمانە هاوینان وشك دەبنەوە، هەروەها بەشێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی لەو ناوچەیە نیشتەجێن.

بەشەکان و شارە شارۆچکەکانی: جەزیرە بەپێی جوگرافیا هەر لەکۆنەوە بە ناوچەیەکی جودا دانراوە و لە کاتێکدا بەسنووری سروشتی جیابووەتەوە، لەلایەن بەرێوەبەرایەتیەوە کراوەتە چوار ویلایەت و موتەسەریفێتییەکی سەربەخۆ، بەشی باکوری خۆرهەلاتی بە ویلایەتی دیاربەکرەوە پەیوەستە ، یەك دوو قەزای خودی ویلایەتی دیاربەکرو لیوای ماردین پێکدێنێ . بەشێکی گەورەی لای کۆتاییەکانی باکوری خۆرئاوای پەیوەستە بەویلایەتی حەلەب، لیوای ئورفە پێکدەهێنێ . لای خۆرهەلاتی بەشی ناوەراستی پەیوەستە بە ویلایەتی موسڵ، بەشی گەورەی لیوای ناوەندی مووسڵ پێکدەهێنێ . لای خۆرئاوای بەشی ناوبراو بریتییە لە نیوەی لیوای (زۆر) کە بەسەر بەخۆیی بەرێوەدەبرێ . بەشی باشووریشی بە لیوای ناوەندی بەغدای ویلایەتی بەغداوە پەیوەستە . هەروەها بەشێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوونە کەزۆربەیان بەناوی (بالی) ناوزەدکراون کەبەشێکن لە هۆزی شێخ بزێنی.

**بارودۆخە مێژووییەکانی:** لەبەر ئەوەی ناوچەی جەزیرە لەژێر چیای جودی- دایە ، بەلانکەی ڕەگەزی مرۆڤ دادەنرێت، هەر لە کۆنەوە مەڵبەندی ڕەگەزی سامی بووە و لە تەوراتدا پەناگەی خەلکێك بووە پێیان گوتراوە (ئیرەم) . بەم هۆیەوە لە کتێبە عیبرانییەکاندا بەناوی(ئیرەمی نەهرەین) واتە (ئیرەمی دووزێ) ناسراوە. هەموو لایەکی ئەم ناوچەیە کراوە بووەو لەبەر ئەوەی بە کەلکی بەرگری لێکردن نەبووە ، هەر لەکۆنەوە لە نێو دەوڵەتاندا بووەتە مەیدانی پێکدادان ، لەو سەردەمانەدا کەمێژوو توانیویەتی تۆماری بکا لە دەستی ئاشوورییەکاندا

بووە . ماوەیەکیش لەلایەن فیرعەونەکانی میسرەوە گیراوە. خوسرەوی جیهانگیر ئەو ناوەی بەدەست خستووەو کە سنوورەکانی ئێرانی تا ڕۆخەکانی دەریای دوورگەکان فراوان کردووە، جەزیرەشی تێکەڵ بەم دەوڵەتە کردووە. کە ئەسکەندەر پەیدابووە، ئەم هەرێمەش کەوتووەتە دەست ئەم جیهانگیرە، دوای مردنی بووەتە بەشی (سەلەفکیا) ی یەك لە پاشا گچکەکان کەلە سووریا فەرمانڕەوایی کردووە. بەڕووخانی دەوڵەتی سەلەفکیا واتە لە ٦٤ی پێش زایین لقێکی دەوڵەتی ئەشکانییان لە جەزیرەو ئەرمینیا دامەزراوە. دوای ئەوە چووەتە ژێر بەرێوەبەرایەتی ساسانییانەوە و سەر لە نوێ وەك ویلایەتێکی ئێرانی لێهاتووە .

لە ناوەراستی سەدەی دووەمی زایینەوە تا هەڵهاتنی ئیسلامی لەنێوان ئێرانییان و ڕۆمانییان و دواتریش ڕۆمەکاندا، بووەتە مەیدانی ئەو جەنگانەی بێ پسانەوە هاتووەتە کایەوە. جاروبار کەوتووەتە دەست ئێرانییان و دەمانێکی زۆریش زێی خابوور لەنێو ئەو دوو دەوڵەتەدا کراوەتە سنوور. دەمێکی زۆر بەر لەهاتنی ئیسلام، هەندێك هۆزی نیمچە دوورگەی عەرەب کە چوونەتە ناو جەزیرە، ئەو خەڵکەی لەوێ کۆبوونەتەوە کەلە خەڵکی کۆنی ڕەسەن و ڕۆم و ئێرانییان پێکهاتوون، تووشی نەهامەتی هێناوە.

لە سەردەمی خەلیفایەتی حەزرەتی عومەری کوری خەتاب- دا (خودا لێی رازی بێت) لە (١٧)ی هیجری (٦٣٨ی زایین)دا حەزرەتی عیازی کوڕی غەنەم، فەرمانی گرتنی جەزیرەی پێ دراوە، کە زۆر بە ئاسانی ئەم ناوچەیەی خستووەتە سەر ولآتانی ئیسلام، سەر لەنوێ خەڵکێکی زۆر لە نیمچە دورگەی عەرەبەوە گواستیانە ئەوێ و نیشتەجێ کران، دوای گرتنی ، ئەو ئازوقەیەی وەکو باج لەم ناوچەیە وەرگیراوە، زۆری ئەو بەرووبوومەی وەك ڕۆنی زەیتوون و سرکەو هەنگوین، گەواهێکی ئاوەدانیی ئەو سەردەمانەیەتی. لەسەردەمی دەوڵەتی ئومەویدا خەڵکی جەزیرە زۆربەیان لایەنگیری عەلەوییانییان کردووە، ئەم ناوچەیە دیسان بووەتە مەیدانی جەنگێکی زۆر.

لە سەردەمی خەلیفایەتی عەبباسیدا، ئاوەدانی جەزیرە گەیبووەتە دوا پلە، لە هەموو لایەکی ئەم ناوچە فراوانەدا شارو شارۆچکەی گەورەو ئاوەدان دامەزراوە وهەموو لایەکی باخ و باخچەبووە، ئەوسا بەشی باکوری بە (دیاربەکر)و بەشی باشووریشی بە(دیاری موزەر) ناوبراوە، کەچی ئەم ئاوەدانیەی کەبووەتە هۆی چاوتێبڕین،هەرلەسەرەتای دەوڵەتی عەبباسیەوە لە هەموو لایەکی جەزیرەوە دەم نادەمێك بەلافی فەرمان بەدەستبوونیان بەسەر کۆمەڵە

کەسانێك ئالآی یاخیبوونیان بەرزکردوتەوە و چ لەناو خودی ئەمانەوە یان لەنێوان ناوەندی خەلیفایەتیدا ئەو جەنگانە ڕوویداوە ،بووەتە تەگەرە لەبەردەمی بەرەوپێشەوە چوونی دیکە.

هەرکە دەوڵەتی عەبباسییش ڕووی لە لاوازی کرد لەلایەن بەگزادە تورکەکان و ئەوانی دیکەوە، لە هەمووولایەکدا دەوڵەتێك دەستی بەهاتنە گۆڕێ کرد ،لەبەرئەوەی جەزیرە دەبووە مەیدانی زۆربەی ئەو جەنگانەی کەهەموو ڕۆژێك لەنێو ئەمانەدا بەرپا دەبوو،ئاوەدانی ئەو ڕۆژگارە ڕووی لە دواکەوتن کرد، سەرەڕای ئەمە، دیاربەکر، مووسڵ، مەییافارقین، حەسەنکەیف، ڕەققە، ڕوحا واتە ئورفە، ماردین، جەزیرەتوئیبنیعومەر و شارەکانی دیکە بە نۆرە،هەندێك جاریش جودا جودا کەدەکرانە پایتەخت، زۆربەی حکومدارانی ئەو دەوڵەتە گچکانەی لەو ناوانەدا دادەمەزران ،بەپێی ڕۆژگار،بە پارێزگاری لەزانست، پەروەردەو فێرکردن و هونەرو بەهاندانی پیاوانی زانست و هونەر ،لەبەر ئەوەی تاڕادەیەکیش بێ بەر لەدەسچووەکان گیرابێ، لەکۆتایی دەوڵەتی عەبباسیدا جەزیرە دیسانەوە ئاوەدان بووەوە، لەسەردەمی خەلیفایەتی عەبباسیدا  ئەو دەوڵەتانەی فەرمانڕەواییان،لە جەزیرە دەکرد، بەشێوەیەکی سەرەکی: بووەیهییەکان، عوقەیلییەکان، مەڕوانیەکان ، ئەییووبیەکان و ئەوانی دیکە.

کە جەنگیز خان دەرکەوت، جەزیرەشی لەگەڵ ولآتەئیسلامیەکانی دیکەوە کردە کەلاوە، ئەوەی ئەم خوێنڕێژەش بە جێی هێشتبوو، تەیمووری لەنگ تەواوی کردبوو،لەو سەردەمەوە زۆربەی جەزیرە شارو شارۆچکەکانی بووە وێرانەو کێڵگەو باخچەکانیشی بوونە گژوگیا و بووە جێی تێدا گەڕانی عەشیرەتە کۆچەرییەکان. لەو دەمەدا کەلەنێوانی جەنگیزو تەیموورددا بەسەرچوو، جەزیرە ، بەدەست ئاققۆینلۆو قەرەقۆینلۆدا بووە و لە کۆتایشدا لەسەرەتای سەدەی دەیەمی هیجریدا(١٦ی زایین)لەلایەن سوڵتان سەلیم (یاوز)خان ەوە تێکەڵ بە ئیمپڕاتوریەتی عوسمانی کرا. لە دەمەوە لەناو ویلایەت و پارێزگاکانی دیاربەکر ،حەلەب، موسڵ و بەغدا دابەش کراوە ، هیچ بایەخێکی نەبووە و ئاوەدانییە کۆنەکەی نەگەڕاوەتەوە.

**- جەزیرەی ئیبنی عومەر [1] :**

شارۆچکەیەکە،لەبەشی باکوری خۆرهەلاتی جەزیرەی پەیوەست بە ویلایەتی دیاربەکر،لەرۆخی لای راستی دیجلەدا لە نزیکی(١٥٠)کیلۆمەتری سەرووی مووسلەوە، واتە لە باکوری خۆراوایدایە. ئەمرۆ بەناوی (جزرە)وە ناوەندی قەزایەکی پەیوەست بە لیوای ماردینە، سەردەمانێك گەلێك ئاوەدان بووە، لە ئەدەبیات شوناسە بەناوبانگەکان و زانایان زاتێکی زۆر کە نازناوی (جەزەری) یان هەلگرتووە و یەك لەوانە ئیبنو ئەسیری مێژوونووسی بەناوبانگ و براکانی کە جزیرە زێدیان بووە .بەپێی گێرانەوە لە (٢٥٠ی هیجری)(٨٦٤ی زایین)دا لەلایەن (حەسەنی کوری عومەری کوری خەتتاب)ەوە دروست کراوە لەبەر ئەوە بەم ناوە ناونراوە .

شوێنەکەی نیمچە دوورگەیەکە لەشێوەی تازەمانگ دا بەناو دیجلەدا چووە، دوای دامەزراندنی شارۆچکەکە کەندەکێك هەلکەندراوە ،پەیوەندی بە وشکانییەوە براوە و تاقمێك ئاش لەم کەندەکەدا دروست کراوە، لەم بارودۆخەی ئێستا دا گچکەو تا دوا رادە شارۆچکەیەکی چلکنە، کەش و هەوایەکەشی مەترسیدارە. جاروباریش (جەزیرەیی عومەرییە)شی پێ دەلێن.

**جزرە:**

(کورتکراوە جەزیرەتوئیبنی عەمەر )ە شارۆچکەیەکە، ناوەندی قەزایەکی پەیوەست بەلیوای ماردینی ویلایەتی دیاربەکرو (١٤٠)کیلۆمەتر لەخۆرهەلاتی ماردینەوەیە.

قەزای جزرە،یەکێکە لەو پێنج قەزایەی لیوای ماردین پێکدەهێنن،لەبەشی کۆتایی خۆرهەلاتی لیواکەدایەو لە باکوری خۆرهەلاتەوە بەوان، لەباشووری خۆرهەلاتییەوەش بەویلایەتی مووسل و سنوورەکانی سنووردارە. لە٢١٩گوند پێکدێ، بری ٣٥٠٠٠کەس سەرژمێریەتی و هەر هەموو موسلمانن. خەلکی قەزاکە لەعەرەب و کورد پێکهاتووە، ئەگەرچی زمانی بەربلاو عەرەبییش بێ، تورکیش بەکاردەهێنرێ. بەشێکی خەلکەکە

---

[1] - ئەم ناوە بەوشێوەیەی ئێرەی (دەرگەی کوری عومەر)دەگەیەنێ، ئێرە کە ناوە فەرمییەکەی ئەمرۆی(جیزرە)یە، لەنێو کورداندا بەناوی (جزیرابوتان)، یانیش بە (جزیر)دەناسرێ و لەکۆنەوە ئەوشارەبووە کە پایتەختی دەولەتی کوردی بوتان بووە. هەروەها ئەو بابەتی ئەویندارییەی ناو (مەم و زین)ی داستانی نەتەوەیی کورد، لەم شارەدا هاتووەتە گۆرێ ، ناوی شارەکە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیداو لە فۆلکلۆری کوردیدا لەشێوەی (جزیر) دایە.

نیشتەجێ و بەشێکیش لە عەشیرەتە عەرەبەکان پێکدێ و بەشێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی لەو گوندو ناوچانەی سەربە جزیرە نیشتەجێ بوونە.

**جوودی:**

لەلای خۆرهەلاتی دیجلەدا و لەسەرووی جەزیرەتوئیبنیعومەردایە . چیایەکی بەرزە لەلیوای حەکاری ویلایەتی واندا. لووتکەکانی بەزۆری بەبەفر داپۆشراون. ئەگەرچی لەتەوراتیشدا نووسرابێ کەکەشتیی حەزرەتی نووح (سلاّوی خوای لێ بێ) لەسەر ئەرارات، واتە لەسەر ئاگریداغ دا دانیشتووەتەوە. لە قورئانی پیرۆزدا ڕوون کراوەتەوە کەلەسەر ئەم چیای جوودی یدا وەستاوە. تەنانەت وا گێڕراوەتەوە کەلەسەر ئەم چیایەدا ئەو نوێژگەیەی حەزرەتی نووح (سلاّوی خوای لێ بێ) دروستی کردووە و هەندێك پاشماوە و شوێنەواری کەشتییەکەشی ماوە زیارەت دەکرێ.

**- قەرە کیلسە:**

شارۆکەیەکە ناوەندی قەزایە، لە لیوای بایەزیدی ویلایەتی ئەرزەڕۆم داو لە (٩٠)کیلۆمەتر باکوری خۆرهەلاّتی بایەزیددا، لەسەر ئەو ڕێیەدا کەلە ئەرزەڕۆمەوە دەچێتە بایەزید. قەزاکەی لە خۆرهەلاّت و باشوورەوە بە دیادین و لە خۆراواو باکوری خۆراواوە بەقەزای ئەلەشکورد، لەباکوورەوەش بە سنووری ڕووسیاوە سنووردارە. کراوەتە سێ ناحیە ، کەناوەکانیان: بوێلویکباش، مونکەسیر، تاشلێچای ەو(٥٦)گوندی هەیە. دانیشتووانی(٧,٤٢١)کەسن، (٢٠٩٦)یان ئەرمەنی و (١٤٢)یان بیانین و ئەوانی دیکە موسلّمانی کورد و تورکن. هێزی بەپیتیی خاکەکەی لە بارێکی مامناوەندیدایە، تا ڕادەیەکیش دارستان و گیاجاڕیشی هەیە. بەروبوومە لە دانەوێلّەو ئازووقەی هەمەچەشنەو سەوزەی جۆراوجۆر و لە میوەجات پێکهاتووە. لەئاژەلّی مالّی، مەڕێکی زۆرو بزن و گوێدرێژ و گامێش و ئاژەلّی دیکەی لێیە. لەناو قەزادا (٣) مزگەوت و(٧)کلّێسەو مەناستر، (٢) قوتابخانەی مندالاّن، (٤٧) خان و(٨٣) دووکان و (١)فڕن و(٣٠) ئاسیاو ٤ چەشمە و (٤٠)پردی لێیە ،پیشەسازی ناوەخۆش لەبەڕەو لباد و گۆریە پێکدێ، بەشێکی زۆریش لە هۆزی شێخ بزێنی نیشتەجێ بوونەلەو ناوچەیەدا.



ئۆزدەمیر-فاروق اغاشێخ بزێنی-کورد احمد

- هەیمەنە:

دەشتێکی فراوانە لە لیواو ویلایەتی ئەنقەرە، بریتییە لە بەشی باشووری لیوای ناوبراو، لە دەوروبەری شاری ئەنقەرەو سیڤری حیسارەوە تادەگاتە سنووری ویلایەتی قۆنیە درێژەی هەیە. لەخۆراواوە بەسەرقاریە، لە خۆرهەلاتیشەوە بەرێرەوی قزل ئیرەمەق سنووردارە، لەنێو ئەم دەشتەدا هەندێك گردۆلکە، لەلای هەرە باشووریشدا بەناوی قەرەجەداغ و پاشاداغ ەوە دووچیای لێیە. زەوی هەیمەنە، ئەگەر چی زۆر بەپیتیش بێ ، لە دۆخی ئێستایدا بۆشت بەکارناهێنرێ، تاقمێك عەشیرەتی کورد ڕەشماڵەکانیانی لێ دادەنێن و مەڕو ماڵاتیان دەلەوەڕێنن. ئەم خاکە فراوانە، بەناوی هەیمەنە، یانیش هەیانتین ەوە کراوەتە قەزایەك و خراوەتە سەر لیوای ئەنقەرە[1]، بەشێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی لەم ناوچەیەو دەوروبەری نیشتەجێ بوونە، کە پاش شەڕی چالدێران لەساڵی (١٥١٤) ەوە، بنەماڵەیەکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی کەوتونەتە ئەم ناوچەیە، تاکو ئێستاش هەر لەوێ ماون و هەر لەو ناوچەیە ژیان بەسەر دەبەن.

---

[1] - کوردوکوردستان، لەیەکەم ئەنسیکلۆپیدیای تورکی لەمێژوودا، قاموسولئەعلامی شەمسەدین سامی، م.ئەمین بۆز ئەرسەلان ، لەعوسمانییەوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی تورکیی نوێ و پێشەکی بۆنووسیوە و پەراوێزی بۆکردووە،ئەحمەد تاقانە، کردوویەتی بەکوردی، چ١،هەولێر،دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس،٢٠٠٨،ل٧٣.

- ئەدەنە:

ناوی ویلایەتێکی دەوڵەتی عوسمانلییە لەرۆژهەلاتەوە بە حەلەب و لەباکورەوە بەسیواس و ئەنقەرەو قۆنیە و لەرۆژئاواوە هەمدیسان بە ویلایەتی قۆنیەو لەباشوورەوەشی بەدەریای سفید دەورە دراوە.

روپێوی نزیکەی(٥٠٠٠٠کم٢) و ژمارەی دانیشتوانی(٣٥٠٠٠٠)کەسە کە (١/٥)ی (یەك لەسەر پێنجی) ئەرمەنین و ئەوانی تر موسڵمانن کە زۆربەیان تورکن. لەدەوروبەری مەڵبەندی ویلایەت ژمارەیەك لە ئەسیری عەرەب ولەرۆژهەلاتی چیای (بەرەکەت) یش چەند عەشیرەتێکی گەورەی کوردی تێدایە، یەکێك لەو عەشیرەتانە عەشیرەتی شێخ بزێنی یە، کەبەشێکی زۆر لەو عەشیرەتە لەو ناوچەیە نیشتەجێن و ژیان بەسەر دەبەن.



جێگری شەرەفەدین ئێلجی- فاروق اغا

- ئەنقەرە:

ناوی ویلایەتەکە دەکەوێتە ئاسیای عوسمانلی، رێك لەناوەراستی نیمچە دورگەی ئەنادۆلی لەباکورەوە بەقەستەمونی و لە رۆژئاواوە بەخوداوەندکارو لە باشوورەوە بە قۆنیەو لە رۆژهەلاتەوەشی بەسێواس دەورە دراوە .ژمارەی دانیشتوانی(٨٩٢٩٠٠)کەسە،(٧٦٣٠٠٠)ی موسڵمان و ئەوانی تر لەگەلانی دیکەن . لەویلایەتدا کوردی چادرنشینی عەشایر زۆرن . ئەم عەشیرەتە کوردانە ئازاو زیرەکن کەبریتین لە عەشیرەتەکانی :( رەشوان، شێخ بزنلی، یادیللیس، ترکیانلی، میکائیلی، قوبیانلی، سفیانلی، ئانینالی). ئەم کوردە عەشیرەتانە زۆر بایەخ بە کشتوکاڵ نادەن و هەرخەریکی بەخێوکردنی مەرومالاتن، بەتایبەتی بزن وگا و ئێسترو ئەسپ و بازرگانیشی پێوە دەکەن، بەشێکی یەکجار زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی لەو

شارەیە نیشتەجێن بەتایبەتی لە هایانەو ناوچەکانی تری سەر بە پارێزگای ئەنقەرە،کە زیاتر لە (٧٠)گوند دەبن لەو ناوچەیە هۆزی شێخ بزێنی.

**- چالدێران:**

دۆڵێکە لە ڕۆژهەلاتی ویلایەتی وان لە سنجەقی بایەزید. لەساڵی(٩٣٥)ی کۆچیدا یاوز سوڵتان سەلیم خان بەسەر شائیسماعیل سەفەویدا لەو دۆڵە بەسەرکەوت لەو شەڕەدا سوپای عوسمانلی لە (١٥٠٠٠٠)کەس پێکهاتبوو، (٨٠٠٠٠)یان سوارەو (٧٠٠٠٠)یان پیادە بوون ، هێزی شا ئیسماعیل سەفەویش لە هەمان ژمارە پێکهاتبوو، بەلاّم پیادەی لەچاو سوارەیدا کەمتر بوو. پاش ئەم جەنگە هۆزی شێخ بزێنی پەرتەوازە بوو بەشێکیان کەوتە باکوری کوردستان کەدەکاتە کوردستانی تورکیا کە تاکو ئێستاش هەر لەوێ ماون و نەوەو وەچەکانیان لە ناوچەیە ژیان بەسەر دەبەن.

**- خوراسان:**

ناو ناحیەیەکە لە قەزای (پاسین)ی سەر بە سنجەق و ویلایەتی (ئەرزەڕۆم)و لە (١٦)گوند پێکهاتووە ،هەندێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

**- خولخون:**

ناوی ناحیەیەکە لە قەزای (کیغی) ی سەر بە سنجەق و ویلایەتی (ئەرزەڕۆم) و لە (١٦)گوند پێکهاتووە ، هەندێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

**- سوشەهری:**

قەزایەکە سەر بەسنجەقی (قەرە حەسار) ی سەر بەویلایەتی سیواس و کەوتۆتە باشووری ڕۆژهەلاّتی سنجەقەوە . لەباکورەوە بەقەرە حەسار ولەڕۆژئاواوە بە قەزای قۆیل حەسار و لەباشووری ڕۆژئاواوە بە سنجەقی سیواس و لە باشوری ڕۆژهەلاّتیشەوە بە ویلایەتی ئەرزە رشۆم دەورە دراوە، مەڵبەندە کۆنەکەی گوندی (ئەندریاس) ە کە لە ئاستی دەریاوە (١٠٧٩)مەتر بەرزە . قەزا لە(٦) ناحیەو(١٧٠)گوند پێکهاتووە و ژمارەی دانیشتوانی (١٥٠٠٠)کەسە کە (٧٥٠٠)یان موسلمان و(٣٧٥٠)یان ڕۆم و(٣٧٥٠)یان کاپۆلیك و

پرۆتستانتن، لەناو موسلماناندا عەشایری کورد بالاٌدەستن وقەزاش(١٠٠) مزگەوت و (٦٣)مەکتەبی مندالاٌن و (٢٥)مەکتەبی خرستیانەکان و چەند تەکیەو زاویەی لێیە، کەبەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

- سیس:

شارۆچکەیەکە سەر بە مەڵبەندی سنجەقی (قوزان) ە لە ویلایەتی (ئەدەنە)،کەوتوٌتە باکوری رۆژهەلاٌتی (ئەدەنە) و ٦٥کم لێی دوورە، ژمارەی دانیشتوانیشی(٣٥٠٠)کەسە و خاوەنی (٢)مزگەوتی گەورەو(٣)قوتابخانەو(٣)کەنیسەیە . قەزای (سیس)یش دەکەوێتە باشووری رۆژئاواوە بە ویلایەتی (قونیە) و لەباکوری رۆژهەلاٌتەوە بە هەردوو قەزای (قلە)و(قارس) و لە باشووری رۆژهەلاٌتەوەش بە سنجەقی (جبل بەرەکەت) دەورە دراوە. ئەم قەزایە یەك ناحیەی هەیە بەناوی (سەرقەنتی بالاٌ) و خاوەن (٩٤)گوندە و ژمارەی دانیشتوانیشی(٩٩٥٠)کەسە کەزۆربەیان لە عەشایری کوردن، خاکەکەی شاخاویەو رەزی زۆرە ، هەندێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

- شێخ بزێنلی:

ناوی عەشیرەتێکی کوردە لە ویلایەتی (ئەنقەرە) و بەشێوەی ناحیە بەرێوە دەچێت، ئەم عەشیرەتە بە شێوەیەکی بەرفراوان لەو شارەیە نیشتەجێ بوونە[1].

عوسمانجق:

شارۆچکەیەکەو مەڵبەندی قەزایەکە لە سنجەقی (ئەماسیە)ی سەر بە ویلایەتی (سیواس) و لەشاری (ئەماسیە) ش (١٠) سەعات دوورە و کەوتوٌتە سەر کەناری رووباری (قزل ئیرماق)، ریك لەسەر ئەو شەقامەی کەلە( ئەماسیە) وە دەچێتە(گوسیە) خەڵکەکەی (١٠٠٠)ی موسڵمانەو ئەوی تر خرستیانن و کۆی هەمووشیان دەگاتە (٨٩٢٠)کەس، چەند مزگەوتێکی

[1] - کوردستان لەچاپکراوە عوسمانلییەکاند، وەرگێرانی: فەیسەڵ دەباغ، دەزگای چاپ و بلاٌوکردنەوەی ئاراس، چ١، هەولێر،٢٠٠٤ .

لیبه كه یه‌كێكیان مزگه‌وتی سولتان بایه‌زیدی دووه‌مه و هه‌روه‌ها چه‌ند پردێك و قه‌لآیه‌كی كۆنی تێدایه، هه‌ندێك له دانیشتوانه‌كه‌ی له هۆزی شێخ بزێنی یه.

**قه‌زاكه‌ی:** كه‌وتوته به‌شی رۆژئاوای سنجه‌ق و به ویلایه‌ته‌كانی (ئه‌نقه‌ره) و(قه‌سته‌مونی) و قه‌زاكانی (كۆپری) و (گومش حاجی كۆی) و (سه‌رزیفۆن) ده‌وره‌دراوه .
خاكه‌كه‌ی به پیته و به‌هۆی ئاوی (قزل ئیرماق)ه‌وه ئاوده‌درێ، به‌روبوومی له گشت جۆره دانه‌وێله و میوه‌و سه‌وزه پێكهاتووه به‌تایبه‌تی ترێ ،نیوه‌ی دانیشتوانی قه‌زا موسلمانن و نیوه‌كه‌ی تریش خرستیانن و كۆی هه‌موشیان (٢٨٩٤٠)كه‌سه ،به‌شێكی زۆری له هۆزی شێخ بزێنی له‌و ناوچه‌یه نیشته‌جێ بوونه.

- **عوسمانییه:**

قه‌زایه‌كه له سنجه‌قی (جبل به‌ره‌كه‌ت)ی سه‌ر به ویلایه‌تی (ئه‌ده‌ن )،ژماره‌ی دانیشتوانی له نێوان (٨-٩) هه‌زار كه‌سه و قه‌زاكه‌ش له (٥) ناحیه و (٢٥) گوند پێكهاتووه.خاكه‌كه‌ی شاخاوییه‌و زۆر به‌كه‌لكی كشتوكاڵ نایه‌ت له‌ناو قه‌زاشدا زێی (حمص)كه لقێكی (جه‌یحان)ه قه‌زاكه ئاودێر ده‌كات ، مه‌لبه‌ندی قه‌زا گوندی (رضائیة)یه‌و له‌قه‌زاشدا (٣)مزگه‌وت و (٥)خان و(٢)فرن و(٣٠)دوكان و (٢)مه‌كته‌ب و (٧)ئاشو (٣)دینگ هه‌یه.له قه‌زاشدا نزیكه‌ی (١٠٠)خرستیان هه‌ن و موسلمانه‌كانیش به هه‌ردوو زمانی كوردی و توركی قسه ده‌كه‌ن،هه‌ندێك له هۆزی شێخ بزێنی له‌و ناوچه‌یه نیشته‌جێ بوونه.

- **قۆچ حه‌سار:-**

گوندێكه‌و مه‌لبه‌ندی ناحیه‌یه‌كه له‌قه‌زاو سنجه‌قی ماردین ی سه‌ربه ویلایه‌تی دیاربه‌كر و (١٦كم) لێی دووره، كاتی خۆی شارۆچكه‌یه‌كی گه‌وره بووه، به‌شێك له دانیشتوانی ئه‌و ناوچه‌یه له هۆزی شێخ بزێنی یه.

**- قەرە کلێسا:**

شارۆچکەیەکەو مەڵبەندی قەزایەکە لە سنجەقی (بایەزید) ی سەر بە ویلایەتی (ئەرزەرۆم). کەوتۆتە سەر ڕێگای (ترابزۆن)و (ئەرزەرۆم) لەسەر سنووری ئێران و ڕوسیا و لە لەئەرزە ڕۆمەوە(١٦٥کم)و لە شارۆچکەی (دیادن)ەوە(٦٦کم) و لە (بایەزید) ەوەش (٩٩کم) دوورە.

قەزاکەی : کەوتۆتە ناوەڕاستی سنجەقی (بایەزید) و بەقەزاکانی (ئالشکر) و (دیادن)و دەوڵەتی ڕوسیا دەورە دراوە.

ژمارەی دانیشتوانی: (٦٩٣٨)کەسە، لەو ژمارەیە (٥٠٠٠) یان موسڵمان و (٢٠٠٠)یان ئەرمەنین. قەزا لە(٣) ناحیە و(٣٨) گوندو(١٣٠٠) خانوو پێك هاتووە، (٢) مەکتەب و مزگەوتێك و کلێسایەك و(٨٣) دوکان و(٤٢) خان و (١) فرن و(٣٠) ئاشی تێدایە، کە بەشێك لەدانیشتوانی ئەو ناوچەیە لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

**- قەرە وێران:**

ناحیە یەکە سەر بە سنجەق و ویلایەتی (سیواس)، بەوناوەش گوندێکی تر هەیە کە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شاری (سیدی) سەر بە ویلایەتی (قۆنیە) ،کەبەشێکی زۆر لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

**- کیفی:**

شارۆچکەیەکەو مەڵبەندی قەزایەکە لە سنجەق و ویلایەتی (ئەرزەرۆم) و کەوتۆتە باشووری ڕۆژئاوای (ئەرزەرۆم) و(١٣٢کم) لێی دوورە و هەروەها کەوتۆتە سەر زێی (بینکول) ی فوراتەوە. دەوروبەری شارۆچکەکە بە چمارەیەکی زۆر لە دارگیز دەورە دراوە.بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

**- ماردین:**

شارۆچکەیەکە و مەڵبەندی سنجەقێکە لە ویلایەتی (دیاربەکر) ، کەوتۆتە سەر چیای (ماسیوس) کە بەرزاییەکەی (١١٠٠)مەترە. ژمارەی دانیشتوانی (٢٥٠٠٠)کەسە، کەبەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنلی یە.

- موش:

مەڵبەندی سنجەقێکە لە ویلایەتی (بتلیس) دا ، ئەم شارە کەوتوّتە باشووری ڕۆژهەلاتی (ئەرزەڕۆم) و(١٧٠کم) لێی دوورە و باکوری ڕۆژئاوای شارۆچکەی (سعرد) و(٨٥کم) لێی دوورە و لە مەڵبەندی ویلایەتیش کە شاری (بتلیس)ە، (٦٥کم) دوورە. شوێنەکەی لە باشووری سنجەقەکەدایە، لەسەر بەرزاییەك کە بەدارستانێکی چڕ دەورە دراوە . بەهێزی قەلاتەکەی وای کردووە کە بە درێژایی مێژوو ئەم قەلاتە بمێنێ . پانایەکەی (٣٠کم)و درێژییەکەی (٨٠کم)ە، و ژمارەی دانیشتوانیشی (٢٧٠٠٠)کەسە، کە زۆربەیان کوردی موسڵمانن، لە شارەکەدا(٣)مزگەوتی گەورەو(١٠)مزگەوتی بچووك و(٤)کلێسا و(٦)مەدرەسە و(١) ڕوشدیە و(٥)خان و(٤)حەمام و(١٥٠)موغازە.لەو ژمارەیەی(١٥٠٠٠)ی کوردی موسڵمان و باقیەکەشی ئەرمەنین. قەزا لە(٣) ناحیە(کتصور،خاندریس،خیوت)و(١٩١)گوند و(٤٢٠٠٠)کەس پێکهاتووە.

لە(موش) دا تەلارێکی حکومەت و قیشلەی سەربازی و فەرمانگەی (تینحسار)و قەرزی گشتی و دادگا هەیە، بێجگە لەمە(٢٥٠٠) خانوو(١)قیرخانە و(٢٠)قاوەخانەی تێدایە.مەڵبەندی موش: (٢١٣)گوندی هەیەو بە پلەی ناحیەیە.

سنجەقی موش: لە باکوورەوە بە ویلایەتی ئەرزەڕۆم و لە ڕۆژهەلاتەوە بە ویلایەتی وان و لەباشوورەوە بە سنجەقی بتلیس و لە ڕۆژئاواوەش بە سنجەقی (کنج)دەورە دراوە.

ژمارەی دانیشتوانی سنجەق(١٢٣٤٥٩)کەسە، لەو ژمارەیە(٧٠٠٠٠)کەسی کوردی موسڵمان و باقیەکەشی لە میللەتانی ترن. لە زستاندا پلەی گەرما بەپێی پێوەری سانتگراد لەناو شار (١٦)و لەدەرەوەی شاریش (١٤)پلەدایە،لە هاوینیشدا پلەی گەرما لەنێوان(٢٦ — ٢٩) پلەدایە،بەشێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە ، کە زیاتر خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و کاسبکارین لە ناوچەکە.

- شارۆچکەی مەلاتییە:

یەکێکە لە شارو شارۆچکەکانی ولاتە ناسراو وکۆنەکەی (ئەناتۆلی)و دەکەوێتە لای دەستە ڕاستی ڕووباری (فورات) وناوو هەواکەشی فێنك و خۆشە و(١٨)سەعاتە ڕێ لە مەڵبەندی ویلایەتەوە دوورە. ئەم شارۆچکەیە مەڵبەندی سنجەقی (مەلاتییە)بوو و ئێستا بەناوی (ئاسکی مەلاتییە) واتە مەلاتییەی کۆن ناودەبرێت، چونکە لەم دواییەدا حکومەت

شارۆچکەی (ئاسپوزز)ی ئاوەدان کردەوە بەناوی (یەنی مەلاتییە)واتە مەلاتییەی نویێ ناونراو کرا بە مەڵبەندی سنجەقەکە.بینایەکانی شارۆچکە کۆنەکە رۆژبە لە رۆژ کۆنتر دەبن و شارۆچکە نوێیەکەش بەرە بەرە فراوانتر دەبێ و ئێستا مزگەوتێکی گەورەی لێیە وخاوەن دوو منارەی گەورەیە کەپێی دەڵێن منارەی(حەمیدییە) و شارۆچکەکەش بە چاندنی قەیسی بەناوبانگە، هەروەها بەشێك لەدانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

- نخاخ:

شارۆچکەیەکەو مەڵبەندی ئیدارەی قەزای (تورتوم)ی سەر بە سنجەق و ویلایەتی (ئەرزەرۆم)،کەوتۆتە باکوری رۆژهەلاتی (ئەرزەرۆم)و(٥٠کم) لێی دووره،لەسنوری (روسیا)وەش (١١کم) دووره.لەسەدەی دەیەمی زایینیدا و بەهۆی قایی قەلاکەی لە بەرامبەر شالاوە یەك لەدوای یەکەکان ناوی دەرکردووە، ژمارەی دانیشتوانیشی(٥٢٠٠)کەسەو زۆربەیان لە عەشایەری کوردن بەشێکیش لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

- یلیجا:

مەڵبەندی ناحییەیەکە لە سنجەقی ئەرزەرۆم و ژمارەی دانیشتوانی(١٢٣٥)کەسە و بەکاری کشتوکاڵی خەریکن و زۆربەشیان لە عەشایەری کوردن و بەشێکی بەرفراوان لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی[1].

-بەشە ئیداریەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانی:

کاربەدەستانی عوسمانی بەچەند نیازێکی تایبەتی ولاتەکەیان[2]. کردبوو بەچەند قەوارەیەکی ئیداری: ویلایەت، سنجەق، قەزا، ناحیە، یاسای فەرەنسایش هەمان جۆرە.

[1] - کوردستان لەچاپکراوە عوسمانلییەکاند، وەرگێرانی: فەیسەڵ دەباغ، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چ١، هەولێر،٢٠٠٤ .

[2] - سولتان سەلیمی یەکەم کوردستانی خستە سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، ئەم سولتانە لە سالانی (١٥١٢- ١٥٢٠)ی ز. دا حوکمی دەوڵەتی عوسمانی کردووە . کوردستانی عێراق ئەو کاتە بە ویلایەتی موسڵەوە بەسترابوو ، بریتی بوو لە سێ سەنجەق.... سەنجەقی ناوەندیش موسڵ بوو کەوا شامیلی قەزای

(پارێزگار)یش بەرپرسیاری سنجەق و قایمقامیش قەزاو کارگێڕی ناوچەش هی ناحیە بوون، کاربەدەستی بالاّو هەوێنی کارگێڕانی حوکمەتی ناوچە دیارە والی بوو، ئەمیش بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خەلیفە دانرابوو [1]، جگە لە کاروباری سوپا و دادگەری دەسەلاّتی بەسەر هەموو بەشەکانی دەوڵەتا هەبوو، ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی پۆلیسی ناوچەو کۆمەڵی مووچە خۆران و ئیشووکاری پارەو پوولی دەکرد، والی بۆ ڕاپەراندنی ئیشووکاری خۆی: دووکەسی دەکرد بە یاریدەدەر، یەکەمیان ( دەفتەردار) واتا ژمێریاری گشتی ، دووەمیان (مەکتەبچی ) واتا ئەمینداری گشتی، مەکتەبچی– لە پاش والی – فەرماندەی سەرۆکانی پۆلیس بوو والیش کۆمەڵێکی بوو ڕاوێژی پێ دەکردن، ئەو کۆمەڵەیە لە یاسای تورکیادا دەزگایەکی سەربەخۆو جیاواز نەبوو، بەڵکو لە جەرگەی یاساکەوە هەڵقولاّبوو، پارێزگارو قایمقام و مودیری ناحیە و کوێخای گوندەکانیش بۆ پرس و ڕاوێژ کۆمەڵی تایبەتی خۆیان هەبوو، ئەندامی ئەو ئەنجومەنانە لە موچەخۆرانی حکومەتی ناوچەکەبوون، بۆ چاوبەست و هەوێنیش خەڵکی ناوچەکە تێهەڵکێش دەکران، ئەمانیش زۆربەیان لەپیاوانی دیاریی و ناوداری کۆمەڵ بوون، ئەو ئەنجومەنانە وێڕای ڕاوێژو ئامۆژگاری دەسەلاّتی تریان نەبوو، هەرچەند یاسای تورکیا خۆی نەخۆش و دەردەدار بوو: بەلاّم هۆی لاوازی ئەو یاسایە ئەمەبوو کە ئیش و کاری ئەو دەوڵەتە بەشێوەیەکی خراپ بەڕێوە دەچوو، دەسەلاّتەکانی والی ڕوو لە پووکانەوەو لاوازی بوون، پایە بەرزەکانی ئەستەمبۆڵ ڕاستەوخۆ موچەخۆریان دادەناو بە بیانووی ڕاوێژپێکردن: یاخۆ یارمەتیدانی والی لە پاڵ ئەودا قوتیان دەکردەوە: بەبێ ئەوەی پرسێك بە والی بکرێت،

---

دهۆك، زاخۆ، نامێدی، (عمادیە) و( شەنگار ) و ئاکرێ (عقرە) بوو .... سەنجەقی کەرکوکیش شامیلی قەزای (هەولێر) و (ڕواندز) و (کۆیە) و (کفری) بوو ... کە سەروەختێکیش ناوی (صلاحیە) یان لێنا ، سەنجەقی سلێمانیش شامیلی قەزای والی بەرپرسیاری ویلایەتی عوسمانی بوو، ئەنجومەنێکی ناوچەیی بە ناوی (ئەنجومەنی کارگێڕان): لە ئەنجامدانی ئیشوکاردا یارمەتی والییان دەدا. (بازیان) و (هەڵەبجە) و (شارەزوور) بوو...( گۆڤاری کۆڕی عیراق – دەستەی کورد – بەرگی (٢١)و (٢٢) – نووسەران).

[1] - عوسمانییەکان پێش سوڵتان (یاوز سلیم) نازناوی خەلیفەیان هەڵنەگرتبوو ... بەلاّم پاش داگیرکردنی (میصر) لەلایەن سوڵتانی ناوبراو دوا خەلیفەی عەباسی ناچار کرد ... لە خەلافەت وازبێنێ ... لەو کاتەوە سوڵتانی عوسمانییەکان ... نازناوی (خەلیفە)ی موسڵمانانیان ... بەسەر خۆیاندا سەپان.

بگرە زۆر جاریش لە دژی ئەو ئەنجام دەدرا، بۆیە دەسەلأت و قسەی والی لە ڕووی ئەواندا بڕی نەدەکرد، سیخوڕو جاسووسەکان سوپایەکی گەورەو قەبە بوون، چاوی زەقیان ئاراستەی هەموو قوژبنێکی ولأت کردبوو، پەیتا پەیتا ڕاپۆرتی پڕوپوچیان ڕاستەوخۆ دەنارد بۆ ئەستەمبۆڵ، دەزگا ناوچەییەکانیش بۆش و بوودەڵە بوون و لە ڕووی ڕەسمیاتیشەوە کەم دەسەلأت بوون، بە کردەوەش ئەندامی ئەو دەزگایانە چووبوونە کۆڕی سیاسەت و کاروباری ناوچەکە: بۆیە ئۆقرەیان لیّ بڕابوو، هەمیشە هەلّپەی ئەوەیان بوو: بۆ تاقمێك دەسکەوتی تایبەتی وەدیی بهێنن، یاخۆ بۆ بەرژەوەندی خودیی خۆیان لەگەلّ گەورەی ناوچەکەدا کلکیان دەکرد بەیەکدا و دەسەلأت و هێزیان یەك دەخست .

جەندرمەی ناوچەش (زەبیتە) نیوەیان پیادەن و نیوەکەی تریشیان سوارن. ئەم ڕێکخراوە دەزگایەکی سەربازی بوو، لیژنەیەکی تایبەتی نێو وەزارەتی عوسمانی سەرپەرشتی کاروباری دەکرد، ئەفسەرانی جەندرمە بەشێکیان کارامەو نیزامی بوون، بەشێکی تریشیان عەشایەرو ڕەمەکی، جەندرمە کرابوون بەچەند بەشێکەوە، هەر بەشێك کارو فەرمانی تایبەتی بۆ دیاری کرابوو وەك: کۆکردنەوەی باج، وەدووکەوتنی تاوانباران، پێشوازی لە بێگانەو گەریدەکان و وەتەك کەوتنیان، لە ئۆردوگاکانی دەرەوەی ویلایەتەکاندا کۆدەکرانەوەو ئامادە دەکران، جەندرمەکان ئازاو جەربەزە بوون[1] .

**کوردەکان:**

لەسەدەی حەڤدەمینی پێش لەدایکبوونی عیسا پێغەمبەرەوە کوردەکان هاتوونە ئەم ناوچەیەو لە دەشتەکانی دیجلەو فوراتدا نیشتەجیّ بوون ، بەلأم لەسەرەتاوە زۆری نەخایاند زەوییە نزمەکانی لای چەپیان جیّ هێلأ و بەرەو باکورو خۆرهەلأت :بەرەو دامێنی چیاکان: بەرەو ئەرمینیاو ئێران ڕەویان کرد، کە کوردەکان چوونە ناو ئەرمەنییەکان: کوردان ناوچە بەرزو چیا سەرکەشەکانیان بۆخۆیان هەلّبژارد و ئەرمەنیەکانیش قولأیی دەربەندو چەم و دۆڵ، بەو شێوەیە ژیان و هەلّپەی ژیاری لەڕەگ و دەماریاندا کەوتە پلدان و بزێوی. کوردەکان بۆیە کە

---

[1]- کوردو کوردستان ، کۆمەلّێك لە پسپۆران و ئەفسەرانی سیاسی ئینگلیز، وەرگێرانی: حسین عوسمان نێرگسە جاری و حسین احمد جاف، چ١، دەزگای چاپ و بلأوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ، ٢٠٠٢.

دەشتی فوراتیان جیٚ هێشت ، چونکە لەبنەچەدا رەگەزێکی چیانشین و ئێجگار بزێون، بەلاّم خێلاّنی نێو چیاکان: لە زستاندا بەرەو پێدەشتەکان شۆڕ دەبنەوە، لەراستیشدا سەرماو زریانی چیا سەرکەشەکانی کوردستان: چ مرۆڤ و چ درندەش وەك یەك ڕاو دەنێن، کوردەکان و ئەرمەنییەکان بەڕادەیەك ئازاو چەلەنگن، بۆ تورکانی دراوسێیان دەستەمۆ نەبوون و لە بۆتەی ئەواندا نەتوانەوە: چونکە خوێنی (ئاریی ) لە دەمارەکانی ئەواندا هێشتا قولْپ دەداو دەبزوێت.

پاش شەری (چالدێران ) لە نێوان سولتّان (سلیم) ی عوسمانی و شاە (اسماعیل)ی سەفەوی لە سالّی (١٥١٤)ی زایینیدا، کوردستان زەرەرو زیانێکی گەورەی لیٚ کەوت و ئەم ناوچەیە لە نێوان دەولّەتی عوسمانی و دەولّەتی(صفوی)ەوە دابەش کرا... چونکە لەو قۆناغەدا هەستی سەربەخۆیی و نەتەوەیی لە ناو ئەو قەومانەی کەوا لە سێبەری دەولّەتی سەفەوی و ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا ... دەژیان هێمان خۆی نەنواندبوو... ئەمەش بەهۆی ئەوە بوو کەوا هەموو لایەك موسلّمان بوو کەس بیری لە جیاوازی نەتەوەیی نەدەکردەوە بەلاّم ئیتر ئەوەبوو کەوا دەستیان کرد بە بیرکردنەوە لە جیاوازی مەزهەبی و مەسەلەی شیعەو سوننی هاتە کایەوە بە دەسیسەی سەفەویەکانەوە، بۆیە هۆزی شێخ بزێنیش وەك بەشێك لە نەتەوەی کورد سەرەتای پەرتەوازەبوونی لەوساکەوە دەستی پیٚ کرد و پەراگەندەی ناوچەکانی تری کوردستان بوون ...

**کوردەکانی نزیك (ئەرزەڕووم)و (دەریاچەی وان):**

لادیٚ پان و بەرینەکانی سنووری باکوورو باکووری خۆرهەلاّتی دەریاچەی (وان) دەکەونە باوەشی ئەم ناوچەیە، سنووری ناوچەکەش شان بەشانی سنووری ڕووسیاو ئێران دەکشیٚ، لە باشووریشدا ئەو سنوورە دەکەوێتە کەنارەکانی خۆرهەلاّتی دەریاچەی (وان) و بە هێلّێك لەم دەریاچەوە دەکشێت بەرەو کەنارە باکوورییەکانی دەریاچەی (ورمیٚ)، لە خۆرئاوایشەوە هێلّی سنووری ناوچەکە: لە (ئەرزەڕووم)ەوە بەلێژگەیەکی پاندا تێدەپەڕێت و (مادراك) و (مووش) جیٚ دێلّیٚ و بەدەوری ئەوپەڕی خۆرئاوای دەریاچەی (وان) دا پێچ دەکاتەوە .

نەریت و یاسای ژیانی خێلّەکانی ئەم مەلّبەندە زۆر ئالّۆزن و بە ستەم دەتوانین نەخشەیان بۆ بکێشین، ئەمانە دەبن بە (٤) کۆمەلّەوە، لە نەریت و پەیڕەوی کۆمەلاّیەتی و ژیانی ئاساییدا لەیەکدی جیاوازن، هەرگیز دابەشکردنی جوگرافی ئەمانەی لە ناوچەیەکدا کۆنەکردۆتەوە.

چوار خێڵێکی دیکه لە دەوروبەری (ئەرزەڕووم) دا دەژین، لە باکووری شارەکەدا خێڵی (شێخ بزەینی) دەژین و دەبن بە دوو بەشەوە، بەشە گەورەکەیان (٤٥٠) خێزانێك دەبن، نەریتەکانی ئەم خێڵە تۆکمەو ڕەسەنن. زۆر نزیکە خێڵی (شێخ بزەینی ) لەو ڕەهەندەو دەرکراوانە بن کە سوڵتان سەلیم لە (ئەرزەڕووم) ەوە تەرەوەنەی کردبوون .



فاروق اغای شێخ بزێنی- علی قازی محمد

**هۆزی شێخ بزێنی لە ئێران (ڕۆژهەلاتی کوردستان):**

لە وولاتی ئێران هۆزی شێخ بزێنی لەم ناوچانە هەیە: لە شاری شیراز هۆزی شێخ بزێنی هەیە هەروەها لە قەزای کازرۆن هۆزی شێخ بزێنی هەیە کە دەکەوێتە نێوان خورەم ئابادو شیراز، هەروەها لە شاری خورەم ئاباد هۆزی شێخ بزێنی هەیە، هەروەها لەشاری مهابادو گوندەکانی دەوروبەری هۆزی شێخ بزێنی هەیە .

*زۆر لە سەرچاوەکاندا دەردەخەن کەوا هۆزی شێخ بزێنی سەرەتا لەشاری (قصر شیرین) بوونەو نیشتەجێ بوونە دواتر بە هۆی ناکۆکی نێوان شا ئیسماعیلی سەفەوی و سوڵتان سەلیمی یەکەم لە دوای شەری چالدێران کە لە ساڵی ١٥١٤ روویدا کە دواتر لە پاش شەری چالدێران و ساڵەکانی (١٦٠٠) بە دواوە پەرتەوازە کرانە بۆ ناوچەکانی تری وەکو عێراق و تورکیاو سووریا بە هەموو گوندو ناوچەو شارەکانییەوە، بۆیە وا دەردەکەوێت کەوا هۆزی شێخ بزێنی لە ئێران راهاتبن بۆ ناوچەکانی وەکو عێراق و تورکیاو سووریا .

*ڕایەکی تر هەیە دەڵێ شێخ بزێنی لە ناوچەی شکاك لە گوندی (شامی ) نزیك سنووری تورکیاو ڕووسیا ڕاهاتوون و پەرتەوازە بوون بۆ ناوچەکانی تری کوردستان .

*ڕایەکی تر هەیە دەڵێ: لە ناوچەی لوڕستانی ئێران ڕاهاتوون بۆ ناوچەکانی عێراق و تورکیاو سووریا ... هتد .

*ڕایەکی تر هەیە کەوا بە پێی هەندێ سەرچاوە کەوا خلیل دلێمی لە کەناڵی تەلە فزیۆنی (صلاح الدین ) باسی کردووە کەوا هۆزی شێخ بزێنی سەرۆکەکانیان (ئەلبوعامرن) واتە تیرەیەکی عەباسین و دەگەڕێنەوە سەر ئیمام عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت ) کە دەکاتە مامی حەزرەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) کەوا بەپێی قسەی ناوبراو (البوعامر) تیرەیەکی عەباسی یە .

*لە ساڵانی کۆتایی (۱۹۱۷)دا، حکومەتی عوسمانی بەتەواوی جڵەوی دەسەڵاتی لە دەست دابوو، لەبەر نەبوونی ئاسایش و لاوازی حکومەتی عوسمانی، هەمەوەندەکان هێرشیان کردە سەر دەشتی کۆیە و دەستیان بە تاڵان کردن و باج وەرگرتن کرد، ئەمەش وای لە حەمە غای کۆیی کرد داوای یارمەتی لە عەشیرەتی شێخ بزێنی بکات بۆ دەرکردنی هەمەوەندەکان، دواجار توانیان لەم کارەدا سەرکەوتوو بن، بەڵام هەر عەشیرەتی شێخ بزێنی خۆیان دواتر مانەوە لە کۆیی تەنانەت بووە هۆی شەرو ناکۆکی لە نێوان یاندا لە دەشتی کۆیە [1].

**قەسری شیرین[2]:**

شارۆچکەیەکە (۱٦۰)کیلۆمەتر لە خۆراوای کرماشان (کرمنشاه)ەوە و لە ویلایەتی ئەردەلان، یان ویلایەتی کوردستان، لە خۆراوای کەلاوەکانی شاری حولوان و لەسەر زێی حولواندا کە بە دیجلەوە پەیوەستە، لە نزیك سنووری عوسمانی، لە دەوروبەریدا کەلاوەیەکی زۆر هەیە کەلە ساسانییەکانەوە بەجێ ماون و هەندێك بینا لەگەڵ پەیکەر و شوێنەواری لەلایەن هونەرەوە بەبایەخیشی لێیە. لەلایەن مێژوونووسانەوە باس دەکرێ کەوا هۆزی شێخ بزێنی لەسەرەتاوە لەو ناوچەیەوە ڕاهاتوون، پەرت و بلاْو بوون بۆ ناوچەکانی تر واتە دوای شەڕی نێوان سوڵتان سەلیم و شا ئیسمائیلی سەفەوی شێخ بزێنی لەو ناوچەیە گوازراونەتەوە

[1] - جەمال فەتحوڵا تەیب، کۆیە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی یە، چ۲، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ۲۰۰۸، ل ٥۱.

[2] - ئەو شوێنەیە کە بووە دابەش کردنی کوردستان لە نێوان عوسمانی و سەفەویدا، لەساڵی (۱٦۳۹) ئەو پەیماننامەی بەناوی (قەسری شیرین) ەوە دەناسرێ و بەناوبانگە.

بۆ ناوچەکانی باکوری کوردستان بەتایبەتی ئەنقەرە و هاپمانەو ئەرزەرۆم و دیار بەکرو ماردین ناوچەکانی تر، دواتر بەشێك هاتوونەتە کوردستانی عێراق و شاری هەولێر بەتایبەتی گوندی کەورگۆسك، بەشێکیشیان بۆ ناوچەکانی کەرکوك و دەوروبەری .

**- قەسر شیرین:**

شارۆچکەیەکە لە ئەیالەتی ئەردەلانی ئێران یاخود ئەیالەتی کوردستان و (١٦٠کم) لە کرمانشانەوە دوورە. لەدەوروبەریدا شوێنەوارێکی زۆری ساسانییەکان هەیە، سەرەتای پەرتەوازە بوونی شێخ بزێنی و پێش جەنگی چاڵدیران لە ساڵی (١٥١٤) لەنێوان سوڵتان سەلیمی یەکەم و شا ئیسماعیلی سەفەوی هۆزی شێخ بزێنی لەو ناوچەیە بوون.



**هۆزی شێخ بزێنی لە ولاتی سوریا (کورستانی رۆژئاوا )**

لە سوریا هۆزی شێخ بزێنی لەم شوێنانەی خوارەوە نیشتە جێ بوون :

١. **گوندی (کێشکی):** کەوتۆتە (مالکیە)یە سەر بە ناوچەی (الجوادیە) ،گوندێکی گەورەیە لەرۆژهەلاتی گوندی ( شێخ ابراهیم) و گوندی (گری دیرا)، لەباکوری قاستیان و بادیان، لەباشوری گوندی سیگرکا، لە رۆژئاوای گوندی گرکی موراد هەلکەوتووە، بەشێك لە دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنینە .

٢. **گوندی (معشوق) مەعشووق:** گوندێکی گەورەیە، سەر بە مەنتیقەی (المالکیە) یەو سەر بە ناحیەی (الجوادیە) لە باکوریەوە گوندی (باباسیە) و گوندی (دیرونا قلنگا) هەلکەوتووە لە رۆژهەلاتەوە گوندی (ئالا رەشەن) ی یەزیدی و رووباری (جراح) و گوندی

(قەترانیە) هەلکەوتووە، لەباشوریەوە گوندی (گۆپگیل) و گوندی (عەرەب شا) هەلکەوتووە، بەشێك لە دانیشتوانی ئەم گوندە لە هۆزی شێخ بزێنینە.

٣. **گوندی زەخیرە (زخیرە):** سەر بە ناوچەی مالکیە و ناحیەی (الجوادیە)یە لە رۆژهەلاتی گوندی (جل ئاغا )هەلکەوتووە، لەباکورەوە گوندی (کفری دەنا)، لە باشوریشەوە گوندەکی عەرەب نشین هەلکەوتوە بەناوی (باقلان) وە گوندی (شەمام)، بەشێکی ئەم گوندە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتە جێ بوونە .

٤. **گوندی (سحل) بەواتای (دەشت):** سەر بە ناوچەی قامشلی یە سەربە قحطانیة (ترپە سپی) لەباکوریەوە گوندی (سیحە) وەباشوری گوندی (کل معروف) هەلکەوتووە، بەشێکی دانیشتووانی ئەم گوندە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتە جێ بوونە .

٥. **گوندی (گریبکیل):** ئەم گوندە لەرووی قەبارەیەوە مام ناوەندیە لە باشوری گوندی (معشوق) هەلکەوتووە، لە رۆژئاواوە گوندی قەترانی هەلکەوتووە، بەشێکی ئەم گوندە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتە جێ بوونە .

٦. **گوندی (دێرونـــــە ئاغا):** بەزمانی عەرەبی پێی دەلێن (دیر غــــــصن)ئەم گوندە گوندەکی گەورەو ناسراوە لەرووی مێژووی یەوە کەوتۆتە نێوان ( جزیرەی بۆتان) و (نســـێبین) لەسەر سنوری نێوان ولاتی تورکیا وسوریا هەلکەوتووە، هۆزی شێخ بزێنی لەم گوندە نیشتە جێ بوونە .

٧. **گوندی شلال (کندکی شلال):** ناوی ئەم گوندە هەر بەناوی ئاغای گوندەکە کراوە، گوندەکی بچووکە، لەلای باکوریەوە گوندی (باکوزان) هەلکەوتووە لە رۆژئاواوە گوندی (دێرونە ئاغا) و گوندی (ئەلەقۆز) هەلکەوتووە، لە باشوریەوە (بەکر ئۆغلی) و گوندی (دێرون کەڤەنگ) هەلکەوتوە، لە رۆژهەلاتەوە گوندی (بادیان) و (کوندك تیپ)، سەربە ناوچەی مالکیە سەر بە ناوچەی (الجوادیە)، ئەم گوندە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتە جێ بوونە .

٨. **گوندی ( خرجی جهوا) خەربی جەهوا:** سەر بەناحیەی ( الجوادیە) لەناوچەی (مالکیە)هەلکەوتوە، لە باکوریەوە گوندی (نبی سادی) وەلەرۆژئاواوە گوندی (جالکا) وە گوندی (عابدا) وە باشوری (جل ئاغا) هەلکەوتووە، ئەم گوندە هۆزی شێخ بزێنی تێدا نیشتە جێ بوونە .

٩. **گوندی( شێخ بزێنی):** ئەم گوندە هەر بەناوی هۆزی شێخ بزێنی یە کەوتۆتە نزیك (عین ترمە ) لە شرق شیمالی شاری دیمەشق، دانیشتوانی ئەم گوندە زۆربەیان لە هۆزی شێخ بزێنین .

١٠. **لە ناحیەی (قبور البیض)کە (تربە سپی)** پیَ دەوترێت لە (القحطانیة) سەر بە پارێزگای (الحسکە)، کەسایەتی ناسراوی شێخ بزێنی لەم شوێنە بەرێز (طاهر) کە (ابو عیماد) پیَ دەلێن، لەدەوری (نهر کێشکی) ڕوباری کێشکی نیشتەجیَ بوون، هەروەها بەشێك لە هۆزی شێخ بزێنی لەم ناوچەیە نیشتەجیَ بوونە .

١١. **قضاء (القـــامشلی ):** سەر بە پارێزگای (الحسکە )یە، کەسایەتی ناسراوی ئەم شوێنە بەرێز (د.بشیر احمد شێخ بزێنی)یە هەنێك لە بنەماڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی لەم قەزایە نیشتە جیَ بوونە .

١٢. **ناحیە (عامودە):** سەر بە پارێزگای (الحسکە )یە، چەند ماڵێك لە هۆزی شێخ بزێنی لەو ناوچەیە نیشتە جیَ بوونە .

١٣. **ناحیە (رمیلان):** سەر بە پارێزگای (الحسکە )یە، بەشێك لە بنەماڵەی هۆزی شێخ بزێنی لەو ناوچەیە نیشتە جیَ بوونە .

١٤. **پارێزگای (دیمەشق) (العاصمە):** بەشێك لە بنەماڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی لەم ناوچەیە نیشتە جیَ بوونە .

١٥. **پارێزگای (الرقە ):** بەشێك لە بنەماڵەی هۆزی شێخ بزێنی لەو ناوچەیە نیشتە جیَ بوونە .

١٦. **ناحیە الجوادیە:** (جل اغا) شی پێدەلێن نزیکی (کێشکی)یە لەشاری حەسەکە، لە ناوچەی (مالکیە)، کە بەشێك لە هۆزی شێخ بزێنی لەم ناوچەیە نیشتەجیَ بوونە.

* شێخ بزێنیەکانی سوریا دەلێن دەوری (٢٠٠) ساڵێك دەبێت کەوتوینەتە ئەو گوند و ناوچانەی سوریا، هەروەها پێشتریش لە تورکیا ڕا هاتوین بۆ سوریا جا لەبەر هەر هۆیەکی سیاسی ئەو کات بێت یان لەبەر هەژاری و نەداری بێت یان لەبەر هەر هۆیەکی تر بێت ، بۆیە ڕێژەی دانیشتوانی هۆزی شێخ بزێنی لە سوریا زۆر نییە وەکو ئەوەی لە تورکیا و عیراق دا هەیە ، هەروەها شێخ بزێنی لەو ناوچانەی نیشتەجیَ ی سوریا زیاتر خەریکی کشتوکاڵن بەتایبەت (گەنم و جۆ و نیسك و نۆك و پەمۆو ......هتد) جگە لە مەرو ماڵات و بزن و چێل بە خێو دەکەن هەر لەم ناوچانەدا .

١٧. **گوندی کشوریە:** دەکەوێتە ناوچەی (مالکیە)سەر بە مەخفەری مستەناوییە لە باکورەوە (چیلکیا)یە، لە رۆژهەلاتیەوە گوندی (گێری) یە و گوندی مستەناویە، لەرۆژئاواوە گوندی (کەهنی کەرك) هەلکەوتووە، لەباشوریەوە گوندی (کورکیان)هەلکەوتووە، ژمارەی خێزانەکانی شێخ بزێنی نیشتە جێی ئەم گوندە ئێستا زیاتر لە (٣٠) مال دەبێت .



**-راگواستنی کورد دوای یەکەمین جەنگی جیهانی:**

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی ، کوردستانی ژێردەستەی عوسمانی کرایە سێ پارچە و، ویلایەتی موسڵ و بەشی رۆژئاوای لورستان خرایە سەر ویلایەتی عێراقی عەرەبی تازە دروستکراو، و هەر لەدوای دروستبوونی ئەو دەوڵەتە لە ساڵی (١٩٢٠) دا، تاکو ئەمرۆ رژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق بەردەوامن لە بەعەرەبکردنی خاکی کوردستان ، بەجۆرێك بەر لە دروست بوونی ئەم دەوڵەتە، سنووری کوردستان لە باشووری شاری عەمارە دەستیپێدەکرد، تا دەگەیشتە زنجیرە چیای حەمرین لە هەردوو ویلایەتی بەسرەو ویلایەتی جزیرە (بەغداد)و ویلایەتی موسڵیش کە پێویست ناکات باسی لێوە بکەین ، چونکە هەرسێ ویلایەتی وان دیاربەکرو موسڵ لە جوگرافیای عوسمانی بە قیسمەتی کوردستان ناوی دەهێنرا.

سەرەرای هەبوونی ژمارەیەکی زۆری کورد لە شارەکانی دیکەی دەرەوەی کوردستان لە عێراق وەك شاری بەغدا، حیللە، رەمادی، تکریت، دیوانییە، ناسرییە، کەربەلا، بەسرە.

سەرەتای ئەنفالیش لە مانگی٦و٧ ساڵی ١٩٦٣ لە کوردستانی باشوور دەستیپێکرد، کە زیاتر گوندەکانی هۆزی شێخ بزێنی و کەرکوکی گرتەوەو گوندێکی زۆریش بە عەرەب کرا، وەك هەموو گوندەکانی نێوان دوبزو کەرکوك و حەویجە.

کوردستانی ژێردەستی (سۆڤێتی پێشوو) ش دابەشی سەر دوو کۆماری ئازربایجان و ئەرمینیا کراو، ساڵی (١٩٢٣) کوردی ناوچەی قەرباغی رۆژئاوا کە لە کۆنەوە بە کوردستانی سوور ناسراوە ئۆتۆنۆمیان وەرگرت و، لە سەردەمی (ستالین)یش بەبێ بریاری رەسمی هەڵوەشێنرایەوە

و لەژێر پەردەی ئاینی ئەم ناوچەیەیان بە تورك ناونووس کرد، لە ئەرمینیاش مافی رۆشنبیریان وەرگرت هەرچەندە لە هەمان سەردەم ئەم مافەش سستی کەوتیێ، پارێزگەی( نەخچەوان)یش کە شارێکی کورد نشین بوو، بە پێی رێکەوتنێکی نێوان (لینین)و (ئەتا تورك) خرایە سەرکۆماری ئازربایجان و لە سەردەمی (ستالین) یش دژی تورك کراو، کوردی ئەم پارێزگایەش لەگەڵ بەشێك لە کوردی ئەرمینیاو جۆرجیا ئاوارەی ئاسیای ناوەند کران.

-کوردستان کۆنترین وولاتی رۆژهەلاتی ناوەراستە کە شارستانی تیا دروست بووەو گەشەی کردووەو بە نێو ولاتانی دیکە بلاو بۆتەوە، بەلگەش بەسەدان ناوی پەرستگاو شوێنی پیرۆزو گۆرو شوێنی مانەوەی پێغەمبەرانە لەوانە: داود، سلێمان، گۆری یونس، شوعەیب، دانیاڵ، زولکە فیل، نوح، ئەیوب و مەقامی ئیبراهیم و عوزیرو هاورێیانی ئەشکەوتە لە شاری ئورفە (سەلات و سەلامی خوایان لێ بێت)، کە دواتر گەلانی بێگانە دەستیان بەسەر ئەم شارستانیە دێرینە داگرت و هاتنە سەر حازرەکی وەك ئەکەدی و بابلی بەر لەزایین و عەرەب و تورك و فارسی) یش لە سەردەمی ئەمڕۆ.

-مێژوونووسان کوردیان بۆ چوار چین دابەش کردووە: رەوەند، کۆچەر، جووتیار، دانیشتووی شار نیشتەجێ (جێوار) رەوەندو کۆچەر لە رەشمالان دەژین و بیرکردنەوەشیان جیایە لەگەڵ جوتیارو دانیشتووی شار بەلام ئێزدی، کاکەیی دیان و جوو سەخت نیشتەجێ بن و کۆچەریشیان کەمتر بووە لە کوردی موسڵمان.

جێوار(نیشتەجێ): جێوار بریتییە لە دانیشتوانی شارو گوند، دانیشتوانی گوندیش کە زیاتر بە چاندن خەریك بوونە و مەڕداریشیان کردووەو هەر لە قۆناغی ڕەوەندیو کۆچەریەوە بونەتە جووتیار.

*دەتوانرێت سەرەتای دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی میدیا (٨٠٠- ٧٠٠ پ . ز) بە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم دەستەواژانە دابنرێت، دوای ئەوەی سوپای میدیا لە تێکهەڵچوونێکی دژ بە ئاشوریەکان، سوپای میدیاکان شکست دێنێت و، (دیاگۆی) فەرمانڕەوا لە لایەن ئاشورییەکانەوە بەدیل دەگیرێ لەگەڵ ژمارەیەك لە سەربازو سەرکردەکان دەگوازرێنەوە شاری نەینەواو، ( دیاکۆ)ش بێسەروشوێن دەکرێت.

دوابەدوای ئەنفالی میدییاکان بە دەستی ئاشووریەکان لە ساڵی (٥٥٠پ.ز)، لە ئەنجامی رووخانی ئیمپراتۆریەتی میدیا بە دەستی ئەخمینییەکان، بنەماڵەی پاشاو ژمارەیەك لە بنەماڵەکانی دیکەی میدیاکان، لە هەمەدانەوە بۆ ناوچەی پارس دەگوازرێنەوە، کە بنەماڵەی

ساسانییەکان بنەماڵەیەکن لە بنەماڵەی میدییەکان، مێژوونووسە ئیسلامییەکانیش ئاماژە بۆ ژمارەیەك لە هۆزانی کورد لە پارس بەناوی (زموم الاکراد) دەکەن، دوورنییە ئەوانیش لە بنەماڵە راگوێزراوەکانی میدیاکان بن، ئەگەر هەندێکیان بە رەوەندی نەچووبنە ئەوێ.

دوای ئەوەی ئیمپراتۆریەتی ساسانی لەلایەن سوپای ئیسلامییەوە دەڕوخێت، دانیشتوانی کوردی مەدائین و شارانی دیکەی ناوەڕاست و باشووری عێراق لەبۆتەی ڕەگەزی عەرەب دەتوێنرێنەوە.

لەسەردەمی عەباسییەکانیش دوای ئەوەی شۆرشی کورد لە موسڵ شکست دێنێ و (جافری داسنی) دەکوژرێ. دەست دەکرێت بە بەعەرەبکردنی شاری موسڵ، هەروەها کورد لە زۆربەی شۆرشەکانی عێراقدا رۆڵی گرنگیان گێڕاوە، لە شکستخواردنی هەر شۆرشێکیش بەشێك لە کوردستان بە عەرەب دەکرا. سەرەڕای کوشتن و ئەنفالکردنی ژمارەیەك لە رۆڵەکانی گەلی کورد.

گەورەترین ئەنفال و داگیر کردنیش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هێرشە یەك لە دوای یەکەکانی زەردپێستەکانی وەك مەغۆڵ، قەرەقۆینلۆ، جەلائیری، سەلجوقی و عوسمانی..کە توانیان ئاران و ئازربایجان و هەمەدان و بەشێك لە ئوستانی ورمێ بە تورك بکەن و، دانیشتوانەکەی لە بۆتەی رەگەزی تورك بتوێننەوە.

فراوانترین گواستنەوەش لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە دەستی پێکرد،سەرەتا ژمارەیەکی زۆر لە هۆزانی کوردی سەرحەدو دیاربەکرو دەرسیم و ئۆرفەو دیلۆك و ئەسکەندەرۆنەو شوێنی دیکەی کوردستانی باکووریان گواستەوە بۆ ئەنەدۆڵی ناوین ، وەك: قۆنیە ، ئەنکەرە، ئاکاسیا، قەیسەرییە و شوێنی دیکە. هەروەها بەشێکی دیکەشیان بۆ ناوچەکانی نێوان ئەزمیرو ئەستەمبۆڵ گواستەوە.

ژمارەیەك لە هۆزی (شێخ بزێنی) کەرکوکیشیان بۆ ئەنەدۆڵی ناوین گواستەوە، هەندێك لە هەمەوەندەکانی نێوان سلێمانی و کەرکوکیشیان بۆ لیبیا گواستەوە، چەند هۆزێکی دەوروبەری دەریاچەی (وان)یشیان بۆ ناوەراست و باشووری عێراق گواستەوە،لەوانە هۆزێك کە ئەمرۆ بەناوی (اکراد) ناسراون. لە هەردوو شاری دیوانییەو ناسرییە نیشتەجێن و زمانی کوردیان لە بیر چۆتەوە، هۆزی (قەرەغول)یش یەك لە هۆزەکانی دەوروبەری دەریاچەی (وان)ە کە

ڕاگوێزراون بۆ ناوەراستی عێراق و، بوونەتە تیرەیەك لە هۆزی شەممەری عەرەبی و، تواونەتەوە لە بۆتەی ڕەگەزی عەرەب[1].

**ڕاگواستنی هۆزی شێخ بزێنی :**

مەبەست لە ڕاگواستن: گواستنەوەی دانیشتوانی ناوچەیەکە لەزێدی باوو باپیرانی و نیشتەجێ کردنیان بەزۆرەملێ لە ناوچەیەکی دی جا چ لەناوەوە یان لەدەرەوەی ولآتێکدابێت، دیارە لە پاڵ ئەم ڕاگواستنە مەرام و ئامانجی تایبەتی هەیە کەڕاگوێزەر دەیکات، سەرباری ئەوەی کە نەتەوەیەکی بالآدەست بەزۆر نەتەوەیەکی ژێردەستە لە خاك و ولآتی خۆی وەدەرنێ، ئەمەش بۆ بەجێ هێنانی مەرامێکی گلآوە وەك لە عێراق دژ بەخەڵکی بێ دیفاعی کوردستان ڕووی دا، ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بەدرێژایی مێژوو بە ئاگرو ئاسن کەوتنە ویژەی میللەتی کوردو بەردەوام بوون بۆ سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەیی و بە سیاسەتێکی نەگۆڕیان داناوە ، سەرەتای ئەم کارەش لەدوای دروست بوونی یەکەم حکومەتی عێراقی لەساڵی (١٩٢١) دەست پێ دەکات و درێژەی کێشاوە تاله سەردەمی حکومەتی یاسین هاشمی لەساڵی (١٩٣٦) و بەئاشکرا دەرکەوت، لە سەردەمی حکومەتی گەیلانی لەساڵی (١٩٤١) چاکتر پەیرەو دەکرا، بەڵام لەساڵی (١٩٦٨) پاش هاتنی ڕژێم بۆ سەرحوکم، شێوازێکی تری گرتە خۆو بەجۆرێکی بەرفراوانتر جێ بەجێ کرا، ئەوەی پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە هەیە، ڕاگواستنی گوندو ناوچە کانی هۆزی شێخ بزێنی یە کە لەسەرەتای حکومرانی ڕژێمەوە دەستی پێ کردوە کەئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هەموو خانوو ڕەزو باغ و بێستان سوتێنران و لە بەرهەم هێنان کەوتن، کە کاری کردە سەرباری ئابووری خەڵکی ناوچەکە، ئاوەدان کردنەوەش بەگران کەوتە سەرشانی خەڵکەکە بەهۆی کزی باری ئابووری، هەر بۆیە پێویستە ئاورێك لەو گوندو ناوچانەی شێخ بزێنی بدرێتەوە و زیاتر پەرەی پێ بدرێ و دووبارە ئەم ناوچانە بنیاتبنرێتەوەو بودجەیەکی تایبەتی بۆ تەرخان بکرێت بۆ ئەوەی سەرجەم گوندەکان دەستی ئاوەدان کردنەوەیان بگاتێ، هەموو پێداویستییەکانی وەك نەخۆشخانەو قوتابخانەو مزگەوت و جادەو ئاو و کارەبای سەرلەنوێ بۆ بچێتەوەو ببوژێتەوە .

[1]- عەباس سلێمان عەباس ، مێژووی دەشتی هەولێر ، بەرگی یەکەم ، هەولێر ،٢٠٠٤، ل١٣٢.

تاقی کردنەوەو تەجروبەکانی جولانەوەی رزگاری نیشتمانی و شۆڕشەکانی گەلانی دنیا گەلێ نموونەمان دەخاتە بەرچاو کە چۆن دەولەتە داگیرکەرو کۆلۆنیا لیستەکان بەسەدان و هەزاران گوندی گەلانی ژێردەستەو داگیرکراویان ڕاگواستوە و ڕەزو باخ و بێستانەکانیان سوتاندون و کاریزو کانیاوەکانیان کوێر کردۆتەوە.

- لەسییەکانی ئەم سەدەیەدا فاشیەکانی ئیتالیا زیاتر لە ٨٠ هەزار کەسیان لە دانیشتوانی لیبیادا ڕاگواست و لە ئۆردوگا – گرتوخانەکان ((معسكرات الاعتقال)) یان خزاندن کە خەلك پێ یان دەووت ((ئۆردوگاکانی مردن)) .

-لە دوای سالی ١٩٥٧ وە فەرەنسا هەموو خاکی جەزائیری کردە چەند چوارگۆشەیەك و دانیشتوانەکەی لەو چەند چوارگۆشەیەدا کۆکردەوەو نیشتەجێ یان کردن .

-لە سالی ١٩٦٢ وە ئەمەریکا بە پێ ی نەخشەیەکی ووردو بەرفراوان زیاتر لە ٣/٢ ی دانیشتوانی ڤێتنامی خواروی لە ١٦ هەزار گونددا کۆکردەوە کە ناویان نابوو ((گوندی ستراتیجی)) .

-هەروەها نازیەکانی ئەلمانیاش لە جەنگی جیهانی دووەم دا هەر شوێنێکیان دەگرت خەلکەکەیان ڕادەگواست و لەشوێنێکی تراکۆیان دەکردەوە و گوندو شارە داگیر کراوەکانیشیان دەکردە قەرەبروت .

-بەهەمان شێوە بەعسیەکانی عێراق زۆربەی ناوچە گرنگەکانی کوردستانیان ڕاگواستوەو زۆربەی دانیشتوانیان لەو شوێنانەدا کۆکردۆتەوە کەناویان ناوە ((گوندی هاوچەرخ ))و کوردیش ناوی ناوە ((ئۆردوگای زۆرەملێ)).

بەلام ئەگەر سیاسەتی فاشیەکانی ئیتالیاو ئیمپریالیزمی فەرەنسی و ئەمەریکی لە ڕاگواستنی گوندو لادێ کانی وولاتە داگیرکراوەکان دا ڕوولە مەبەستێکی سوپایی ڕووت بووبێ بۆ ئەوەی تەنگ بە شۆڕشگێڕە چەکدارەکان هەلبچنن و جەماوەریان لێ دوور بخەنەوە، ئەوا ڕاگواستنی گوندو لادێکانی کوردستان بەتایبەتی گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی .

-هەموو ئەو گوندو لادێ یانەی بەهۆی سنوورەوە ڕاگوێزراون لە ئۆردوگا زۆرەملێیەکاندا کۆکراونەتەوە، لەکاتێکدا ئەو شوێنانەی بەهۆی تەوەرەی ستراتیجییەوە ڕاگوێزراون کەمیان لە ئۆردوگاکاندا کۆکراونەتەوە، بەلکو زۆربەیان بەشارو ناوچەکانی باشووری عێراقدا پەرش و بلاوکراونەتەوە یا لە ناوچەکانی تری کوردستاندا پەرتەوازەبوون.

-لەبەرئەوەی مەبەستی رژێم لەکردنەوەی ئۆردوگاکان مەبەستێکی سوپایی یە تادانیشتوانی ئەو ناوچانە لەژێر دەسەلاّت و لەناو ئەلقەی دەسەلاّتی شۆرشدا دەربهێنێ، بۆیە ئەو ئۆردوگایانە گشتیان لەنزیك شارەکان و لەسەر شەقامە سەرەکی یەکانی نێوان شارەکاندا رۆنراون.

ا-ئەو ناوچانەی بەهۆی سنوورەو بەر ڕاگواستن کەوتون:

*قەزاکانی: هەلّەبجە، پێنجوین، شارباژێڕ، دوکان، پشدەر لەپارێزگای سلێمانی.

* قەزاکانی: چۆمان، رواندز، زێبار لەپارێزگای هەولێر.

* قەزاکانی: ئامێدی، زاخۆ لەپارێزگای دهۆك.

ب-ژمارەی گوندە ڕاگوێزراوەکانی پارێزگای سلێمانی: ٥١٧گوند، ١٨٥٩٩خێزان، کە بەشێکیان لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

-ژمارەی گوندە ڕاگوێزراوەکانی پارێزگای هەولێر: ١٤٨گوند، هی ١٣٢گوندیان ٤٣٨٧خێزان، کە بەشێکیان لە هۆزی شێخ بزێنی یە.

-ژمارەی گوندە ڕاگوێزراوەکانی پارێزگای دهۆك: ٢٠٧گوند، ٧٨٢٨خێزان. هی هەرسێ پارێزگاکە : ٨٧٢گوند، ٣٠٨١٤خێزان.

ج-بۆکۆکردنەوەی ئەم گوندانە چەندین ئۆردوگای زۆرەملێ دروست کراون لە سلێمانی و هەولێر و دهۆك.

د-ڕێژەی ئەو خاکەی بەهۆی سنورەوە ڕاگوێزراوە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

-پارێزگای سلێمانی ٣١,١٪

-پارێزگای هەولێر ٢٦,٩٥٪

-پارێزگای دهۆك ٦٠,٤٦٪ (لەگەلّ تەوەرەی ستراتیجی)

-ڕێژەی ئەو خاکەی لەهەموو ناوچەی ئۆتۆنۆمی دا بەر ڕاگواستن کەوتوون: ٣٦,٠٤٪ واتە زیاتر لە ١٣,١٠٠٪کم² لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی ڕاگوێزراوە (بەهەموو جۆرەکانی ڕاگواستنەوە).

*پارێزگای تەئمیم: ٢٨گوندو١٠٥٨ خێزان. کە زۆربەیان لە هۆزی شێخ بزێنین.

*پارێزگای سەلاحەددین: ٢٣گوندو ١١٥٤ خێزانیان بەردەکەوێ. کەبەشی هەرە زۆریان بەر ئەم قەزایانە دەکەون: مەخمور: ٣٣گوند، کۆیە:٣٢گوند، کەرکوك: ٢٥گوند، دوز:٢٣گوند، دوکان:٢٢گوندو سلێمانی:١٧گوند، کە بەشێکی زۆری لە هۆزی شێخ بزێنین.

-بەگوێرەی سالّەکان ژمارەی گوندە سوتێنراوەکان بەم جۆرەیە:

*لەساڵی ١٩٦٣دا ١٣گوند سوتێنراو تەخت کران کە ئەمانەن:
-گوندەکانی: خدرجە، گاوەرە، کەنداڵ لەناحیەی دیبەگە، هەروەها دارەخورما، حەسەن بلْباس، حاجی شێخان، لاوەر لەهەمان ناحیەدا. لەساڵی١٩٨٥یش دووبارە کاول کرانەوە.
-لەناحیەی قەرە حەسەن: گوندەکانی پەنجا علی، مەحمودئاوا.
-لەناحیەی شوان گوندەکانی: قزلْقایە، وەلی پاشا.
لەناحیەی قەرە هەنجیر: سۆنە گۆلی، یارەولی کەهی دووەمیان جارێکی تر لە ١٩٨٦/١٠ تێکدراوەتەوە.
*لەساڵی١٩٧٧دا(١)گوند.
*لەساڵی١٩٨٠دا(١) مەرکەز ناحیەو(١)گوند.
*لەساڵی١٩٨١دا(١)مەرکەز ناحیە.
*لە ساڵی ١٩٨٢دا(٤)گوند.
*لەساڵی١٩٨٣دا(١٥)گوند.
*لەساڵی١٩٨٥دا(١٣٥)گوند.
*لەساڵی ١٩٨٦دا (٥٨)گوند.
ئەوگوندانەی بەر ڕاگواستن کەوتوون هەموو دانیشتوانەکەی پەرش و بلاْون، کە بەشێکی زۆری دانیشتووانی ئەم گوندو ناوچانە لە هۆزی شێخ بزێنی بوون، کە هەندێك لەو گوندانە زیاتر لەجارێك کاولکراون.

***پوختەی ڕاگواستن**

١-مەسەلەی ڕاگواستنی شارو گوندو لادێکانی کوردستان لەبەرنامەی سیاسی ڕژێم مەسەلەیەکی بنەرەتی پێك دەهێنێ کە: هەڵکەندنی کوردە لەسەرخاك و نیشتمانەکەی و دەربەدەرکردن و پەرەوازە کردنی، بە مەبەستی نەهێشتنی((مەترسی کورد))لەسەر پاشەڕۆژی عێراق . ڕاگواستنی کورد گەلێ ناوچەی جیاجیای گرتۆتەوە:
-هەموو ئەوناوچانەی بەتەوەرەی ستراتیجی دادەنرێت بۆپارێزگاری کردنیعێراق لەمەترسییەکانی دەرەوە: ئێران،تورکیا،سوریا،کەبۆتە هۆی ڕاگواستن و کۆچ پێکردنی کورد لە هەموو قەزاکانی: خانەقین، مەندەلی، بەدرە، شنگار، تەلەعفەر، سمێل، بەشێکی زاخۆ. هەروەها هەموو ئەوناوچانەی بەتەوەرەی ستراتیجی دادەنرێن بۆپارێزگاری کردنی عێراق

لەمەترسی داهاتوی کورد کەبۆتە هۆی ڕاگواستنی بەشێك لەگوندەکانی ناحیەکانی: ئاڵتون کۆپری، قەرەهەنجیر، تازەخورماتو هەروەها قەزای شێخان و بەشێك لە قەزای تلکێف .
ژمارەی ئەوگوندانەی بەهۆی تەوەرە ستراتیجی یەکانەوە ڕاگوێزراون دەکاتە زیاتر لە٥٩٣ گوند (کەلەو بەشەدا کۆکراونەتەوە)و ژمارەی خێزانەکانی تەنها ٣٢٠ گوندیان دەکاتە:٢٢٥٢٩ خێزان.
-هەروەها هەزاران ماڵ لەشارەکانی کەرکوك وخانەقین، مەندەلی، شنگار، سمێل، شێخان ، تەلەعفەر ڕاگوێزراون و بەشارو ناوچەکانی تری عێراق و کوردستان دا پەرش و بلاو کرانەوە.
-زۆربەی ناوچەنەوتاوییەکانی کوردستان بەر شالاوی ڕاگواستن کەوتوون و دانیشتوانەکەشی کۆچ پێ کراون، ئەمەش بەپلەی یەکەم پارێزگای کەرکوك(قەزاکانی دوبزو کەرکوك)و گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی و قەزای کۆیەی گرتۆتەوەو زیاتر لە ٧١ گوند(کەلەو بەشەدا کۆکراوەتەوە) ڕاگوێزراون کە ژمارەی خێزانەکانیان هی ٥٥ گوند: ٢٦٥٨ خێزانە کە زۆربەیان لەهۆزی شێخ بزێنی بوونە .
-هەمووناوچەکانی سنوور بەقەلایی ١٠- ٢٠ کم ڕاگوێزراوەو ئەمەش بەپلەی یەکەم پارێزگای سلێمانیو هەولێرو دهۆکی گرتۆتەوەو زیاتر لە ٨٧٢ گوند ڕاگوێزراوە کە ژمارەی خێزانەکانی زیاتر لە : ٣٠٨١٤ خێزانە. بە شێکی زۆری شێخ بزێنی بوونە .
-زیاترلە٣٢ شارو ئۆردوگاو گوند بەهۆی جۆراوجۆرەوە ڕاگوێزراون کە ژمارەی خێزانەکانیان:١٣٣٣ خێزانە. بە جۆرە لەم لێکۆلینەوەیەدا ١٨٩٥ گوندوشار بەر ڕاگواستن کەوتون کە ژمارەی خێزانەکانی ١٤٧٦ گوندیان دەکاتە ٨٤٨٧٧ خێزان، بە شێکی زۆریان لەهۆزی شێخ بزێنی بوونە .
٢-هەروەها بەسەدان گوند لەژێرزەبری تۆپ و بۆمباراندا چۆڵ کراون، کە بەشێکی زۆر لەو ناوچانە دانیشتووانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە.
٣-زیاتر لە ٣٦٦٨٤کم[٢] لەخاکی کوردستان بەرشالاوی دڕندانەی(تەرحیل و تەهجیر) کەوتووەکە ٤٢,٦٦٪ی خاکی کوردستانی عێراق پێك دێنێ کە زۆربەی زۆری لە هۆزی شێخ بزێنییە .
٤-ڕاگواستنی گوندو لادێکانی کوردستانبوە هۆی لاوازکردنی باری ئابووری لەکوردستانی عێراقدا چونکە بوە هۆی سوتاندنی سەدان هەزار ڕەزو باخ و ملیۆنان سەرمەڕوبزن و ڕەشەولاخ و وولاخەبەرزە(سامانی ئاژەڵی)و هەزاران پورە هەنگ لەبەین بران. دانیشتوانی ئەو گوندو

ناوچانەشی لە هێزێکی بەرهەمهێنەوە کردە هێزێکی بەرخۆر، کە هەموو ئەمانە کاریگەری زۆری لەسەر تاکی کورد هەبوو بە تایبەتی رۆڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی، کە پشکی شێری ئەم وێرانکارییە بەر رۆڵە قارەمانەکانی هۆزی شێخ بزێنی کەوت، کە تاکو ئێستاش کاریگەرییەکانی ئەم کاولکارییە لەسەر رۆڵە نەبەردەکانی ئەم هۆزە قارەمانە هەر ماوە .

-ئاماری ئەوناوچانەی بەهۆی تەوەرە ستراتیجییەکانەوە ڕاگوێزراون، بەتایبەتی ئەم گوندو ناوچانەی هۆزی شێخ بزێنی تێیدا بەر ئەو شاڵاوە کەوتن ئەمانەن:

یەکەم: تەوەرەکانی دەرەوە

١-پارێزگای دیالە

ا-قەزای خانەقین- *ناحیەی مەیدان(مەرکەزەکەی :مەیدان)

| ژمارە | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | خورخوری خواروو | ٢٥ |
| ٢ | خورخوری سەروو | ٥٥ |
| ٣ | تازە دێ ی حاجیلەر | ٣٠ |
| ٤ | دێی کوێخارەحیم | ٢٥ |
| ٥ | حەسار | ٢٠ |
| ٦ | سارتك | ٤٠ |

***ناحیەی مەرکەز:**

| ژمارە | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | گومە زەرد | ٦٠ |

دووەم: تەوەرەکانی ناوەوە:

١-پاریزگای نەینەوا

ا-قەزای شێخان(مەرکەزەکەی: عەین سفنی)/ ناحیەی مەرکەز:

| ژمارە | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | پیران شێخان | ١٥ |
| ٢ | شێخکا شەرەفا | ٣٥ |

٢-پارێزگای کەرکوك

ا-قەزای دوبز/ ناحیەی ئاڵتون کۆپری(مەرکەزەکەی:پردێ)

| ژمارە | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | قەرغەتو | ٦٥ |
| ٢ | یارمجە | ٨٥ |

*ناحیەی سەر گەڕان:

| ژمارە | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | سێکانی | ٦٠ |

ئاماری ناوچە نەوتاوییەکانی ڕاگوێزراوەکان

١-پارێزگای کەرکوك/ قەزای کەرکوك/ ناحیەی یایچی(مەرکەزەکەی: یایچی)

| ژمارە | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | تۆپزاوە | ٦٠ |

ب-قەزای دوبز/ ناحیەی مەرکەز

| ژمارە | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | سێکانیان | ٥٠ |
| ٢ | قەرەدەرە | ١٠٠ |
| ٣ | قوشقایە | ١٠٠ |
| ٤ | هەنجیرەی بچووك | ٣٠ |
| ٥ | شۆراو | ١٠٠ |
| ٦ | تەقتەق | ٦٠ |
| ٧ | چەخماخە | ٦٠ |
| ٨ | شیرناو | ٤٥ |
| ٩ | سمایلاوا | ٨ |

*ناحیەی سەرگەران (کراوەتە قودس) :

| ژمارە | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | شناغە | ٨٠ |

| | | |
|---|---|---|
| ٢ | مەلحەوالی | ١٠٠ |
| ٣ | پەلکانە | ١٠٠ |
| ٤ | دەرماناو | ٣٠ |
| ٥ | سێ قوچان | ٣٠ |

٢-پارێزگای هەولێر/قەزای کۆیە / ناحیەی تەقتەق(مەرکەزەکەی: تەقتەق)

| ژمارە | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | ئێلینجاخ | ١٣٥ |

ناحیەی شۆڕش (مەرکەزەکەی :دیگەڵە)

| ژ | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | سماقە | ٥٥ |

ئاماری ناوچەی سنوریە ڕاگوێزراوەکان

قەزای دوکان / ناحیەی مەرگە (مەرکەزەکەی : بنگرد)

| ژ | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | خورخوڕ | ٢٣٥ |
| ٢ | گۆمەزەرد | ٥٤ |

*ناحیەی تیلەکۆ (مەرکەزەکەی : تیلەکۆ)

| ژ | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | گۆمەزەرد | ١٦ |

ناحیەی ئاغجەلەر:

| ژ | ناوی گوند | ژمارەی ماڵ |
|---|---|---|
| ١ | گۆپتەپە | ٢٣٠ |
| ٢ | هەیدەر بەگ | ٨٥ |
| ٣ | عەسکەر | ١٢٤ |
| ٤ | قشلاغ | ٦٠ |

پارێزگای هەولێر /ناحیەی قوشتەپە :

| ژمارەی ماڵ | ناوی گوند | ژ |
|---|---|---|
| ١١٥ | قەشقە | ١ |

*ناحیەی تەقتەق :

| ژمارەی ماڵ | ناوی گوند | ژ |
|---|---|---|
| ٧٥٠ | سێ گردکان | ١ |

پارێزگای کەرکوك / ناحیەی شوان (مەرکەزەکەی ڕێدار)

| ژمارەی ماڵ | ناوی گوند | ژ |
|---|---|---|
| ٥٠ | پەلکانە | ١ |
| ٣٥ | کانی ڕەش | ٢ |
| ٥٠ | شەوگێر | ٣ |
| ٦٠ | قولکی | ٤ |
| ١٩ | کاولە سوار | ٥ |
| ٧٠ | عەلی بەیان | ٦ |
| ٥٠ | دوبزنی | ٧ |
| ٤٥ | قزلقایە | ٨ |

قەزای دوبز/ ناحیەی ئالتون کۆپری (مەرکەزەکەی : پردێ)

| ژمارەی ماڵ | ناوی گوند | ژ |
|---|---|---|
| ٨٠ | قەرەسالی سەروو | ١ |
| ٣٠ | قەرەسالی خواروو | ٢ |
| ١٢٠ | حەساری گەورە | ٣ |

ئاماری ئەو ناوچانەی بەهۆی ترەوە ڕاگوێزراون
- ئەو ناوچانەی بەهۆی ڕاپەرینی خەڵکەوە ڕاگوێزراون.
- پارێزگای سلێمانی / قەزای دوکان / ناحیەی بنگرد

| ژمارەی ماڵ | ناوی گوند | ژ |
|---|---|---|
| ٢٥٠ | بنگرد | ١ |
| ١٣٥ | هەنجیرە | ٢ |
| ٥٠٠ | ئۆردوگای بنگرد | ٣ |

پاریزگای دهوك/ قەزای سێمێل/ناحیەی سلێڤانی (مەرکەزەکەی :جاران:ئاسەهێ،ئێستا، باتێل)

| ژمارەی ماڵ | ناوی گوند | ژ |
|---|---|---|
| ٣٠ | کێلە سپی | ١ |

قەزای زاخۆ/ناحیەی کولی (مەرکەزەکەی :باتیفە)[١]

| ژمارەی ماڵ | ناوی گوند | ژ |
|---|---|---|
| ١٠ | یەك ماڵە | ١ |

**کۆچکردنی کوردەکان بۆ خوراسان:**

لەدەورانی سەفەوییەکانی فەرمانڕەوای شا ئیسماعیل و شا تەهماسب و شاعەباس بۆ خوراسان کۆچ کراون کۆچی گەورەی کورد بۆ خوراسان لەساڵی ١٠٠٣ی مانگی لەناوچەی خوارەوەی رامین بەرەو خوراسان دەستی پێکرد، شا عەباس کوردی بۆ ڕۆژهەلاتی تاران هێناو بو تا بەرهەڵستی بکەن لەهێرشی ئوزبەگەکان .ئەم کۆچ پێکردنە لە ساڵی ١٠٠٧-١٠١٠ی مانگی درێژەی کێشا . کوردەکان لەناوچەکانی سنووری بەتایبەتی لە ((درون))یان

[١]- ئەمین قادر مینە، تەرحیل تەعریب تتبعیث، لە بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، چاپی دووەم، ١٩٩٩، سلێمانی، ل ١٤١ .

((درونگر)) یاخود ((دەرگەزی ئێستا)) شوێنی خۆیان دامەزراند، دوای ئەوە کوردەکان یەکەم شاری خۆیان بەناوی ((شێروان)) دامەزراند و لە کەناری شارۆچکەی خەبوشان پێگەی شەڕی خۆیان دروست کرد کەبە گەڕەکی کوردان ناسرابوو ، وەئێستا بە(( قوچان)) ناوبانگی دەرکردووە، لە کۆتایی فەرمانڕەوای سەفەوییەکاندا دوڵی خانی کوردی شادلو، شاری ((بجنورد))ی دروست کرد کەئێستا شارێکی گرنگی خوراسانە،لەنێوان ئاواییە ناوەندەکانی کوردەکانی میلانلو کە ئێستا بە ((ئەسفەراین)) ناسراوە، تاوەکو ئێستاش کوردی تێدا دەژی.

وەلەکۆتایی دەورانی اجاریدا شاری سەر سنوور ((باژگیران یان باجگیران ))یان دروست کردو ((چناران)) بووە مەڵبەندی فەرمانداری کوردەکانی ((زەعفەرانلو)) کەئێستا شارێکی خنجیلانەی سەر بە پارێزگای مەشهەدە، هەروەها شاری دەرگەزیان دروست کرد ،ئەم کۆچ کردنەش لەکوردەکانی کوردستانی ئێرانەوە بۆ خوراسان بوو بەناوی ((ایل چمشگزك)) بەگوێرەی بەڵگە مێژوویەکان نزیکەی ٤٥هەزار خێزانی کورد بەرەو خوراسان کە ئەکاتە ٢٢٥٠٠٠کەس.

وەلەفەرمانڕەوایی نادر شادا دووبارە نزیکەی دووهەزار خێزانی کوردی بەرەو عومەرانلو بۆ ناوچەی ((گیلا)) گواستەوە ، تاببنە بەربەستێك بۆهاتنی رووسەکان ، نزیکەی ٦٠ گوندی کورد نشین ، هەمووشیان بەزمانی کوردی شێوەی کرمانجی سەروو ، قسە دەکەن و گۆڕانکاریان بەسەردا نەهاتووە ، هەروەها نادر شا ٤٥٠٠ماڵی کوردی لەئەفشار ناوچەی ئازربایجانی ئورمێ وە گواستەوە بۆ خوراسان وە لەناوچەی ئابیوەرد و دەرەجز جێ نشینی کردن ، پاش ئەوەی کە ناوچەی ئەرزروم و بەلباس کەوتە ژێر دەستی لەوانەش ٣ هەزار ماڵی لەو تایفانە کۆچ کرد بەرەو خوراسان و لەناوچەی خەبوشان ئالی ئالاداغ جێ نشینی کردن، لە خوراسان یەك میلیون کورد هەیە وە١٦٠٠ گوندی کورد نشین هەیە و لەشارەکانی بجنورد، جاجرم، سەبزەوار، نەیشاپور، شیروان، قوچان، مەشهەد، دەرگەز، لەوانەش ٥هەزار خێزان تاوەکو ئێستاش هەر بەشێوە ی کۆچەری و چادر نشین ئەژین، ئەمڕۆ گەورەترین مەڵبەندی کۆبوونەوەی کورد لەخوراسان شاری مەشهەدە.

زۆر لەمێژوو نووسان ئەڵێن کورد لە خوراساندا لە هاتنی عارەبەوە بۆ سەر ئێران دەست پێدەکات واتا لە دەوروبەری ساڵی ٣٠ك دا. هەرچەندە کۆچکردنی زۆر و فراوان لە فەرمانڕەوای شاعەباسدا بووە.

خەبووشان یەکەم شاری ئوستانی ماد بووە. دانیشتوانی قوچان کورد و تاجیکن، تێکڕاهەموو شیعە مەزهەبن . دیسان ئەم مێژووە لەگەڵ مێژووە کۆچ کردنی کوردەکان لەکاتی فەرمانڕەوای شا عەباسدا دوو سەد ساڵ لەپێشترە .

دیسان لەپەرتوکی ((منم تەیمور جهانگشا، کۆکردنەوەی مارسل بریون لەلاپەڕە ٦٣تەیمور دەڵێت: من کاتێ گەیشتمە(( قوچان)) خەڵکێکم بینی بەزمانێ قسەیان دەکرد نەفارسی ونە عەرەبی بوو لێم ڕوون بووەوو کە ئەوانە کوردن و لەکوردستانەوە کۆچیان پێکردوون ولە قوچان نیشتەجێ بوون. چونکە پیاوانی کورد لێهاتوو بوون ،چەند کەسێکم داواکرد و لەگەڵیاندا دانیشتم و پێم ووتن ئایا ئارەزوو دەکەن بێنەوە ناو سوپای منەوە و ببنە سەرباز ، لێیان پرسیم تۆکێیت ووتم من تەیمورم سوڵتانی (ماوراء النهر)، کوردەکان ووتیان ئێمە نامانەوێت لە خزم و کەس و کارمان دورکەوینەوە و پێویستیمان بە سەربازی نیە ، خاوەنی مەڕومالاتین و ژیانی خۆمان باش دامەزراندووە .ئەم دیتنەی تەیمور لەنگ لەساڵی ٧٧٨کۆچیدا بووە، دیسان ئەمەش نموونەیەکی مێژووییە کە کوردەکان لەخوراساندا هەبووە، پێش شاعەباس کۆچیان پێکردوون لەکوردستانەوە بۆ خوراسان.

**ڕاگوێزانی کورد لەکوردستانی تورکیا:**

سوڵتان مرادی چوارەمی عوسمانی لە ساڵی ١٦٣٩زاینی تیرەی باجەلانی لەدیاربەکرەوە گوێزاوەتەوە بۆ رۆژئاوای زەهاو ،دەورووبەری خانەقین و کەلورەکانی لەوێ دەرکردووە. ئێستاش تیرەی باجەلان لەدەوری خانەقینن.

کوردەکان لەکوردستانی تورکیا ،لەشەری یەکەمی جیهاندا تورکەکان بەهەموو تواناىانەوە کەوتنە کوشتن و سوتاندنی دێهات و ڕاگوێزان، سوپای تورکیا کەخۆی لەبەردەم سوپای رووسیادا پێ ڕانەگیرا بەشکاوی کشایەوە دواوە، کەوتە ڕەشبگیری لەناوخەڵکی بێتاوانی کوردستاندا، داخی شکانی خۆیان بەوان ڕشت ، لەم بارەیەوە عبدالعزیز یامولکی نوسیویەتی، سوپای تورکیا کە بەشکاوی ناچار بوو ئەرزروم بەجێبهێڵێ و بکشێتە دواوە هەڵی کوتایە سەر کوردەکان بەماڵ و مندالەوە بەرەو ئەنادوڵ ڕایان گوێزان و پۆل پۆل هەموویانی پێش خۆدان ، کوردەکانیش لەبەر بێ چەکی بەرەنگاریان پێنەکرا. کاربەدەستانی تورکیا بۆ راگواستن و نیشتەجێ کردنی زۆرداەکی کورد ، فەرمانی نهێنی و تایبەتیان دەرکرد .

ئەمانە هەمووی بەلایەك لە ١٩٨٨/٣/٢٢ دا دەستکرا بەهێرش کردن بۆناوچەکانی بازیان و قەرەداغ و گەرمیان، پاش مانگێك هەرچی دانیشتوانی گەرمیان بوون گیران، لەگەڵ هەندێکی ناوچەی قەرەداغ و بازیاندا، تا ئێستاش بێ سەرو شوێنن، زۆریان لەوانە لەبرساندا مردوون، کچ و کوری تازە پێگەیشتوو فرۆشراون، گەنجەکانیان کوژراون و پیرەژن و پیرە پیاویش مردوون و کوشتوونیان، هەرچی بوو هەمووی تالآن کرا، لەو هێرشانەدا ١٨٢ هەزارکەس شەهیدکراون لەکاتی ئەنفالەکاندا ، هەرچی دێهات بوو ڕووخێنراو سوتێنرا. دوای هێرش بۆبازیان و قەرەداغ و گەرمیان، هێرشیان کردە سەر ناوچەی ئاغجەلەر بەتایبەتی گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی، پاشان ناوچەی کۆیە ، ناوچەی شەقلاوەو ، ڕەواندوز، هەموو ناوچەی بادینان وای لێکرا، خەڵکێکی زۆر ئاژەڵ و ڕەشەولاخ و ناوماڵیان بەجێهێشتووەو بەسکی ڕووتی و برسێتی و هیلاکی خۆیان گەیاندە ناو سنووری ئێران و تورکیا، ئەوانەی تورکیاکە بەشێکیان لە هۆزی شێخ بزێنی بوون لە زستاندا لەژێرچادر دا دەژیان، ژیانیان زۆر تاڵ بوو هەر هەفتەی دەها منداڵیان ئەمردن بەهۆی سەرماو بێ دەرامەتیەوە. بەڵێ هەموو دێهات و شارۆچکەکانی کوردستانی باشور نەما، باغ و باغات هەمووی وشك بوو، تەنانەت گۆڕستانەکانیشیان تەخت و بێ شوێنەوار کرد لەکۆتایی سەدەی بیستەمدا بێگومانە هیچ ڕەوشتێکی مرۆڤایەتی،بەو پەڕی دڕندەیەتیەوە کەوتۆتە گیانی گەلی کورد، بەمەبەستی تواندنەوەی و سڕینەوەی لەسەر نەخشە. ئەمەبوو کردەوەی داگیرکەران کەکوردێکی یەکجار زۆر ڕاگواستن وکۆچکردنی لەماڵ و حاڵی خۆی بە سەر هات ئەوانەی پێشتر بەو نیازە هەوڵیاندا هەر بەو مەبەستە وەك ئەکەدیەکان و بابلیەکان و ئاشوریەکان رووخان و لەناوچوون و مێژووش تا ئیستا باسی کردەوەی دڕندانەی ئەوانە ئەکات. سەیرێکی مێژووی کۆن و دوژمنایەتی ئەو لایەنە بەرامبەر نەتەوەی کورد. بۆ شوێنێکی دوور گوازراوەتەوە[1]، بەتایبەتیش لەنێو هۆزی شێخ بزێنی کەخەڵکێکی زۆر لە هۆزی شێخ بزێنی کەوتە بەرشالآوی ڕاگواستن و کۆچکردنی دوژمنان کەتاکو ئێستاش کاریگەری ئەم ڕاگواستنە لەسەر تاکی شێخ بزێنی هەرماوە ، بۆیە لەپاش بارزانیەکان هۆزی شێخ بزێنی دووەم هۆزە کە وێرانکاری بەسەر دا هاتبێت ئەویش چ لە ئەنفال و ڕاگواستن و کۆچکردن و وێرانکردنی ماڵ و حاڵیان .

---

[1] - عبدللا قەرەدانی(مەلاعەلی) ، ڕاگوێزانی کورد لەمێژوودا، لەبلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بەخشی سەردەم ، سلێمانی، ٢٠٠٤، چاپی دووەم ، ل ٣٩.

## ئەنفالکردنی ڕۆڵەکانی هۆزی شێخ بزێنی

### قۆناغی چوارەمی پرۆسەی ئەنفال

دۆڵی زێی بچووك لە (٣-٨ ) /١٩٨٨/٥.

پرۆسەی ئەنفالی چوار، دوای کۆتایی هاتنی ئەنفالی گەرمیان دەستی پێکرد، ڕژێم بۆ درێژەدان بە کارەکەی لەو پەری بەهێزیدابوو لەڕووی هێزی ئاسمانی و زەمینیەوە، بۆیە ناوچەی دۆڵی زێی بچووکی هەڵبژاردبوو بۆ ئەنفالی چوار، چونکە ناوچەیەکی جوگرافیای زۆر گرنگ بوو بەتایبەت شوێنێکی گرنگی (پێشمەرگە )بووە[1] . لەو بەهارەدا خەڵکی کەناری زێی بچووك خەریکی کشتوکاڵ کردن بوون، بەتایبەت خەڵکی لادێکان بە ئاژەڵداریەوە خەریك بوون ، ڕژێم خەڵکی ئەو ناوچەیەی دایە بەر هێرشی سەربازی و ئەنفال کردن و ڕاگوێزانیان بۆ ئۆردوگان، وەکو پیشەی هەمیشەیی هەستا بە کیمیا باران کردنی گوندی (گۆپتەپە) ی کەناری زێی بچووك کە ژمارەی (٣٠٠) ماڵ بوون ، لەم کیمیا بارانەدا نزیکەی (٣٠٠) کەس لە ژن و منداڵ و خەڵکی بێتاوان شەهید بوون[2]، سەرلە بەیانی ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٣ هێزی پیادەی ڕژێم لە هەموو لایەکەوە دەستی بە هێرشکردن کرد بۆ سەر (ئاغجەلەر و چەمچەماڵ، دەشتی کۆیە، تەق تەق و دەوروبەری ناوچەی شوان و شێخ بزێنی ) کە ئەو کات هێزەکانی پێشمەرگە لەم ناوچانە بوون، دوای تەواو بوونی ئەنفالی چوار کە تەق تەق و دەوروبەری زۆرترین زیانیان بەرکەوت، خەڵکەکەی بەرەو شوێنە نادیارەکان بران، لەم شاڵاوەدا زیاتر لە ١٣٨ گوند وێران کران نزیکەی (١٠٠٠٠) کەس بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن، کە بەشی هەرە زۆری لە هۆزی شێخ بزێنی بوو، ڕژێم ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٨ کۆتایی ئەنفالی چواری ڕاگەیاند .

---

[1] - یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٠ .

[2] - میدڵ ئیست ووچ، جینۆساید لە عیراقدا پەلاماری ئەنفال بۆسەر کورد، وەرگێرانی: سیامند مفتی زادە، سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٣٨.

## جوگرافیای شاڵاوەکانی ئەنفال لە دۆڵی زێی بچووك

لەگەڵ گزنگی هەتاوی رۆژی ۱۹۸۸/۵/۳ ، پرۆسەی ئەنفالی دۆڵی زێی بچووك دەستی پێکرد، هێزە سەربازیەکانی رژێم کەبۆ ئەم پرۆسەیە تەرخان کرابوو[1]، شاڵاوی دڕندانەی ئەنفالی چوار سەرەتا بە کیمیاباران کردنی گوندەکانی (گۆپتەپەو عەسکەر) لە ئێوارەی ۱۹۸۸/۵/۳ دەستی پێکرد کە زیاتر لە (۳۰۰) کەس شەهید بوون لە خەڵکی سڤیل و ژن و مناڵ کە بەشێك لەو خەڵکە لە هۆزی شێخ بزێنی بوون. دواتر لە رۆژی ٤ مایسی ۱۹۸۸ لە (۲۰) قۆڵەوە هێرشی سوپا دەستی پێکرد بۆسەر ناوچەی دۆڵی زێی بچووك گوندەکانی سەر بە (ئاغجەلەر، چەمچەماڵ، تەکیە، دووکان، دەشتی کۆیە، دێگەڵە، تەق تەق، ڕێدار شوان و شێخ بزێنی، پردێ) کەتەواوی گوندەکانی سەربەم ناوچانە خاپورکران لەگەڵ زەوی تەخت کران[2].

هێرشەکانی قۆناغی ئەنفالی چوار بە چەند قۆڵێکی جیا بەم شێوەی لای خوارەوە دابەش کرابوو.

قۆڵی یەکەم / لە سلێمانیەوە بەرەو گوندەکانی : خەرابە، چەمی ڕێزان، کەڵەشێرە، گۆپتەپە، عەسکەر، گەورەدێ، کەلکەسماق و کلسە.

قۆڵی دووەم/ لە شارۆچکەی تەق تەق و سەربازگەی قەڵاتەوە هێزەکانی رژێم بەم شێوە هێرشیان کرد:

یەك / لە تەق تەقەوە بەرەو گوندەکانی : ئەسکەندەربەگی، جەلەمۆرد، دار ئەختیار، شێخان، گرد خەبەر، گەڵناغاج، قەرەناو، قەسرۆك، مامەلێسی، کە هەموو ئەمانە ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی یە.

دوو / لە چۆم حەیدەرەوە بەرەو گوندەکانی : خەرابە، کانی ڕەش، گۆمەشین، قزلۆو، موخەڕەس، مەلازیاد، کە بەشێك لەو گوندانە ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی یە.

سێ/ لە گەرمکەوە بەرەو گوندەکانی: کانی لەلە، ئۆمەرگومبەت، سێگردکان، سێکانی، ئاوماڵ، سارتك، شەیتان، قەمبەر، کە گشتیان ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی یە.

[1] - جمعە کانی لەلەیی: ئەنفال نەوەیك بۆ لەناوبردن ، کوردستانی نوێ، ژمارە: ٥٧٦٩ ، ٢٠١٢/٥/٤، ل ٨.

[2] - ئەبوبەکر محمد حاجی (مەلاشاخی)، ئەنفالی خاڵ خالان ، چ۱، چاپخانەی داناز، سلێمانی، ۲۰۰۱، ل١٥.

چوار/ لەکانی ڕەشەوە بەرەو گوندەکانی : دەرماناو، عەمدۆن، مەرزیخە .
قۆڵی سێ یەم / لە سمایل بەگی سەر بە شارۆچکەی شوانەوە بەرەو گوندەکانی: تەپەکوڕە، تەوەکەل، پەلکانە، حەسەن قەپاغ، خدرشیرین، شەوگێڕ، کارێزە، کاولەسوار، مام ڕەش، مۆرد خواردە، قەرەسالم.
قۆڵی چوارەم/ پەلاماری ئەم قۆڵە بەم شێوەیەبوو:
یەك/ لەگوڵم کەوەی ئاغجەلەر هەروەها لە چەمچەماڵەوە بەرەو گوندەکانی : تلیان، تیژە، دەلۆ، کلاو قوت، مام ڕەش، مەشخەلان .
دوو/ لە تەکیەوە بەرەو گوندەکانی : دالاوە، شێخ پاڵەوان، عەسکەر، گۆپتەپە، هەیدەربەگ[1] .
قۆڵی پێنجەم/ پەلاماری ئەم قۆڵە بەم شێوەیەبوو:
یەك/ لەسەربازگەی تۆپزاوای سەر بەشاری کۆیەوە بەرەو گوندەکانی : پێبازۆك، حاجی قەلا، کانیکوردە، قەسرۆك و قوڕەبەرازە.
دوو/ لە بانی تاڵەبانەوە بەرەو گوندەکانی : باغەجنێر، تەکەڵتوو، پەلکانە، شێوەجانی، کونە گورگ.
سێ/ لەبانی تاڵەبانەوە بەرەو گوندەکانی : مەرزان، ئیلنجاغ، شیواشۆك، داریەسەرو گوندەکانی دەوروبەری .
چوار/ هێزێکی تریشیان بەرەو دۆڵی سماقوڵی بەرێکەوت، بەڵام لەبەر بەرگری هێزی پێشمەرگە بۆ ماوەیەك وەستان[2] .
لە ئەنجامی ئەم شاڵاوەدا زیاتر لە (١٠٠٠٠) کەس خە ڵکی سڤیل وبێتاوان لە ژن و منال و پیاو لەلایەن هێزەکانی ڕژێم بەرەو گۆڕە بەکۆمەڵەکان بران لەلایەن تیمەکانی گولەباران کردنەوە کوژران[3]، کەبەشی هەرە زۆری ئەم بەرکەوتووانە لە هۆزی شێخ بزێنی بوون .

---

[1] - ڕەهبەر سید برایم، ئەنفالی چوار لە ڕۆژ ژمێری بیرەوەری پێشمەرگایەتیمدا ، یادنامەیەکی کوردستانی نوێ ، ژمارە: ٥٧٦٩ ، ل٢.

[2] - دەرسیم دیبەگەیی، ئینسکلۆپیدیای تاوانبارانی ئەنفال و کوردۆسایدکردنی گەلی باشوری کوردستان، چ١، هەولێر، ٢٠١١، ل٤٨- ٤٩.

[3] - شۆرش حاجی ڕسول ، ئەنفالی کوردو دەولەتی عێراق، چ٢، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٣ ، ل ١٠٧.

سەرئەنجام ڕژێم لە ڕۆژی ٨/٥/ ١٩٨٨ کۆتایی بەشالاّوی ئەنفالی چوار هێنا، کەدەشتی کۆیەو تەق تەق و گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی و دەوروبەری ئامانجی سەرەکی بوو، گەورەترین زیانی بەرکەوت، بەدەست گرتن بەسەر ناوچەکانی ئەمبەرو ئەوبەری کەناری زێی بچووك کەزۆربەیان گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی یە[1].

ئەوەی شایەنی باسە بۆ ئێوارەکەی ڕۆژی ٤ مایسی ١٩٨٨ دۆڵی چەمی ڕێزان بەتەواوەتی کپ و بێدەنگ بوو، بەتەواوەتی لەلایەن سوپای ڕژێمەوە کۆنترۆڵ کراو تەواوی خەڵکەکەی بەرشالاّوی ئەنفال کەوتن بەسواری ئیڤاو زیلەکان گوازرانەوە بارەگای سەرەکی عەمەلیاتی ئەنفال لەشاری کەرکوك، بەتەواوەتی لێواری ئەم بەرو ئەو بەری زێی بچووك وێران کرابوو، تەواوی گوندەکان سوتێنران لەگەڵ زەوی تەخت کران تەنیا ژمارەیەکی کەمی خەڵك رزگاریان بوو، نزیکەی (١٦٨٠) کەس ناونووس کران کەبێ سەرو شوێن کراون لە شەش گوندی گەورەی وەك (کلێسە ، بۆگرد، کانی بی، قزلۆ، کانی هەنجیر، گۆمەشین) تەواوی ئەم گوندانە لە شالاّوی ئەنفالی چواردا وێران کران بەپێی ئەو راپۆرتە دەست نوسەی کەلە ڕۆژی ٦ی مایسی لەلایەن فەرماندەی فەیلەقی یەکەوە دەرچووە، باس لەوە دەکات تەواوی ئەوانەی دەست بەسەر کراون ژن و منالّن، بەلاّم ئەو خەڵکەی کەوا لەباکوری زێی بچووك دەژیان هیچ ڕێگایەکیان نەبوو هەواڵی کیمیا بارانی گۆپتەپەیان پێبگات، چونکە هێزەکانی ڕژێم ئەو قەیاغەیان لەکارخست بوو کە گوند نشینان بەکاریان دەهێنا بۆ ڕاکێشانی کەڵەکەکانیان بۆ پەرینەوە لەم بەر بۆ ئەو بەر دروستیان کردبوو، بەلاّم هاتنی بەشێك لە دەربازبووانی کیمیایەکەی گۆپتەپە کە بەشێکیان کوێر بوبوون بەشێکیان لە ڕێگادا مردبوون خەڵکی باشووری زێی بچووکی لە شالاّوی ئەنفالی چوار بە ئاگا هێنایەوە، بەشێکیان هەر ئەو شەوە ڕایان کردوو گوندەکانیان چۆڵ کرد، بەلاّم بەشێکی تری دەربازبوانی گۆپتەپە لە نیوە شەودا لایان دابووە گردخەبەر، کە گوندێکی ناوچەی شێخ بزێنی بوو، خەڵکی ئێرە پێشتر هەستیان کردبوو کە دەقەومێت، بۆیە هەندێك لە پیاوەکانی ژن و منالّەکانیان ناردبوو بۆ شارۆچکەکان، خۆشیان پەنایان بردبووە بەر ئەشکەوتەکان و دۆڵ و عەردەکانی چیاکانی دەوروپشتیان .

[1] - یادگار عبدالله، ئەنفالی چوار ڕەهەندەسیاسیەکانی، یادنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە : ٥٧٦٩، لە٤/٥/٢٠١٢، ل٤.

بەم چەشنە ئەو بەیانیە بەرەو گوندی قامیشە ڕێگایان گرتەبەر، چونکە دەیانزانی کەسوپای ڕژێم لەوێیەو لەوە دەترسان نەوەك ئەمانیش کیمیایان بەسەرابکرێت خەڵکەکە بە (نۆ) عارەبانەی تراکتۆر دەرچون و نزیکەی دوو کاتژمێری خایاند تا گەیشتنە گوندی قامیشە، لەوە دەچێت سوپای ڕژێم بەتاکتیك گوندی قامیشەی دیاری کردبێت کەهەمان ڕۆڵی گوندەکانی وەك ملە سورەو ئەلیاوای گەرمیان ببینێت وەك سەنتەرێکی کۆکردنەوەی ئەنفالی چوار .

شایانی باسە پێدەچێت هێزەکانی سوپا هەندێك نیجرائاتی جیاوازی پەیرەو کردبێت لە پەلاماردانی گوندی جەلە مۆردا، کە گوندێکی تری ناوچەی شێخ بزێنی بوو بەدووری ماوەی چەند میلێك دەکەوتە خوار گردخەبەرەوە، سوپای ڕژێم لە ٦ی مایس گەیشتنە گوندی جەلەمۆرد، بەڵام زوتر خەڵکەکە دەنگوباسی کیمیا باران کردنی گۆپتەپەیان پێگەیشت لەلایەن خەڵکە دەربازبووەکان تەواوی خەڵکی گوندەکە هەڵ هاتن بۆشاخەکان لەگەڵ هەزاران لە خەلکی ئاوارەی گوندەکانی تر لە ناو ئەشکەوت و ژێر دارەکان خۆیان حەشاردابوو، هەر لەو شوێنەدا ژن و پیاو منالّیان لێك جیا کردەوە لێرەش وەك گوندی قامیشە ئالّتون و پارەو ناسنامەکانیان لە خەڵکەکە سەند، پاشان هێنایانیان بۆناو گوندەکە بۆئەوەی ئەو دیمەنە تراژیدیایە ببینن کەوا گوندەکەیان دەسوتێت و خانووەکانیان بەر شۆفڵ دراوە ماڵ و سامانیشیان دەسوتێت و سێ چوار زیلی سەربازیش ڕاوەستاوە وا تاڵان باردەکات .

بەم شێوەیەی باسمان کرد لە شاڵاوی ئەنفالی چواردا ، ڕژێم سەرجەم ناوچەکانی دەشتی کۆیەو تەق تەق و شوان و شێخ بزێنی سەروو خواروو ئاغجەلەروو سنووری خاڵ خالان و چەمی ڕێزانی وێرانکرد، بەپێی ئامارێك کە دەست ڕێکخراوی (MEW) کەوتووە، باس لە وێرانکردنی گوندەکانی ئەم سنوورانە دەکات بەم شێوەیە، لە سنووری ئاغجەلەر (٧٥) گوندو لەناوچەی شوان (ڕێدار) (٦١) گوندوو لەسنووری تەق تەق (٥٢) گوندوو لەمەرکەزی کۆیەش (٢٦) گوندو لەگەڵ (٢٣) گوندی پردێش، کەسەرجەمی هەموویان دەکاتە (٢٣٧) گوند کەبەشی هەرە زۆری لە هۆزی شێخ بزێنی بوو. سەرەرای ئەو وێرانکاریەی گوندەکان ژمارەیەکی زۆری خەڵك لەژن و منالّ و پیرو لاو شوێن بزرکران، بەپێی ئامارەکان شوێن بزرکراوانی ئەم شالاوە زیاتر لە (٢٥٠٠) کەس لەدەشتی کۆیەو دەوروبەری کەبەشێکیان لە هۆزی شێخ بزێنی بوو، زیاتر لە (٣٠٠٠) کەس لەناوچەی شوان و شێخ بزێنی و قەڵاسیوکە،

کە زۆربەیان لەهۆزی شێخ بزێنی بوو، بەلاّم ئەگەر سەرژمێری ورد بکرێت لەم ژمارەیە زیاتر ئەنفال کراوە[1].

**ئاکامەکانی ئەنفال لەڕووی ئابوورییەوە:**

لە کەژێکی بەهاردا لەکاتێکدا سروشت لە کوردستان وردەوردە بزەو جوڵەی ژیان دەهاتەوە ناو گیانی، خەڵکی خەریکی ژیانی ئاسایی ڕۆژانەی خۆیان بوون، لە وڵاتی دێرینی سەدان ساڵەی باوباپیران، بەلاّم لەم ڕۆژانەدا هەورێکی ڕەش کوشندەو سامناك باڵی بەسەر ئاسمانی هەرێمی کوردستاندا گرتەوە. ڕق و کینەی ڕژێم بەسەر ناوچەی کوردستاندا دابەزاند،لەو کاتەدا ڕژێم ناوچەکانی هەرێمی دایە بەر شالاّوی بەناو ئەنفال سەدان هەزار مرۆڤی بێتاوانی کوردی لە گۆمی خوێندا نقوم کرد[2] . دێهاتەکانی کوردستانی لە وڵاتی دایکدا وێران کرد، هەربۆیە پرۆسەی ئەنفال بەتەنیا زیانی گیانی لێنەکەوتەوە، بەڵکو زیانی ماددی و مەعنەوی زۆری لێکەوتەوە ئەو ناوچانەی بەڕوخانی ژێرخانی ئابووری کوردستان و ئیفلاس بوونی خەڵکی گوندەکان، کەبەشی هەرەزۆریان گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی بوون[3]. لەئەنجامی سووتانی ڕەزو باخەکان بەتالاّن بردنی مەڕو ماڵات و وشك کردنی کانیاوەکان چۆڵ کردنی گوندەکان، ئەمانە بوونە هۆی خراب بوونی باری ئابووری کوردستان، ئەگەر سەرنجێك بدەینە پێش ڕوودانی پرۆسەی ئەنفال بەووردی، ئەوا دەبینین خەڵکی گوندەکان بەکشتوکاڵ کردن و بەخێوکردنی ئاژەڵدارییەوە خەریك بوون بەئاشکرا دیارە ئابووری کوردستان بە پلەی یەکەم پشتی بە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بەستبوو، واتا ئابووری کوردستان لەسەر پێی خۆی وەستابوو، چونکە بەشێکی زۆری ناوچەکانی کوردستان بەتایبەتیش ناوچەی دۆڵی زێی بچووك دەشتی کۆیەو شوان و شێخ بزێنی و بەستی شەرغەو تەواوی ئەم بەرو ئەو بەری کەنار زێی بچووك، کەبەشی هەرە زۆری لە هۆزی شێخ بزێنی بوون، شوێنی گرنگی بەرووبومی کشتوکاڵی بوون، بۆیە ئەم پرۆسەی ئەنفالە ئەو سەروەت و سامانەی کەخەڵکی گوندەکان بە درێژایی ژیانی

---

[1] - یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو ، ل١٢٦.

[2] - میدڵ ئیست ووچ، جینۆساید لە عێراقدا پەلاماری ئەنفال بۆسەر کورد، و: سیامەند مفتی زادە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٥.

[3] - سالار حەمەسور باسیرە، هەڵەبجەو ئەنفال، چ١، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی ، ٢٠٠٣، ل ٤٩.

ڕۆژانەیان وەدەستیان هێنابوو لە پرۆسەی ئەنفال بەتالآن بران و ئابووری گوندەکان و گشتی هاتە سەر سفر[1].

شالآوی ئەنفال ئەوەندە گەورەبوو هێندەی نەمابوو میللەتی کورد تێدا لەناو بچێ ئەو ڕەگەزەی چیا نشینەکان کەنەتەوەیەکی زوڵم لێکراوی دەستی ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق ، بێگومان لەناوبردنی هەزاران گوندو شارو شارۆچکەو سووتاندنی سەدان پارچە زەوی دارستان و بەهەزاران سەر لە ئاژەڵ و مەڕو مالآت لەناو بران و بەتالآن بران بۆیە ئەنفال چەند زیانی گیانی لێکەوتەوە بگرە زیاتر لەوە زیانی ماددی لێکەوتەوە کە بەچەندان ملیار دۆلار مەزەندە دەکرێت ، جگە لە لەناوبردن و بەتالآن بردنی دوومليۆن سەر مەڕو مالآت بەئاژەڵی کێویشەوە[2]، شالآوی ئەنفال و کیمیاباران کردنی ناوچەکان بەتەنیا زیانی ماددی گیانی لێنەکەوتۆتەوە، بەڵکو کارەساتێکی ژینگەیی سایکۆلۆژی گەورەبوو کەبووە هۆی شێواندنی ڕواڵەتی گیانداری و ڕووەکی لەناوچەکە، بووە هۆی لەناوبردنی ڕووبەرێکی فراوانی زەوی کشتوکاڵی کەرۆڵی هەبوو لەژینگەی کوردستان بووە هۆی تاراندن و تۆقاندنی باڵندە کێویەکان وە سووتاندنی گژووگیاو سەیرانگاکان، کوێرکردنەوەی سەرچاوەی ئاوی کانیاوو بیروو کارێزەکان کە کوردستان دەوڵەمەندە بەئاوی سروشتی بەتایبەت ئاوی سەر زەوی کەرۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە برەو پێدانی ئابووری کوردستان لە دانەوێڵەو سەوزەو میوە، چونکە دۆڵی زێی بچووك تەواوی زەوییەکانی بەراوە بەهۆی کاریگەری ئاوی بەستی دووکان کەبەم ناوچەیەدا ڕێدەکات، ئەمە جگە لە سامانی ماسی کە زێی بچووك دەوڵەمەندە بەسامانی ماسی بەتایبەت بۆ گوندەکانی لێوار ئەم ڕووبارە سوودێکی ئێجگار گەورەی هەیە لەڕاوکردنی ماسی و بەخێوکردنی ئاژەڵ و پەلەوەری جۆراوجۆر لەکەنار زێی بچووك بەتایبەت دەشتی کۆیەو تەق تەق و شوان و شێخ بزێنی[3] .

---

[1] - شێخ صدیق، کاریگەری ئەنفال لەسەر دەروونی کۆمەلآیەتی پاش ماوەی ئەنفالەکان، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ:٢٤، سالی ٢٠٠٢ ، ل ٢١٨.

[2] - یوسف معروف دزەیی، تاوانی ئەنفال بەرامبەر کورد، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ: ١٩، هەولێر، بەهاری ٢٠٠١، ل٤٣ .

[3] - دێدەوان یعقوب، ئەنفالی چوارو یادکردنەوەیەکی جیا، یادنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە: ٥٧٦٩، لە ٢٠١٢/٥/٤، ل٧.

لە شاڵاوەکانی ئەنفالدا کەئەم ناوچەیە بەر شاڵاوی ئەنفالی چوار کەوت، گەورەترین و زۆرترین زیانی ماددی و گیانی بەرکەوت لەڕووی ئابوورییەوە ناوچەی دۆڵی زێی بچووك و گوندەکانی هۆزی شێخ بزێنی و دەشتی کۆیەو تەق تەق و دەوروبەری کە خاوەنی زۆرترین ژمارەی ئاژەڵ و مەڕو ماڵات بوو کە بە (٤٠٠٠) سەر مەزەندە دەکرێ، بەتاڵان بران وە زەویە کشتوکاڵیەکان سوتێنران ڕەزو باخەکان و کانیاوەکان وشك کران، بەتایبەت لەو کاتەدا کەخەڵك خەریکی شینایی کردن بوو لە زەویە کشتوکاڵیەکانی کەنار زێی بچووك بۆیە زۆربەی خەڵکەکە ئەنفال کران، چونکە شوێنی خۆ حەشاردانیان نەبوو وە رژێمیش چەمەکانی دەسوتاند بۆئەوەی خەڵك خۆی تێدا حەشار نەدات، لەو کاتەدا سەرانی رژێم ئاوی دەریاچەی دووکانیان بەردایەوە بۆئەوەی خەڵکی گوندەکانی ئەمبەرو ئەوبەری زێی بچووك هاتووچۆکردنیان لێببڕێت و زۆربەی زەویە کشتوکاڵیەکان بوون بەژێر ئاوەوە، زیانێکی زۆری بەناوچەی کەنار زێی بچووك بەتایبەتیش گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی و دەشتی کۆیەو تەق تەق و گوندەکانی دەوروبەری گەیاند، کەبە وتەی لقی کشتوکاڵی تەق تەق بە بری ١٠ ملیۆن دیناری ئەوکات مەزەندە دەکرێت[١]. بۆیە دەتوانین بڵێین ناوچەی دۆڵی زێی بچووك بەگشتی کەناوچەیەکی هۆزی شێخ بزێنی یەو دەشتی کۆیەو تەق تەق و دەوروبەری گەورەترین زیانی ماددی بەرکەوت لەڕووی ئابوریەوە بەتەواوی ئابووری ناوچەکە بەرەو خراپی ڕۆیشت سەرەڕای ڕاگوێزانی خەڵك بۆ ئۆردوگاکان و بەجێهێشتنی زەویە کشتوکاڵیەکان و ئیفلاس بوونی ئابووریان .

**ئاکامەکانی ئەنفال لەڕووی کۆمەلایەتیەوە.**

ئاشکرایە پرۆسەی ئەنفال لە بیری گشت کوردان هاوتای قڕکردن و کۆمەڵ کوژیە ، ئەنفال کۆدێکی سەربازیە بۆ ئەو زنجیرە شاڵاوە بەر فراوانەیە کە سوپای عێراق لە نێوان ٢٣ ی شوبات تا ٦ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٨ لە دژی میللەتی کورد بە ئەنجامی گەیاند ، بۆسەر ئەو

[١] - میدڵ نیست ووچ، جینۆساید لەعێراقدا پەلاماری ئەنفال بۆسەر کورد، و: محمد حمە صالح، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٦.

ناوچانەی هەرێم کەڕژێم  بە ناوچەی قەدەغەکراو سەیری دەکرد[1]. لە پاش تەواو بوونی پرۆسەی ئەنفال چەندان ئاکامی خراپی لێکەوتەوە لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتیەوە ، خەڵکی ئەو ناوچانەی کە لە ئەنفالی چواردا لە ماڵ و حاڵی خۆیان دەرپەڕێنران ئەوانەی بە پاش ماوەی ئەنفال دادەنرێن کە بەر ئەو شالاوە نەکەوتوون لە ئۆردووگا زۆرەملێیەکان کۆکرانەوە، دیارە زۆربەی ئەو ئۆردووگایانەی کە ڕژێم دروستی کردوون وەك جێگایەك بۆ نیشتەجێ کردنی پاشماوەی ئەنفال کراوەکان، هەر شوێنێك بۆ خۆی ناوێکی لێنرابوو وەك (ئۆردووگای دارەتوو، ئۆردووگای بنەسلاوە، ئۆردووگای کەورگۆسك)[2]. ئەم ئۆردووگایانە بەشێوازێکی زۆر ناشارستانیانەو ناتەندروست بنیات نرابوون کە هیچ مەرجێکی ژیانی تێدا نەبوو، لەو ئۆردووگایانە دەچووکە(هیتلەر) بۆ جولەکە دروستی کردبوون، زۆربەی خەڵکی تەق تەق و دەوروبەری کەناری زێی بچوك دانیشتوانی گوندەکانی هۆزی شێخ بزێنی گوێزرانەوە بۆ ئەم ئۆردووگایانە، گەر چاوێك بە ژیانی خەڵکی ئەم ئۆردووگایانە دابخشێنین دەیان و سەدان پرسیار دروست دەبێ لەناخی مرۆڤداو برینێکی پڕ بەسۆو قوڵ لە ناخی تاکی کورد دا بەجێ دەهێڵێ . لێرەدا چاودێریان باشتر دەکرا، چونکە هەرماڵێك هی ناوچەیەکی کوردستان بوو بۆیە خەڵك شارەزای ئەو شوێنانە نەبوو تووشی زۆر کێشەوگرفت بوون[3]. پاش ئەوەی ئەو خێزانانە خزێنرانە ئۆردووگاکانەوە هیچ کام لە پێداویستیەکان بۆ ئەم ئۆردووگایانە دابین نەکرابوو وەك خوێندنگا، ئاوی خواردنەوەو بنکەی تەندروستی ئەمانە هەمووی کێشە بوون سەرەڕای ئەوەی خەڵکی گوندەکان لەگەڵ ئەو شوێنانە ڕانەهاتبوون پێشتر لە ژینگەی تایبەت بە خۆیان بوون بۆیە لێرەدا تووشی زۆر گرفت بوون ئەویش گۆڕینی پیشەکەیان بوو لە کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بۆ کرێکاری کە ئەویش زۆر بە زەحمەت دەست دەکەوت، بێگومان ئەم گۆڕانکاریە کاریگەری سلبی هەبوو لەسەر بارودۆخی

[1] - د.جبار قادر، ئەنفال دەرهاویشتەی ڕەگەزپەرستی و توتالیتاریزم و کۆمەڵگەی داخراوە، گۆڤاری ئەنفال، ژ:٥، سلێمانی ،٢٠٠٤، ل٢٤١.

[2] - میدڵ ئیست ووچ، جینۆساید لە عێراقدا پەلاماری ئەنفال بۆسەر کورد، و: محمد صالح توفیق، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٨.

[3] - ئەیاد کەمال، تاوانی ئەنفال و پاشماوەی ئەنفال لەنێوان ژیان و سوراغێك بۆ ئاینده، گۆڤاری ئەنفال، ژ:٢، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٤.

دەروونی و کۆمەڵایەتی پاشماوەی ئەنفال بەتایبەت ژنان، چونکە بەشێکی زۆری ئەو ژنانەی کە مێردەکانیان ئەنفال کرابوو بژێوی ژیانیان بۆ خێزان ئەرکی سەر شانی ژنان بوو[1]. ئەو خێزانانە یا ئەوا دەستەو ئەژنۆ دادەنیشتن یان چاوەڕوانی مەرگ بکەن یان دەبوایە بۆ بژێوی خێزانەکانیان هەوڵیان بدایە، بەلاّم گەڕان بە دوای نان پەیدا کردن لەو کاتەدا زۆر مەترسی داربوو، چونکە خەڵك لە ژێر چاودێری رژێم دابوو، بەلاّم ئەوە چەرخی رۆژگارە واگەڕایەوە کوردی بەم مەینەتیە گەیاند، کە تا ئەمرۆش کەس و کاری ئەنفال کراوەکان ئیش و ئازاری ئەو تاوانەیان بە ڕوخسارەوە ماوە بەتایبەتیش ڕۆڵەی ئەنفالکراوی هۆزی شێخ بزێنی چونکە بەشی هەرە زۆری ئەم ئەنفال و وێرانکارییە بەر ئەم هۆزە کەوت .کەس و کاری قوربانیانی ئەنفال هەموو ئەوانەی کە لە شالاّوەکەدا ڕزگاریان بوو، دونیایەك کێشەو گرفتی سایکۆلۆژیان بۆ دروست بووە، سایکۆلۆژیەت لە ناو پاشماوەی ئەنفالەکان دەگەڕێتەوە بۆ کاردانەوەی شالاّوە دڕندانەکەی بەعس کە بۆ هەر خێزانێك دەیان کێشەی جۆراوجۆری بۆ درووست کردوون[2].

ڕەنگە لەهەر خێزانێك کێشەو گیروگرفتی جۆراوجۆر دروست بووبێ ئەویش بە هۆی ڕانەهاتنی پێشووتری لەگەڵ ژینگەی لەو جۆرە، دیارە لە دەستدانی گوندەکانیان و چۆڵ کردنی شوێنی نیشتەجێ بوونیان بەزۆر نیشتەجێ کردنیان لە ئۆردووگاکاندا سەرەڕای نەبوونی بێکاری و بژێوی ژیانیان و شوکردنەوەی ژنە ئەنفالەکان کە ئەمانە کۆمەڵێك پرسیاریان دروست کردووە لە هزری پاشماوەی ئەنفالەکان[3]. بۆیە زێدەڕۆیی نیە ئەگەر بڵێین نەخۆشیە دەرونییەکانی کەسوکاری ئەنفال کراوەکان بەرێژەی نەخۆشیە جەستەییەکان یەکسانن، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زیاد بووندایە، زۆربەی ئەو منداڵانەی کە باوکیان ئەنفالە لە خوێندن دابڕاون خەریکی

[1] - تەها سایمان، کاردانەوەی پەلاماری ئەنفال لەسەر ژنان ، گۆڤاری ئەنفال ، ژ:٣ ، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٩١.

[2] - شێخ صدیق، کاریگەری ئەنفال لەسەر لایەنی دەروونی و کۆمەڵایەتی پاشماوەی ئەنفالەکان، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ، ژ: ٢٤ ، هەولێر ٢٠٠٢، ل٢٢١.

[3] - ئەلوەند عبدالغفور حسن، ئەنفال و گرفتە دەروونەکانی ژنان، گۆڤاری ئەنفال، ژ: ٢، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٢٥_٢٦:

کارکردنن بۆ بژێوی ژیانیان[1].ئەمانەو چەندان کێشەی تر کە منالآنی ئەنفال کراو پێوەی دەنالێنن لەم رۆژگارەدا کە ٢٢ ساڵ بەسەر ئەو شالاوەدا تێدەپەرێت کەچی تاکو ئێستا حکومەتی کوردی بەرامبەر بە منالآنی ئەنفال کراو و کەس و کارەکانیشیان کەمتەرخەمە ، بۆیە وەك ئەرکی سەر شانی حکومەت لە سەرووی هەمووشیانەوە مندالآنی ئەنفال کراوی هۆزی شێخ بزێنی، چونکە ئەنفال و وێرانکاری گەورە بەر ئەو هۆزە کەوت، هەروەها ئەوان بوونە هۆی ناسینی کێشەی کورد بە جیهانی دەرەوە کە ئەمرۆی کوردستان بە خوێنی ئەو شەهیدانە هاتۆتە بەرهەم. کە حکومەت و پەرلەمان و چەندان زانکۆو پەیمانگاو خوێندنگای هاوچەرخە. ئەنفال ئەو زامەی کە هەرگیز لە جەستەی کورد دەرناچێ زامێکی قووڵە کە مرۆڤی کورد تا ئەمرۆش پێوەی دەناڵێنێ بۆتە هۆی سەرهەڵدانی سەدان لەو کێشانەی کە پێشتر باسمان کرد، بۆیە دەمەوێ باسی ئەو زامە بکەم کە لە دڵی منالآنی ئەنفال کراودا بە تایبەتیش هۆزی شێخ بزێنی کە هەمیشە ئازاریان دەدات[2].

| ١ | ژمارەی گوندە وێرانکراوەکان لە قۆناغی ئەنفالی چواردا | | |
|---|---|---|---|
| ژ | قەزا | ناحیە | ژمارەی گوند |
| ١ | ناوەندی پارێزگای کەرکوك | شوان/ کە هۆزی شێخ بزێنی زۆری لێ نیشتە جێ یە | ٦١ |
| | | پردێ/کەبەشێك لە هۆزی شێخ بزێنی لێ نیشتە جێ یە | ٢٣ |
| ٢ | چەمچەماڵ | ئاغجەلەر / کەبەشێکی زۆری هۆزی شێخ بزێنی لێ یە | ٧٥ |
| ٣ | کۆیە | سەنتەری قەزا _ ئاشتی سێگردکان/ | ٤٠ |

[1] - تەها سلێمان، کاردانەوەی پەلاماری ئەنفال لەسەر ژنان، گۆڤاری ئەنفال ، ژمارە: ٣، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٤.

[2] - ئیدریس ئۆمەرگومبەتی، ئەنفالی زێی بچووك، لێکۆلینەوەیەکی مێژوویی، سیاسی، ئابوری، کۆمەلآیەتییە، چ١، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٣.

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | کەبەشێکی زۆری هۆزی شێخ بزێنی لێ یە | |
| | | تەق تەق _قەرەناو / کە ناوچەیەکی شێخ بزێنی یە | ٧٢ |
| | | شۆڕش/ هەندێك لە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنی یە | ٢٦ |
| ٤ | دووکان | خەلەکان_ سورداش_ پیرە مەگرون | ٢٤ |
| | کۆی گشتی | | ٣٢١ |

| ٢ | ژمارەی سەرجەم ئەو کەسانەی لە قۆناغی چوارەمدا ئەنفال کران | | | |
|---|---|---|---|---|
| ژ | شوێن | نێر | مێ | ژمارەی ئەنفال کراوەکان |
| ١ | قەلاسێوکەو ئاغجەلەر/کە ناوچەیەکی شێخ بزێنی یە | ٧٦٢ | ٢٨٧ | ١٠٤٩ |
| | دۆلی سورداش_ دووکان | ١١٦ | ٢٦ | ١٣٢ |
| | شوان/کەبەشێکی زۆری دانیشتوانی لە هۆزی شێخ بزێنی یە | ٢٠٩ | ٧٦ | ٣٨٥ |
| | شێخ بزێنی سەروو | ٩٧٧ | ٦٨١ | ١٦٥٨ |
| | شێخ بزێنی خواروو | ٥٩ | ٣٣ | ٩٢ |
| | تەقتەق و دەوروبەری/ کە ناوچەیەکی شێخ بزێنی یە | ١٥٣ | ٤٦ | ١٩٩ |
| | کویەو دەوروبەری / کەبەشێکی شێخ بزێنی یە | ٤٧٨ | ١٦٤ | ٦٤٢ |
| | کۆی گشتی | ٢٨٥٤ | ١٣١٣ | ٤١٦٧ |

مەبەست لە ئەنفالی چوار کە ڕژێم بە هەزاران لە سەرباز لە ١٩٨٨/٥/٣لە ئاسمان و زەویەوە هێرشیان بردە سەر ناوچەکانی کەنار زێی بچوك هەر لە دۆڵی خەلەکان و سورداش و چەمی ڕێزان و قەڵاسێوکەو ئاغجەلەرو تەکیەو شێخ بزێنی سەروو خواروو شوان و تەق تەق و دەشتی کۆیە و ئاوەکو پردێ، ئەم پەلامارە دوایی داستانی تەکەڵتوو لە دووری (٦)کم لە خۆرهەڵاتی تەق تەقەوە، حکومەت توانی دەست بەسەر تەواوی ناوچەی زێودەر بگرێت.
لە ٧ی مایس کۆتایی بە شاڵاوەکە بهێنێت، ئەو ناوچانەی کە زۆرترین زیانیان بەرکەوت شێخ بزێنی سەروو(١٦٥٨)لە پیرو منداڵ و ژن و پیاو بێ سەرو شوێن کراون دواتر قەڵاسێوکە بە پلەی دووەم کە(١٠٤٩)کەس ئەنفال کران، ئەو ناوچانەی کە زۆرترین زیانی گیانیان بەرکەوت شێخ بزێنی سەروو بوون هەروەها (٩)گوندی باکووری خۆرئاوای تەق تەق بە هۆی بوونی نەوتەوە لە ساڵی ١٩٨٠وە ڕاگوێزرابوون، لەم ئەنفالەدا ڕژێم سودی لە ئاوی زێی بچوك وەرگرت کاتیك کوڵاو کوڵ ئاوەکەی لە دوکانەوە بەردابوۆوە، ئەو دیمەنانەی کە لەم ڕۆژگارەدا بینراوە قازو مراویەکانی قەڵاسێوکەو شێخ بزێنی سەروو و دەشتی کۆیە بوون کە پۆل پۆل خۆیان بە ئاوی زێی بچوك دادەداو خەڵکی نەفس نزم ڕاویان دەکردن[1].

## ئەنفالی گوندەکانی هۆزی شێخ بزێنی

ئەنفال سورەتێکە لە قورئانی پیرۆزدا، کە تیایدا باس لە بردنی ماڵ و سامان دەکات، کە لە ئەنجامی هێرشەکان دەبردراو بە حەلال لە قەلەم دەدرا، ئەنفال وشەیەکی عەرەبی وەرگیراوە و بەر لە هاتنی ئیسلام هەبووە، ئەنفال لە نەفییەوە هاتووە و پاشان وەك پرۆسە و شێوە پراکتیکییەکەی بوویتە ئەنفال، ئەنفال ئۆپەراسیۆنێکە دژی بێ بڕواو هاوبەش دانەرەکان بۆ خودا ئەنجام دراوە هاوکات بۆ سەردەمێك بووە، کە دەسەڵاتی ئیسلام ئەوەندە بەهێز نەبووە لە سەرەتای جێگیربوون بووە، ئەویش بۆ خۆ چەسپاندن و خۆ گرتنەوە و دەربازبوون بوو لە لەناوچوون، ئەنفال وشەیەکی عەرەبییە، بۆ چەند مانا بەکاردێت بۆ یەکەم جار ئەم زاراوەیە لە لایەن پسپۆری یاسایی پۆلۆنی ڕافایل لیمکن بەکارهێنراوە، عەرەبەکان بەر لە هاتنی ئیسلام بە مانای تالانکردنی جەنگ بەکاریان هێناوە....ئەنفال ناوی سورەتی هەشتەمینی قورئانی پیرۆزە و لە (٧٥) ئایات پێك هاتووە و لە ساڵی دووەمی کۆچی لە مانگی ڕەمەزان دابەزیوە،

[1]- ئەم بابەتە لە گۆشەی زێودەری گۆڤاری تاك، ژمارە: ١٦ نیسانی ٢٠٠٦ بلاوکراوەتەوە.

هەروەها ئەنفال لە نەفلیشەوە هاتووە کە بە سێ شەوی یەکەمی مانگ دەگوترێت[1]، ئەنفال زاراوەیەکی قورئانییە و بنەڕەتێکی عەرەبی هەیە، ئەنفال کۆی (نفل)یە، بە واتای (غنائم) دێت کۆی (غنیمە)یە، واتا ئەنفال لە ڕووی زمانەوانی زاراوەییەوە سەیر دەکرێت و لە ڕووی زاراوە وشەیەکی عەرەبییە و کۆی (نفل)ە، بە واتای (زیادە دەستکەوت) دێت، بۆیە هەرچەندە زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر وشەی ئەنفال، بەڵام دەتوانین بڵێین ئەنفال بەو ماڵ و سامان و ئاژەڵ و زەخیراتە دەوترێت کە جەنگاوەرانی موسوڵمان لە شەڕدا لە بێ باوەڕان بەدەستی دەهێنن، زۆرینەی شرۆڤەکارانی قورئانی پیرۆز هۆکاری هاتنە خوارەوەی سورەتی هەشتەم بەناوی ئەنفال دەگەڕێننەوە بۆ ساڵی دووەمی کۆچی و جەنگی بەدری گەورە کە لە نێوان موسوڵمان و بێ باوەڕان ڕوویدا، کاتێك پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) بینی موسوڵمانەکان لە جەنگ ناکۆکی کەوتۆتە نێوانیان لەسەر ئەو کەل و پەل و شتومەکانەی کە لە سوپای بێ باوەڕان جێماوە.

ئەنفال سومبولی مێژووی هاوچەرخ و بگرە دێرینی کوردە، ڕەنگدانەوەی چڕبوونەوەی مەرگی فیزیکی و لە گۆڕانی زمان و کەلتوری نەتەوەیە لە تەواوی مێژوو دا، هەروەها ئەنفال گەورەترین تاوانە لە مێژووی گەلی کورد دا بەرامبەری کرابێ لە کوردستاندا لە ساڵی (١٩٨٨)، شاڵاوێکی دڕندانەیە مەبەستی سەرەکی لەناو بردن یان کەمکردنەوەی ڕێژەی دانیشتوانی کوردە لە کوردستانی عێراقدا، ئەنفال پرۆسەیەکی نەخشە بۆ کێشراو و بەرنامە بۆ دارێژراو بوو، یەکێك بوو لە خاڵە بنەڕەتی و ستراتیژییەکانی کۆلۆنیالیزمی عێراق، بۆ لەناو بردنی کۆمەڵی نەتەوەی کورد و بڕانەوەی ڕەچەلەکی مرۆڤی کورد لە کوردستانی باشوور، بۆ شێواندنی سروشتی نیشتمانەکەی لە ڕووی جوگرافی و دیمۆگرافی و کلتوورییەوە، ئەنفال....تراژیدیا و زامێکی قوولی جەستەی کۆمەڵگای کوردییە.

لە سەرەتای فراوان بوونی دەسەڵاتی ئیسلامەوە گەلی کورد یەکێك بوو لەو گەلانەی، کە ئامێزی بۆ ئەم ئایینە پیرۆزەی ئیسلام کردەوە، گەلێ خزمەتی بێ ووچانی پێشکەش بەو ئایینە پیرۆزە کرد لەوانە قارەمانییەتی (صلاح الدینی ئەیوبی) و هەروەها سەدان بەرگ لە کتێب و شاکاری زانایانی کورد بەڵگەی ئەوەن، کە گەلی کورد خزمەتێکی بێ پایانی

[1] - ڕێبوار ڕەمەزان بارزانی، بارۆڤی لەناوبردنی بارزانییەکان، چ١، ل١٧ .

پێشکەش بە ئایینی ئیسلام کردووە، کەچی کاربەدەستانی ئەوسای عێراق بەجۆرێکی دڕندانە توانیان ڕێگە بەخۆیان بدەن کەوا ئەنفالی گەلی کورد بکەن، لەناویشیاندا هۆزی شێخ بزێنی و ئەو گوند و ناوچانەی کە تێیدا نیشتەجێ بوون، بۆیە هیچ بیریان لەوە نەکردەوە کە موسولمان نابێ موسولمان ئەنفال بکات، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ((

))[1] ، ئەم ئایەتە پیرۆزە لەکاتی شەڕی نێوان موسولمان و نەیارەکانیدا هاتە خوارەوە، کە مەبەست لەم ئایەتە ناوبژی کردنی ناکۆکەکان و هاندان و تەماح خستنە بەر شەڕکەرەکانی ئیسلام بوو دژی دوژمنانی ئیسلام، دیارە وشەی (ئەنفال)یش دەقاو دەق لە کوردیدا بە مانای (دەسکەوت) و (تالاَن) دێت، بۆیە دەبینین ڕژێمی پێشووی عێراق زۆر بە دڕندانە ئەنفالی هێنایە سەر کوردستان و زۆر شوێنی وێران کرد بەتایبەتی ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی و شوێنی نیشتەجێ بوونیان، بۆیە ئەو گوند و ناوچانەی شێخ بزێنی کە بەر شالاَوی ئەنفالَ کەوتن هەموو کێلگە کشتوکالییەکانیان سوتێنران و زۆربەی ڕەزو باغەکانیان کران بە خۆلەمێش، هەرچی سیمای ئاوەدانی بوو لە گوندەکانیان نەمان و چەندین سەر ئاژەلَ و مەڕو مالاَت و پەلەوەر تالاَن کران، هەر بەهۆی ئەنفالەوە ڕووبەرێکی گەورە لە خاکی بە پیت و بەرەکەتی ناوچەکانی شێخ بزێنی لەلایەن جووتیارانی ئەو ناوچانەوە چۆلکران و وێران کران، کە هەموو ئەمانە بوو بەهۆکارێکی کاریگەر بۆ دواکەوتنی لایەنی ئابوری کوردستان بەگشتی و ناوچەکانی شێخ بزێنی بە تایبەتی، بۆیە ئەنفالی ناوچەکانی شێخ بزێنی بوو بە زیانێکی گەورە لە ڕووی ئابوری و کۆمەلاَیەتی و ڕۆشنبیری و زۆر لایەنی تر لە دواکەوتنی هۆزی شێخ بزێنی لە پێشکەوتن و زانست و خوێندەواری دا، مەبەستیش لە ئەنفالی ناوچەکانی شێخ بزێنی ئەنفالی چوارە، کە زۆربەی ناوچەکانی شێخ بزێنی گرتەوە، بۆیە سنوری ئەنفالی چوار لە بناری دۆکانەوە دەستی پێکرد، تاکو لێوار و کەنارەکانی شاری کەرکوك و بن هەولێر بە درێژایی ئەمبەرو ئەوبەری زێی بچووك شۆڕ بووەوە بۆ ڕۆخی پردێ، لەوێوە بۆ کلکەی قەرەچۆغ، لە بەشی باکوری چەمچەمالَەوە بۆ دەم زێی بچووك، ئەو زێیەی بەدرێژایی مێژوو، ئەم بەرو ئەوبەری هەردەم ئاوەدان بووە، کە لەگەلَ خۆیدا سنووری نێوان هەردوو پارێزگای کەرکوك و هەولێری بەش دەکرد، بۆیە ئەنفالی چوار سنوری چەندین شارو شارۆچکەی گرتەوە

[1]-سورەتی ئەنفال، ئایەتی ١ .

(چەمچەماڵ، تەکیە، قەرەهەنجیر، ئاغجەلەر، کۆتەڵ، تەقتەق، قوشتەپە، کۆیە، دێگەلە، پردێ، شوان، دوکان، خەلەکان، مەخموور...هتد)، لەو سنورە پان و بەرینە لە ماوەی چەند ڕۆژێك دا، شوێنەواری شارستانیەت و ژیانی هەزاران ساڵی مرۆڤایەتی بە تەواوی سڕایەوە، بۆیە دوای هەزاران ساڵ لە ئاوەدانی و خزمەتکردن بە مرۆڤایەتی و داهێنان و پێشکەوتن، کران بە وێرانە و کەلاوە، بۆیە جگە لە دار تەلی شۆڕەوە بووی کارەبا، چەم و ڕەزی چۆڵ، داری سووتاو و لادێی ڕووخاو، خۆلەمێشی سوتاو و بۆگەنی ئاژەڵ و پەلەوەری مردارەوە بوو، هیچی دیکە لەدوای ئەنفالەوە بەجێ نەما، مرۆڤ و ئاژەڵ و مێرووله و باڵندە، دارو درەخت هەمووی بەپێ ی بڕیاری (٤٠٠٨)ی (عەلی حەسەن مەجید)، جاڕنامەی مەرگیان بۆ درا، ئا ئەمەبوو سەرەتاو دەستپێکی ئەنفال، بۆیە ئەنفالی چوار بووە هۆی ئەنفال کردنی گوندەکانی هۆزی شێخ بزینی، کە گوندەکانی شێخ بزێنی سەروو خاوەن خاکێکی کشتوکاڵی بەراو و زەوی دێمی بە پیت و بەرەکەت بوو، کێڵگەی بەرینی گەنم و جۆ، مەرەزەی سەوز، گوڵی تەماتە و سەوزە، کێڵگەی لۆکە و گوڵە بەڕۆژە، بامیە و شووتی، ڕەزی بەرینی هەنجیر و قەیسی و هەنار....ئەو ناوچانەی نەخشاندبوو، گوله گەنم و جۆ و گوله بەڕۆژەکان سەریان نابوو بە سەری یەکەوە، هەموو پێکرا بە داماوییەوە سەیری ئەم گوندو ناوچانەی شێخ بزێنیان دەکرد، کزە بایەکی غەمگین مژدەی ڕۆیشتنی بەهارو هاتنی هاوینی پێ بوو، بەهێمنی هەڵی کردبوو، دەغل و دانی ئەو دەشتاییە بۆ ژیان سەمایان دەکرد، کە چاوت بە شێو و دۆڵ و دارەکان دەکەوت، هەستت بە سوکنایەتی لە ڕوحەوە و خۆشی لە دڵەوە دەکرد، ڕۆژێکی ساماڵ و خۆش مرۆڤی دەهێنایە جووڵە، بێگەردی و شینایی ئاسمان ئاوی لەچاو دادەهینا، خۆرەتاوی ئەو دەمەو ئێوارەیە، تیشکی زێڕینی خۆی بەیەکسانی بەسەر دۆڵ و شیوو هەڵەت و تەختاییەکانی گوندو ناوچەکانی شێخ بزێنیدا دەبەخشییەوە، بەلاّم پەلاماری ئەنفالی چوار کە لە بەرواری ١٩٨٨/٥/٣ بە کیمیا بارانکردنی گوندەکانی (گۆپتەپە) و (عەسکەر) دەستی پێکرد، هەموو ئەو نەخشە جوانانەی سروشتی ئەو ناوچانەی سڕییەوە، کە لە بەرە بەیانی ١٩٨٨/٥/٤ هێزێکی گەورەی سوپای عێراق لە میحوەرەکانی چەمچەماڵ و ئاغجەلەر و شوان و پردێ و تەقتەق و کۆیە و قوشتەپە، پەلاماری ناوچەکانی شێخ بزێنی سەروو و شێخ بزێنی خواروو و شوان و دەشتی کۆیە و قەلاسێوکە و چەند گوندێکی دۆڵی سورداشیاندا، لەم پەلامارەشدا کە هێزەکانی سوپای عیراق ئەنجامیاندا نزیکەی (١٠) دە هەزار کەس بەر شالاّوی ئەنفال کەوتن، نزیکەی (٧) حەوت هەزار کەسیان لە بیابانەکانی خواروو و ناوەڕاستی عێراق بە کۆمەڵ

شەهید کران، بۆیە دوا بەدوای هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی سوپای عێراق بۆ سەر ناوچەکانی (شێخ بزێنی) و بەشێکی ئاوەدانی ناوچەی (شوان) لە باکوری خۆرهەلاّتی کەرکوك، پاش تەواو بوونی قۆناغەکانی یەکەم و دووەم و سێیەمی ئەنفال، لە ناوچەکانی دۆلّی جافایەتی و قەرەداغ و گەرمیان .... خەلکێکی زۆری شارەکان بۆ دەربازبوون لە شەڕ، پەنایان هێنابوو بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەلاّتی پێشمەرگە لە (قەلاسێوکە) و (شێخ بزێنی) و دەوروبەری چیای (خالّخالاّن)، پاش ئەوەی کەوا دانیشتوانی ئەم گوندانە لەوانە: (جگیلە، کانی ڕەش، مەرزیخە، عەمدۆن، دەرماناو، پەلکانە، شەوگێر، کاولەسوار، تورکی، قەرەسالم.... هتد)، هەندێك زانیاریان هەبوو کەوا هێزەکانی سوپای عێراق کۆبووینەوە بەنیازن پەلاماری ناوچەکانی (شێخ بزێنی) و (شوان ) و (قەلاسێوکە) و (دەشتی کۆیە) بدەن، بۆیە لەو ڕۆژەدا بە سەدان خێزان لە زێ ی بچووك پەرینەوە و ڕوویان کردە (کەرکوك) و (تەقتەق) و ئۆردوگاکانی دەوروبەری هەولێر، دواتر پاش نوێژی شێوان چەند فڕۆکەیەکی هێزی ئاسمانی عێراق هێرشیان کردە سەر ناوچەی (قەلاسێوکە).... گوندەکانی (گۆپتەپە) و (عەسکەر)، بە چەکی کیمیایی بۆردومانیان کرد، کە تێیدا ژمارەیەکی زۆر لەو ناوچانە شەهیدو بریندارى ژەهراوی بوون، دواتر لەگەل کازیوەی بەیاندا پێش ئەوەی گزنگ بکەوێ، بەر لەوەی چۆلەکە بجریوێنێ، نەیان هێشت کەو و سوێسکە لە هێلانەکانیان سەر دەر بێنن و بە ئازادی بخوێنن، ڕژێم دەستی کرد بە تۆپ باران و کاتیۆشا بۆ سەر ئەو ناوچانە ... ئەوە دەسپێکی هێرشی ئەنفالی چوارە .... لەگەلّ گزنگی هەتاوی (٤)ی مایسی (١٩٨٨)دا فەیلەقی یەکی سوپای عێراق بە پشتیوانی هێزی ئاسمانی بە فەرماندەی ( فريق ركن سلطان هاشم) لە چەند میحوەرێکەوە دەستی بە هێرش کردن بەرەو (خالخالاّن) و هەردوو بەری زێ ی بچووك کرد لەوانە لە میحوەری تەقتەق: لەسەر بازگەی قەلاتەوە بۆ گوندەکانی / قەرەناو، قەسرۆك، گردخەبەر، گەلّناغاج، مامەلێسی، جەلەمۆرد، شێخان، ئەسکەندەربەگی .... هتد، لە میحوەری سلێمانی-دوکان: بۆ گوندەکانی عەسکەر و گۆپتەپە ... هتد، لە (گەرمك)ەوە بۆ/ ئۆمەرگۆمەت، سێگردکان، ئاومالّ، سارتك، قەمبەر .... هتد، لە (کانی ڕەش)ەوە بۆ گوندەکانی/ مەرزیخە، عەمدۆن، دەرماناو، پەلکانە...هتد، لە میحوەری (شوان) لە (علی بەیان) بۆ حەسەن قەباغ، پەلکانە، شەوگێر، کاولەسوار، تورکی، قەرەسالم....هتد، بۆیە ژمارەیەکی یەکجار زۆری سوپای عێراق بە پالّپشتی سەدان دەبابە و زرێپۆش هەموو ناوچەکانی (شێخ بزێنی)یان گەمارۆدا، کە بە هەلیکۆپتەرو ناپالّم و بۆمبی هیشووەیی و ڕۆکێت و دۆشکا هەموویان ئاگر باران کرد،بۆیە لە

قۆناغی چوارەمی ئەنفالْ دا لەدوای کیمیا بارانکردنی گوندی (گۆپتەپە) و (عەسکەر) و گرتن و ڕاپێچکردنی هەزاران مرۆڤی کورد خەلکێکی زۆر لە ناوچەکانی (شێخ بزێنی) و (شوان) و (قەلاسێوکە) و (دەشتی کۆیە) ڕوویان کردە ئەشکەوت و بێشەلان و دەشت و لێرەوارەکان ... ئەویش بە مەبەستی خۆ حەشاردان و ڕزگاربوون لە توونی مەرگ و بەرداشی کارەسات، بۆیە لە ئەنفالی چواردا، کە لە بەرواری (١٩٨٨/٥/٥) گوندەکانی (شێخ بزێنی) لە لایەن ئەنفالچیەکانی ڕژێمی پێشوو وێران و یەخسیر دەکرێن، بۆیە کێ بێ لە خەلکی گوندەکانی (گۆپتەپە) و (گەلْناغاج) و هەموو شێخ بزێنی سەروو کە باس لە ئەنفال بکرێ ( خالخالان)ی نەیەتەوە بیر.... ئاخر لەدوای کیمیا بارانکردنی گۆپتەپە بە سەدان برینداری ژاراوی بوو، بە هەزاران خەلکی ناوچەکانی ( شێخ بزێنی) و (شوان) و (قەلاسێوکە) پەنایان بۆ ئامێزی ئەم دەڤەرە شاخاوییە هێنابوو، بۆیە هەر لە ڕۆژی (١٩٨٨/٥/١٤) زیاتر لە (٢٠٠) دووسەد مرۆڤ لە گوندی (قەسرۆك)ی شێخ بزێنی ڕاپێچی (تۆبزاوا) دەکرێن، ئێستاش کەس نازانێ ئەو باقی ئەنفالکراوەکانی تر چییان بەسەرهات، بۆیە بەس تەنها لە گوندی (چۆغلیجە) بە دیاریکراوی (١١٨) سەدو هەژدە کەس لە دانیشتوانی ئەم دێیە بەر شالاوی ئەنفالْ کەوتن، کە ئەم گوندە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێخ بزێنین، لەڕووی کارگێڕییەوە سەر بە ناحیەی (تاغجەلەر)ی پارێزگای کەرکوکە، بۆیە هۆزی شێخ بزێنی زیانێکی یەکجار گەورەی لێ کەوت بەهۆی ئەو ئەنفال و وێرانکاریەی کە بەسەر گوندو ناوچەکانی داهات لەلایەن ڕژێمی پێشووی عیراق، کە تاکو ئێستاش ڕەنگدانەوەی ئەنفال لەسەر ئەو گوند و ناوچانەی شێخ بزێنی دا هەرماوە، بۆیە هۆزی شێخ بزینی هەر لە دێر زەمانەوە لەسەردەمی تورکەکانەوە بەر شالاوی کۆچ پێ کردن (تهجیر) کەوتووە، تورك ئەم هۆزە گەورەی پەرتەوازە کردووە و لێکی ترازاندوون بۆ وولاتی تورکیا و ئێران و سوریا و عێراق، هەروەها چەندین ناخۆشی و نەهامەتی تر لە ڕابردوو بەسەر هۆزی شێخ بزێنیدا هاتووە.

لەبەرئەوە یەکەمین تاوانکاری ڕەشەکوژی و بەکۆمەلْ کوشتنی بەناهەق و خەلکی سڤیل و بێ چەك و ستەم دیدە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، کۆ کوژی ئەرمەنییەکان بوو، لەلایەن دەسەلاْتی تۆتالیتاریای خوێنڕێژی عوسمانییە کەمالیستەکانەوە، کە لە دەرکەوتەدا زیاتر لە ملیۆنێك و نیو ڕۆح و هەناسە و جەستە بە کۆمەلْ کوشتوبڕ کران و بە نامرۆیانە قەتلوعام کران، ئەم تاوانەش لە هەموو گێتیدا سەدای بلاْوبۆوەو بە دڕندەترین و یەکەمین هۆلۆکۆست لە مێژووی بوون و دونیادا هەژمارکرا، دووەم ستەم و تاوان لە چاخی بیستەمدا ئەنفالکردن و

کۆمەڵکوژی نەتەوەی کوردی بەشمەینەتبوو لە باشووری کوردستانی لکێنراو بە عەرەبی شۆڤێنییەوە، ئەویش دوای وەستانی جەنگ و ئاگری شەڕی نابەرامبەری کەنداوی یەکەم عێراق-ئێران، ڕژێمی بەعس و دەسەلآت و فەرمانڕەوا بەهێزی ئاگر و ئاسن و خوێن ڕشتن بڕیاری قڕکردن و جینۆسایدکردنی گەلی باشوری کوردستانی نەبەزیو و خۆڕاگری دا، بەچاوبەستن و لەژێر پەردەی ئایەتی قورئانی پیرۆزی (ئەنفال)دا، جێبەجێ کردنی ئەم تاوانکارییە نێودەوڵەتییە بە هەشت قۆناغ دەستی پێکرد، لە ئاکامدا زیاتر لە (١٨٢٠٠٠) تاکی کورد بە لاشەو گیان و هەناسە و هۆشەوە، زیندەبەچاڵکران و تاکو ئێستاش بە تێپەڕبوونی نزیکەی لە چارێگە سەدەیەك شوێن بزرن و تەنانەت ڕووفات و جەستەکانیشیان دیارنین و بێ ئارامگە و بێ گلکۆن، هەروەها دەسەلاتی سیاسی باشوری کوردستان ڕۆژی (١٤)ی نیسانی هەموو ساڵێ کردووەتە ڕۆژی یادکردنەوەی کارەساتی ئەنفالکردنی گەلی کورد، لەم ساڵیادەدا ئاماژەیەکی خێرا دەکەین بە سەرەتاو قۆناغەکانی شالآو و پەلامارەکانی ڕژێمی پێشوو، کە تاوانی ئەنفالکردنی بە هەشت قۆناغ لەماوەی (شوبات تاکو ئەیلوول)ی ساڵی ( ١٩٨٨ ) دەستی پێکرد و ئەنجامدرا، بۆیە ئەوەی کە لەسەرەوە باسم کردووە بە دیاریکراوی ئەنفالی گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنییە، کە ئەنفالی چوارە، کە ناوچەکانی شێخ بزێنی و شوان و تەقتەق و ئاغجەلەری نێوان شارۆچکەی کۆیە و چەمچەماڵ دەگرێتەوە، کە لە (٨-٣)ی مایسی ١٩٨٨ ئەنجامدراوە، بۆیە ساتە وەختەکانی کۆمەڵکوژی نەتەوەی کورد ڕۆژێکی شوومە و ڕەشە لە مێژووی سەروەرییە پڕ شکۆدارەکەی خەباتی بێ وچانی ڕووبەڕووبونەوەی ئەرکەکانی نیشتمانی و نەتەوەیی گەلەکەمان، لە سەنگەری هەق دژ بە ناهەق و بەرەنگاربوونەوەی داگیرکارە یەك لە دوای یەکە فەرمانڕەواکانی بەغدا و بە تایبەتی شۆڤێنییەتی ڕژێمی ڕووخاو بەرامبەر داد و مافی کۆمەڵانی سڤیل و بێ تاوانی باشوری کوردستان و مرۆڤایەتی، بۆیە هەڵوەستەکردن لەسەر کەیس و ئاراستە و ڕەهەندی ئەنفالکردنی کورد ئەوەندە چڕو ئاڵۆزە کە نەسەرەتاو نەکۆتایی هەیە، لەبەرئەوەی تاوانکاری ئەنفالکردن و هێرشکردنە سەر خاکی کوردستان هەموو سنورەکانی عورف و لۆژیك، عەقل و یاساکانی ئاسمانیشی بەزاند، گوناهی میللەتەکەمان تەنیا ئەوەبوو کە هەڵگری ناسنامەی ئینتمای کورد بوون، بۆیە ساڵوەگەری قڕکردنی گەلەکەمان ئەوەمان دەخاتەوە بیرو دڵە زامدارە کوڵاوەکان بەوە تۆزێك ئارام دەبێ، کە ئێستا لە باشوری کوردستان تەکان و سەرهەڵدانی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی و بەرفراوانبوونی شارەکانی کوردستان هەم لە ڕووی

جۆری و چۆنایەتییەوە بەخۆیەوەی بینیوە، وێڕای شەکاوەیی ئالآی کوردستان و هاتنە ئارای حکومەت و دەزگای شەرعی پەرلەمانی کوردستان، بۆیە هەقە تاوانی ئەنفال هەرگیز لە یاد نەکرێ و بیکەینە میتۆدی پەروەردەیی و نەوە دوای نەوەی پێگۆش بکەین، ئەم تاوانە هەموو یاساکانی ئاسمان و زەمین و یاساکانی نێودەوڵەتی و ڕەوشتی بەزاند، ئەنجامدانی ئەم تاوانکارییە وەحشییانە ڕەشبگیری کردنی پیرو گەنج و منداڵ و مێینە، بێ جیاکاری ڕەگەز و تەمەن بە پرۆسەیەکی درێژخایەن کە بە چەندین قۆناغ دا دەستی پێکرد، ئەویش کۆکوشتن و ڕەشەکوژی زیاتر لە سەدان هەزار ئاه و نزای کوردی بێگوناهی خێر لەخۆ نەدیو بوو، کە تێنو و برسی کران و بەلاشەو گیانەوە زیندەبەچاڵ کران بەبێ ئەوەی بزانرێ کە بکوژەکانییان چییان لێیان دەوێ لە ڕەهەندی ئەنفالدا تەنیاو تەنیا کوردبوون تاوانبوو، لە ئەنفال هەزاران لادێ و شارۆچکە وێران دەکرێ، دەنگی باعە و چریکە و چرپە و دواندنی جێ ژوان کپ دەکرێ، شاکار و داهێنان و کەلتوور و فۆلکلۆر و نەریت دەسوتێنندرێن، کانیاو و سەرچاوەکان کوێر دەکرێن، هەزاران مزگەوت و سەکۆ و خوێندنگە وێران دەکرێن، بەلاشەو گیانەوە تاکی کورد بێ تاوان بە کۆمەڵ زیندەبەچاڵکران .

ئەم وولآتەی ئێمە دابەشکراوە، ئەم خاك و زادگا جوانە کە ناوی کوردستانە، هەموو پایزانێك بەرگێکی زەرد دەپۆشێت، زستان دوند و قەدپاڵ سپی ڕەنگ، بەهاران تارای ڕەنگین بەسەردا دەدا، وەك بووکێکی ڕازاوە خۆی پێشکەشی گەلەکەی دەکات، هیواکان نوێ دەبنەوە، سروشت دووبارە دەبووژێتەوە، دیسان نەورۆزە و ساڵێکی نوێ دێتەوە، ئەم دیارییە نەخشینە کە خودای مەزن ڕەوای بینیوە بە کوردان، نەیاران پێی نارازین و بەدرێژایی مێژوو دژایەتی کورد و کوردستان دەکەن، هەرچیان بۆ کراوە درێغیان بۆ لەناوبردنی کورد نەکردووە، بەلآم سەرەنجام هەر ئاشتیخوازان سەردەکەون و شەڕەنگێزان بەرەو زبڵدانی مێژوو، بۆیە دیمەنە تراژیدیەکانی بەسەرهات و ژیانی کورد بەداخەوە گەلێك زۆرن، لە بەهاری (١٩٨٨)ی سەدەی بیستەم، سەدەی ستەم لە کوردان، هەلەبجە، گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی، بادینان، گەرمیان، لە وولآتی شەهید و ئەنفالستان دەست پێ دەکەین، دەپرسین یاران بەهاری ئەم ساڵ بۆ وەك بەهاری سالآن نەبوو، هیواکان لە شارەزوور خنکێنران و سوتێنران، لەگەرمیان و گوندو ناوچەکانی شێخ بزێنی دوای ئەنفال ئەتك و زیندەبەچاڵ کران، لە عەرعەر و نگرۆسەلمان، ئەی نەتەوە یەکگرتووەکان مافی مرۆڤ، ویژدان، هەموو جیهان ئێوە لە بەهاری

(١٩٨٨)دا سەرقالی چی بوون؟ وا گوێی خۆتان ئاخنی بوو؟ دەنگ و زریکەی منداڵانی هەڵەبجە و گوندو ناوچەکانی شێخ بزێنی و گەرمیانتان نەدەبیست؟ بۆ گوێتان بۆ هیچ وتارێك ڕانەدەگرت؟ هەر ڕۆژنامەیەکیشتان بەرچاو نەکەوت؟ ئەدی بۆ دیمەنێکی پێ خاوسی پیرەمێردێك، منداڵێك، پیرە دایکێك ویژدانی نەهەژاندن؟ خۆ ئێوە بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە لەم گەردونەدا لە هەموو شتێك ئاگادارن، گەر پاساوتان ئەوە بێت ئەو زوڵمانە لە چوار دیواری گرتووخانەکاندا کراون، ئەی خۆ (سەگە ڕەش) بە مانگەشەو، لە پێش چاوی مانگە دەسکردەکانتان شەو تا بەیانی لە بیابانی بێ پایان، گۆشتی لەشی ئەنفالکراوەکانی دەخوارد، حەقمانە کە بپرسین ئەو کیژۆڵانە لە سنوور بێ پاساپۆرت چۆن دەرباز کران و بە وولاتانی دراوسێ فرۆشران، یاسای باجی مرۆڤ، ئەنترپۆل، ڕۆڵیان چۆن بوو؟ ئاگاتان لەم ئاڵ و وێرەش نەبوو؟ ئەی ئەو فرۆکانەشتان نەدەبینی زۆر بێباکانە بە سنگێکی فراوانەوە لە بەهاری (١٩٨٨) هەڵەبجەیان ژەهر باران دەکرد، هاولاتیانی بێ تاوان بێ چەك لەژێر ڕەحمی فرۆکەکاندا نەیاندەزانی روو لە کوێ بکەن؟ هانا بۆ کوێ بەرن؟ گوندو ناوچەکانی شێخ بزێنی و گەرمیانیش لە ژێر بەزەیی قامچی جەلادەکانی بەغدادا هاواریان دەگەشتە حەوت تەبەقەی ئاسمان، جیاکردنەوەی کۆرپەی ساوا لە دایك لە کەلتووری کام جەنگەڵستاندا بوونی هەیە؟ کوێر کردنەوەی سەرچاوەی کارێزو کانی پیشەی کام سەرابی بیابانە؟ سووتانی خەڵە و خەرمان، وشك کردنی باغ و باغات، کاولکردنی مزگەوت، پەرستگا، شوێنی پیرۆز، پسپۆری کام دیکتاتۆری بە ئەزموونە؟ دڵنیام نەك ئێوە بەڵکو هەموو جیهان ئاگادارە، ئەم کردەوە نامرۆڤانە تەنهاو تەنها پیشەی پیاو خراپ و دڕندانە ، دۆستان ئەم بەهارە بۆ کورد بۆ وا هەر نەهاتییە، ئەی ڕا نەگوێزرا، ئەی نەفی نەکرا، ناونیشان، بیانوو، پاساو ماوە بۆ لەناوبردنمان دوژمن بەکاری بهێنێت، ئەمجارە ڕژێم پەنای بۆ دەقە پیرۆزەکان بردووە، بۆ ئەوەی کەس ڕێگەی لێ نەگرێت شەرعیەت بە قڕکردنی کوردان بدات، ئینجا دەشتی کۆ، کۆسار، گوندنشینانی هەژار، دیلن، بە زیل و ئیڤاکان، بەرەو عەرەبستانیان دەبەن، خاکێکی لماوی نامۆ بۆ ئەوان، با فریایاکەوین، بزانین ئەم تاوانبارانە، ئەم بێتاوانانە بۆ کوێ دەبەن؟ کام چارەنووس چاوەڕێیان دەکات؟ ئەی هاوار ئەم هەموو خەلکە لادێیە خێر لەخۆ نەدیوە بۆ کوێ دەبەن؟ چ تاوانێکیان ئەنجام داوە؟ ماڵی کێیان خواردووە؟ بێ نان بێ ئاو بێ شیری منداڵ، ئەم مرۆڤانە وا بارکراون، ساناترین گفتار لەگەڵیان، کێبڵی جەللاد و دار حەیزەرانی ئەفسەران، چاویان لێنابڕن بست بە

بست لەگەڵیاندان، خۆتان باش دەزانن، ئەم بێ بەزەییانە ئەو گوندانەی مابوون ئەنفالیان کردن، هیواو ئومێدی ئەم هەزاران خەڵکەیان لەم دەمی بەهارەدا لەبار برد، مامەی جووتیار دەیان تەگبیری بۆ دروێنەی ئەمساڵ کردبوو، کوڕانی عاشق لە گوند، دڵیان خۆشبوو، دایاننابوو پاش فرۆشتنی مەڕومالاَت زەماوەند بکەن، کوڕە جوتیاری ماندو نەناس بەتەمابوو تراکتۆرێکی نوێ بکڕێت، دایە پیرەش سەوقاتییەکی زەریفی ئامادەکردووە، کەمێك هەوا خۆشی کرد، بۆ شار بیبا بۆ کوڕە لاوەکەی خوازبێنی پێ بکات، مێرمنداڵەکانی ئاوانیش نەیان دەزانی ڕۆژ چۆن بەرێکەن، کە قوتابخانە تەواو بووە، پایسکل دەکرن لە جادەی بەرماڵاَن کێبڕکێ ی پێ دەکەن، کچۆڵەکانی گوندیش چاو لە ڕێن لالەی دوکاندار، بووکی نوێیان بۆ بهێنێت لە شار، سروشت و کێلگە ڕازاوە و تێرئاو، ئەمساڵ پەیمانیان بە گوند نشینان داوە، کە زیاد لە ساڵاَن بەروبوومیان پێشکەش بکەن، تەواوی خەڵکی ئاوایی بە هیواوە دەژیان، هەمیشە سوپاسگوزاری خودای گەورەیان دەکرد، دەیان پرسی لە یەکتر تۆ بڵێیت: هیچ شوێنێك لەم جیهانەدا بە ئەندازەی ئەم گوندەی ئێمە خۆش و دڵگیر بێت، هیواکان دوور و نزیك هەموو لە چاوەڕوانی دابوون، بەلاَم ئاخ سەد داخ ڕژێم هات هەموو هیواکانی لەناو برد، سەرەتای ڕۆژە سەختەکان لێرە ڕا دەستی پێ کرد، چوار دەوری ئەو گوندو ناوچانەی شێخ بزێنی بە زرێپۆش و سەرباز تەندرا، فڕۆکەی تووڕە لە ئاسمان، سەربازی پۆستاڵسوری چنگ ڕەش کەوتنە ناو ماڵاَنی ئەو گوندو ناوچانەی شێخ بزێنی، دەروازەی چەندین ساڵەی نەخشێنراویان، بەنێزەکەکانیان دەشکاند، ئەم دۆخە نالەبارە بۆ گوندنشینە ئەنفالکراوەکان، هات و هاواری منداڵ لە ترسی چەکداران، تەقەمەنی و خوودەو بێری و تفەنگەکانی دەستیان، دەگەشتە قولایی ئاسمان، سەگی بە وەفای گوندکە هاتە وەڕین لە ڕژێم بێ ئەوەی لێ ی تێبگەن یەکسەر کوشتیان، مەڕومالاَت و ڕەشەولاغ، هەنگ و کۆتر و پەلەوەر، ئەوانیش دزران، تالاَنفرۆشکران، سەرئەنجام سروشت، کانی، مرۆڤ و گیانلەبەران، پێکرا ئەنفالکران، خانووی سەدان ساڵەی مزگەوت، ماڵی کۆنەساڵ، دیوەخان، نەخۆشخانە و قوتابخانە، هەر لەبەر چاوی خەڵکی ئاوایی بە تی ئێن تی خاپوورکران، ڕووخێنران، هیواکان هەموو پێکەوە خنکێنران، نەعاشق بە مەحبووبەکەی گەشت، نەجوتیار بەرهەمی ساڵی کۆکردەوە، نە مەڕو ماڵاَت فرۆشرا بۆ زەماوەند، نە کوڕە جوتیار بوو بە خاوەنی تراکتۆری نوێ، دایە پیرەش سەوقاتیەکەی لە بوخچە سپیەکەدا بەجێ هێڵاَو ئەنفالچیان ئەویشیان لێك هەڵوەشان، ژن و

کچانیان بە دیل گرت و پیاوانی نازایان لە خوێنی خۆیان گەوزاند و ئەمجارە پیرو لاو و منداڵ و بەشێکی زیندووی ژینگەی کوردستانیشیان لەناو برد، کورد ئەمجارە جیا لەو سەردەمەی پێشوو ئەنفالکرا ... لە قیامەتدا هەرکەسەو غەمی خۆیەتی، بەلام دایە خاتوون غەمی کچە عازەبەکانی هەموو شتێکیان لەبیر بردبووەوە، بە دەم سەرخستنیان بۆ ناو ئیڤاکان، ئەم هەر لەپێش خۆیەوە ئەیگووت: خوایە شەرەفمان بپارێزیت، چەندین ساڵە لەم گوندەدا دەستمان بە کلاوەکەی خۆمانەوە گرتووە، کەس ناوی نەبردووین، ئێستا ئەم کچە نازدارانەی من بکەونە دەست ئەم گورگانە، مەگەر تەنها خودا بیانپارێزێت، لە پڕ داد و هاواری مەلای گوند بە قورئانێکی بەرگ سەوزەوە، خەیاڵەکانی دایە خاتوونیان بچڕاند، هیوایەکی نوێ ی پێ بەخشی، کێشانی دار حەیزەرانەکە بە دەستی مەلاکەدا لەلایەن ئەفسەرەکەوە، نەك هەر دایە خاتوونی بێ ئومێد کرد، بەڵکو مرۆڤایەتیشی خستە ژێر پرسیارەوە، هەرچییان پێبوو لێیان سەندن، هەموو خەلکی هەژاری لادێی بوون، هەندێکیان هەر نەیاندەزانی لەسەرچی گیراون؟ هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئافرەتەکاندا باسی لێوە ناکرێت، هەموو پێکەوە بەرەو چارەنوسێکی نادیار بەرێکران، بۆیە ئەنفالکراوەکانی گوندو ناوچەکانی شێخ بزێنی پاش ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر لە دوا مەنزلگایان بە وشەی (ویل) ترسناکترین وشە لە دەروازەی زیندانی نگرۆسەلمان پێشوازیکران، ئەو وشەی کە لە قورئانی پیرۆز دا دەیان جار (پەروەردگار) بەکاری هێناوە، بۆ ئاگادارکردنەوەی مرۆڤەکان لە تاوان، بەلام دەبێ ئەوان چ تاوانێکیان ئەنجام دابێت کە رژێم بەوشێوە ئەنفالی کردن، هەر لەبەرئەوەی کە کوردبوون و هەژار بوون، خۆ کورد بوونیان بە دەستی خۆیان نەبووە، خودای گەورە بە کورد دروستی کردوون، بۆ دەستیش دەخەنە کاری خودای گەورەوە، هەر بۆیە ئەنفالکردنی گوندو ناوچەکانی شێخ بزێنی دەبێتە سیمبولی ستەملێکراوی کوردستان، هەر لەم ساڵیادە هەزاران شکۆداری و حورمەت لە گیانی پاکی شەهیدانی ئەنفالی بێ مەزارگە و بێ گلکۆ، رێزو پایەداری و سەروەری بۆ خانەوادە سەربەرزەکانیان کە نیشانەی خۆڕاگری و بەرخودانن، هێمای بوێری و قوربانیدانن، جەفەنگ و نیشانەی فەخرو شانازین بە تایبەت هەموو ئەو دایکانەی کە چەندین جار جەرگیان سووتاوە و براو مێرد و کەس و جگەرگۆشەکانیان بە زیندوویی زیندە بەچاڵکران، دڵەکانیان داتەپیوە و کانیاوی چاویان ووشك بووە و قەترەیەك فرمێسکی لێ نایێتەخوار، چونکە کانیاوی چاویان وشکی کردووە، چ جای ڕامان و بیرکردنەوەیان کە بێجگە لە خۆزکە بە مەرگ خواستن هیچ

هیوایەکیان نەماوە، بۆیە داواکارین چیتر نەتەوەی کورد بەگشتی و هۆزی شێخ بزێنی بەتایبەتی نەکرێتە قوربانی بەرژەوەندی ولآتانی زلهێز، لە خودای مەزن دەخوازین لەناو هیچ میللەتێکی سەر ئەم زەمینەدا، دووبارە نەبێتەوە ئەنفال و کیمیاباران، بژی کورد، بژی کوردستان بژی رۆڵەی نەبەردو قارەمانی هۆزی شێخ بزێنی، سلاو بۆ گشت شەهیدان، بەتایبەت شەهیدانی زیندوو پاشماوەی ئەنفال و کیمیاباران، لەبەرئەوە بەیەکگرتن و یەکڕیزیمان سەربەخۆیی یەکجاری بۆ کوردستان بە دەست دەهێنین... دەبا یەکتریمان خۆشبوێت، ڕابردووی ئەم گەلە ستەم دیدەیە لەیاد نەکەین، ئێمە میللەتێکی ئەنفال و کیمیاباران و جینۆسایدکراوین، هەموو لا دەست لەناو دەست و نەهامەتییەکانی پێشوو بکەینە خۆش گوزەرانی بۆ گەل، بەکردار بوەستین دژی نادادپەروەری بەرژەوەندی تایبەتی هەل پەرستان...بارودۆخی ئەنفالکراوەکان ئاسوودە تر بکەین، خودای مەزن پشت و پەنای نەتەوەی کورد بێت بۆ ئازادی و سەربەخۆیی لە هەر چوار پارچەی کوردستان .

---

ئەنفالکردنی نەتەوەی کورد بەگشتی و گوندو ناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی بەتایبەتی چەندین زیان و دەرهاوێشتەی لێ کەوتەوە، بۆیە دەرهاوێشتەکانی ئەنفال زۆر لەوە گەورەتر بوون کە لە کاتی کارەساتەکاندا درکی پێ بکرێت، بەکورتی هەندێك لەو دەرهاوێشتانە دەخەمە ڕوو کە ئەمانەن:

**١-لەڕووی مرۆڤایەتییەوە:** زیانە مرۆڤایەتییەکانی پرۆسەی ئەنفال، بە گەورەترین زیان هەژمار دەکرێت، چونکە بە لەدەستدانی (١٨٢٠٠٠) تاکی کورد، یەك نەوە یان زیاتر لەناوچوون، ئەوەی جێگەی لێ وردبوونەوەیە ئەوەیە کە زۆرینەی ئەو کەسانەی لەم پرۆسەیەدا وون بوون، گەنج و منداڵ بوون بەمەش پرۆسەی زۆربوون سست بوو، چونکە گوند نشینەکان بەهۆی زۆری کار، هەڵدەستان بە خستنەوەی منداڵی زۆر ئەمە لەگەڵ هەبوونی ڕێژەیەکی زۆری فرەژنی، کە ئەمەش بەهەمان شێوە کاریگەری زۆری دەبوو لەسەر خستنەوەی نەوەی زۆر.

**٢-لەڕووی ئابوورییەوە:** یەکێکی تر لە گەورەترین دەرهاوێشتەکانی گۆڕینی کۆمەڵگای کوردی بوو لە کۆمەڵگایەکی گوند نشینی بەرهەمهێنەوە، بۆ کۆمەڵگایەکی شار نشینی بەکاربەر، ئەگەر سەرنج بدەین سوپا لەو هەڵمەتە هەستا بە لەناوبردنی سەدان هیکتار لە باغچە و ڕەزو باغ و کێڵگەی کشتوکالی، ئەویش لە ڕێگەی سووتاندنی ڕاستەوخۆ یان لە

ڕێگەی پڕکردنەوەی کانیاوەکان، لە ڕاستیدا پێش کارەساتی ئەنفال سەرەڕای سەختی شێوازی بەرهەمهێنانی دانەوێڵە لە زۆر شوێنی کوردستان زۆربەی گوندنشینەکان بەشی پێداویستیەکانی خۆیان لە گەنم و جۆ و دانەوێڵەکانی تر بەرهەم دەهێنا، بەڵام لە ناوچە دەشتاییەکاندا بەتایبەتی دەشتەکانی قەراج و گەرمیان و گوندو ناوچەکانی شێخ بزێنی و هەولێر و شارەزوور و ..... هتد، بەرهەمی جووتیاران بە هەزار تەن دانەوێڵە دەخەملێنراو دەنێردران بۆ سایلۆکان، بەڵام ئەم بوارەی بەرهەمیش زیانی گەورەی پێ کەوت، ئەمە هاوکات لەگەڵ لە دەستدانی بەرهەمی ڕۆژانەی سەدان تەن لە سەوزە، کە پێویستی خۆراکی ڕۆژانەی هاوڵاتیانی شارەکان و گوندەکان بوون، بەمەش کەل و پەلی خۆماڵی لە بازارەکانی کوردستاندا نەماو خەڵك پەنایان بردە بەر کەل و پەلی خۆراکی هاوردە، کە تا بە ئەمڕۆ بگات لەم کردارەدا چەندین ملیارد دۆلار لە داهاتی نیشتمانی لە بەرامبەر ئەم پێداویستیانە بۆ دەرەوەی سنوورەکان ڕەوانە دەکرێت، ئەگەر سەرنج بدەینە سروشت و هەڵکەوتەی جیۆلۆجی کوردستان ئەوا دەبینین زۆرینەی زەوییەکەی شاخاوییە، لەگەڵ بوونی لەوەڕگایەکی زۆر، بەهۆی زۆری ڕێژەی باران بارین، بەمەش کەشێکی لەبارە بۆ بەخێوکردنی مەڕو ماڵات زیاتر لە کشتوکاڵ، بەڵام لە شاڵاوی ئەنفال دا بە هەزاران سەر (مەڕ، بزن، وڵاخ و ولاخی بەرزە، باڵندەی ماڵی.....هتد) لەلایەن سوپاوە بەتاڵان بران، بەمەش ئەم سامانە گەورەیەی کوردستان کەوتە بەر مەترسی لەناوچوون، لەڕاستیشدا بە پلەی یەکەم ئەم زیان و دەرهاویشتەیە بەر تاکی گوندنشینی کورد کەوت، ناچاربوو بۆ بەدەست هێنانی داهاتی خۆی، ببێت بە مووچە خۆر چاوەڕوانی بەشە خۆراکی مانگانە و بەهای بژێوی ڕۆژانەی لە حکومەت بکات.

**٣-لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە:** ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو ئۆردوگا زۆرە ملێیانەی کە پاشماوەی ئەنفالەکانی تێدا نیشتەجێبوون، بەردەوام پڕ بوون ئێستاش پڕن لە کێشەی کۆمەڵایەتی و نائارامی، ئەویش بە دڵنیاییەوە دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی ئەو کۆکردنەوەیەی ڕژێم کە بەسەدان گوند لە یەك کۆمەڵگادا کۆکردەوە، بەمەش ئەگەر لە هەر گوندێك یەك کێشە هەبوویێت ئەوا ئۆردوگاکە دەبوو بە لانکەی سەدان کێشە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی زۆربەی منداڵەکان بەهۆی سەختی بارودۆخی ژیانەوە نەیانتوانی خوێندن تەواو بکەن یان بەمەش ژمارەیەکی زۆری منداڵ کەوتنە کۆڵان و بە ناچاری بۆ پەیداکردنی بژێوی کەوتنە کارکردن، لە هەمان کاتدا پاش ماوەی ئەو نەوەیە لە کەشێکی نالەباردا پەروەردەبوون، کە بریتی بوو لە خێزانی بێ

سەرپەرشت و پڕ لە کێشە و گرێی دەروونی دوور لە نازی دایك و باوك ... هتد، ئەمڕۆ دوای تێپەڕبوونی (٢٥) ساڵ بەسەر ئەو کارەساتەدا، دەرهاویشتەکانی بەئاشکرا بە کۆمەڵگای کوردییەوە دیارە، ئەویش بەچۆڵی مانەوەی گوندەکان و ئاوەدان نەکردنەوەیان، چونکە نەوەی دوای ئەنفال لە کەش و هەوای شاردا ژیاوە و ناتوانێت لە گوند دا گوزەر بکات، تەنانەت ئەگەر کەش و هەوای شاریشیان لە گوندەکاندا لە ئاو و کارەبا و ڕێگاوبان بۆ فەراهەم بکرێت، ئەمە لەگەڵ تێکچوونی دیمۆگرافی کوردستان و لەناوچوونی بەشێکی زۆری کلتووری کوردی.

لێرەدا من لیستی ئەنفالکراوەکانی گوند و ناوچەکانی شێخ بزێنی بە ناو و تەمەنەکانیانەوە لە شێخ بزێنی سەروو و خواروو[١]، گشتی دەخەمە بەر دیدی خوێنەران، کە سوودم وەرگرتووە لە پەرتووکی ئەنفالی خاخالانی مەلا شاخی، بۆیە سەرەتا لە ناوی هەموو ئەو گوندانەی شێخ بزێنی کە ئەنفالکراون دەست پێ دەکەم دواتر دێمە سەر ناوی ئەنفالکراوەکان لەو گوندانەدا .

گوندە ئەنفالکراوەکانی شێخ بزێنی سەروو: (قەرەناو، قودرەتە، سماقە، قەمیشە، قەسرۆك، گردخەبەر، چۆغلیجە، توتەقەڵ، جەڵەمۆرد، سەرچنار، شێخان، گەڵناغاج، کانی هەنجیری برایم اغا، ئەسکەندەربەگی).

گوندە ئەنفالکراوەکانی شێخ بزێنی خواروو: (جگیلە، کانی ڕەش، مەرزیخە، دەرماناو، پەلکانە، شەوگێر، تورکی، دەرماناو خواروو، چیاچەرمك، کاولەسوار، قەرەسالم، ئۆمەر گۆمەت، سێکانی، سێگردکان، ئاومال).

---

[١] - مەلا شاخی، ئەنفالی خاخالان(ئەنفالی چوار)، چ٢، چاپخانەی کارۆخ، کەرکوك، ٢٠٠٧، ل١٩٣ .

**لیستی ئەنفالکراوەکانی گوندەکانی هۆزی شێخ بزێنی:**

**أ- لیستی ئەنفالکراوەکانی ( شێخ بزێنی سەروو ) :**

١- لیستی ئەنفالکراوەکانی گوندی (قەرەناو):

| ژمارە | ناوی سیانی | لەدایکبووی |
|---|---|---|
| ١- | عبدالرزاق حامد کاکل | ١٩٥٦ |
| ٢- | صابر حامد کاکل | ١٩٦٨ |
| ٣- | سەردار خورشید محمد | ١٩٦٦ |
| ٤- | ئاسۆ محمد امین احمد | ١٩٦٦ |
| ٥- | جلیل عبید مصطفی | ١٩٦٩ |
| ٦- | رضا محمد کریم | ١٩٥٥ |
| ٧- | جلال محمد امین کریم | ١٩٦٤ |
| ٨- | صدیق محمد حمە امین | ١٩٥١ |
| ٩- | فائق محمد حمە امین | ١٩٦٢ |
| ١٠- | نجم عبدی صابر | ١٩٦١ |
| ١١- | هادی عبدی صابر | ١٩٥٦ |
| ١٢- | جوهر احمد محمد امین | ١٩٥٣ |
| ١٣- | رضا احمد حمە امین | ١٩٤٩ |
| ١٤- | مدیر رشید نجم | ١٩٦٧ |
| ١٥- | موشیر رشید نجم | ١٩٦٢ |
| ١٦- | مجید رشید نجم | ١٩٥٤ |
| ١٧- | زاهیر محمد قادر | ١٩٤٩ |
| ١٨- | طاهر محمد قادر | ١٩٥٢ |
| ١٩- | فرهاد محمد جمیل | ١٩٦٦ |
| ٢٠- | ئازاد محمد جمیل | ١٩٦٤ |
| ٢١- | ئاسۆ احمد جمیل | ١٩٦٨ |
| ٢٢- | نەوزاد احمد جمیل | ١٩٦٧ |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٣- | عەزیز عەلی عومەر | ١٩٤٩ |
| ٢٤- | عبدالله عەلی عومەر | ١٩٥٠ |
| ٢٥- | مجید یوسف ئەسعەد | ١٩٥٠ |
| ٢٦- | محمد رضا یوسف | ١٩٦٨ |
| ٢٧- | فارس عەباس مجید | ١٩٦٢ |
| ٢٨- | تمین حەویز حەسەن | ١٩٦٩ |
| ٢٩- | عومەر عبدالله ئەحمەد | ١٩٦٤ |
| ٣٠- | ابوبکر قادر ئەحمەد | ١٩٥٦ |
| ٣١- | ئازاد فوئاد کریم | ١٩٦٠ |
| ٣٢ | صلاح انور سەعید | ١٩٦٥ |
| ٣٣- | سەردار سەعید امام | ١٩٦٧ |
| ٣٤- | نظام عومەر محمد | ١٩٦٩ |
| ٣٥- | عوسمان عومەر محمد | ١٩٦٧ |
| ٣٦- | عارف تەها ئیسماعیل | ١٩٦٧ |
| ٣٧- | عبدالرحمن رؤوف محمد | ١٩٥٤ |
| ٣٨- | مجید حامد محمد | ١٩٥٣ |
| ٣٩- | جمال محمد امین عەلی | ١٩٧٠ |
| ٤٠- | کمال محمد امین عەلی | ١٩٦٧ |
| ٤١- | عەلی محمد امین عەلی | ١٩٦٦ |
| ٤٢- | ناصح مولود محمد | ١٩٧٠ |
| ٤٣- | سەعید محمد عبدالرحمن | ١٩٦٦ |
| ٤٤- | غەفور قادر | ١٩٥٤ |
| ٤٥- | شکر نەریمان شریف | ١٩٥٥ |
| ٤٦- | مونی محمد یاسین | ١٩٥٦ |
| ٤٧- | بەشدار غفور قادر | ١٩٨٢ |
| ٤٨- | رێباز غفور قادر | ١٩٨٣ |

| | | |
|---|---|---|
| -٤٩ | زارا غفور قادر | ١٩٨٠ |
| -٥٠ | شنۆ غفور قادر | ١٩٨٥ |
| -٥١ | نضال مستەفا عومەر | ١٩٥٧ |
| -٥٢ | عومەر کاکە رەش فەتاح | ١٩٨٢ |
| -٥٣ | عەزیز کاکە رەش فەتاح | ١٩٨٢ |
| -٥٤ | ئارام کاکە رەش فەتاح | ١٩٨٤ |
| -٥٥ | سۆزان کاکە رەش فەتاح | ١٩٨٥ |
| -٥٦ | مریم خالد ئەحمەد | ١٩٨٦ |
| -٥٧ | ئاڤان ستار مەولود | ١٩٨٥ |
| -٥٨ | ڕۆژان ستار مەولود | ١٩٨٦ |
| -٥٩ | بنار ستار مەولود | ١٩٨٧ |
| -٦٠ | ئاشتی عەلی میکائیل | ١٩٥٧ |
| -٦١ | یوسف ابوبکر قادر | ١٩٧٩ |
| -٦٢ | سالار ابوبکر قادر | ١٩٨١ |
| -٦٣ | ساکار ابوبکر قادر | ١٩٨٤ |
| -٦٤ | عارف ابوبکر قادر | ١٩٦٥ |
| -٦٥ | ئالتون محمد عومەر | ١٩٥٣ |
| -٦٦ | زەیتون شوکر نەریمان | ١٩٧٤ |
| -٦٧ | ئاسۆ شوکر نریمان | ١٩٧٢ |
| -٦٨ | ئاکۆ شوکر نەریمان | ١٩٧٤ |
| -٦٩ | حەسۆ شوکر نەریمان | ١٩٧٢ |
| -٧٠ | سۆزان شوکر نەریمان | ١٩٨٠ |
| -٧١ | ژیان شوکر نەریمان | ١٩٨٢ |
| -٧٢ | ڤیان شوکر نەریمان | ١٩٨١ |
| -٧٣ | شمان ئەحمەد رضا | ١٩٨٦ |
| -٧٤ | سهام ئەحمەد رضا | ١٩٦٨ |

| | | |
|---|---|---|
| ٧٥- | سەنگەر عارف مەولود | ١٩٨٣ |
| ٧٦- | چنار عارف مولود | ١٩٧٨ |
| ٧٧- | مریم عزیز محمد | ١٩٧٢ |

٢- لیستی ئەنفالکراوەکانی گوندی (قودرەتە):

| ژمارە | ناوی سیانی | لەدایکبووی |
|---|---|---|
| ١- | عومەر عەزیز تۆفیق | ١٩٤٠ |
| ٢- | خانەگول عەزیز تۆفیق | ١٩٤٥ |
| ٣- | جمیلە عومەر عزیز | ١٩٧١ |
| ٤- | ئیسماعیل عومەر عزیز | ١٩٧٣ |
| ٥- | بۆکان عومەر عزیز | ١٩٨٠ |
| ٦- | عاصی عومەر عزیز | ١٩٨٣ |
| ٧- | سەرگوڵ عومەر عزیز | ١٩٨٤ |
| ٨- | جەواد خدر تۆفیق | ١٩٦٩ |
| ٩- | نەوشێروان خدر تۆفیق | ١٩٧١ |
| ١٠- | سالار صالح عەلی | ١٩٧٠ |
| ١١- | فەرهاد محمد تۆفیق | ١٩٧٣ |
| ١٢- | تارق تاهیر عەلی | ١٩٧٢ |
| ١٣- | سالم عزیز تۆفیق | ١٩٧٢ |

٣- لیستی ئەنفالکراوەکانی گوندی (سماقە):

| ژمارە | ناوی سیانی | لەدایکبووی |
|---|---|---|
| ١- | مدینە صدیق صالح | ١٩٦٣ |
| ٢- | ئامانج صمد عزیز | ١٩٨٢ |
| ٣- | ئارام صمد عزیز | ١٩٨٣ |
| ٤- | دیلان صمد عزیز | ١٩٨٥ |

| | | |
|---|---|---|
| -٥ | شلێر سلیم ئەحمەد | ١٩٧٢ |
| -٦ | رێگر طالب عزیز | ١٩٨٨ |
| -٧ | زبیدە عبداللە معروف | ١٩٤٣ |
| -٨ | ستی کاکە عەزیز | ١٩٧٠ |
| -٩ | سەنیە کاکە عەزیز | ١٩٧٣ |
| -١٠ | رزگار کاکە عزیز | ١٩٧٥ |
| -١١ | سەمیرە کاکە عزیز | ١٩٧٨ |
| -١٢ | کابان کاکە عزیز | ١٩٨٠ |
| -١٣ | شۆخان کاکە عزیز | ١٩٨٦ |
| -١٤ | حمەخان حسین مستەفا | ١٩٤٦ |
| -١٥ | لوقمان حمەخان حسین | ١٩٧٠ |
| -١٦ | کەمال ئەحمەد نەجم | ١٩٥٦ |
| -١٧ | ئەحمەد عارف محمد | ١٩٦٩ |
| -١٨ | هیدایەت محمد رەمەزان | ١٩٥٦ |
| -١٩ | عبدالمناف نادر عمر | ١٩٥٦ |
| -٢٠ | ناودل جعفر حسین | ١٩٥٢ |
| -٢١ | نوری خورشید محمد | ١٩٦٤ |
| -٢٢ | عائشە محمد میکائیل | ١٩٤٠ |
| -٢٣ | خدر معروف سەعید | ١٩٦٣ |
| -٢٤ | جوامێر عبداللە مجید | ١٩٦٤ |
| -٢٥ | جلال احمد رضا | ١٩٧٠ |
| -٢٦ | گولیخان انور محمد | ١٩٧٢ |
| -٢٧ | سۆران جلال احمد | ١٩٨٨ |
| -٢٨ | عزیزعبداللە میکائیل | ١٩٦٥ |
| -٢٩ | جبرائیل نادر عبداللە | ١٩٦٦ |
| -٣٠ | طاهر خورشید محمد | ١٩٥٤ |

| | | |
|---|---|---|
| -٣١ | بدريه كاكەمين محمد | ١٩٥٦ |
| -٣٢ | بەشدار طاهر خورشيد | ١٩٨٧ |
| -٣٣ | ئاوات طاهر خورشيد | ١٩٨٨ |
| -٣٤ | قادر عبدالله جبرائيل | ١٩٤٩ |
| -٣٥ | دلێر طاهر خورشيد | ١٩٨٣ |
| -٣٦ | شلێر طاهر خورشيد | ١٩٨٧ |
| -٣٧ | زارا فەقێ عەلی | ١٩٥٦ |
| -٣٨ | كاروان قادر عبدالله | ١٩٧٤ |
| -٣٩ | مەريوان قادر عبدالله | ١٩٧٦ |
| -٤٠ | كارزان قادر عبدالله | ١٩٧٨ |
| -٤١ | شيلان قادر عبدالله | ١٩٧٩ |
| -٤٢ | رێزان قادر عبدالله | ١٩٨١ |
| -٤٣ | نەشميل قادر عبدالله | ١٩٨٣ |
| -٤٤ | شيرين قادر عبدالله | ١٩٨٥ |
| -٤٥ | كەريم كاكل عومەر | ١٩٥٢ |
| -٤٦ | غوربەت محمد سلێمان | ١٩٥٦ |
| -٤٧ | ئيسماعيل كەريم كاكل | ١٩٧٧ |
| -٤٨ | ئيبراهيم كەريم كاكل | ١٩٧٩ |
| -٤٩ | صبيحە كەريم كاكل | ١٩٧٥ |
| -٥٠ | ئەيوب كەريم كاكل | ١٩٨٦ |
| -٥١ | طيب كەريم كاكل | ١٩٨٨ |
| -٥٢ | حبيبە كەريم كاكل | ١٩٨٣ |
| ٥٣ | نضال مەولود محمد | ١٩٧٠ |
| -٥٤ | صالح حسين امين | ١٩٣٩ |
| -٥٥ | سەرگوڵ جلال نەجم | ١٩٦٩ |
| -٥٦ | نەجات معروف سەعيد | ١٩٧١ |

| | | |
|---|---|---|
| -٥٧ | نوری خورشید محمد | ١٩٦٥ |
| -٥٨ | شادیه طاهر خورشید | ١٩٨٥ |
| -٥٩ | شەمام ئەحمەد رضا | ١٩٦٩ |
| -٦٠ | شوان جلال ئەحمەد | ١٩٦٨ |
| -٦١ | قادر عەلی محمد | ١٩٥٤ |
| -٦٢ | نازدار عزیز رسول | ١٩٥٤ |

٤- لیستی ئەنفالکراوەکانی گوندی (قەمیشە):

| ژمارە | ناوی سیانی | لەدایکبووی |
|---|---|---|
| -١ | صابر کەریم سلیمان | ١٩٣١ |
| -٢ | صبیحە محمد صالح | ١٩٣٥ |
| -٣ | کامران صابر کەریم | ١٩٧٣ |
| -٤ | صبیحە صابر کەریم | ١٩٧٠ |
| -٥ | بدیعە صابر کەریم | ١٩٧٥ |
| -٦ | شیلان صابر کەریم | ١٩٧٧ |
| -٧ | دلێر صابر کەریم | ١٩٧٩ |
| -٨ | فاخر صابر عەلی | ١٩٧٨ |
| -٩ | شوکر عەلی محمود | ١٩٥٢ |
| -١٠ | زەیتون رشید عمر | ١٩٥٤ |
| -١١ | زەینەب شوکر عەلی | ١٩٧٦ |
| -١٢ | زێرین شوکر عەلی | ١٩٧٨ |
| -١٣ | صباح شوکر عەلی | ١٩٨٤ |
| -١٤ | رازیە شوکر عەلی | ١٩٨٤ |
| -١٥ | مهدیە علی میکائیل | ١٩٨٦ |
| -١٦ | گولیخان انور احمد | ١٩٥٤ |
| -١٧ | زارا انور احمد | ١٩٧١ |

| | | |
|---|---|---|
| -١٨ | نەورۆز انور احمد | ١٩٧٣ |
| -١٩ | ئەحمەد انور ئەحمەد | ١٩٧٥ |
| -٢٠ | نەرمين انور احمد | ١٩٨٠ |
| -٢١ | پەيمان انور احمد | ١٩٨٢ |
| -٢٢ | بۆكان انور احمد | ١٩٨٤ |
| -٢٣ | بيمان انور احمد | ١٩٨٦ |
| -٢٤ | تمين احمد حسن | ١٩٥٤ |
| -٢٥ | ئامينە عەلى محمود | ١٩٢٥ |
| -٢٦ | لميعە رەحمان ابراهيم | ١٩٧٠ |
| -٢٧ | ابراهيم رەحمان ابراهيم | ١٩٧٦ |
| -٢٨ | عومەر رەحمان ابراهيم | ١٩٧١ |
| -٣٠ | رێبوار رەحمان ابراهيم | ١٩٨٢ |
| -٣١ | سەرباز رەحمان ابراهيم | ؟ |
| -٣٢ | عبيد كەريم مەردان | ١٩٤٧ |
| -٣٣ | اقليمە صالح محمود | ١٩٦٥ |
| -٣٤ | قادر عەلى محمود | ١٩٥٤ |
| -٣٥ | محمد وەيسى واحد | ١٩٧٠ |

٥- ليستى ئەنفالكراوەكانى گوندى (قەسرۆك):

| ژمارە | ناوى سيانى | لەدايكبووى |
|---|---|---|
| -١ | فاخر ئەحمەد محمد | ١٩٧١ |
| -٢ | ئەحمدە شەوكەت ئەفەندى | ١٩٧٣ |
| -٣ | مەهديە صديق حمەد امين | ١٩٥٥ |
| -٤ | سەعديە عبدالرحمن احمد | ١٩٧٨ |
| -٥ | اسماعيل عبدالرحمن احمد | ١٩٧٩ |
| -٦ | ئەردەلان عبدالرحمن احمد | ١٩٨٢ |

| | | |
|---|---|---|
| -٧ | ئەرخەوان عبدالرحمن احمد | ١٩٨٤ |
| -٨ | زارا عبدالرحمن احمد | ١٩٨٦ |
| -٩ | سەلام ئەحمەد محمد | ١٩٦٦ |
| -١٠ | بەسێ رەفیق تۆفیق | ١٩٤٥ |
| -١١ | فەیسەڵ قەرەنی حمدامین | ١٩٧٢ |
| -١٢ | مەسعود قەرەنی حمدامین | ١٩٧٥ |
| -١٣ | نەجیبە قەرەنی حمدامین | ١٩٧٧ |
| -١٤ | محمد قەرەنی حمدامین | ١٩٨٠ |
| -١٥ | سەکینە اسماعیل نوری | ١٩٦٩ |
| -١٦ | محی الدین نصرالله امین | ١٩٤٠ |
| -١٧ | احمد امین نصرالله | ١٩٧١ |
| -١٨ | رەحمە ئەفەندی زارا | ١٩٤٢ |
| -١٩ | هاجەرە رەفیق تۆفیق | ١٩٣٨ |
| -٢٠ | عبدالکریم شەفیق حسین | ١٩٥٣ |
| -٢١ | تۆفیق رەفیق تۆفیق (شەهید) | ١٩٣٨ |
| -٢٢ | روخسار جومعە | ١٩٦٠ |
| -٢٣ | رێبوار تۆفیق رەفیق | ١٩٨٥ |
| -٢٤ | هاوکار تۆفیق رەفیق | ١٩٨٧ |
| -٢٥ | صباح تۆفیق رەفیق | ١٩٦٦ |
| -٢٦ | کۆچەر صباح تۆفیق | ١٩٨٦ |
| -٢٧ | سەنگەر صباح تۆفیق | ١٩٨٧ |
| -٢٨ | عبدالله محمد قادر | ١٩٧٥ |
| -٢٩ | جلال صدرالدین نصرالدین | ١٩٦٥ |
| -٣٠ | ئەرسەلان عبدالرحمن احمد | ١٩٧٩ |
| -٣١ | زۆلێخا صابر محمد | ١٩٦٧ |
| -٣٢ | شاهۆ جلال صدرالدین | ١٩٨٧ |

| | | |
|---|---|---|
| -٣٣ | سەرگوڵ ئەفەندی رەزا | ١٩٣٠ |
| -٣٤ | دلێر ئەحمەد رەفیق | ١٩٧٧ |
| -٣٥ | ئارام ئەحمەد رەفیق | ١٩٨٠ |
| -٣٦ | جمال صدرالدین نصرالدین | ١٩٥٥ |
| -٣٧ | ئەستی صالح سەعید | ١٩٥٩ |
| -٣٨ | سامی جمال صدرالدین | ١٩٧٧ |
| -٣٩ | شادیە جمال صدرالدین | ١٩٧٩ |
| -٤٠ | ئاوات جمال صدرالدین | ١٩٨٢ |
| -٤١ | ئاواز جمال صدرالدین | ١٩٨٤ |
| -٤٢ | سەنگەر جمال صدرالدین | ١٩٨٧ |
| -٤٣ | سانیە صالح حمدامین | ١٩٣٥ |
| -٤٤ | سوعاد محمد رەجەب | ١٩٦٢ |
| -٤٥ | ئاوات بایز صالح | ١٩٧٩ |
| -٤٦ | خەبات بایز صالح | ١٩٨١ |
| -٤٧ | خانزاد بایز صالح | ١٩٨٣ |
| -٤٨ | ئاشتی بایز صالح | ١٩٨٤ |
| -٤٩ | داماو بایز صالح | ١٩٨٨ |
| -٥٠ | ئامینە عەلی محمد | ١٩٣٠ |
| -٥١ | عوسمان محمد کەریم | ١٩٥٢ |
| -٥٢ | رابیعە عوسمان محمد | ١٩٧٨ |
| -٥٣ | شێروان عوسمان محمد | ١٩٧٩ |
| -٥٤ | کاروان عوسمان محمد | ١٩٨٠ |
| -٥٥ | کارزان عوسمان محمد | ١٩٨١ |
| -٥٦ | سەمیعە عوسمان محمد | ١٩٨٢ |
| -٥٧ | شڤان عوسمان محمد | ١٩٨٤ |
| -٥٨ | مروەت عبداللە | ١٩٥٤ |

